**سپاس و پێزانین**

سپاســـی هاوڕێم خاتـــوو ژوولیێت مانـــس «Juliette Mince» دەکەم کە ئەرکی چاپی ئەم کتێبەی لە ئەستۆ گرت. ئەو خاتوونە بە بەردەوامی لە ڕەوتی نووسینی ئەم کتێبەدا هاوکاریی کردم و بە بێ یارمەتیی ئەو، ئەم کتێبە هەرگیز بەم شێوەیە کە دەیبینن، چاپ نەدەبوو.

هەروەهـــا ئەمەکداریی خۆم بۆ بەڕێز ژرار شـــاڵیان «Gerard Chalian» دەردەبڕم کە ســـەرەڕای هەموو ئاســـتەنگەکان، شـــێلگیرانە هانیدام بۆ نووسین و بەردەوام بوونم لە نووسینی ئەم کتێبە.

نووسەر

پێشکەشە بە

ئەم کتێبە پێشـــکەش دەکەم بە هەموو منداڵەکانمان، نەوەکانمان و بە هەموو بنەماڵە کوردەکانمان و هەروەها بە هەموو هاوڕێیانی ئێرانیمـــان، کورد و غەیری کورد و هیوادارم بەشـــێک لە مێژووی خۆیانی تێدا بەدی بکەن.

نووسەر

# ناوەرۆک

پێشەکیی کاک مستەفا هیجری ........ ٨
پێشەکیی دوکتور خەسرەو عەبدوڵڵایی مەندوولکانی ........ ١٢
پێشەکیی نووسەر ........ ١٥
ناساندن: ورەبەرزیی ژنێک ........ ٢٠
ئورووپاییەک لە وڵاتی کوردستاندا ........ ٣٢
پاشکۆ ........ ٣٨٦

## پێشەکیی کاک مستەفا هیجری

تۆ کە ڕۆژانە مێشکت بەبیستنی خەبەرەکان و وێنەکانی خولقاندنی جینایەت بەدەستی ئەو جینایەتکارانەی، سەودای مەرگ و خوێن بژیوی ژیانیانە، بۆمباران دەکرێ، ئەسەدی کوندەپەپوو دەبینی کە وڵاتێکی خاپوور کردووە و بە هەزاران منداڵی لەژێر وێرانەکاندا بێگیان کردووەو لە کۆشکەکەی خۆیدا سەرخۆشانە بەسەر ئەو وڵاتە کاولکراوەدا دەخوێنێ، کاتێک بیر لە حاڵی ئەو کچۆڵە قوتابییە منداڵکارانەی نیجریە دەکەیتەوە کە دڕندەکانی بوکۆحەرام لە قوتابخانەکاندا وەکوو دیل ڕەپێچیاندان و لەگەڵ خۆیان بردیانن، یان خەلافەتی ئیسلامیی سوننی چ ڕۆژە ڕەشییەکیان بۆ ژن و منداڵی ئێزدییەکانی شەنگال پێکهێنا بۆ ئەوەی بە پاداشی ئەم دڕندەییە بەهەشتی بەرینیان بە نسیب بێت و، خەلافەتی ئیسلامیی شیعە لە ئێران لە قوتابخانەکانی ئێران بەپێی بەرنامە کار دەکەن بۆ ئەوەی مێشکی قوتابییەکان لە مرۆڤایەتی بەتاڵ کەنەوە و بیانکەن بە کەرەسەی دەستی خوێناویی خۆیان و، لە زیندانەکاندا وەکوو ئەرکێکی ئایینی کەرامەتی کچان پێش لە ئێعدام کردنیان دەشکێنن بۆ ئەوەی لە ڕۆژی قیامەت ئەو کچانە نەچنە بەهەشت نەکا جێگەی

خۆیـان بەرتەنـگ بێتەوە و دەیان و سـەدان خەبـەری دیکەی لەو چەشنە چرکە بە چرکە بیر و هۆشت داگیر دەکەن. ناحەقت نییە کە لە ژیان و مرۆڤایەتی بێزار و بێهیوا بی.

بـەڵام لایەکی دیکـەی ئەم ژیانە گـەش و ڕەنگینـەی مرۆڤایەتی دەبینی کە چەندە بەرز و درەوشـاوەیە، ئەوانەی لەوپەڕی دونیاوە دەچن بە فریای لێقەوماوانی دەسـتی داعشەکان و بوکۆحەرامەکان بکـەون و لەو ڕێگەیەدا گیانی خۆیان بە سـەخاوەتەوە دەبەخشـن. مرۆڤگەلێکـی خـاوەن ئیرادەی بـەرز کە بە زانیـاری و ئاگاهییەوە ئامادەن هەموو شـتێکی خۆیان بکەنە قوربانـی و گیان بکەنەوە بە گیانی ئەو مرۆڤایەتییەدا کە لەسەرە مەرگدایە.

نموونـەی ئەو مرۆڤانە کە زۆربەشـیان بێ ناو و نیشـانن زۆرن و هـەر ئەوەش هیوامان بـەرز ڕادەگرێ کە مرۆڤایەتی زیندووە، با ئێمەش بۆ بەهێزتر کردنی، ئەرکی مرۆیی خۆمان بەجێ بگەیەنین.

ئێـوە یەکێـک لـەو نموونانە لە کتێبـی «ئوروپاییـەک لە وڵاتی کوردانـدا» دەدۆزنەوە.

نووسـەری ئەم کتێبە و قارەمانەکەشـی خانمـی هێلێن کرۆلیش.. هاوسـەری ڕێبەری شـەهید دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوویە کە لەنێو کوردەکاندا بە نەسـرین خانم ناسـراوە. من سـاڵانێکی دوور و درێـژە لەگـەڵ ئـەو خانمە ئاشـنام و لەو بیـر و بۆچوون و ئەو خۆشەویستییەی کە لەدڵیدایە بۆ کورد ئاگادارم، بێجگە لە پێوەندییە تەلەفۆنییەکانـی کـە لەگەڵ ئەو بەڕێزە هەمە، هـەر کاتێکیش ڕێگەم کەوتۆتە پاریس بە خزمەتی گەیشتووم و گوێم لە قسەکانی گرتووە. هەمیشە دڵی بۆ کورد و بەتایبەت بۆ حیزبی دێموکرات لێ‌دەدا، بۆیە هەر کات ڕووداوێکی تاڵ لە کوردستان بێتە پێش ئەو نیگەرانە.

بـەڵام ڕاسـتییەکەی هەتـا کتێبەکەیـم نەخوێندبـۆوە، قـەت بـە زەینیشـمدا نەدەهات کە ئەو خانمە ئەوەندە خۆبەخش، بە تەحەمول

و فیداکار بووبێ و لە پێناو خۆشەویستیی کورد و ڕزگاربوونی کورد لە چەنگ ستەم و، وفاداری بە هاوسەرەکەی، ئەو ژیان و بەسەرهاتە تاڵ و پڕ لە کوێرەوەرییەی قبووڵ کردبێ، چونکە قەت باسی ئەم بیرەوەرییە تاڵانە و ئەوەی لەپێناو بیروباوەڕیدا بەسەری هاتووە ناکا، قەت ئەو زەحمەتانەت پێ نافرۆشێتەوەو بە چاوتدا نایانداتەوە.

لە ئاخر سەفەرمدا بۆ پاریس ڕۆژی ٢٢ی مانگی jun (جوون) لە شوێنی نوێنەرایەتیی حیزب لە پاریس میوانم بوو، لە نێوان قسەکانمدا گوتم نەسرین خانم دوای خوێندنەوەی بەسەرهاتەکەت لە کتێبی ئوروپاییەک لە وڵاتی کورداندا ڕاستیی ئەو ژیانە پڕ لە ژانەت لەپێناو کورد و دوکتور قاسملوومدا بۆ دەرکەوت، بەڵام پێشتر قەت لە دانیشتنەکاندا باسی ئەو ڕووداوانەت نەکردووە، لە وەڵامدا گوتی «جا بۆچی باسم کردبا»، ئەوە ڕێگەی هەڵبژاردەی خۆم بووەو بە زانیاری و شارەزاییەوە هەڵمبژاردووە، چ پێویست بوو لێرەو ولەوێ باسی بکەم.

ئەو کتێبە بێجگە لەوەی کە پەردە لەسەر بەشێک لە ڕاستییە شاراوەکانی ژیان و تێکۆشانی نهێنیی دوکتور قاسملوو لە تاران و هێندێک لە کەسایەتییەکانی دیکە لا دەدات، ئیرادەی بەهێزی نەسرین خانم وەک ژنێک بۆ تەحەمولی ئەو هەموو ناتەباییە، هێندێک تێنەگەیشتوویی کەسانیکی دیکە، ژیانە نهێنییەکەی لە ئاوارەییدا بۆ هەموو کەس جێگەی لێ فێربوونە.

نەسرین خانم لە ڕیزی ئەو ژمارە لە هاوسەرانی پێشمەرگەدایە، کە بە درێژایی ساڵانی خەباتی پڕ لە سەروەری و لە هەمانکاتدا پڕ لە خوێن و فرمێسکدا باری قورس و تاقەت پڕووکێنی پێشمەرگایەتییان لەگەڵ هاوسەرەکانیان دابەش کردووە و زۆر جاریش بەشی قورستریان بەرکەوتووە، کە بەو حاڵەش کۆمەڵگە

کەمتــر بــە بارگرانی و زەحمەتە لــە تاقەت بەدەرەکانــی ئەو ژنانە دەزانێ.

نەسرین خانم بەهۆی غەریب بوونی و بێگانە بوونی، زەحمەت و بارگرانییەکەی چەند قات بووە. خۆشــحاڵم کە یەکێک لە هاندەرانی پێداگری نەســرین خانم بووم بۆ نووســینی ســەربردەی ژیانی لە دووتوێی کتێبێکدا.

مستەفا هیجری

## پێشەکیی دوکتور خەسرەو عەبدوڵڵایی مەندوولکانی

ســاڵێک لەمەوبەر، کاتێک کتێبەکەی خاتوو نەسرین قاسملوو، لە ژێر نێــوی «ئورووپاییەک لە وڵاتــی کوردستاندا»، بە زمانی فەرانســەوی لە پاریــس چاپ و بڵاو کرایەوە، بە ســەرنجدان بەوەیکــە بۆخۆم یەکێک لە هاوکارانی ناوبراو لە نووســینەوەی بەسەرهات و بیرەوەرییەکانیدا بووم، ســەرەڕای ئەوەش کە تەندرووســتیم باش نەبوو، بڕیارمدا ئەو کتێبــە وەربگێڕمە ســەر زمانی فارســی بۆئەوەی بکەوێتە بەردەســت هاووڵاتییە فارســەکانم بە هەمــوو نەتەوەکانییەوە و لەم ســۆنگەیەوە هەمــووان ئاگاداری چۆنیەتی ژیانی دوو خەباتکار بن کە هەموو ژیانی خۆیان لە ڕێگای ئازادی و بە تایبەتی ڕزگاریی نەتەوەی کورددا بەخت کرد. هەربۆیەش بابەتەکەم لای خاتوو نەســرین باس کرد. بەڕێزی، بە خۆشــییەوە پێشوازیی لە پێشنیارەکەی من کرد و بەم شێوەیە بوو کە شــانازیی وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ ســەر زمانی فارسی بە من بەخشرا و ئێســتاش کــە وەرگێڕانەکــەم تەواو کردووە، هەســت بە خۆشــی و شــادومانی دەکەم و لــەو ڕووەوە کە بۆخۆم ماوەی حەوت ســاڵ، لە بەشی پەیوەندییەکانی دەرەوەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێراندا، شانازیی هاوکاریی نەمر دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملووم هەبووە و لە دیدار و کۆبوونەوەکانی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسان، کەسایەتییە فەرهەنگی،

کۆمەڵایەتی و سیاسـی و دەسـەڵاتدارانی وڵاتە ئورووپاییەکاندا ئامادە بـووم و لە نزیکەوە شـاهێدی تێگەیشـتوویی و لێهاتوویـی ئەم پیاوە مەزنەی مێژووی خەباتی نەتەوەی کورد و باوەڕی قووڵی ئەو بە پێکەوە ژیانی نەتەوەکانی ئێران لەسـەر بنەمای مافی بەرانبەر لە چوارچێوەی ئێرانێکـی دێموکراتیکدا بـووم، بەوپەڕی شـانازییەوە، وەرگێڕانی ئەم کتێبە بە ڕۆحی پاکی نەمر، دوکتور عەبدولڕەحمانی قاسملوو، دیپلۆمات و گەورە پیاوی مێژووی خەباتی نەتەوەی کورد پێشکەش دەکەم.

بـەڵام سـەبارەت بـە وەرگێڕانـی کتێبـی «ئورووپاییەک لـە وڵاتی کوردانـدا» بە پێویسـتی دەزانم سـەرنجی خوێنەرانـی بەڕێز بۆ چەند خاڵێک ڕابکێشم:

١- پێشەکیی نووسەر بۆ چاپی فارسیی ئەم کتێبە، لەگەڵ پێشەکییەکەی بۆ چاپە فەرانسـەوییەکەی جیاوازیی هەیە کـە دەگەڕێتەوە بۆ بڕیاڕی نووسەر سەبارەت بە ئاڵوگۆڕ لە هەندێ لە بەشەکاندا.

٢- لە چاپی فارسـیی کتێبەکەدا، نووسـەر هەنـدێ هەڵەی وردی نێو چاپە فەرانسەوییەکەی ڕاست کردۆتەوە.

٣- نووسەر پێشەکییەکی بۆ چاپە فارسییەکەی نووسیوە.

لـە کۆتاییشـدا سپاسـی هاوسـەرم گوڵنـاز و منداڵەکانم هـەژار و شـیلان دەکەم کە سەرەڕای هەموو گرفتەکان، شێلگیرانە بۆ وەرگێڕان و بەردەوامبوونـم لەم ئەرکـە، هانیاندام. هەربۆیەش بەشـێوەیەک لە شێوەکان لەم وەرگێڕانەدا بە بەشداریان دەزانم.

خەسرەو عەبدوڵڵایی مەندولکانی

مامۆستای زمانی کوردی لە ئەنستیتۆی زمان و کولتوورە

ڕۆژهەڵاتییەکان (پاریس)

پاریس ٢٠١٢/٩/٢٧

## پێشەکیی نووسەر

خوێنەرانی بەڕێز!

لە ڕێی گێڕانەوەی ژیانی خۆمەوە، ویستم شاهێدی بۆ ژنان و پیاوانێک بدەم کە بە ئیرادەیەکی پتەوەوە لەبەرانبەر نادادپەروەریدا هەستانەوە و بەگژیدا چوون و هەربۆیەش، شیاوی نازناوی شۆڕشگێڕن.

هەڵگرتنی بەرپرسایەتیی نووسینەوەی ژیانی مرۆڤێک، هەردەم هەڵگری ئەو ئەگەرەیە کە مرۆڤ نەتوانێت دەرەقەت وردبینییەکی مێژوویی بێت، چونکە دەبێت هەم سەرنجی پێویست بە ناوەرۆک و پانتاییەکەی بدرێت و هەم لە پێوەندی لەگەڵ ڕووداوەکان و زەمەندا، کورتبێژی هەڵبژێریت. پەرتەوازەیــی و ئاڵۆزیــی ڕەوتی ژیانی پیاوێک یــان ژنێک، کارەکە بە سانایی ناباتە پێشەوە. هەموو ژیانێک وەکوو مووزاییکێکی ڕەنگامەیە و ڕەوتەکەی بە بەردەوامی و بێ وەستان لە ڕێی پێشهاتەکان و ڕووداوە چاوەڕواننەکراوەکانەوە دەپچڕێـت و دەرتانی بەردەوامبوونێکی یەک نەوایان نییە. ژیانی من و عەبدولڕەحمانیش پڕ هەوراز و نشێو و تەژی لە ڕەنگە جیاوازەکان بوو.

ئێمــێ ســێزێر «Amie Cesaire» دەڵێت:»ئەو مرۆڤانەی کە ئامانجیان ڕزگاریــی مــرۆڤ لە هەرچەشــنە کــۆت و زنجیرێک بێــت، بەلایانەوە هەڵەکــردن لە بێهەڵوێســتی شایســتەترە. ژیانــی مرۆڤگەلێکــی ئەوتۆ

لــە لمە خزۆکــەکان دەچێت. ئەوان بــۆ مانەوە و ســەقامگیرییان دەبێ خۆڕاگربن. من و عەبدولڕەحمان، هەردووکمان لەســەر لمە خزۆکەکان و لە سووچێکی ئەم گۆی زەوییە لەدایک بووین.

مرۆڤگەلێــک وەکــوو عەبدولڕەحمان کە لە شــێوە ژیانێکی ئاســایی دەردەچــن، دەکەونــە بــەر ســەرنجی وردی لایەنگــران و هەروەهــا ڕکەبەرەکانیــان و کەســایەتی و چالاکییەکانیان لە لایەن ئەو لایەنگر و ڕکەبەرانەوە دەکەوێتە ژێر هاوێنە و هەر گرووپێک بە پێی توانا فیکری و زەینییەکانیــان، ئــەم مرۆڤە هەڵکەوتانە دەنەخشــێنن. هەر گرووپێک بەپێی خواســتی خۆی هەڵسوکەوت دەکات و ئەوەش دەتوانێت بە پێی چلۆنایەتیی خواســتی ئەو گرووپە لەســەر بنەمــای پێداهەڵگوتن و یان ســووک کردن و بچووک کردنەوەی کەســایەتیی بەرانبەریان گۆڕانی بەسەردابێت.

ئــەم وێنایە ســەبارەت بــە عەبدولڕەحمان و دواجــار هەردووکمان، ڕاســت و جێگرە. هەر ئەوەش یەکێک لەو هۆکارانەیە کە بۆ نووســین هانــدەرم بــوو. چونکوو بیرەوەرییــەکان لەگەڵ تێپەڕینــی زەمەن کاڵ دەبنەوە و دەژاکێن و جگە لەوەی لە بیر و زەینی هەندێ لەو کەسانەدا کە لــە جەرگەی ئــەو ڕووداوانەدا ژیــاون دەمێنێتــەوە، چی‌دیکەی لێ نامێنێتــەوە و ئەگەر ئەو ڕووداوانە بە لێکدانەوە و شــرۆڤەی خەڵکانی دیکە بسپێردرێن، ڕەنگە ڕاستییەکان چەواشە و خەوشدار بکرێن.

مەبەســتم لــە گێڕانەوەی ژیانــم ئەوەیە کە خوێنەر لە ڕاســتییەکانی ژیانمان نزیک بکەمەوە. هەوڵمداوە سەبارەت بە کەسایەتیی ڕاستەقینەی عەبدولڕەحمــان بەئینســافەوە هەڵســوکەوت بکــەم و ئــەوەش بــەو مانەیەیە کە نەمویســتووە هەندێ تایبەتمەندیی نەرێنی ئەو بشارمەوە. عەبدولڕەحمان مرۆڤێک بوو، نەک فریشتە و یان بوونەوەرێکی ئاسمانی و ســەروو مرۆیی. ئەوەی لە ژیانی ئەوەدا گرینگە، هەر ئەو شــتەیە کە مــرۆڤ وەکــوو ڕێنوێــن و ڕێگەچارە بۆ بەرەکانی پــاش خۆی بەجێی دەهێڵێــت. گومان لەوەدا نییە کە عەبدولڕەحمان لە زەین و تێگەیشــتنی

هاونیشتمانەکانی خۆیدا ئاڵوگۆڕی دروست کرد و ڕوانگەیانی بە نیسبەت دنیا گۆڕی و هەستی خەباتکاریی و ئۆگریی ژیانی ئازادی لەواندا بەهێزتر و زیندووتر کردەوە و ئەوەش هەمان دەسکەوتە کە وەک میراتێک لەو بەجێما.

لە گێڕانەوەی ژیانمدا، خوێنەر چۆنیەتی ژیانی ئێمە دەدۆزێتەوە، نەک لێکدانەوەیەکی مێژوویی. سەرەڕای هەموو ئەوانەش، هەبوون ئەو کاتانەش کە شاهێدی تێپەڕینی بەپەلەی ڕەوتی ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان بووم.

لە سەردەمی دەسەڵاتداریی محەممەد ڕەزا پەهلەویدا، بەشداریم لە خەباتی نهێنیدا کردووە و لەو کاتانەشدا کە خەڵکی کورد لەگەڵ سوپای خومەینی شەڕیان دەکرد، لە کوردستان بووم. لە ڕەوتی ئەو دابڕانانەشدا کە لە حیزبی دێموکراتدا ڕوویدا، لەوێ بووم. بەڵام لە نووسینەوەی ژیانمدا ئەو ململانێ نێوخۆییانە ڕەنگیان نەداوەتەوە، لەبەر ئەوەی منیان لەو پرس و گرفتانە دوور ڕاگرتبوو، هەربۆیەش نەمدەتوانی سەبارەت بەو بابەتانە بەدرووستی بۆچوونی خۆم دەرببڕم. بەپێچەوانەوە، لە گێڕانەوەی ژیانمدا توانیم لە ڕێی ئەزموونەکانمەوە، باسی ڕۆژەڕەشی و نەهامەتیی ئەو خەڵکانە بکەم کە لەم ناوچەیەدا دەژین و هەروەها بارودۆخی نالەبار و تەژی لە نادادپەروەریی ئەو ژنانەی کە لەگەڵ ئەو دۆخە بەرەوڕوون. لە پێوەندی لەگەڵ پێگەی کۆمەڵایەتیی ژنان لە هەموو وڵاتانی ناوچە، وەک ژنانی ئێرانی، عێراقی، تورک و یان هەر نەتەوەیەکی دیکە و لەوانە، ژنانی کورد، بە ڕاستبێژییەکی بێبەزەییانەوە هەڵوێستم گرتووە و شاهێدیم بۆ بێبایەخیی ژنانی نێو ئەو کۆمەڵگا دژەژنانە، لە ڕوانگەی قورعانەوە، داوە. پێگەی کۆمەڵایەتی و ئەو هەژاریی و نەهامەتییانەی کە ژنان لەگەڵی بەرەوڕوون، بەڕاستی جێگەی بێزارییە.

عەبدولڕەحمان بەقووڵی بڕوای بەوە هەبوو کە شەڕ، چارەسەری کێشەکان نییە و دێر یان زوو دەبێ لە دەوری مێزێک کۆ ببنەوە

و پرســەکان لە ڕێــی وتووێژێکی ڕاســتگۆیانەوە چارەســەر بکرێن و هەربۆیەش بانگهێشــتی کۆماری ئیســلامیی ســەبارەت بە دانوســتانی قبــووڵ کرد. بە پێــی بەرنامەی ڕاگەیەندراو، کۆتایی هێنان بە شــەڕی نێوان دوو لایەنی دژبەر و هەروەها خودموختاریی کوردســتان دەبوو دانووستانی لەسەر کرابا.

عەبدولڕەحمان هەوڵــی دەدا ڕێگاچارەیەک بدۆزێتەوە کە ببێتە هۆی هێورتر کردنەوەی ئەو دۆخە نالەبارەی کە خەڵکی کوردی تێدا دەژیا و ڕەنگە هەر ئەم هەوڵ و تێکۆشــانانەش بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکی گونجاو، بووبێتنە هۆی ئەوە کە چاوپۆشــی لە هەندێ شــت بکا و ئەو خاڵــە لەبیربکات کە تێرۆریســتەکانی ســەر بە ئاخوندەکان، ســەرەتا دەســت دەکەن بە چەواشــەکاری و دواتــر هەوڵی لەناوبــردن ئەدەن. عەبدولڕەحمــان کە بە پێی سرووشــتی خۆی لە سیاســەتدا، مرۆڤێکی بیرتیــژ و دووربیــن بوو، پێی وابــوو دەتوانێ بیرکردنــەوەی مەلاکان بگۆڕێت و هەر ئەو بیرکردنەوەش بە نرخی لەدەســتدانی گیانی تەواو بوو. بە کوشتنی عەبدولڕەحمان ڕێژیمی مەلاکان نەیتوانی نەتەوەیەک لە خواســتی مافەکانی پاشگەز کاتەوە. ئەوان توانییان مرۆڤێک لەناوبەرن، بــەڵام هزر و ئازادی و دیرۆکی ئەو وەکوو ڕێبەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران وەکوو خۆی ماوەتەوە.

تا هەنووکە کتێبگەلێکی زۆر ســەبارەت بە کوردەکان و کوردســتان بڵاو بۆتەوە. هەندێ لەم کتێبانە ناوەرۆکێکی شیاویان هەیە.

پاش کوشــتنی عەبدولڕەحمان قاســملوو، گەلێک کتێبی دیکەش چاپ و بــڵاو کرانــەوە کــە یان ســەبارەت بە مێــژووی حیزبــی دێموکراتی کوردســتانی ئێرانن، یان شــرۆڤەی کەسایەتیی ســکرتێری گشتی ئەم حیزبەیان کردووە. هەر بۆیەش، سەرەڕای ئەوەی زۆرێک لە هاوڕێکانم داوایــان لێدەکــردم بیرەوەرییەکانــم بنووســمەوە، ماوەیەکــی زۆر ســەبارەت بە نووســینەوەی بیرەوەریگەلێکی ئەوتۆ لە شک و گوماندا بووم. پرســۆک بوون ســەبارەت بە ژیانی ژنێکی ئوروپایی کە لەگەڵ

پیاوێکی ڕۆژهەڵاتی ژیانی هاوبەشـــی پێکهێناوە و مێردەکەی ڕێبەرێکی ناودار بووە، جێی تێگەیشـــتنە. ســـەرەڕای ئەمەش، نووســـینەوەی ئەم بیرەوەرییانە گرێدراوی شرۆڤەی مێژووی کوردستانی ئێران و حیزبی دێموکراتـــی کوردســـتانی ئێرانیـــش بـــوون. چونکە خودی نووســـەری بیرەوەرییەکان لەو خەباتەدا بەشدار بووە. بەڵام بە بۆچوونی من، ئەم کارە لە ڕێی کەســـانێکی دیکەوە کە لە من باشـــتر بەسەر ئەم بابەتانەدا زاڵن، نووسراوەتەوە.

بەوحاڵـــەش، پـــاش ئـــەوەی کە درکم بـــەوە کرد کە ژیانـــی ئەم دوو کەســـەمان، بۆتە هـــۆی هەڵێنجانـــە ناڕاســـتەکان، بڕیـــاری گێڕانەوەی ژیانی خۆمم دا. هەندێک لەم هەڵێنجان و تێگەیشـــتنانە زەم و هەندێکی دیکەشـــیان پێدا هەڵگوتن و وەســـف کردنێک بووە کـــە گەورەکردنەوە و زێدەڕۆیـــی پێوە دیار بووە. ئـــەم گێڕانەوانە لە ژیانمان هەردووکیان دوور لە ڕاستین.

بۆ ئەوەی بتوانم وەکوو تاکێک، بە ڕوانگەیەکی عەینی و ڕاستبینانەوە، لە دەرەوە ســـەیری خۆم و بنەماڵەکەم بکەم، نووسین لە زمانی سێهەم کەسەوەم هەڵبژارد.

هەروەها ناوی «لینا»م بۆ ئەو سێهەم کەسە هەڵبژارد، کە لە ڕاستیدا کورتکراوەی چوار ناوە. هەربۆیەش ئەوەی دەنووسرێت، تەنیا بیرەوەری نییە، بەڵکوو لەگەڵ ئەو بابەتانەی کە خەڵکانی دیکەش لەوبارەوە پێیان گوتـــووم، گردم کردوونەتـــەوە. بە تەواوییش ئاگام لـــەوە هەیە کە لەو ڕووەوە کە ڕۆڵگێڕان و هەروەها شاهێدەکانی ڕووداوێک، زۆربەی جار هەڵێنجانی ناتەبا لەیەکتریان هەیە، هەربۆیەش لەم گێڕانەوەی ژیانەمدا، هەبوونـــی چەنـــد هەڵەیەک ڕێـــی تێدەچێت. بەڵام لە نووســـینەوەی ئەم ژیاننامەیەدا، هەم کەڵکم لە یادداشتە جۆراوجۆرەکانی خۆم وەرگرتووە و هـــەم لـــە بیری بەردەنگەکانـــم و بە بۆچوونی خۆم، ئـــاوا زیاتر جێی متمانە پێکردن بوون.

ژیانی خەباتکاران، هەم هەڵگری بڕگەگەلی مەترسیدارە و هەم لێوانلێوە

لە ساتە بەختەوەرەکان و خۆشی و هەروەها چەرمەسەرییەکانی ژیانی شەخسـیی و پرس و گرفتە ئاسـاییەکانی ژیانی ڕۆژانە. هەندێجار وا هەسـت پێدەکرێـت کـە ڕووداوێک لەگـەڵ ڕووداوەکـەی پێش خۆی پەیوەندییەکـی ڕاسـتەوخۆی نییە، بـەڵام دەبێ درک بـەوە بکرێت کە ئەو ڕووداوەش بەشـێکە لە تانوپـۆی لۆژیکیی پێکهاتەیەک کە ژیانێک دروسـت دەکـەن. ئەگەر بمویسـتبایە کـۆی ئەو ڕووداوانـەی کە لەم ژیاننامەیـەدا هاتـوون بـە وردی بگێڕمـەوە، بێگومان شـرۆڤەی هەر ڕووداوێک دەیتوانی لەخۆیدا هەڵگری کتێبێک بێت. بەڵام مەبەسـتی من لـە گێڕانەوەی ئەم کتێبە، تەنیـا وێناکردنی ژیانی خەباتکارانە، و ژیانی ڕۆژانە و هەروەها ئەو دۆخەیە کە ئەو ژیانەی پێدا تێپەڕیوە.

## ناساندن: ورەبەرزیی ژنێک

ئەم کتێبەی لەبەردەستی ئێوەدایە، چیرۆکی ژیانی ژنێکی ورەبەرزە، لەو چەشنە ورەبەرزییانەی کە کەس باسی ناکات، چونکە هەوڵی نەداوە بیکاتە هەرا و وتەی بریقەدار و مەبەستی ئەو، ورەبەرزیی و خۆڕاگریی ڕۆژانەی ژنانێکە کە دەکەونە دۆخێکەوە کە خۆیان هەڵیان نەبژاردووە. هەربۆیەش، لەپێشدا خاوەنی ئەو تایبەتمەندییە نەبووە کە دواتر تێیدا ئاشکرا دەبێت، ڕەنگیشە بووبێت و...

لێنا لە کاتێکدا کە تەمەنی تەنیا شەشساڵ بووە، دایکی دەکوژرێت و هەر ئەوەش سەردەمی منداڵیی ئەو تێکدەشکێنێت. باوکی زۆر لەخەمی ئەودا نییە و نەنکی، واتە دایکی باوکی بە گشتی ژنێکی ڕقئەستوورە و حەزی لە شکاندنەوەی خەڵکە(دایکی لێنا هیچ پەیوەندییەکی بە دنیای ئەم نەنکەوە نەبوو). بەختەوەرانە، لێنا پوورێکی(خوشکی دایکی) هەبوو کە هەرچەند بە هۆی هەژارییەوە نەیدەتوانی بیباتە لای خۆی( مێردی پووری لەو کرێکارانە بوو کە لە قووڵایی کانگا ژێرزەوینییەکانی بەردەخەڵووز لە یەکێک لە ناوچە بەردەڵانییەکانی چێکۆسلۆڤاکی کاری دەکرد)، بەڵام لە لێنا تێدەگەیشت و هەردەم هەوڵی دەدا باری سەر شانی ژیانە پڕ لە نەهامەتییەکەی لێنا سووک بکات و بە سۆزێک دڵی بداتەوە.

هێــزی ڕاکێشــان و بەتایبــەت ئۆگریی لینــای بچکۆلە بــۆ فێربوون، ســەرنج و مێهرەبانیــی ڕاهێنەرەکانی هەتیوخانە و مامۆســتاکانی ئەو قوتابخانانــەی بۆ لای لینا ڕاکێشــا بــوو کە لێی دەخوێنــدن. بێگومان، ئــەوەش لەخۆیدا، تا ڕادەیەک ببووە هۆی دڵخۆشــیی لینا. ســەردەمی منداڵیی لە لایەک، دەبێتە هۆی شکڵ گرتنی پێویستییەکی حاشاهەڵنەگر لە ناخی لینادا، پێویســتیی بەوەیکە خۆی بۆ خەباتێک تەرخان بکات کە لــە پێنــاوی وەدیهاتنی دادپەروەریدا بێت و لە لایەکی دیکەشــەوە، ئەو دەکاتە خاوەنی تایبەتمەندییەک کە دواتر لە سەردەمی ژیانی پڕ شەپۆلی لەگەڵ کوردەکاندا، خۆشەویستی و ڕێزی ئەوانی بۆ بگەڕێنێتەوە و ئەو تایبەتمەندییانــەش بریتی بوون لە: ورەبەرزی، ڕژد بوون، ڕێزدانان بۆ دیتران، خۆڕاگری لە بەرانبەر ئاستەنگەکاندا، کە گرێدراوی چەشنێک لە فیداکاری و لەخۆبوردوویی بوو.

ماوەیەکــی کورت پاش جەنگی جیهانیی دووهەم، کۆمۆنیســتەکان لە چێکۆســلۆڤاکی دەســەڵات دەگرنــە دەســت و درگای دواناوەندییەکان و زانکــۆکان بــەڕووی منداڵــی کرێــکارەکان و هەتیوگەلێــک وەک لینا دەکەنەوە. لینا هاوکات، هەم کار دەکات و هەم شەوانە، سەرەتا دەچێتە دواناوەنــدی و دواتریــش زانکــۆ. بــەڵام وەک دەڵێن: ڕەوتــی ژیان بە شــێوەیەکی دیکە دەچێتە پێشــەوە و ئەو ناتوانێت خوێندنی باڵا تەواو بکات، چونکوو عەبدولڕەحمان قاسملوو دەناسێت و لەگەڵ ئەودا ژیانی هاوبەش پێکدەهێنێت.

لینــا لــە جــەژن و بۆنەیەکــی زانکــۆدا عەبدولڕەحمــان دەناســێت. عەبدولڕەحمــان زمانــی چێکییەکەی تــا ڕادەیەکی زۆر پــاراو بووە و هەربۆیــەش لینــا پێی وا دەبێ کە خەڵکی ســلۆڤاکە. بــەڵام ئەو کوردە و موســوڵمان و خۆی بە نیســبەت دین و ئایینەوە بە بێباوەڕ پێناســە دەکات. ســەرەڕای هەمــوو ئەوانــەش لینا بــۆ ئــەوەی بتوانێت لەگەڵ عەبدولڕەحمان ژیانی هاوبەش پێک بێنێت، ناچار دەبێت لە ســەفارەتی ئێــران زەماوەند بکات، لینــا ناچار دەبێت ئایینی ئیســلام قبووڵ بکات.

هەرچەنـد لـە سـەفارەت پێیـان گوتبوو کە ئەو ئیسـلام هێنانـە تەنیا بەشێوەی «فۆرمالیتە»یە.

لە هاوڕێیەتیی لەگەڵ عەبدولڕحماندا کە سـاڵانێکی زۆر سـکرتێریی گشتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانی لە ئەستۆ بووە و دواتریش بـوو بە یەکێک لە خۆشەویسـتترین ڕێبەرانی بزووتنـەوەی کورد لەم وڵاتەدا و لە هەموو ناوچە کوردنشینەکاندا، لینایش بەو پەڕی خواستی دەروونـی خۆی پشـتیوانیی لە دۆزی کـورد کـرد. عەبدولڕەحمان لە سـاڵەکانی کۆتایـی تەمەنیـدا ببـووە کەسـایەتییەکی نێونەتەوەیـی و توانیی بە شـێوەیەکی گونجاوتر و بنەڕەتیتـر «دۆزی کورد» بە دنیا بناسێنێت.

عەبدولڕەحمـان پیاوێکـی گەلێک زیرەک، هەڵگـری کولتوورێکی باڵا، تێکەڵەیەک لە کولتووری ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی(ئەو بەشـێکی زۆری خوێندنی خۆی لە پاریس و پراگ تێپەڕاندبوو) و لە ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکـدا هێزێکـی بێ هاوتای هەبوو. سـەرەڕای ئـەوەش، ئەو هەرگیز لەو توانایەی خۆی بۆ سـەپاندنی بۆچوونە سیاسییەکانی خۆی کەڵکی وەرنەگرت. ئەو کە بە چەند زمان قسەی دەکرد و لە ڕووی سیاسییەوە، دیپلۆماتێکی زگماک بوو، بە بەکارهێنانی کاریگەرترین لێکدانەوەکان، چ بۆ شـرۆڤەی خەباتەکەی چ بۆ ورووژاندنی لایەنگرەکانی، هەوڵی دەدا بەرانبەرەکەی تێبگەیەنێت و ڕازیی بکات. ئەو هەروەها سیاسەتمەدارێکی زیـرەک و کارامـە و پابەند بە بنەماگەلێکی خـەوش هەڵنەگر بوو. ئەو قبووڵـی نەدەکـرد کـە بـۆ دەسـتەبەرکردنی ئامانج، دەکرێـت لە هەر ئامرازێـک کەڵک وەربگیرێت و دژی بەکارهێنانی کردەوەی دژەمرۆیی، وەکـوو ڕفاندن یان بە بارمتەگرتنـی مرۆڤەکان بوو، ئەو کردەوانە لەو سەردەمەدا لە نێوان هەندێ لە بزووتنەوە سیاسییەکاندا باو بوو، بەڵام ئـەو هەمیشـە حیزبەکەی خۆی لە تێـوەگلان لـە کردەوەگەلێکی وەها دوور دەگرت. دیارە تایبەتمەندیگەلێکی ئەوتۆ بۆ ڕاکێشـانی سـەرنجی ژنێـک وەک لینـا، کاریگەریـی هەبووە. ئەم ژن وپیاوە گەنجە، لەسـەر

بناغــەی بنەماگەلێکــی وەها یەکدەگرن و هەرکام بە شــێوازی خۆی و لە ڕێگەی جیاوازەوە بۆ دەســتەبەرکردنی لائیسیتە و دادپەروەرییەکی گشتگیر خەبات دەکەن.

لێنا تایبەتمەندییەکی دەگمەنی دیکەشــی هەیە و ئەویش عەشقی ئەوە بۆ کوردســتان و دیمەنــە جوانەکانی ئەم وڵاتە کــە هەرگیز فەرامۆش ناکرێــن و هەروەها ئەو خۆشەویســتیی و ئۆگرییەیە کە بۆ کوردەکان هەیەتی. دیارە ئەم خۆشەویســتی و ئۆگرییە هەنگاو بە هەنگاو و پاش ئاشــنا بوونی لەگەڵ کوردەکان دروست بوو. لە ڕاستیدا، ئەم خاتوونە ڕۆژئاواییــە کە لە وڵاتێکی ژێر دەســەڵاتی حکوومەتێکی پاوانخوازەوە هاتبــوو، لــە ڕۆحی خۆیــدا دەبێتە کــورد، دیارە بە هەســت کردن بەو پێویستییە کە پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو، دەبێ بۆ بەرابەرییەکی یاسایی، ئاڵوگۆڕی بەسەردابێت و لەو ڕێگایەدا نابێت لە خەبات پاشەکشە بکرێت و ئەو لە گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانی خۆیدا، ژنانی وڵاتە نوێیەکەی خۆی لەبیر نەکردووە و بۆ ســاتێکیش لە بایەخی دێموکراســی بۆ دەستەبەر کردنی ئەم بەرابەرییە خافڵ نەبووە.

چیرۆکــی ژیانی لێنا، چیرۆکــی فێربوونی شارســتانییەتێکی دیکەیە، شارســتانییەتێک کە لەودا، ژنان بە نیسبەت ئەمڕۆ ئازادتر بوون. ژنان فێری بەشــێک لەم شارســتانیەتییە، بە تایبەت لە بواری چێشت لێنان و ڕاهاتــن لە داب و نەریتە باوەکانی دەکــەن. لە فێربوونی داب و نەریتە باوەکانــدا، لێنا گوێڕایەڵــی ئەوان دەبێت، چونکوو ئــەو نایهەوێت ببێتە هۆی ڕاچڵەکانی ئەو کەسانەی کە ئیتر ئەندامانی بنەماڵەی ئەو بوون. لە هەمان کاتدا، هەرکاتێک کە بۆی بلوایە و پێی بکرایە، بە کەڵک وەرگرتن لە چەشــنێک پەروەردە کردن و ڕاهێنــان بۆ یارمەتیدانی هاوڕێکانی لە ڕەوتی دەســتەبەرکردنی کۆمەڵگەیەکی دێموکراتیک سڵی نەدەکردەوە. ســەرەڕای ئەوەش، لێنا بــە بێ ئەوەی هەوڵی شــاردنەوەی بدات، لەو بــوارەدا دان بە شکســتە زۆرەکانی خۆیدا دەنێت، بــە تایبەتی لە نێوان پیاوەکاندا.

لێنــا بە نیســبەت وڵاتە نوێیەکەیەوە خەمســارد نییــە و هەربۆیەش، هەرکاتێــک کە هەلێکی بۆ بڕەخســێت، هەوڵ دەدات بەو گەڕەکانەی کە لێی دەژیا ئاشنا بێت، و وەهایە کە بە بێ ئاگاداریی مێردەکەی سەردانی گەڕەکەکانی باشــووری تاران دەکات و بینینی هەژاریی لەڕادەبەدەری ئەو گەڕەکانە، دەبێتە هۆی سەرسووڕمانی، یان بینینی گوندە هەژار و بێئیمکاناتەکان گەلێک خەمباری دەکات. لە ڕاســتیدا، لێنا لەوێ ئەوەی بە جیهانی سێهەم ناوبانگی دەرکردبوو دەبینێ و ئەوەش کاریگەرییەکی قووڵی لەســەر دادەنێت. ئەو کەشفە، دەبێتە هاندەرێک بۆ بەهێز کردنی مەیلی، بۆ خەبات لە نێوان کەســانێکدا کە چیدیکە خۆی ببووە بەشــێک لەوان.

لێنا، زۆرێک لە ســاڵەکانی ژیانی خۆی بە شــێوەی نهێنی لەو ناوچە تێپــەڕ کرد. ئەو بە کەڵک وەرگرتن لەو کاتە زیادییانەی کە ئەو شــێوە ژیانە بەسەریدا سەپاندبووی، هەوڵی فێربوونی زمانی فارسی و کوردی دەدات. مەبەســتی لــە فێربــوون ئەوە بوو کــە لەوانی دیکــە تێبگات و ئەوانیش لە خۆی تێبگەیەنێت و بە تایبەتی، دەستی بەو دوو کولتوورە دەوڵەمەند و سەرنجڕاکێشە ڕابگات.

ئــەو هێزێکی خۆگونجاندنی لەڕادەبەدەری لە خۆی نیشــان دەدا، کە عەشــق و خۆشەویستی بۆ هاوســەرەکەی بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو هێزە نەیدەتوانی تاکە هۆکاری بێت. ئەم هێز و توانایە لە ڕاستیدا سەرچاوەکەی دەگەڕایەوە بۆ ئەو ڕێزە قووڵەی کە لێنا لە پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤەکاندا لە خۆی نیشــانی دەدا. لێنا لە بڕیاردان و پێشــداوەریی ســەبارەت بە مرۆڤــەکان خــۆی دوور دەگرت. ئەو هەوڵی دەدا لــە گرفتەکان تێبگات و درکیــان بکات، ئاریشــەگەلێک وەک تێکــەڵ نەبوونی ژن وپیاو(دوور خســتنەوەی ژنان لە پیاوان)، دۆخــی ژنان(کە دیارە حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران هەوڵێکی بێوچانی بۆ چارەسەری ئەو دۆخە دەدا)، نەریتە کۆنەکان، بەتایبەت لە گوندەکان و یان لە گەڕەکە هەژارنشینەکانی شــارەکان، نابەرابەرییە کۆمەڵایەتییــە تاقەتپڕووکێنەکان کە جەوهەر

و ڕۆحی دێموکراتیک نەیدەتوانی بەیەکجاری بیانسـڕێتەوە. سەرەڕای ئەمـەش، لینا لە هەر بارودۆخێکدا وەکـوو ژنێک بوونی دەبێت، ژنێکی خاوەن سـەربەخۆیی فیکری کە هەوڵ دەدات بیرکردنەوە و کردەوەی وەک یەک بێت.

لەم بوارانەدا، مێردەکەی ئەوەندەی پێی بکرێت یارمەتیدەریەتی و بە وەرگێڕانی وشـەکان و بەتایبەتی شیکردنەوەی ئەو هێماگەلەی کە لینا هێشتا ناتوانێت لێیان تێبگات یارمەتی دەدات.

پاش ئەوەی گەیشتنە کوردستانی ئێران، هاوسەرەکەی، لینا دەبات بۆ لای بنەماڵەکەی خـۆی. بنەماڵەی عەبدولڕەحمان هەر زۆر زوو لەگەڵ لینا ڕادێن و وەریدەگرن(لینا ژنێکی جوان، ڕووخۆش و دەم بەپێکەنین بوو). بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا، لینا هەسـت بە بەختەوەرییەکی قووڵ دەکات. بنەماڵـەی مێردەکـەی، بنەماڵەیەکی سـاماندار و تێکەلەیەک لە نەریتی کۆن و دابی مودێڕن بوون(هەموو کوڕەکانی بنەماڵە بە مەبەستی خوێنـدن ڕەوانـەی دەرەوەی وڵات کراون). لینا لـەم کۆمەڵگە ئاڵۆز و گەورە و لە هەمان کاتدا تەژی لە خاکەڕایی و خۆشەویستییەدا، هەوڵ دەدات فێـر بێت چۆن خۆی بگونجێنێت. ئـەو بە وردی و کارامەییەکی تایبەتەوە لەگەڵ خەم و شـادییەکانی ئەو کۆمەڵگەیە خۆی ڕێکدەخات. لەو بوارەشـدا، عەبدولڕەحمان بە مەبەستی پێشگرتن لە ئەگەری هەڵە، بـە بێ ئەوەی داوا لە لینا بکات خۆی لەگەڵ نۆرمەکانی ئەو کۆمەڵگەیە بگونجێنێـت، بە هانایەوە دێت و سـەرەداوەکانی ئەو ژیانەی بۆ ڕوون دەکاتەوە. مەبەسـتی ئەو لەو هاوکارییـە، ملکەچ بوونێکی کوێرکوێرانە بۆ داب و نەریتەکان (کە زۆربەشیان لە نەهی کراوە ئاینییەکان دەچن) نەبووە، بەڵکوو ویسـتوویەتی لینا لەگەڵ ڕۆح و کاکڵەی وجوودیی ئەو کۆمەڵگەیە ئاشنا بکات.

لە ڕاسـتیدا، ڕووخۆشـی، دڵفراوانی و خاکی بوونی لینا، دەبێتە هۆی ئەوە کە هەموو خۆشیان بوێت و ڕێزی لێ بگرن.

بـەڵام دەورانـی خـۆش و بەشـکۆی ژیانـی لینا لـە نێـو بنەماڵەی

عەبدولڕەحماندا زۆر ناخایەنێت. پێویستییەکانی خەباتی هاوسەرەکەی، دەبێتە هۆی ئەوەی لینا لەو ژیانە تەژی لە سۆز و خۆشەویستییەی کە بۆ یەکەمین جار بوو لە ژیانیدا ئەزموونی دەکرد دابڕێت. هەرچەند کە لەو بنەماڵەیەدا، هێماکان شوێنی وشەکانیان گرتبووەوە، بەڵام ئەوەندە ڕوون و ڕاشکاوانە بوون کە دواجار، ژنەکان لێک تێدەگەیشتن و پیاوەکانیش لە بوونی ژنێکی بێگانە و کاریگەریی لەسەر ژنەکانی خۆیان نیگەران نەبوون. هەرچەند لەو سەردەمەدا، پێشگرتن بە ژنان، بە نیسبەت چوونەدەرەوە و هەڵسوکەوت لەگەڵ پیاوان کەمتر بوو. سەرەڕای ئەوەش، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، حیزبێکی لائیکە و لە گێڕانەوەی ژیاننامەی لیناشدا، ئێمە زۆر بەدەگمەن ئاماژە بۆ سەرچاوە ئایینییەکان دەبینین. لینا کە ساویلکانە دڵی بە هێنانەدی خەونەکانی کچێکی گەنج کە بە هەتیوی گەورە بووە و حەزی لە پێکهێنانی بنەماڵەیەکی ڕاستەقینەیە خۆش کردبوو، ناچار دەبێت پاشەکشە لە حەز و ئاواتەکانی بکات و پاش ماوەیەک تێدەگات کە بۆ کەسێک کە شەو و ڕۆژی خۆی بۆ خەباتەکەی تەرخان کردووە، خەباتکارێک کە ڕۆژ بە ڕۆژ ئاستی بەرپرسیارییەتەکەی بەرز دەبێتەوە، بنەماڵە واتە ڕێکخراو و حیزبەکەی، ئەگەر بەربەستێکیش، تەنانەت ئەگەر هاوسەر و منداڵەکانیشی بن بێتە سەر ڕێی خەباتەکەی، دەبێت وەلا بنرێت.

نەبوون و دوورکەوتنەوە بەردەوامەکانی مێردەکەی، دەبێتە هۆی ئەوەی لینا بە تەنیا هەردوو کچەکەی گەورە بکات. جگە لەوەش، ژیانی نهێنیی مێردەکەی، لینا و منداڵەکانیش ناچار دەکات مل بۆ ئەو شێوە ژیانە ڕاکێشن. لە ڕاستیدا، خەباتی مێردەکەی، هۆکارێک دەبێت بۆ ئەوەی لیناش لە هەمان ئاستدا تێکەڵ بەو خەباتە بێت. بە تایبەت کە ڕێژیمیش هەر بەو چاوەوە لێی دەڕوانێ. هەربۆیەش چالاکییەکانی هاوسەرەکەی، لیناش دەخاتە مەترسیگەلێکی زۆرەوە. بۆ نموونە، ئاماژە بە چوونی لینا بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس و ڕووبەڕووبوونەوەی تۆقێنەر لەگەڵ ساواک، پۆلیسی سیاسیی تۆقێنەر و بێبەزەیی ڕێژیمی

شـا بکەین کـە لە کۆتاییشـدا لینا بـە نیسـبەت دەربازبوونی خۆی و کۆرپەلەکـەی ئەمەکداری مێهرەبانیی ئەفسـەرێک دەبێـت. بەهەرحاڵ، هاوسـەری خەباتکارێک کە بە شـوێنیەوەن، بەقەدەر ئەو خەباتکارە لە ژێر هەڕەشە و مەترسیدایە. بەڵام لینا، لە گێڕانەوەی ژیانی خۆیدا تەنیا باسـی ئەمە دەکات. دیسانەوەش، لینا بە وردبینییەکی تایبەتەوە پەنجە لەسەر ئەو پارادۆکسانە دادەنێت کە لەو سەردەمەدا حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵی بەرەوڕوو بووە. یەکێک لە ئامانجەکانی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران، سـەرەڕای دابین کردنی دێموکراسـی، بەرابەریی ژن و پیاوە. لەو بوارەدا، لە ڕاسـتیدا حیزب بەنیازی جێگیر کردنـی نۆرمگەلێکـە کە بە تـەواوی دژ بە نەریتـە زاڵەکانە و لە ژیانی ڕۆژانەدا، باوەکان بەسەر ئوسوول و تیئۆرییەکاندا زاڵ دەبن. هەر لەو ڕووەشـەوەیە کە دەبینین سـەرەڕای ئەوەی کە لە شاری تاران یازدە خەباتکار لە ژێر میچێکدا دەژین، هیچکام لە هاوڕێیانی پیاو تەنانەت بە بیریشیاندا نایەت کە لە ماڵدا دەست بدەنە کارێک و یارمەتیی لینا بدەن و ئەوەش دواجار نارەزایەتیی لینای لێدەکەوێتەوە. سـەرەڕای هەموو ئەوانەش پێویستە هەژاریی درێژخایەنیشی لێ زیاد بکەین.

پاش ئەوەی حیزب بڕیار دەدات کە پێویسـتە لینا بۆ هەمیشـە و بە شێوەیەکی نهێنی، لە ڕێی عێراقەوە، ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بەجێبهێڵێت، لینـا بـە تێپەڕاندنـی مەوداگەلێکـی دوور و درێـژ و خۆڕاگـری لـە بەرانبـەر گەرمـا و تینوویەتی، ترس و ماندوویەتـی تاقەتپڕووکێن و نەبوونی خواردەمەنی پێویسـت بۆ منداڵەکانی، لە ڕێی ڕەوەز و شاخە تووشەکانی کوردستانەوە سـەفەر دەکات. کاتێکیش کە دەگاتە عێراق، هیچ ئاسـەوارێک لەو پارە، بلیتی فڕۆکە و پاسـپۆرتانەی کە بڕیار بوو سەفەرە دەسبەجێکەی ئەو و منداڵەکانی مسۆگەر کەن لە ئارادا نییە. لینا و منداڵەکانـی وێڕای چاوەڕوانی بۆ وەرگرتنی بەڵگەنامە پێویسـتەکان، ناچار دەبن ژیانێکی نهێنی لە حەشارگە جۆراوجۆرەکاندا بەسەر بەرن، وەک کۆشـکێکی تۆقێنـەر، تاریک و نیـوە ڕووخاو لە دڵـی بیاباندا. لە

ترسـی ئەوەی نەکا حەشـارگەکەیان کەشـف بێت، ئـەوان نەدەبوو بە هیچ شـێوەیەک لەو کۆشـکە بێنە دەرەوە. هەربۆیەش، بۆ ئارام کردن و بێدەنـگ کردنـی منداڵەکانـی، لینا بیـری داهێنەری خـۆی بۆ یاریی منداڵەکانـی دەخاتە گەڕ و هەموو هەوڵیشـی ئەوەیـە کە منداڵەکانی لە شـۆکە چارەسەر هەڵنەگرەکان بپارێزێت. بەڵام خودی لینا لەو کۆشکە تۆقێنەرەدا تووشـی زمان گیران دەبێت و ساڵانێکی زۆر دەخایەنێت تا چاک دەبێتەوە.

بـە بۆچوونی من، ئەوە تەنیا ژنە کـە دەتوانێت ئەوە بکات کە لینا بۆ پاراسـتن و پارێـزگاری کردن لـە منداڵەکانی لە بەرانبـەر هەموو ئەو چەرمەسـەری و نەهامەتییانەدا کردی. ئەم ژیانە سـەختەی ڕۆژانەیان کـە زۆربەی کاتیش بە نهێنی بووە، سـەرەڕای ئەوەی کە دەبێتە هۆی ئاشـنا بوونی لینا لەگەڵ هاوڕێیانێکی وەفادار و هەمیشـەیی، بۆ خودی ئەو، لێکەوتەی قورسی بەدواوە دەبێت. بۆ نموونە، کچەکانی سەرەڕای تێپەڕینـی زەمـەن، لەوەی لینـا لەگەڵ ئـەوان و بۆ ئـەوان ئەزموونی کردووە تێناگەن. ئایا منداڵەکان، پاش پێگەیشـتنیان، دەتوانن لە دایک و باوکیان کە ئامانجەکانی خەباتیان بەسەر ئەواندا فەرز کردووە، تێبگەن؟ دیـارە دەبێت وەبیر بهێنینەوە کە لینا هەرگیز کچەکانی بێسەرپەرشـت نەهێشـتۆتەوە. بەو حاڵەشـەوە، تێنەگەیشـتن لەم بابەتە وەکوو خۆی ماوەتەوە و ئەوان تەنیا لینا بە بەرپرسی خۆیان دەزانن.

لینا کە کوردەکان بە «خوشکە نەسرین» ناوی دەبەن، لانیکەم ڕێزێکی یەکجـار زۆری هەیە لای بنەماڵەکەی، واتە کوردەکان. ڕاسـتە کە لینا، سەرەڕای هەموو ئاستەنگەکان و بە تەنیا مانەوەی کچەکانی، بە نۆرەی خۆی لەو خەباتەدا بەشدار بووە و هەرگیزیش وازی لێ نەهێناوە، بەڵام دەبـێ ئەو ڕاسـتییە بزانین کـە عەبدولڕەحمانیش گیانـی خۆی لە ڕێی ئـەو خەباتەدا فیدا کردووە. ئەو لە ڕەوتی ئەو داوەدا کە نێردراوەکانی ڕەفسـەنجانی، یەکێک لە جێگرەوەکانی خومەینی، بە شـێوەی نهێنی و لە ژێرناوی دانوسـتان بە مەبەستی ئاشتی لە ڤییەنی پێتەختی ئۆتریش

نابوویانەوە، تێرۆر کرا. لینا ئێســتاش بەردەوام پرسیار لەخۆی دەکات کە چۆن بوو ئەو پیاوە زیرەک و بیرتیژە، سەرەڕای بەئاگابوون لە فێڵ و فەند و چەواشەکاری و دووڕووییەکانی ڕێبەرانی ئێران، متمانەی بە وادە و بەڵێنییەکانی ئەوان کردا!

لینا ئەوجارەشــیان دەســت دەداتەوە خەبات، خەباتی ئەم جارەی بۆ ئەوەیە کە لەو جینایەتەدا کە هەروا بێئەنجام ماوەتەوە، بەرپرســایەتی حکوومەتــی ئەو کاتی ئۆتریش بە فەرمی وەربگیرێت و پەردە لەســەر تێرۆریســمێک لابدرێــت کــە ڕێژیمــی کۆمــاری ئیســلامیی ئێــران بە بەردەوامــی، لــە دژی دژبەرانی خۆی، بە تایبەت لە دژی کوردەکان کە ڕاشــکاوانە و بــە ورەوە خوازیاری مافە ڕەواکانــی خۆیانن، کەڵکی لێ وەردەگرێت.

ژوولییێت مانس Juliette Minces
فونتنێ ـ لوکونت، ژانوییەی ٢٠١١

ـ لەبیری بکە، ئەو دەبێتە هۆی چارەڕەشیی تۆ. ئەو موسوڵمانە و تۆ شـــارەزای ڕۆژهەڵات نیت! لەگەڵ ئێمە بمێنەوە، منداڵەکەشت بۆ گەورە دەکەین. ئەم منداڵە پێویســـتی بە بنەماڵەیە و ئێمە بە عەشقەوە ئاگامان لێی دەبێت...

ـ بــەڵام پــووریێ گیان(خوشــکی دایکــی)، ئەو هاوســـەری منــە! ئەو پیاوێکی لائیکە. ســـاڵانێکی زۆر لێرە ژیاوە و شـــارەزای ژیانی ئێمەیە. جگــە لەوەش من نامەوێ منداڵەکەم لە بوونــی باوک بێبەش بکەم. من باش دەزانم بێباوکی مانای چییە، تۆش باشـــتر لە هەموو کەســـێک ئەو ڕاستییە دەزانیت کە من بەو دەردەوە چەند ئازارم کێشاوە.

ـ دیــارە بۆ گوێگرتن لــە ئامۆژگارییەکانــم زۆر گەنجیت و گەلێکیش عاشــقیت. ئێســـتا کە ئاوا بێقەراری پەیوەســـت بوون بەویت، بڕۆ و من هیوای بەختەوەریت بۆ دەخوازم.

بەو شێوەیە بوو کە لینا بەمەبەستی ژیان لە ئێران، ڕێی ئەو وڵاتەی گرتەبەر.

■ سەرەتا

هەموو شتێک، بە سەردەمی منداڵی، پەروەردە، ڕاهێنان و بنەماڵەوە، ئەم دوو لاوەی لێک جیاواز دەکرد.

عەبدولڕەحمان لە بنەماڵەیەکی سامانداری و فیئۆداڵدا گەورە ببوو. باوکی، کوردێکی ڕۆشنبیر، خاوەنی چەند گوند و دەربەندێک بە خاکێکی بە پیزەوە لە کوردستانی ئێران بوو و ماوەیەکیش ڕاوێژکاری شازادەی جێنشینی ئێران بوو. باوکی کە پیاوێکی خۆشڕوو و لە هەمانکاتدا، بەزاکوون بوو، بایەخی پێویستی بە پەروەردە و بارهێنانی منداڵەکانی دابوو. عەبدولڕەحمان لە بنەماڵەیەکدا گەورە ببوو کە ئەندامەکانی خۆشیاندەویست و تێگەیشتن لە نێوانیاندا هەبوو.

عەبدولڕەحمان، جگە لەساڵی کۆتایی دواناوەندی، هەموو سەردەمی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی خۆی لە شاری زێدی خۆی تێپەڕاندبوو. دواساڵی دواناوەندی لە پێتەخت تێپەڕاندبوو. قوتابییەکی سەرکەوتوو بوو، فووتبۆڵی دەکرد، یان لە شاخەکانی ئەو دەورووبەرە شاخەوانیی دەکرد. هەرچەند باڵابەرز و پتەو بوو، بەڵام ئۆگرییەکی ئەوتۆی بۆ وەرزش نەبوو. ژیانی گەنجییەتی ئەو لە خۆشبژیوی و ساماندارییدا تێپەڕیبوو، وەکوو ڕووبارێک کە بە ئارامی بەرەو زەریا دەخوشێت.

هێشــتا گەنج بوو(لە تەمەنی چواردەســاڵیدا) کە وەکوو کۆمۆنیستێک چووبــووە ڕیــزی خەباتکارانی ڕێگای ئازادییــەوە، باوکی کە خۆی بۆ کشــانەوە لە ژیانی سیاسی ئامادە دەکرد، کاتێک ئەو هەواڵە دەبیسێت، لــە دیدارێکدا، نارەزایەتیی خۆی لەگەڵ بڕیاری کوڕەکەی ڕادەگەیەنێت. لەو دیدارەدا باوک بە کوڕەکەی دەڵێت: «ئێســتا کە وایە، تەنیا دەتوانم بڵێــم، ئەگــەر بڕیــارت دا کارێک بکەیت، بەباشــی بیکــە و هەرگیز لەو ڕێبازەی کــە هەڵتبــژاردووە، دوور مەکەرەوە». ڕەنگیشــە، هۆکاری ئــەوەی دوایین کوڕی ناردبووە پێتەخت بۆ ئــەوەی لە قوتابخانەیەکی تــەواو وەختی ســەختگیردا دەرس بخوێنێت، هیوایــەک بوو بۆ ئەوەی کوڕەکەی گیرۆدەی سیاسەت نەبێت.

بەڵام ژیانی لێنا هیچ لە ژیانی عەبدولڕەحمان نەدەچوو. لێنا، لە ماوەی قەیرانە گەورەکەی ســاڵەکانی ١٩٣٠، لە پراگ، پێتەختی چێکۆسلۆڤاکی لــە دایــک و باوکێک کە زۆر زوو لێک جــودا ببوونەوە لەدایک ببوو. لە تەمەنــی ٦ ســاڵیدا، دایکی کۆچی دوایــی دەکات و لێنا هەتیو دەبێت. لە ڕاســتیدا ئــەو لە ئۆرووپایەکــی خاپوور کراوی پــاش جەنگی جیهانیی دووهەم و لە نێوان کەســانێکدا گەورە ببوو کە یان نەیدەناسین یان بە باشی نەیدەناسین. هەربۆیەش کەسێکی نەبوو کە چاوەدێریی پەروەردە و ڕاهێنانــی بکات. تەنیا چەند مامۆســتایەک بایەخیان بەو بابەتە دابوو و هانیــان دابوو و هەوڵیان‌دابوو هەســتی باوەڕبەخۆبوونی تێدا بەهێز بکەن. لە هەموو ســەردەمی منداڵی، مێرمنداڵی و لاویەتیدا، بەردەوام لە شــارێکەوە بۆ شــارێک و لە قوتابخانەیەکەوە بــۆ قوتابخانەیەکی دیکە ڕادەگوێزرا. ئەو لە ماوەی خوێندنی ســەرەتایی و ناوەندیدا، یازدەجار لە قوتابخانەیەکــەوە بۆ قوتابخانەیەکی دیکە ڕاگوێزرا. لەو ڕووەوە کە کەسێکی نەبوو هەتا یارمەتیدەری بێت، ناچار بوو خوێندنی ناوەندی لە قوتابخانەیەکی شــەوانەڕۆژی بەرێتەسەر. هەربۆیەش، بۆ دابین کردنی پێداویســتییەکانی ژیانــی ناچار بوو هاوکات کاریــش بکات. ئەو گەلێک کاری جیاواز و قورســی تاقی کردبووەوە. ســەردەمێک وەک کرێکار،

کۆکردنەوەی ئەو وردەئاسـنانەی پێ ڕاسـپێردراوە کـە لە مەکینەکان دەڕژانە خوارەوە. سەردەمێکیش وەکوو کرێکاری قاڵبگیر، نموونەکانی سـرپی بۆ پیشەسازییە سـووکەکان، دەڕژاندە قاڵبەکانەوە. ئەو وەکوو ئێستاندارديست و کەسی دووهەم لە ژمێرياريیەکدا و هەروەها وەکوو دارێژەری پيشەسازی کاری کردووە.

لە نێوان چالاکییە وەرزشییەکاندا، حەزی لە مەلە و پیاسەی درێژخایەن بوو. ئەو، بەهۆی بەشمەینەتییەکانی سەردەمی منداڵی و هەروەها ژیانە ناسەقامگیرەکەی، قەڵافەتێکی لاوازی هەبوو.

سەرەڕای بوونی هەموو ئەو جیاوازییە گەورانە لە ژیان و پەروەردە و ڕاهێنانیانـدا، هـەردوو لاو، کۆمەڵێـک خاڵی گرینگی هاوبەشیشـیان هەبـوو. هەردووکیان حەزێکی لەبـن نەهاتوویان بۆ فێربوون هەبوو و هەروەها عاشـقی ئازادی بوون و ئامـادە بوون خەباتی بۆ بکەن. جگە لـەوەش، هەردووکیان زۆر گەنج بوون. کاتێک لە پراگ یەکتریان بینی، تەمەنی عەبدولڕەحمان ٢٠ سـاڵ و لینا ١٧ سـاڵ بوو. عەبدولڕەحمان سـەرقاڵی تـەواو کردنـی خوێندنـی زانکـۆ بـوو، لێنـا ڕۆژان وەکوو نەخشـەکێش (دیـسـيناترێس)ی پيشەسـازی کاری دەکرد و شەوانيش سـەرقاڵی خۆئامادەکـردن بـۆ تێپەڕاندنـی تاقیکردنەوەکانـی چوونـە زانکـۆ بوو. عەبدولڕەحمـان ببووە ئەندامی حيزبـی «توودە»ی ئێران و مارکسيسـم و لێنینيسـمی خوێندبووەوە، دەیویسـت ژیانی خۆی بۆ ئازادیـی خەڵکەکـەی تەرخـان بکات. لێنـا ئەندامی ڕێکخـراوی لاوانی چێکۆسـلۆڤاکی بوو، بەڵام کەمتر سـوودی لە ئیدئۆلۆژیی کۆمۆنیستی وەرگرتبـوو، بـەڵام پێداگر بوو لـەوەی هاوکاریی ئەو پیـاوە بکات کە خۆشـی دەویسـت، لە خەبات بۆ ڕزگاریی نەتەوەکەیـدا. هاوکات، لێنا خەونی بە ژیان لە ناو بنەماڵەیەکی پڕخێزانەوە دەدیت(چونکە خۆی لە بنەماڵەیەکـی ئەوتۆ بێبەش بوو) و بە دڵنیاییەوە نەیدەزانی کە دۆخێکی ئەوتۆ لەگەڵ ژیانی خەباتکارێکدا ناگونجێت.

بەهەرحاڵ، دیدارە بڕووسـکە ئاسـاکەیان، بوو بە عەشـقێکی گەورە

کە ســەرەڕای تێپەڕبوونی ســاڵانێکی زۆر، ئەوانی بۆ ماوەی ٣٧ ساڵ یەککخســت. ئەوان شــان بە شــانی یەک ڕێگایەکیان گرتەبەر کە بەرەو دەریایەکی خرۆشان و زۆرجار مەرگهێنەری دەبردن.

■ عەبدولڕەحمان و بنەماڵەکەی

عەبدولڕەحمان کە ساڵی ١٩٣٠ لە شاری ورمێ(ڕەزاییە) لەدایک بوو، دوایین منداڵی بنەماڵەی قاسملوو لە ناو کوڕەکاندا بوو. «محەممەد»ی باوکی، کوردێکی ســوننە مەزهەب و «نانە»ی دایکی، ژنێکی ئاسووری و پەیڕەوی ئایینی مەسیحییەت بوو. بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوبەش لەگەڵ محەممەددا، ئایینی خۆی گۆڕیبوو و ببووە موسوڵمان و ناوی فاتمەیان لێ نابــوو. «وســووقوددیوان» چەندین ژنی هەبوو. بــە وتەی خودی محەممەد، ئەو ٩ ژنی هەبووە. بەڵام بە پێی قسەی نانە خانم، محەممەد ٢٥ ژنــی هێنابوو، بەڵام لەو ژنانە تەنیا ســیانیان منداڵیان بە محەممەد بەخشیبوو.

بنەماڵەی قاســملوو، لق و پۆپی زۆری لێ ببووەوە کە لە باشــووری کوردســتانەوە هەتــا ئێســتامبولی تورکیــە پەرەی ســەندبوو و ئەگەر بگوترێت کە ئەو بنەماڵەیە سەدان ئەندامی هەیە، زێدەڕۆیی نەکراوە. بەڵام عەبدولڕەحمان زۆر بەکەمی باسی دەکردن. هەربۆیەش، زانیارییەکانی ئێمە لەوبارەوە کەم وکورت و ناتەواون. ســەبارەت بە بنەماڵەی دایکی عەبدولڕەحمانیش، ســەرەڕای بەدواداچــوون و لێکۆڵینەوەی زۆر، لێنا زانیارییەکی ئەوتۆی نییە.

محەممــەدی باوکــی عەبدولڕەحمان، هەڵگری نازناوی ســەڵتەنەتیی، وســووقوددیوان[١] بــوو و هەربۆیــەش خەڵک بە وســووق ئاغا ناویان دەبرد. لە ساڵەکانی کۆتایی دەیەی ١٨٩٠، شای ئەوکات، ئەوی ناردبوو بۆ لای شــازادەی جێنشــین «محەممەد عەلی»، کە لە شاری تەورێزی ئازەربایجــان نیشــتەجێ بــوو. باوکــی عەبدولڕەحمــان لــەوێ ئەرکی

١. وسووق: واتە جێی متمانە، وسووقوددیوان واتە جێی متمانەی دامودەزگای پاشایەتی

سەرپەرشتیی ئەسپەکانی شازادەی جێنشینی لە ئەستۆ بوو.

ئۆگریـــی کوردەکان بۆ ئەســـپ و چاپوکیی ئەوان لە ســـوارکاریدا، لە کۆنـــەوە بەناوبانگە و وســـووق ئاغا واتە محەممەد خـــان، لەو بوارەدا کوردێکـــی ڕاســـتەقینە بوو. شـــازادەی جێنشـــین حەزی لـــە ڕاو بوو و محەممـــەد خـــان لە کاتی ڕاودا هاوڕێیەتی دەکرد. شـــازادەی جێنشـــین وردە وردە پـــەی بـــە زانســـتی محەممـــەد خـــان دەبات و ســـەرەنجام سەرنجی دەداتێ و دەیکاتە ڕاوێژکاری خۆی. هەر ئەو بابەتەش، وەک دەبینیـــن، بـــۆ محەممەد خان قورس دەکەوێتەوە. شـــازادەی جێنشـــین زۆری حـــەز لە مەتەڵ بوو، ســـەری دەخســـتە ســـەر ڕاوێژکارەکەی و توورەی دەکرد. ڕۆژێک کە پێکەوە سەرقاڵی ڕاو بوون، شازادە پرسیار لـــە ڕاوێژکارەکـــەی دەکات: «ئەوە چییـــە کە ســـەگەکان نایخۆن بەڵام سونییەکان دەیخۆن؟»

جێی وەبیرهێنانەوەیە کە بنەماڵەی سەڵتەنەتی شیعە مەزهەب بوون. لە حاڵێکدا کە کوردەکان بە زۆری سوننی مەزهەبن. باوکی عەبدولڕەحمان کـــە لەو کاتـــەدا نازناو و پێگەی وســـووقوددیوانی هەبوو، ڕاشـــکاوانە وەڵامی دەداتەوە: «جەنابی شـــازادەی جێنشـــین، ئەوە کەروێشـــکە کە ئێمە گۆشتەکەی دەخۆین، بەڵام ســـەگەکان نایخۆن».(لێرەدا مەبەستی شیعەکان بووە).

دیـــارە ئـــەوە ســـووکایەتیکردنێکی دوور لە ئەدەب بـــووە، بەڵام ئایا شازادەی جێنشینیش پرسیارەکەی بێ ئەدەبانە نەبوو؟

شـــازادە دەســـبەجێ ئەمـــری دەستبەســـەرکردنی ڕاوێژکارەکـــەی دەردەکات و ڕەوانـــەی ورمێـــی دەکات لـــە ٤٠٠ کیلۆمیتریی تەورێزدا. لـــەوێ والیی ورمـــێ محەممەد خان بە کۆت و زنجیر دەبەســـتێتەوە و دەینێرێتـــە زینـــدان. بەڵام وســـووقوددیوان پیاوێکی ســـاماندار بوو، بە دانـــی بەرتیل، بە زوویی لـــە زیندان هاتەدەرەوە. هێنـــدەی نەخایاند کە شـــازادەی جێنشـــین کە بیری وســـووقی کردبوو، چەند ڕاسپاردەیەکی نـــاردە لای بۆ ئەوەی بگەڕێتـــەوە و پێگەکەی پێشـــووی وەربگرێتەوە.

وسووقوددیوان نێردراوەکانی بە مێهرەبانی و ڕێزەوە وەرگرت و ڕێی پێــدان بە پێی نەریتی میوانداری چەند ڕۆژێک پشــوو بدەن و پاشــان بــە دەســتی بەتاڵ بەڕێی کردنەوە بۆ تەوریــز و پاش ئەوەش، هەرگیز نەگەڕایەوە بۆلای شــازادەی جێنشین. پێویســتە بگوترێت نازناوەکەی ئەو، واتە «وسووقوددیوان»، هەرگیز لێی وەرنەگیرایەوە.

وســووقوددیوان کەســایەتییەکی هەڵکەوتــە و دەگمەنی هەبوو. ئەو کە لەدایک بووی ساڵی ١٨٧٥ بوو، بە نیسبەت سەردەمەکەی خۆیەوە، پیاوێکی ڕۆشنبیر و خوێندەوار بوو و شانازیی بە کوردبوونی خۆیەوە دەکرد. ئەو موســوڵمانێکی ســوننی مەزهەب و ســاماندار و بە قووڵی باوەڕمەند بە ئایینی ئیسلام بوو. حەوت گوند و گەلی قاسملووی وەک میرات بۆ مابووەوە. ســەرئەنجام، لە کاتێکدا کــە حکوومەتی ناوەندی، پــرۆژەی نــاوی خێزانیی هێنایە ئــارا، نازناوی خێزانەکــەی خۆی لەو دەربەندەوە وەرگرت. ئەو مرۆڤێکی ژیان خۆشەویست بوو و کەڵکی لە جوانییەکانی ژیان وەردەگرت. بایەخێکی زۆری بە پاراستنی کەرامەتی خــۆی و خێزانەکەی دەدا و هەروەها ســەرنجێکی زۆری دەدایە دابین بوونــی ژیانــی داهاتــووی کوڕەکانــی و هەوڵی دەدا کوڕەکانیشــی لە داهاتــوودا ناو و ناوبانگی بنەماڵەکەیان بەرز ڕابگرن. هەربۆیەش، زۆر پێــش ئەوەش کە بچنە قوتابخانە، شــیعر و مەتەڵ و پەندی پێشــینیان و یارییــە جۆراوجــۆرەکان وەک، شــەترەنجی فێر دەکــردن. هەروەها سوارکاریشــیی فێر کردبــوون. هەربۆیەش، کاتێــک کوڕەکانی چوونە قوتابخانــە، شــارەزاییان لە دوو زمانــی تورکیی ئازەریــی و کوردیدا هەبوو (عەبدولڕەحمان جگە لەو دوو زمانە، بە زمانی ئاســووریش کە دایکی بە نهێنی فێری دەکرد قســەی دەکرد). زمانی فارسی، چ ئەوکات و چ ئەمڕۆکــەش، تاکە زمانی زۆرەملەی خوێندنە لە ئێران. هەربۆیەش منداڵێکی تەمەن شــەش ســاڵ کە لە کەمینەیەکی نەتەوەییە، بۆ ئەوەی بیەوێت لە خوێندنەکەیدا سەرکەوتوو بێت، پێویستە بە زووترین کات ئەو زمانە فێر بێت. ســەرەڕای ئەوەش، لە ڕەوتی خوێندندا دەبوو زمانێکی

«بیانی»یش فێر بن. عەبدولڕەحمان زمانی فەرانسەویی وەکوو زمانی بیانی هەڵبژاردبوو، هاوکات کوڕەکان دەبوو بچنە مەکتەبی قورئانیش کە ماوەی دوو ساڵی دەخایاند و بەم چەشنە فێری عەرەبیی قورعانیش دەبوون. بەم شێوەیە، منداڵەکانی وسووق ئاغا، پێش کۆتایی هاتنی قۆناغی دواناوەندی، بەسەر پێنج تا شەش زماندا زاڵ ببون.

حکومەتەکانی ئێران، چ لە سەردەمی پاشایەتیدا و چ لە سەردەمی کۆماری ئیسلامیدا، هەرگیز ئامادە نەبوون تایبەتمەندییە فەرهەنگییەکانی کەمینەکان و بە تایبەت، زمانی دایکییان بە فەرمی بناسن. ئەمە لە ڕاستیدا، شێوازێک بوو بۆ ڕاگرتنیان لە نەخوێندەواریدا و لە هەمانکاتدا، ژێرچەپۆکە و گوێڕایەڵ کردنیان. سەرەڕای ئەوەش، کاتێک کە ئەو منداڵانەی فارس زمان نین دەرفەتی چوونە قوتابخانەیان بۆ دەڕەخسێت، ئەگەر لە خوێندنەکەیاندا سەرکەوتوو بن، بە ناچاری و لە دەرئەنجامی یاسا تەژی لە هەڵاواردنەکان بەنیسبەت کەمینەکانەوە، تووشی چەند زمانی دەبن. لە ڕەوتی جەنگی جیهانیی دووهەمدا، وسووقوددیوان لە شاری ڕەزاییە (ورمێ) لە دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستدا(حیزبی توودە) بەشداری کرد. ئەو وەکوو ئەندامی کومیتەی هەڵبژاردنی حیزب، ئەندامی ئەو هەیئەتی نوێنەرانە بوو کە ناردیانن بۆ باکۆ لە سۆڤییەت بۆ ئەوەی سەبارەت بە بابەتە جۆراوجۆرەکان و لەوانە، دۆخی کوردەکان لە ئێران دیالۆگ بکەن(لەو کاتەدا،سوپای سوور بەشی باکووری ئێرانی بەدەستەوە گرتبوو). بەڵام، پاش گەڕانەوە لە باکۆ، وسووقوددیوان بە بێ ئەوەی کەسێک لە هۆکارەکەی ئاگادار بێت، وازی لە هەموو بەرپرسایەتییە سیاسییەکانی خۆی هێنا. لەوە بەدوا، ئەو هەموو ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ بەڕێوەبەریی کاروباری گوندەکان و زەوییەکانی خۆی و هەروەها گرتنە ئەستۆی ڕۆڵی «ڕیش سپی» و جێ متمانەی خەڵک لە ناوچەکەدا، کە ئەم بەرپرسایەتییە لە ساڵەکانی(١٩٠٧-١٨٩٦) دا لە لایەن موزەفەرەدین شای قاجارەوە هاوکات لەگەڵ پێدانی نازناوی وسووقوددیوان خرابووە ئەستۆی. وسووقوددیوان لە تەمەنی ٩٨ ساڵیدا

ماڵئاوایی لە ژیان کرد.دوو ساڵ پاش ئەوەش دایکی عەبدولڕەحمان لە تەمەنی ٧٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

■ دایکی عەبدولڕەحمان

لــەو ڕووەوە کــە نانە خانم، تاکە ژن بوو کــە منداڵی کوڕی ببوو، لە ڕاســتیدا، خانمی یەکــەم و گەورەی ماڵ و سەرپەرشــتی بنەماڵە بوو. ئەو کە لە بنەڕەتدا مەســیحی بوو و دواتر ببووە موســوڵمان، هەرگیز خودای مەسیحییەتی لەبیر نەکردبوو. ئەو بە شێوەی پەنهانی سەردانی کەنیســەی ئۆرتۆدۆکسی شاری دەکرد و هەندێ کات، عەبدولڕەحمانی بچکۆلەشــی لەگــەڵ خۆی دەبرد. ئەم ســەربزێوییە هاوبەشــە، ڕازێک بــوو لە بەینی ئەو دووانەدا کە تەنانەت عەبدولڕەحمانی بچکۆلانەش بە پاراستنی ئەو ڕازە پابەند بوو. ئەم بابەتە دەرەتانی ئەوەی بۆ ڕەخساند کە پەی بە بوونی باوەڕگەلی دیکە و هەروەها پێویســتیی ڕێزگرتن لەو باوەڕانە ببات. عەبدولڕەحمان بە درێژایی تەمەنی ئەو ڕۆشنبیرییەی بە نیسبەت باوەڕە ئایینییەکانی دیکە، لە خۆی نیشان دا.

بــە وتەی نانە خانم، دوایین کوڕی لە هاویندا لەدایک ببوو. نانە خانم ڕاشکاوانە دەیگوت: «کەش زۆر گەرم بوو و مێشەکان ئازاریان ئەدام». بــەڵام بــە وتەی یەکێک لــە ئامۆزاکانی، بابووش(نزیــکان و خزمەکانی عەبدولڕەحمــان لــە ماڵــەوە، بەو نــاوە بانگیان لێ دەکرد) لە زســتاندا لەدایــک ببــوو. پاش مشــتومڕێکی زۆر، دواجار، ئامۆزا ســەرکەوت و نانەخانــم دانی بە شکســتی خۆیدا هێنا و ئەوە بــوو کە ڕێکەوتی ٢٢ی دێســامبریان وەکوو ڕۆژی لەدایک بوونــی عەبدولڕەحمان دیاریکرد. بەهەرحاڵ، ئەم بابەتە کە ئایا ڕێکەوتی هەڵبژێردراو، ڕاستە یان ئەوەی بۆ ماوەی شــەش مانگ گەنجتر یــان پیرتریان کردووە، هەرگیز ڕوون نابێتەوە( شــایانی گوتنە کە لەگەڵ ئەوەدا دەرکردنی ناســنامە لە ساڵی ١٩٢٥دا لە ئێران بوو بە باو، بەڵام ماوەیەکی زۆری خایاند هەتا خەڵک لەگەڵــی ڕاهاتن. بۆ خەڵــک، گرینگ ئەوە بوو کە بزانــن لەدایک بوونی

منداڵەکەیان هاوکات بووە لەگەڵ ڕووداوێکی گرینگدا).

■ سەردەمی منداڵیی بابووش

عەبدولڕەحمان بەشـێکی زۆری سـەردەمی منداڵیی خـۆی، لای لقە جیاوازەکانی بنەماڵە لە دەرەوەی شار، لە گوند و «گەلی قاسملوو» و یان لە گوندەکانی دیکەی کوردسـتان بردەسـەر. تەنانەت ئەوکاتەی لە شار چووە قوتابخانە، دیسانەوە لە کاتی پشووی خوێندندا دەگەڕایەوە بۆ ئەو گوندانە و کاتەکانی خۆی لەوێ دەبردەسەر. ئەوەش بووە هۆی ئەوە کە لە نزیکەوە لەگەڵ ژیانی گوندنشـینەکان ئاشنا بێت و لە یاریی و خۆشـییەکانی منداڵانی گونددا بەشداری بکات. ئەم بابەتە بووە هۆی ئەوەی کە ئەو هەژاریی و چەرمەسـەریی تاقەتپڕووکێنی گوندنشـینە کوردەکان بەچاوی خۆی ببینێت.

ئـەو سـاڵانە بـۆ عەبدولڕەحمـان، لە لایەکـەوە سـاڵانێکی پڕاوپڕی بەختـەوەری و لە لایەکـی دیکەوە، دەرفەتێک بوون بـۆ ئەوەی لەگەڵ دۆخی ژیانی خەڵکەکەی ئاشـنا بێت. ئەو سـاڵانە، ئەویان لەگەڵ ژیانی خەڵکی ناوچەکە و هەڵسوکەوت و شێوازی ئاخاوتنیان نزیک کردەوە و بووە هۆی ئەوە کە جوگرافیای ناوچەکە بەتەواوی بناسـێت. هەندێ لە هاوڕێیانی ئەو سـەردەمە لە ژیانی ئەو، تا کۆتایی تەمەنی پێی وەفادار مانـەوە. ئەوەی ئەو لەوێ و لە سـەردەمی منداڵیـدا فێری ببوو، دواتر لـە ڕەوتی خەباتدا سـوودی بۆی هەبوو و تەنانـەت هەندێجار بوونە هـۆی ڕزگار بوونی لە مـەرگ. ئەو وەکوو هاوڕێکانی دیکەی فێر ببوو کـە چلۆن بە هەڵگرتنی بەردێکی ئاسـایی لە بەرانبـەر ئاژەڵە دڕندە و مەترسـیدارەکاندا بەرگـری لە خـۆی بکات. لەو بوارەدا تـەواو کارامە ببوو و هەربۆیەش، تەنیا یەک جار دووپشک پێوەی دابوو. دووپشکەکە دابووی بە سـمتییەوە. شـوێنی پێوەدانەکە، ئاوسـا بوو و دواتر چڵکی کردبـوو و ئاسـەواری برینێکـی قـووڵ بـە شـوێنی پێوەدانەکەیـەوە مابووەوە.

عەبدولڕەحمان هێشــتا تەمەنی لە دەوری سێ تا چوار ساڵدا بوو کە یاریی شــەترەنجی دەزانی و هەندێ لە شیعرەکانی شاعیرانی کلاسیک، بریتــی لــە کورد و فارســی لەبــەر دەخوێنــدەوە. ئــەوەش ببوە هۆی ئــەوە کە ئەو قوتابییەکی ســەرکەوتوو بێت و لــە هاوپۆلەکانی دیکەی لەپێشــەوەتر بێت. ســەرەڕای ئەوەش، باوکی وەکوو هاندانێک، بەڵێنیی کڕینــی دووچەرخەیەکــی پێدابوو. ئەو هەموو ســاڵێک ئــەو بەڵێنییەی نــوێ دەکردەوە. بــەڵام عەبدولڕەحمــان هەرگیز نەبــووە خاوەنی ئەو دووچەرخەیە. باوکی بەڕواڵــەت بەڵێنییەکەی خۆی لەیاد دەکرد. دواتر کاتێک کە عەبدولڕەحمان ئەو بابەتەی دەگێڕایەوە، دەیگوت کە تەنانەت لەو تەمەنەشدا ئەو بابەتانە بۆی گرینگ نەبووە.

براکانــی عەبدولڕەحمان بــە پێکەنینەوە باســی تووڕەبوونی ئەویان دەکــرد لەو کاتانەدا کە وەڵامی داخوازەکانی نەدەدرایەوە و دەیانگوت، عەبدەلڕەحمان دەســتی دەدایە بەرد و لەو ڕووەوە کە هەرگیز لە سیلە گرتن و پێکاندا هەڵەی نەدەکرد و دەســتی زۆر ڕاســت بووە، براکانی یەکسەر ڕایاندەکرد.

ژنانــی بنەماڵە، لەوانــەش خوشــکەکانی عەبدولڕەحمــان کە هەموو ســەرقاڵی کاری ناوماڵ بوون و لە تەمەنی شــووکردندا بوون، ئۆگری بوون و خۆشەویستییەکی یەکجار زۆریان بۆ ئەو هەبوو و بە تایبەتی نازیــان هەڵدەگــرت. ئــەوان ملکەچی هەمــوو حــەز و داواکارییەکانی دەبــوون. پێدەچێت ئەم بابەتــە هەربەتەنیا بەهۆی پەیڕەوی کردنیان لە دەســتوورە ئاینییەکان نەبووبێت کــە ژنی بە گوێڕایەڵ بوونی بەرانبەر بــە پیاو هانــداوە، بەڵکوو بێگومان، سەرنجڕاکێشــیی و کاریزما بوونی عەبدولڕەحمان بوو کە زۆر زوو بۆ هەمووان دەرکەوتبوو، کاریگەریی لەسەر ئەو سەرنجە تایبەتە هەبووە.

عەبدولڕحمــان لای دایکــی زۆر خۆشەویســت بــوو. پێدەچێت پاش گەیشــتنی بــە تەمەنی هەرزەکاری، ئەم عەشــقە بێ ســنوورەی ژنانی بنەماڵــە بەرانبــەر بە ئەو و هەروەها پەروەردەی عاتفی و هەســتیاری

نەریتــی، ڕۆڵێکی کاریگەری لە پەیوەندی نێوان عەبدولڕەحمان و ژناندا گێڕابێت.

■ کۆتایی جەنگی جیهانیی دووهەم

عەبدولڕەحمــان کــە هێشــتا گەنجێکــی ١٣ ســاڵ بــوو، یەکێــک لــە مامۆســتاکانی دواناوەندی، کتێبی لێنین سەبارەت بە «مافی نەتەوەکان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیاندا»ی دەداتێ کە بیخوێنێتەوە.

بە ســەرنجدان بەوەیکە قاســملوو لە دایکییەوە پێکەوە گونجان و لە باوکییەوە بەرپرســیارەتی، خەباتگێڕی و دادپەروەری‌خوازی فێر ببوو، خوێندنــەوەی ئەو کتێبە، ڕۆڵێکی دیاریکەری لــە ژیانی ئەودا گێڕا. ئەو هەســتی بە پێویستیی خەبات و لە ڕاســتیدا ئیجباری خەبات لە ڕەوتی ڕزگاریــی خەڵکەکەیــی لە خۆیدا هەســت پێدەکرد و ئــەوەش ڕێک ئەو کاتە بوو کە خەباتگێڕانی ڕێگای ڕزگاری، کۆمۆنیسمیان بە هاوسەنگی دێموکراســی دەزانی. سوپای ســووریش لە باکووری ئێران سەقامگیر ببــوون، لــەوێ دۆخێکی تەژی لە ئازادی هاتبووە ئــاراوە. هەربۆیەش، بۆچوونە کۆمۆنیســتییەکان بە خێرایی پەرەی دەسەند و چالاکییە دژە سەڵتەنەتییەکان دەرەتانی گەشەی بۆ ڕەخسا بوو.

ســاڵی ١٩٤٤، لە تەمەنی ١٤ ســاڵیدا، عەبدولڕەحمان دەبێتە ئەندامی لاوانی کۆمۆنیست.

بوونی سوپای سوور لە ئێران بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئێران بۆ لای ئاڵمانــی نازی بای دابــووەوە، هاوپەیمانان بڕیاریــان دابوو ئەو وڵاتە داگیــر بکەن. هێزەکانی بریتانیا لە باشــوور و ســووپای ســۆڤییەت لە باکوور گیرســابوونەوە، پاش کۆتایی هاتنــی جەنگ، هێزەکانی بریتانیا لە ئێران کشــانەوە، بەڵام هێزەکانی سۆڤییەت مانەوە و لە سای بوونی ســۆڤییەتەکان، حیزبی کۆمۆنیســتی ئازەربایجان، بە ڕێبەریی جەعفەر پیشــەوەری، لــە ســاڵی ١٩٤٥، لــە ئازەربایجان(ئێــران) دامەزراندنــی کۆمارێکــی خودموختــاری ڕاگەیانــد و لە کوردســتانی ئێرانیشــدا، لە

ژانوییــەی ١٩٤٦ لە شــاری مەهابــاد، بە ســەرۆک کۆماریی حاکمێکی نەتەوەخــوازی کــورد بە ناوی قــازی محەممەد، کۆماری کوردســتان، بوونی خۆی ڕاگەیاند.

ســۆڤییەتەکان کــە ســتراتژییەکی درێژخایەنیــان هەبــوو، ئەو دوو کۆمارە خودموختارەی هاوســنووری خۆیانیان هان دەدا یەکگرتوو بن بۆ ئەوەی لەو ســۆنگەوە هەم ئیمتیازی دەرهێنانی بەشــێک لە نەوتیان دەســت کەوێت و هەم دەســتیان بە دەریاکانی باشــوور ڕابگات. بەڵام پلانی سۆڤیەتەکان بە هۆی دژایەتیی مەجلیسی ئێرانەوە شکستی هێنا.

ئەم شکســتە و گوشــارەکانی ڕێکخــراوی نەتەوەیەکگرتــووەکان و هەروەها گوشــارەکانی بریتانیاییەکان و ئەمریکاییەکان، ســەرئەنجام، ســۆڤییەتی ناچــار کــرد خاکــی ئێــران بەجێبهێڵێــت و بەم چەشــنە، کۆماریخوازەکانی ئازەربایجان و کوردستانیان بە تەنیا هێشتەوە. شای گەنجی ئێران، محەممەد ڕەزا پەهلەوی، دەستبەجێ هێزەکانی ئەرتەشی بــۆ بەرەنگاربوونــەوەی ئــەو دوو کۆمارە بەڕێ کرد. پاش ســاڵانێک، کاتێــک لینــا هاتە ئەو ناوچەیە، خەڵک هێشــتاش باســی ئــەو دڕندەیی و کاولکارییانەیــان دەکرد کــە هێزەکانی ئەرتــەش ئەنجامیان دابوون. هــەزاران کەس کوژرابــوون و ماڵەکان و بەروبوویان ئاگر درابوون و ئــەوە کۆتایــی کاری ئەو دوو کۆمارە خودموختــارە بوو، لەکاتێکدا کە تەمەنی کۆماری کوردستان تەنیا ١١ مانگی تێپەڕاندبوو.

جەعفــەری پیشــەوەری و ئەندامانــی حکومەتەکەی و کاربەدەســت و پیاوەکانــی، پەنایان بردە بەر ســۆڤییەت و لە کۆمــارە جیاوازەکانی یەکیەتیی سۆڤییەتدا بڵاو بوونەوە.

بەڵام قازی محەممەد پێشــنیازی سۆڤییەتەکانی بۆ پەناهەندەبوون لە سۆڤیەت قبووڵ نەکرد و ئاوا وەڵامی دایەوە: «دەمهەوێ لەگەڵ گەلەکەم بمێنمــەوە و لەگــەڵ گەلەکــەم هاوچارەنووس بم». قــازی محەممەد و ئەندامانــی حکومەتەکەی کە دەستبەســەر و ڕەوانەی زیندان کرابوون، دادگایی کران و سزای ئێعدامیان بۆ دەرچوو. ماوەیەک پاش دەرچوونی

حوکمی دادگا، لە بەرەبەیانی یەکێک لە ڕۆژەکانی مانگی مارسی ١٩٤٧ لە شاری مەهاباد، پێتەختی کۆماری کوردستاندا لە سێدارە دران.

لەم سەردەمە قەیراناوییەدا، هیچکام لە چوار کوڕەکەی محەممەد ئاغا قاسملوو لە کوردستان نەبوون. کوڕی گەورەتر بە ناوی حسێن، لە تورکیە سەرقاڵی خوێندن بوو لە بواری «مێعماری»دا. ئەحمەد، لە پاریس بیرکاریی دەخوێند و عەلی لە تەورێز، سەرقاڵی خوێندنی پزیشکی بوو. عەبدولڕەحمانیش لە تاران، لە قوتابخانەیەکی شەوانەڕۆژی سەرقاڵی تێپەڕاندنی دوایین ساڵی خوێندنی دواناوەندی بوو. کوڕەکانی قاسملوو، هەرچەند لە کوردستان نەبوون، بەڵام ئاگاداری ڕووداوەکان بوون و هەموویان لەوەی بەسەر کوردستاندا هاتبوو، بە قووڵی دڵنیگەران و بێتاقەت بوون. بۆ عەبدولڕەحمان ئەم بابەتانە، ڕاستیی ڕوانگەکانی مارکس و لێنینیان دەردەخست و ئەو توانیبووی خۆی لە چاوەدێرییە توندەکانی قوتابخانەکەی بدزێتەوە و تێکەڵ بە ڕەوتی خەبات لە دژی بنەماڵەی پەهلەوی بێت. هەرکە خوێندنی دواناوەندی تەواو کرد، وسووقوددیوانی باوکی، عەبدولڕەحمانی بە مەبەستی خوێندن نارد بۆ لای برا گەورەکەی لە پاریس بۆ ئەوەی لە بواری پیشەسازیدا درێژە بە خوێندن بدات. عەبدولڕەحمان کە لەوکاتەدا تەمەنی ١٧ ساڵ بوو، لە پاریس لەگەڵ ئازادییەک بەرەوڕوو بوو کە هەرگیز ئەزموونی نەکردبوو و بەو وزە تایبەتەوە کە لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی ئەو بوو، تێکەڵ بە خەبات لە دژی ڕێژیمی شا بوو.

ئەو ماوەی یەک ساڵ دەرفەتی فێربوونی زمانی فەرانسەوی هەبوو. بەڵام بە هۆی ئەوەوە کە پێش ئەوەی بچێتە فەرانسە شارەزاییەکی باشی لە زمانی فەرانسەوی هەبوو، کاتێکی زۆری بۆ چالاکیی سیاسی بۆ دەمایەوە.

لەم سەردەمەدا، حکومەتی ئێران ئیزنی ناردنی پارە بۆ خوێندکارانی دەرەوەی وڵاتی تەنیا بەو بنەماڵانە دەدا کە بەڵێنیی بەشداری نەکردن لە چالاکییە سیاسییەکانیان دەدا. هەربۆیەش، سەبارەت بە عەبدولڕەحمان

ئەوەی قەرار بوو بقەومێ، قەوما: «کاربەدەستانی ڕێژیمی شا، تەنانەت پێش لەوەی بچێتە زانکۆ، تاکە سەرچاوەی بژیوی ئەویان بڕی».

■ عەبدولڕەحمان لە پراگ

عەبدولڕەحمـــان بـــە یارمەتیی حیزبی توودە، توانیبووی بوورســـێکی خوێندنـــی تایبەت بـــە خوێندکارانی بیانی لە حکومەتی چێکۆســـلۆڤاکی وەربگرێت و بێتە پراگ و ئەوەش ڕێک پاش ئەو کاتە بوو کە حکومەتی چێکۆســـلۆڤاکی لـــە ســـاڵی ١٩٤٨دا گۆڕدرابـــوو بۆ «دێموکراســـییەکی خەڵکی»(کۆمۆنیســـتی)، عەبدولڕەحمـــان کـــە تەمەنی ببووە ١٨ ســـاڵ، بڕیـــاری‌دا بواری خوێندنەکەی بگۆڕێت و لە قوتابخانەی باڵا، لە بواری سیاســـەت و ئابووریـــدا ناونووســـی کـــرد و ســـاڵی ١٩٥٢ شـــەهادەی «بەکالۆریۆسی سوور»، کە شەهادەیەکی باڵا بوو، بەدەست بهێنێت.

لەو ســـاڵانەی پاش جەنگـــدا، زۆر نەبوون ئـــەو خوێندکارانەی کە لە وڵاتی چێکۆســـلۆڤاکی دەیانخوێند و گرووپێکی بچووکیان ئێرانی بوون و عەبدولڕەحمـــان تاکە کـــوردی ئێرانیی ئەو گرووپە بـــوو. لە پاریس، پێتەختی فەرانســـەی دێموکراتیک، چالاکیی سیاســـی بۆ هەمووان ئازاد بـــوو و بیانییەکان و بە تایبەتی، خوێندکارانی بیانی بە تەواوی کەڵکیان لـــێ وەردەگـــرت. بەڵام لە چێکۆســـلۆڤاکی دۆخەکە بە تـــەواوی جیاواز بوو. کۆمۆنیســـتەکان کە بە ســـەرکەوتن لـــە هەڵبژاردنەکانی فێڤریەی ١٩٤٨دا دەسەڵاتیان بەدەســـتەوە گرتبوو، سەرەڕای ئەوەیکە بۆچوونە پێشـــکەوتووەکانی خوێندکارە بیانییەکان لە گەڵ سیاسەتەکانی ئەواندا دەگونجـــا، بـــەڵام لەســـەر ڕێپێوانی ســـەر شـــەقامی ئـــەم خوێندکارانە ڕەزامەند نەبوون. کەچی بانگهێشـــتیان دەکردن تاکوو بەشـــداریی لەو ڕێپێوانانـــەدا بکـــەن کە خۆیـــان، بۆ نموونە بە بۆنەی ســـەرەتای مانگی «مـــەی» ەوە ڕێکیان دەخســـتن. عەبدولڕەحمان جـل و بەرگی کوردی لەبـــەر دەکرد و بە حەزەوە لـــەو ڕێپێوانانەدا کە ڕێپێوانگەلێکی ئەمری، شـــاد، ئاشـــتیخوازانە و بە بێ بچووکترین داخوازێک بوو، بەشـــداریی

دەکــرد. «لــەو ڕێپێوانانەدا، ســەمامان دەکرد و گۆرانیمــان دەگوت و دەچووینە پێشــەوە. هەموو یەکتریان بە «تۆ»بانگ دەکرد و دروشمی لە پێشەوە دارێژراو و دیاریکراویان دەدا».

عەبدولڕەحمان بەهۆی خوێندکاربوونیەوە، ناچاربوو ئاستی چالاکییە سیاســیەکانی دابەزێنێت و هەموو کاتەکانی بــۆ خوێندن تەرخان کرد. ئــەو کــە ڕۆژانە تا ١٣ کاتژمێر کاری دەکرد، لــە ژوورێکی داخیلییەکی خوێنــدکاری بە نێوی ئۆپلێتالۆڤا (opletalova) لە ناوەندی شــاری پراگ دەژیا. لەم ژوورەدا، ئەو دوو هاوژووری هەبوو، عەرەبێکی مەسیحیی بەغــدادی بە نێــوی ئەدیــب، و دووهەمییش چێکییەک بــە نێوی کارێل (karel) کە دایک و بابی لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کۆماری چێک دەژیان. عەبدولڕەحمان و کارێل زۆر زوو بوونە ئاواڵ و هەردووکیان لە ڕۆژانی پشــوو و بۆنەکاندا، دەچوون بۆلای دایک وبابی کارێل. عەبدولڕەحمان کــە توانایەکــی لەڕادەبەدەری بۆ فێربوونی زمــان هەبوو، بە یارمەتیی کارێل، زۆر زوو زمانی چێکی فێر بوو و بەو زمانە بە پاراوی قســەی دەکرد.

■ ئەو سەدەیەی ڕواڵەتی دونیای گۆڕی

بــاب و باپیرانــی عەبدولڕەحمان و لینا، شــاهێدی ئاڵوگۆڕی جیهان، بریتی لە ئۆرووپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوون. گۆڕینی سنوورەکان، پێکهاتنــی دەوڵەتە نوێیەکان و...لەو ئاڵوگۆڕانــە بوون. هەرەس هێنانی ئێمپراتۆریەتی ئۆتریش ـ مەجارستان، هۆکاری پێکهاتنی حکومەتە نوێیە ســەربەخۆ و دێموکراتیکەکان و لەوانە، حکومەتی چێکۆســلۆڤاکی بوو لە ساڵی ١٩١٨دا.

لــە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســتیش پاش هــەرەس هێنانــی ئێمپراتۆریەتی عوســمانی، جیهــان شــاهێدی ســەرهەڵدانی حکومەتە نوێیــەکان بوو. ئەم ئاڵوگۆڕانە هیوای دەســتەبەرکردنی ســەربەخۆیی لای کوردەکانی دروست کردبوو. بەڵام گڕی ئەم هیوایە زۆر زوو کوژایەوە و ئەوەش

کاریگەرییەکی زۆر ناخۆشی لەسەر وسووقوددیوان دانا.
هیواکانی باپیری لێناش کە پێی وابوو کۆمۆنیسم، ئازادی، بەرابەری و برایەتی بەدوای خۆیدا دێنێ، بووە بڵقی سەرئاو.
منداڵەکانیشیان کە درێژەدەری ڕێگەی ئەوان بوون، شکستیان هێنا.
وێدەچوو ڕێگەی گەیشتن بە دنیایەکی دادپەروەرانەتر دوورودرێژە.

■ دیداری عەبدولڕەحمان و لێنا

کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٥١ بوو. عەبدولڕەحمان دواساڵی زانکۆی تێدەپەڕاند. تەمەنی ئەو ٢٠ ساڵ بوو. بەڵام لێنا هێشتا چەند مانگێکی مابوو بۆ ئەوەی تەمەنی بگاتە ١٨ ساڵ. لەم سەردەمەدا، لێنا، هەم بە مەبەستی دابین کردنی بژێوی ژیانی کاری دەکرد و هەم خۆی بۆ تاقیکردنەوەکانی چوونە زانکۆ و بەدەستهێنانی بوورسێکی خوێندن ئامادە دەکرد.
پاییزی ئەو ساڵە گەلێک سارد بوو و لە مانگی نۆڤامبردا بەفر دەستی بە بارین کردبوو. قوتابخانەی خوێندنی باڵای زانستە سیاسی و ئابوورییەکان لەسەر شەرەفی یەکێک لە مامۆستاکانەوە، ئاهەنگێکی لە یەکێک لە هۆڵە گەورەکانی تایبەت بە بۆنەکان سازدابوو. ئەنجومەنی مامۆستاکان، کۆمەڵێکی زۆر لە خوێندکارانی زانکۆکانی دیکە، و هەروەها کادری بەڕێوەبەریی زانکۆ، ئامادەی ئەو ئاهەنگە بوون. چەند میوانێکی بیانیش لەوێ بوون. گرووپی کۆڕاڵ کە لێنا پێش لەوەی بێتە زانکۆ ئەندامیان بوو، بەڕێوەبەریی بەشی هونەری و کولتووریی ئاهەنگەکەیان لە ئەستۆ گرتبوو و دەبوو لە نێوان وتار و پەیامە پیرۆزباییەکاندا، چالاکیی هونەری بنوێنن. پرۆگرامی گرووپی کۆڕال بریتی بوو لە: گۆرانیگەلێک سەبارەت بە پێکهاتەی سۆسیالیزم، پێداهەڵگوتن بەسەر پێشەنگەکانی کۆمۆنیزم، لە ستالینەوە بگرە هەتا مائۆتسێ دۆنگ و هەروەها گۆرانیی نەتەوەیی و خۆجێیی.
لەسەرداخوازی بەڕێز ژۆزێف، ئەو مامۆستایەی ئاهەنگەکەی بۆ

ڕێکخرابــوو، سەردەســتەی گرووپی کۆڕاڵ، ئەرکــی میوانداریی چەند خوێنــدکاری بیانیی بە لێنا ســپاردبوو، چونکوو ئەو تاقە کەس بوو کە کەم تا زۆرێک ئینگلیســی دەزانی، لێنا، هەرچەند زۆریش لەو ئەرکە پێ سپێردراوە ڕازی نەبوو، بەڵام بە ناچاری وەئەستۆی گرت.

چــوار پیــاوی گەنج لــە دەوری مێزێکی چکۆلە دانیشــتبوون. لێنا بە گوتنی ڕســتەیەک کە پێشــتر بە وردی ئامادەی کردبوو، خۆی وەکوو دیلمانــج پێ ناســاندن. لێنــا لەمکاتــەدا، دەروونێکی شــڵەژاوی هەبوو. بەڵام هەڵســوکەوتی گونجــاوی ئەو پیاوە گەنجانە دڵنیایی پێبەخشــی. هەڵسوکەوتیان دەرخەری ئەوە بوو کە بە ئامادەبوونی ئەو خۆشحاڵن. لێنــا زۆر زوو تێگەیــی کە تەنیــا یەکێکیان لە زمانی چێکــی تێناگات و ئەویش عەرەبێکی ســووری بوو کە لاقێکی لە ڕەوتی خەباتدا لەدەست دابوو(دواتر، عەبدولڕەحمان ئاشــکرای کردبوو کە لەڕاستیدا ئەو پیاوە لاقــی لــە ڕووداوی ئۆتۆمبیلــدا لەدەســت دابوو و ئــەو گەنجە عەرەبە ویســتبووی لــەو ڕێگــەوە کاریگەریــی لەســەر لێنــا دابنێت). کەســی دووهەمیــش عەرەبێکــی مەســیحیی بەغدادی بوو کە بــە زمانی چێکی قســەی دەکــرد. دوو کەســەکەی دیکەش، لــە ڕوانگەی لێنــاوە چێکیی ڕەسەن بوون. یەکێک لەو دووانە ناوی «کارێل» بوو، ئەوی دیکەش بە بۆچوونی لێنا، دەبوو خەڵکی سلۆڤاک بێت بە هەندێ ناپاراوی لە زماندا، پێستی سپی، قژ و چاویشی ڕەش بوون. ئەم تایبەتمەندییانە زۆرێک لە سلۆڤاکەکان هەیانبوو. چاوەکانی شاد و پڕ لە پێکەنین بوون.

لێنــا لە ژۆزێف توورە بــوو، چونکە گاڵتــەی پێکردبوو، هەربۆیەش وازی لەو گەنجانە هێنا و بابەتەکەی بۆ ژۆزێف باس کرد. بەڵام ژۆزێف وەڵامی دایەوە کە ئەوە بڕیاری مامۆستا بووە. ژۆزێف، سەرپەرشتیاری گرووپی کۆڕاڵ و مامۆســتای خاوەن ئاهەنگیش ئەو شــەوە قارەمانی ئەو میوانیە بوو. لێنا کە تەنانەت تەمەنی نەگەیشــتبووە ١٨ ساڵ، ناچار بوو ملکەچی بڕیارەکە بێت. هەربۆیەش، بە بێ مەیلی گەڕایەوە بۆ لای مێزی «بیانییەکان».

شــەوێکی خــۆش و دڵڕفێــن بوو. پیــاوە گەنجــەکان ســەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و بەرخۆدانەکانی لە ڕێی ئازادیدا قسەیان دەکرد و چیرۆکی پێکەنینداریان بۆ لێنا دەگێڕایەوە بۆ ئەوەی پێبکەنێت. ئەوان زۆر مێهرەبان بوون و بە ڕێزێکی زۆرەوە هەڵســوکەوتیان لەگەڵ لێنا دەکرد.

ئاهەنگەکە لە کۆتایی نزیک دەبووەوە و لێنا دەبوو بیرێک لە گەڕانەوەی خــۆی بۆ ماڵــەوە بکاتەوە. هەر چوار گەنجەکە دەیانویســت هاوکاریی بکەن و بیبەنەوە بۆ ماڵەوە. بەڵام ئەوەیان کە بە «ئێسلۆڤاکیایی» پاراو قســەی دەکرد، بەوانی دیکەی گوت کە پێویست بەو هەموو کەسە نییە و بۆ بردنەوەی یەک کەس پێویستە و ئەو کەسەش خۆیەتی.

لە دەرەوە کەش سارد بوو. ئەوان، بە ئارامی و بە هێمنی لە تەپۆڵکەکە سەردەکەوتن و بەرەو ناوچەی ڤینۆهرادی (Vinohrady) دەڕۆیشتن و لە ڕێدا باسی زۆر شتیان دەکرد. لێنا کە هێشتاش پێیوابوو ئەو گەنجەی لەگەڵی هاتووە خەڵکی ســلۆڤاکییە و هەر لە ســەرەتای دانیشــتنەکەوە بە قووڵی عاشــقی ببــوو، بێدەنگ بوو و تەنانەت نەیدەوێرا پرســیاری ناوەکەی لێ بکات. چونکوو لە ســەرەتای ئاشــنا بوونیاندا، نەیتوانیبوو ناوەکەی بە مێشــکی بســپێرێت. لێنا لە کاتی قســە کــردن لە گەڵ ئەو گەنجــەدا، وشــەی «ئێوە» (لە بریی تۆ ـ وەکوو ڕێــز گرتنێک)ی بەکار دەهێنا، لە کاتێکدا کە گەنجەکان بە پێی سرووشــت هەر وشــەی «تۆ» بــەکار دەبەن. لێنــا لەو دۆخەی بەســەری هاتبــوو تێنەدەگەیی.. وتنی ئەوەیکــە ئــەو کوردە، کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەســەر لێنــا نەبوو. ئەو هیچی سەبارەت بە کوردەکان نەدەزانی، بەڵام بەوحاڵەشەوە، بە خۆی دەگوت: « لە هەر کوێیەکەوە بێین، هەموو مرۆڤین، مەگین وانییە؟».

ئــەو دووانە لە نزیکیی ئەو ماڵــەی کە لێنا و ئانجێلینای هاوڕێی تێیدا دەژیان، ماڵئاواییان لە یەکتر کرد.

لێنــا بــۆ ئانجێلیکــی هاوڕێــی ئاوا باســی کــرد: « ئەو بــە نیگایەکی وەهــا تەژی لــە خۆشەویســتی و مێهرەبانییەوە ســەیرم دەکات کە تا

ئێستا هەرگیز ئەزموونم نەکردووە و من دڵنیام کە خۆشی دەوێم». ئانجێلیک کە لە هەستی لینا تێگەیشتبوو و بە نیسبەت لیناوە، تەمەنی زیاتر بوو و قایمکارتریش بوو، بە مەبەستی پێشگرتن بە شکستێکی چاوەڕواننەکراو، بەڵام مومکین، هەوڵی هێور کردنەوەی لینا و دامرکاندنی ئاگری حەزە دەروونیەکەی دەدا. قەزا و قەدەر، هەندێجار ڕێکەوتی سەیر وسەمەرە بەدوای خۆیدا دێنێت. هەمان شەو، ئانجێلیک بە لینای ڕاگەیاند کە خاوەنماڵەکەیان، کە ئامۆزای خۆیشی بوو، داوای خانووەکەی کردۆتەوە. دواجار لینا، دەبوو بەدوایماڵێکی نوێ بۆکرێ بگەڕێت. هەربۆیەش، ڕۆژی دواتر، لینا سەردانی بەرپرسانی گرووپی مۆسیقای کرد و بابەتەکەی بۆ گێڕانەوە و ئەوانیش لە داخیلییەکی خۆیان، کە یازدە کچی دیکەشی لێبوو، شوێنێکیان بۆ لیناش کردەوە. ئەو داخیلییە لە نهۆمی دووهەمی یەکێک لە بیناکانی کۆی داخیلییەکان بوو، هەمان بینا کە، ئەدیب، کارێل و ئەو «سلۆڤاکیاییە» لە نهۆمی یەکەمیدا دەژیان!

■ جوانترین سەردەمی ژیانی لینا....

لە ڕاستیدا عەبدولڕحمان ببووە پشتیوان و عاشقی لینا و بە چەشنێکیش، ڕۆڵی مامۆستا و ئوستادی ئەوی دەگێڕا و ئەوەش سەرەتای جوانترین سەردەمی ژیانی لینا بوو.

بەهار شوێنی زستانی گرتبووەوە و عەبدولڕەحمان خوازبێنی لە لینا کردبوو. لینا لەوپەڕی خۆشیدا بوو. لەو ماوەدا، لینا زۆر شت سەبارەت بە نیشتمانی ئەو فێر ببوو. عەبدولڕەحمان تەنانەت دۆخی ژنانی ئێرانی بۆ ڕوون کردبووەوە و لینا بە قبووڵ کردنی خوازبێنییەکەی ئەو، داب و نەریتەکانی وڵاتەکەشی قبووڵ کردبوو. خۆشەویستی بۆ تێگەیشتنێکی درووست لە بابەتەکان و ئاستەنگەکانی سەر ڕێگای ڕۆشنبیرێک، ڕێگر بوو. لینا عاشق بوو، نەیدەزانی لە داهاتوودا پێویستە ئاستەنگگەلێک لەسەر ڕێی خۆی لابەرێت کە تەنانەت بە بیریشیدا نەدەهات. دیارە

عەبدولڕەحمان ئەوی لەو ئاستەنگ و بابەتانە ئاگادار کردبووەوە. لە ڕاستیدا، ئەوە دڵی بوو کە لە بری عەقڵی بڕیاری دەدا. ئەو هێندە بەختەوەر و دڵنیا لە خۆی و عەشقی عەبدولڕەحمان بوو کە بەڵێنی بە خۆی دابوو بۆ هەموو شوێنێک دوای بکەوێت و لەگەڵیدا بێت.

ئەزموونێکی گەلێ قورس بوو، بەڵام لینا هەرگیز لەو کارەی خۆی پەشیمان نەبووەوە.

■ دووجار پرۆسەی زەماوەندی عەبدولڕحمان ولینا

نەریتی زەماوەندەکەیان لە باڵوێزخانەی ئێران و لە پراگیش بەڕێوەچوو و ئەو کاتە بەهاری ساڵی ١٩٥٢ بوو. مارەبڕینەکەیان لە ڕێی مەلایەکی ڕووخۆش، ڕێکپۆش و شیعە مەزهەبەوە بەڕێوەچوو. ئەو بە جلوبەرگێکی ئۆرووپایی و بە کراسێکی سپی و کراوات و ڕیشێکی ڕێکەوە، پیاوێکی زەنگین دەهاتە بەرچاو. شاهێدەکان بریتی بوون لە: دوو کارمەندی باڵوێزخانەکە و جەنابی باڵوێز و لەو ڕۆژە گرینگەی ژیانیاندا کەسی دیکەی لێ نەبوو. ڕێک وەک ئەوەی پێشان بۆ دایکی عەبدولڕەحمان ڕوویدابوو، لێناش ناچار بوو ببێتە موسوڵمان. هەرچەند لینا باوەڕی بەو ئایینە نەبوو، بەڵام بۆ موسوڵمان بوون و ڕەت کردنەوەی ئایینی پێشووی، ناچار بوو پەیڕەوی لەو ڕەوشە بکات. ئەوەش لە حاڵێکدا بوو کە عەبدولڕەحمان لە لایەن دامودەزگای ئیداریی ئێرانەوە وەکوو موسوڵمان حیسابی بۆ دەکرا. بۆ ئەوەی لە ئایینی ئیسلامدا، بۆ کەسێک کە لە دایک و بابێکی موسوڵمان لەدایک بووبێت، دەرەتانی گۆڕینی ئایین نییە. هەربۆیەش، تەنانەت لە ئەگەری پابەند نەبوون بە باوەڕە ئایینیەکانیش، عەبدولڕەحمان و لینا بە بێ هەرچەشنە ناڕەزایەتییەک ملکەچی ئەو ئیجبارە ئاینییە دەبوون.

ئاهەنگی زەماوەندەکەیان لە ڕێستورانتێکی لۆکاڵی بە ناوی ماڵی بۆنەکان(کە بریتی بوو لە بینایەکی جوان لە ناوەندی پراگدا) بەڕێوەچوو. خواردنی زەماوەندەکەیان سادە بوو، بۆ ئەوەی هیچکام

لەو دوانە ئەوەندە پارەیان پێ نەبوو هەتا بتوانن ئاهەنگێکی ڕاستەقینە بگرن و میوانی زۆر بانگهێشت بکەن. جل و بەرگی تایبەت بە بووک و زاوا و شتومەکەی تایبەتی دیکەی زەماوەندی ئاساییش لە ئارادا نەبوو. عەبدولڕەحمان بە بوورسێکی خوێندنی کەم و کورتەوە دەژیا، ئەوەندە کەم کە دەرەتانی هیچ زیادە خەرجێکی پێ نەدەدا. مووچەی لینا‌ش هەندێ لە داهاتەکەی عەبدولڕەحمان زیاتر بوو. هەربۆیەش، تێچووەکەیان لە بەینی خۆیاندا دابەش کرد.

ڕێستورانتەکە چۆڵ بوو. لینا جوانترین مێزی ڕێستورانتەکەی، کە نزیک بە پەنجەرەکە و ڕوو بە گۆڕەپانی «کۆماری» و کەنیسەی «سەنت ژۆزێف» (ژۆزێفی پیرۆز) بوو هەڵبژاردبوو. ئەوان سالادی کاهوو و مریشکی سوورەوە کراو و پەتاتەیان داوا کرد. هێنانی خواردنەکە زۆری خایاند. بەڵام لەو ڕووەوە کە ئەوان هەمیشە بابەتگەلێکی زۆریان هەبوو بۆ باس کردن، ئەوەندە سەرنجیان نەدایە درەنگ کەوتنی خواردنەکەیان تا ئەو کاتەی برسیەتی بە ئاگای هێنانەوە. دواجار پێشخزمەتەکان خواردنی نیوەڕۆیان هێنا کە بریتی بوو لە چواریەکی مریشکێکی وشک و دان شکێن، پەتاتەیەکی مامناوەندی و سالادێکی سیس هەڵاتوو و نوقم بوو لە ئاو وخوێیەکی زەرد ڕەنگ و نەخورەمدا. بەڵام، هەموو ئەوانە بایەخێکیان بۆ ئەوان نەبوو، چونکوو شاد و خۆشحاڵ بوون.

پاش چەند مانگ، عەبدولڕەحمان خوێندنی خۆی لە زانکۆ تەواو کرد و لە مانگی سێپتامبردا بە وەرگرتنی شەهادەی بەکالۆریۆس، پراگی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ ئێران. لینا لەو کاتەدا، سکی دوو مانگان بوو. لە ڕوانگەی لیناوە، ئەمە یەکەمین منداڵ لەو کۆمەڵە منداڵە بوو کە دەیویست بیبێت. لەو بوارەدا، عەبدولڕەحمان هەمیشە بە نەرمی سەری دەخستە سەری. بەڵام لینا، نەک بە تەواوی بڕوای بەوە هەبوو، بەڵکوو سووریش بوو لەسەر ئەوەی هاوکاریی هاوسەرەکەی بکات، چونکە هەمیشە دەیویست مرۆڤێکی بەکەڵک و کاریگەر بێت. تەنانەت بیریشی

لێ نەدەکردەوە کە دایکایەتی، لەمپەری سەر ڕێگای ئەو هاوکاری کردنە بێ. بەڵام لێنا، هەستی بە هێزێکی پتەو لەخۆیدا دەکرد و دڵنیا بوو کە لە تەنشت هاوسەرەکەیدا، دەتوانێت بەسەر هەموو بەربەست و کێشەکاندا زاڵ بێت، لەگەڵ ڕۆشتنی مێردەکەی لە پراگ، لێنا، سەرلەنوێ هەستی بە تەنیایی کردەوە. ژیانی هاوبەش، دووگیان بوون و هیوای پەیوەست بوون بە عەبدولڕەحمان، پرۆژەی چوونە زانکۆی لێنای پووچەڵ کردەوە. هەربۆیەش، ئەو سەرەڕای ئەوەی کە بە خۆشییەوە چاوەڕێی لەدایک بوونی منداڵەکەی بوو، وەکوو نەخشەکێشێکی پیشەسازییش کاری دەکرد. بەڵام لێنا، دڵ لەدوای مێردەکەی بوو و دڵەڕاوکێی ئەوەشی هەبوو کە بەو مووچە کەمەوە کە بەئاستەم بەشی بژیوییەکەی خۆی دەکرد، پاش لەدایک بوونی منداڵەکەی، چی لێ بەسەر دێت.

■ پێکهێنانەوەی ژیانی هاوبەش

لەو کاتەوە کە عەبدولڕەحمان پراگی بەجێهێشتبوو، تەنها دوو کارتپۆستالی لە پاپۆڕێکەوە کە ئەوی بەرەو وڵاتەکەی دەبردەوە و هەروەها نامەیەکیشی لە تارانەوە بە ناونیشانی چاخانەیەک بۆ لێنا ناردبوو. لێنا دەیتوانی بە هەمان ناونیشان نامە بۆ عەبدولڕەحمان بنووسێت و زۆربەی جاریش هەر وای دەکرد و چاوەڕوانی وەڵامی نامەکانی دەکرد. بەڵام وەڵامێکی بۆ نەدەهاتەوە. هەموو پێیان دەگوت هاوسەرەکەی وازی لێهێناوە. بەڵام لێنا بڕوای بەو قسانە نەدەکرد. بەڵام وردە وردە، لێناش کەوتە گومانەوە و پرسیارەکان سەریان دەکردە هەناوی. هەربۆیەش، لە سەرلێشێواویدا دەژیا و گەلێکیش هەستی بە چارەڕەشی دەکرد. سەرەڕای ئەوەش، لێنا چاوەڕوانی گەیشتنی بەڵگەنامەگەلێک بوو کە لە ڕێی ئەوانەوە مارەنامەکەیان لە دەزگای دادوەریی چێک فەرمی کاتەوە، چونکوو چێکوسلۆڤاکی، پێکهێنانی ژیانی هاوبەشیی هاوڵاتیانی چێکیی لە دەرەوەی دامودەزگا فەرمییەکانی خۆیانی بەفەرمی نەدەناسی. لە کاتی یەکەمین مارەبڕیندا،

عەبدولڕەحمان بەڵگەنامە پێویستەکانی بۆ ئەو تۆمار کردنە پێ نەبوو. هەربۆیەش، دەبوو ئەو بەڵگەنامەگەلە لە ئێرانەوە بۆ لێنا ڕەوانە بکات. لە ڕاستیدا، هەردووکیان پێش سەفەرەکەی عەبدولڕەحمان سەبارەت بە ناردنی ئەو بەڵگەنامەگەلە ڕێککەوتبوون. لە بەرانبەر قسە و قسەلۆکەکانی هاوڕێیان و دەوروبەردا، لێنا بەرگریی لە عەبدولڕەحمان دەکرد و دەیگوت کە بە دڵنیاییەوە تووشی کێشەیەک بووە کە نەیتوانیوە بەڵگەنامەکان بنێرێت.

لە بەشی منداڵبوونی نەخۆشخانە، دواجار، ئەو نامەیەی کە ڕۆژانێکی زۆر بوو لێنا چاوەڕوانی بوو، گەیشتە دەستی. مانگی ئاڤریل بوو و عەبدولڕەحمان دیسامبری ڕابردوو سەفەری کردبوو. خاوەنماڵەکەی لێنا کە نامەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بە بزەیەکی مێهرەبانانەوە سەیری لێنای کرد کە خەریک بوو پاکەتە ئەستوور و قاوەییەکەی نامەکەی هەڵدەپچڕی. لێنا ورووژابوو. تەمەنی کچۆڵەکەی ٤ ڕۆژ بوو.

لێنا کۆرپەیەکی تەندرووست، هەر وەک میوەی گەییوی ببوو و ناوی نابوو مینا. مینا کۆرپەیەک بوو بە ئێسقانی پتەوەوە، نینۆکەکانی هێند درێژ بوون کە ناچار بوون بۆی بکەن و هەروەها موویەکی ڕەش کە هەنیەی داپۆشیبوو و لە پشتەسەرەوە هەتا نێوقەدە بچکۆلانەکەی شۆڕ ببووەوە[٢] و دوو چاوی درشت، بە نیگایەکی قووڵەوە. بەڕاستی کۆرپەیەکی جوان بوو.

ئەو مامانەی کە هەندێ جار سەردانی لێنای دەکرد، لەو ڕووەوە کە خۆی منداڵی نەدەبوو، دەیویست تێیبگەیەنێت کە لەبەر ئەوەی لێنا دایکێکی تەنیایە(مێردی نییە)، بۆ گەورەکردنی کۆرپەلەکەی تووشی گرفت و ئاستەنگی گەورە دەبێت. لێنا زۆری هەوڵ دەدا ئەو مامانە تێبگەیەنێت کە مێردی هەیە، بەڵام ئەو بڕوای نەدەکرد و لەسەر بۆچوونەکانی خۆی سوور بوو.

---

٢ بە پێی پشتڕاستکردنەوەی نووسەر، مینا منداڵێکی دەگمەن بووە و لە کاتی لەدایک بوونیدا پرچی درێژ بووە.

مینــا ببووە هــۆی شــادییەکی لەڕادەبەدەر بۆ لێنا، بە ســەیر کردنی ملّچەملّچ کردنی مینا لە کاتی شیر خواردندا، ئەوەیکە دایمە برسی بوو و جۆری بزەی سەر لێوی، لێنا هەستی بە بەختەوەری دەکرد. سەرەڕای هەمــوو ئەوانە، لە باری دەروونییەوە ڕووخا بوو. نە کەس ســەردانی کردبــوو تا لــە بەختەوەرییەکەیدا بەشــداری بکات و نــە ئاهەنگێکیش بــە بۆنــەی لەدایک بوونــی کیژۆڵەکەیەوە بەڕێوە چووبوو. هاوســەرە دوورەدەســتەکەی، تەنانەت ئاگاداری لەدایک بوونی کۆرپەکەی نەبوو. تا ئەو کاتەی پاکەتە گەورە قاوەیی ڕەنگەکە گەیبووە دەســتی، تەنانەت هەندێ جار لێنا پرســیاری لە خۆی دەکرد کە تۆ بڵێی ڕۆژێک بگاتەوە بە مێردەکەی.

لــەو پاکەتــادا هەمــوو بەڵگەنامە پێویســتەکان بــۆ بەفەرمیی کردنی هاوســەرگیرییەکەیان بــە پێــی یاســاکانی چێکۆســلۆڤاکی هەبــوون، نامەیەکیشــی تێــدا بوو کە لەودا عەبدولڕەحمــان داوای لە لێنا کردبوو بچێت بــۆ ئێران. هەروەهــا عەبدولڕەحمان بە نووســراوە «کارێل»ی کردبــووە کەفیلــی خۆی بــۆ ئەوەی بــە نوێنەرایەتیی ئــەو، کاروباری پێویســت بە مارەبڕینەکە بەڕێوە ببات. هەروەها لە پاکەتەکەدا، بلیتێکی فڕۆکە بۆ ســەفەر لە پراگەوە بەرەو تاران و بڕی پێنج دۆلاریشــی تێدا بــوو. دواجار، ئەوەی مابووەوە لێنا بیــکات، مارەبڕینێکی دووبارە بوو بە ئامادەبوونی کارێل لە لایەن عەبدولڕەحمانەوە و دواتریش ســەفەر کردن بەرەو تاران.

پاش ئەوەی لە زایینگە هاتە دەرەوە، لێنا هەســتی بە ماندوویەتییەکی زۆر دەکــرد و هێشــتاش کاریگەرییەکانی ژانگرتــن و منداڵبوون بەری نەدابــوو. بــەو حاڵەشــەوە، نامــەی هاوســەرەکەی، هێزێکــی بەبەردا هێنایــەوە. کاروبارە پێویســتەکانی مارەبڕینەکەی ئەنجــام دا و لەگەڵ کارێل لە کومیتەی نەتەوەیی ناوچەی یەکی شاری پراگ بۆ مارەکردنەکە ئامــادە بوون. مینای بچکۆلانــەش کە لە ئامێزی پوورە زدێنکا(Zdenka) دا نووســتبوو، لەوێ ئامادە بوو. ڕێوڕەســمێکی کورتخایەن بوو. پاش

ڕێوڕەسمەکە، شاهیدەکان و چەند هاوڕێیەکیان کە لەوێ ئامادە بوون، گەڕانەوە بۆ سەر ئیش و کارەکانی خۆیان. تەنها، پوورە زدێنکا لەگەڵ کچی خوشکەکەی و مینای بچکۆلانەدا مایەوە. پێکەوە نانی نیوەڕۆیان خوارد. دواتر، پوورە زدێنکاش گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی و بۆ لای مێردەکەی و باپیری. ماڵی پوورە زدێنکا، ماڵۆچکەیەک بوو لە شوێنێکی دوور، هەڵکەوتوو لە چەند کیلۆمیتریی نزیکترین شار بە پراگ. لێناش بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ ژوورە بچووک و هەژارانەکەی و دەستپێکردنەوەی کاروباری ڕۆژانە، لەگەڵ کۆرپەلەکەی سواری تراموا بوو.

لێنا لە ژوورە بچووکەکەیدا، تەنیا مەقەڵییەکی بچووکی کارەبایی، مێزێکی زۆر بچووک و تەختێکی نووستنی هەبوو. ئاو لە دەرەوەی ژوورەکە بوو، کە بریتی بوو لە: شێرەیەکی ئاو کە لە ڕێڕەوەکە و لە تەنشت ژوورەکەیەوە بوو. ئەو بڕە پارەیەی کە لێنا وەکوو مۆڵەتی زەیستانی و هاوکاریی بژیوی منداڵەکەی خرابووە سەر مووچەکەی، بەشی بژیوییەکەی نەدەکرد. هەربۆیەش، لێنا دەبوو بە زوویی بگەڕێتەوە سەر کارەکەی.

■ پەیوەست بوون بە عەبدولڕەحمان یان مانەوە لە پراگ؟

شیکردنەوەی دۆخی ئەوکات زۆریش سادە نییە. زۆربەی ئەوانەی پەیوەندییان بە لێناوە هەبوو، ئامۆژگارییەکی هاوشێوەیان دەکرد: «بەهیچ شێوەیەک مەڕۆ بۆ لای عەبدولڕەحمان و بە ڕۆشتن بۆ ئەو وڵاتە دواکەوتوو و پەرەنەسەندووە، خۆت تووشی ئەو گێچەڵە مەکە». بۆ نەبیستنی وتەکانی ئەو جۆرەکەسانە، لێنا دووریی لێدەکردن. لێنا سوور بوو لەسەر ڕۆشتن، چونکوو هەم منداڵەکەی و هەم باوکی منداڵەکەی گەلێک خۆشدەویست و هەربۆیەش نەیدەویست لێکتر دایانبڕێت.

لە لایەکەوە، لێنا بە خۆی دەگوت کە ڕەنگە پووری، باوکی دایکی و

هاوڕێکانی ڕاست بکەن، لە لایەکی دیکەشەوە، بە خۆی دەگوت: بە مانەوە لە پراگ دەتوانێت داهاتوویەکی چلۆن بە کیژۆڵەکەی ببەخشێت؟ ئەو بە چاوی خۆی، ژیانی خۆی و هاوڕێکانی دەبینی: « دەبوو پێش شەبەقی بەیانی هەستێ، منداڵەکە تێرکات، لە قاپێکی گەورەدا، لەسەر مەقەڵییە کارەباییەکە ئاو گەرم بکات، سەروملی منداڵەکە بشوات و جلوبەرگی لەبەرکات و پاشان ڕاکەڕاکە بیباتە دایەنگە. پاشان سواری پاسە خاو و خلیچەکان بێت و هانکەهانک خۆی بگەیەنێتە شوێنی کارەکەی. پاش دەرچوون لە شوێنی کاریش دەبوو لە سەفە دوور و درێژە بێکۆتاییەکاندا چاوەڕوانی نۆرەی کڕینی پێداویستییەکانی ڕۆژانەی بێت. پاشان راکەڕاکە بچێتەوە بۆ دایەنگە و منداڵەکەی وەربگرێتەوە و لەوێشەوە بڕواتەوە بۆماڵەوە، خەریکی شوشتن و پاک کردنەوە بێت و دواجار لە نیوەشەودا بخەوێت و سەرلەنوێ شەبەقی بەیان هەستێتەوە و هەموو ڕۆژێک ئەو ڕەوتە دووبارە کاتەوە. سەرەڕای ئەوەش دەبوو بە تاقی تەنیا دەرەقەتی هەموو ئەو کارانە بێت. لە ڕاستیدا ئامۆژگاریی و پێشنیازی دەوروبەرییەکانی ئەوە بوو کە خۆپەرستانە، تەنیا بیر لە خۆی و منداڵەکەی بکاتەوە.

لینا دەیزانی کە ڕێگایەکی دیکەش بوونی هەیە، بەڵام بە ڕوونی بۆی نەدەچووەوە سەر یەک، شتێک وەک ئەوەی هەست بکات بەرپرسایەتییەکی لەسەر شانە کە دەبێ جێبەجێی بکات.

لە تەمەنی دوازدە ساڵەوە، لینا ناچار بوو پشت بە خۆی ببەستێت. کەسی نەبوو ڕاوێژی پێبکات و لە کاتی بڕیارداندا داوای هاوکاری لێ بکات و یان چاوەڕوانیی سۆز و میهرەبانی لێی هەبێت. لە ڕاستیدا ئەو کەسی نەبوو کە هاوبەشی خۆشی و ناخۆشییەکانی بێت. بەڵام ئێستا، ئەو کچەکەی و عەبدولڕەحمانی هەبوو. ئەوان بنەماڵەی بوون و لینا بە هیچ نرخێک ئامادە نەبوو لە هیوای پێکەوەبوونی ئەندامانی بنەماڵە و هاوبەش بوون لە خۆشی و ناخۆشییەکانی یەکتردا چاوپۆشی بکات.

■ بڕیاری سەفەر

لەو سەردەمەدا کە لێنا دەچوو بۆ قوتابخانە، مامۆستاکانی، خۆشەویستیی نیشتمان و حەزی تێگەیشتن لە جیهانیان فێر کردبوو. لێنا بە عەشقێکی ڕاستگۆیانەوە وڵاتەکەی خۆی خۆشدەویست و ڕێزێکی قووڵی بۆی هەبوو. بەو حاڵەشەوە لەوێ هەستی بە ئۆخژن نەدەکرد. ئەو لەوێ، ئارامیی منداڵێکی بەختەوەری، بەخۆیەوە نەبینیبوو. لەوێ جگە لە پووری و بنەماڵەکەی، ئازیزێکی دیکەی نەبوو. پووری و بنەماڵەکەشی دوور لەو دەژیان. تەنیاییەکەی قورسایی خستبووە سەر شانی. بە کەمی هاوڕێکانی دەبینی. باپیری و پووری داوایان لێکردبوو کە لەگەڵ ئەوان بژی. بەڵام، لێنا حەزی لەو شێوە ژیانە قورس و تەریک کەوتووەی ئەوان نەبوو.

لە فڕۆکەخانە، لەو کاتەدا کە چاوەڕوانی سواربوونی فڕۆکە بوو، لێنا بیری لە ژیانی خۆی، لە سەردەمی منداڵی و گەنجیەتی دەکردەوە و ئەو ئەزموونە قورسانەی کە بۆ مرۆڤێک لە تەمەنی ئەودا هاتبوونە پێشەوە، بە پێش چاویدا تێدەپەڕین. هەستی بە ئارامییەکی سەرسووڕهێنەر، تێکەڵ بە وردە پەشیمانییەکی دەروونی دەکرد. چونکوو سەرەڕای هەموو ئەوانەش، لەوێش هەموو شتەکان بە تەواوی ڕەش نەبوون.

■ گەیشتن بە ئێران

زۆربەی کاتەکان، کاتێک کەسێک لە شوێنێکەوە دێت، ئەوانەی چاوەڕوانی گەیشتنی ئەو کەسەن، بە بێ ئەوەی بۆخۆشیان بڕوایان بە کردەوەکەیان هەبێت، بەدەنگی بەرز هاوار دەکەن و «بەخێرهاتنی» ئەو کەسە دەکەن. لێناش کاتێک لە فڕۆکەخانەی «مێهرئاباد» خۆی لە بەرانبەر عەبدولڕەحماندا دییەوە، هەستێکی وەهای هەبوو. ئایا عەبدولڕەحمان لەبەر ئەو دوو هاوڕێیەی کە لەگەڵی هاتبوون نەیدەویست خۆشحاڵیی خۆی دەرببڕێت؟ لێنا کە نەیدەزانی هەڵسوکەوتی دەبێ چۆن بێت، بە ژێستێکەوە ویستی منداڵەکە بدا بە باوەشیەوە. بەڵام، ئەو تەنیا سەیری

میناى چکۆلانەى کرد و پاشان گوتى: «چەند ناشیرینە». بۆ لێنا، ئەو ڕستەیە گاڵتەیەکى دڵشکێن بوو. هەڵبەت، وتەکەى عەبدولڕەحمان ڕاستیش نەبوو. چونکوو میناى بچکۆلە، ڕێک بە پێچەوانەوە، زۆریش جوان بوو. بەڵام، لێنا لەگەڵ ئەوەدا کە دەیزانى کە گاڵتە کردن بەشێک لە سروشتى عەبدولڕەحمان و هەروەها خاڵى سەرنجڕاکێشى ئەو بوو، کەیفى بەو گاڵتەیە نەهات. جارێ ئەوە لێ لێ بوو. چونکوو کارمەندانى گومریکیش دەستیان بەسەر هەموو ئەو شتانەدا گرت کە لێنا لەگەڵ خۆى هێنابوونى. نیشتمانە نوێکەى بە گاڵتەیەکى بە ئازار و گومرکچییە دزەکانییەوە پێشوازییان لێکردبوو و بەم کردەوەیە، لێنا و کچەکەى هێچ شتومەکێکیان بۆ دەسپێکى ژیانە نوێکەیان پێ نەمابوو. لە ڕاستیدا، ئەوان بە ماوەیەکى کورت پاش ئەو کودتایەى حکوومەتە تاڕادەیەک دێموکراتیکەکەى موسەدێقى ڕووخاندبوو، گەیشتبوونە ئێران. عەبدولڕەحمانیش، تازە خەباتێکى ڕاستەقینە و جیددى و بە وتەیەکى دیکە پیشەى سیاسەتى هەڵبژاردبوو. لە ڕاستیدا، ئەوان لە کات و ساتێکى نەگونجاودا سەفەریان کردبوو. کاتێک مرۆڤ لە خەباتەوە دەگلێ، تەنیا بیر لە خەبات و هاوڕێ خەباتکارەکانى دەکاتەوە. ئەو دوو خاڵە، بۆ مرۆڤێکى شۆڕشگێڕ خاڵى سەرەکییە و شتەکانى دیکە دەکەونە پەڕاوێزەوە. هەموو شتێک، لە ساتى بەکەڵک بوونیدا بایەخى خۆى وەردەگرێت. ئەوەش، تەنها لە ئاستى تێگەیشتنى ئەو کەسانەدایە کە لە لووتکەى خەباتدان و درک پێکردنى بۆ ئەوانەى لە دەرەوەى ئەو بازنەیەدان سانا نییە.

عەبدولڕەحمان بۆ بەجێهێشتنى فڕۆکەخانە پەلەى بوو. ئەوانى بەرەو ماڵى هاوڕێیەکى دەبرد، ئەو ماڵەى کە بڕیاڕ بوو لەوێ بژین.

لە کاتى تێپەڕین بە شەقامەکانى پێتەختدا، لێنا واق وڕ ماو سەیرى شارەکەى دەکرد. خۆرەتاو بەتین و هەوا گەرم بوو. کۆڵانەکان، دووکانە بچووکەکان، دەنگەکان، ئەو ئاژەڵانەى بە تەنشت ئۆتۆمبیلەکاندا تێدەپەڕین و ئەو هەژارى و ساماندارییەى، هاوتەریبى یەکتر دەهاتنە

پێــش چــاو، هیچیان لەو کۆمەڵگە دڵڕفێنە نەدەچوون کە ئەو پێشــتر لە چێک و شاری پراگ و ئاسمانە هەورینەکەی بینیبووی. ئەو پێی دەنایە جیهانێکی نەناســراوەوە، دنیایەک کە لەودا ڕەنگەکان بە بێ هیچ عەیب و گرێیــەک خۆیان دەنواند و چەشــنێک خوێنگەرمیی و بێدەروەســتی بەسەریدا زاڵ بوو.

تەنانەت دەنگەکان لە ڕووی بەرزی و نزمییەوە، ســەیر و ســەمەرە دەهاتنــە پێــش چــاو. لێنا خۆی لــە بەرانبــەر خەڵکان و شــتومەکێکی جۆراوجــۆردا دەبینییــەوە کــە وەســف نەدەکــران و هەســتی دەکرد ئــەوە کۆتایی ناخۆشــی و چەرمەســەری و ســەرەتای بەختەوەری و حەسانەوەی دەبێت.

■ شێمیران

«شێمیران» لە باکووری تاران و لە بناری زنجیرە شاخێک و لەوانە شــاخی دەماوەندا هەڵکەوتووە. ســەرەڕای ئەوەیکە شــێمیران لە ڕێی گرد و ناوچەیەکی نائاوەدانەوە لە تاران دابڕابوو، بەڵام وەک بەشــێک لــە پێتەخت دەهاتــە هەژمار. ئەوان لە ناوچەی «تەجریش»، گەیشــتنە ماڵێکــی بچــووک کە لە ناو داراندا شــاردرابۆوە. لێرە، لە لایەن خاوەن ماڵێکەوە بە ناوی «ت»، کە لە هاوڕێیانی پراگیان بوو و خوشکەکەیەوە بە گەرمی پێشــوازی کران کە دوو ژووری بچووکی لە نهۆمی یەکەمی ماڵەکەی بۆ ئامادە کردبوون.

لێنا ژیانە نوێیەکەی خۆی لێرەوە دەســت پێکرد. زۆرجار پرسیاریان لێدەکــرد کــە ڕەوتی گونجانی لەگەڵ ئەو ژیانەیــدا چلۆن دەڕواتە پێش و لێنــاش وەڵامی دەدایەوە کە هیچ کێشــەیەکی نییە. لێنا هەرگیز باری دەروونیی خۆی نەدەدرکاند. بەڵام ڕاستییەکە ئەوە بوو کە دۆخەکە هێند سانایش نەبوو. بەڵام ساتگەلێکی خۆشیش هەبوون، وەکوو ئەو ڕۆژەی کە عەبدولڕەحمان لەگەڵ خۆی بردی بۆ ناوشــار، واتە ناوەندی تاران. ئەو پرســیاری زۆری ئاراســتەی عەبدولڕەحمان دەکرد. وەڵامەکانیش

هەم دەبوونە هۆی شاد بوونی و هەم خێرا دەبوونە بەشێک لە بیرگەی. ڕاستییەکە ئەوە بوو کە لینا لە فێربووندا ئازا بوو. لە ڕاستیدا وەکوو یارییەکی دوولایەنەی لێهاتبوو کە سەرقاڵی دەکردن.

ماوەی دوو حەوتوویان بەو شێوەیە پێکەوە تێپەڕاند. پاشان، عەبدولڕەحمان بارگەی سەفەری بەست. لینا پرسیاری لێکرد: «بۆ کوێ دەچی؟»

عەبدولڕەحمان وەڵامی دایەوە و گوتی: « لەمەبەدوا، هەرگیز ئەو پرسیارە لە من مەکە».

لینا: «بۆچی؟»

عەبدولڕەحمان: « لەبەر ئەوەی ئەگەر ڕۆژێک لە لایەن پۆلیسەوە دەستبەسەر بکرێیت، هەرچی کەمتر بزانیت، هەرئەوەندەش دەبیتە هۆی زەبر وێکەوتن».

ڕێساکانی خەبات قورسن.

بەڕێز «ت» و خوشکەکەشی سەفەریان کرد، بە بێ ئەوەی بڵێن بۆ کوێ دەچن و کەی دەگەڕێنەوە. لینا و مینای بچکۆلانە و کوڕێکی بچووکی تەمەن نۆ یان یازدەساڵەی خەڵکی باشووری تاران، بە تەنیا مانەوە. کوڕەکە هەموو کار وباری ناو ماڵی بەڕێوە دەبرد. خاوەنماڵەکە، ئەو کوڕەی لە ماڵەوە بەجێهێشتبوو بۆ ئەوەی هەم ئاگای لە ماڵەکە بێت و هەم لە کاروباری ناوماڵدا یارمەتیی لینا بدات. ناوی حسێن بوو کە بە شێوەزارێکی تایبەت بە باشووری ئێران بانگیان لێدەکرد حوسێن. حوسێن هەم پێداویستییەکانی ماڵەوەی دەکڕی، هەم کاروباری ناوماڵی بەڕێوە دەبرد و لە ڕاستیدا ڕۆڵی یەکەمین مامۆستای لینای دەگێڕا لە بواری فێربوونی زمانی فارسی و شارستانێتی و چێشت لێنانی ئێرانیدا.

مینا بە بوونی برایەکی گەورەتر لە خۆی شادمان بوو. ئەو دووانە یەکتریان زۆر خۆشدەویست و مینا دەستە بچکۆلەکانی ڕادەوەشاند و لە هەمانکاتدا لە ناخی دڵەوە پێدەکەنین. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە

هەرسێکیان زۆر پێدەکەنین و لەو دۆخەی هەیانبوو زۆریش دڵخۆش و شاد بوون. لینا تا ئەو کاتە، هەستی بە بەختەوەرییەکی ئەوتۆ نەکردبوو، شادکامییەک کە لەبیر نەدەکرا. بەڵام، جێی عەبدولڕەحمان بەتاڵ بوو. شادکامی لە تەنیشت منداڵەکاندا شتێکی سرووشتییە، بەڵام نەبوونی کەسێک کە مرۆڤ بتوانێت سەبارەت بە بابەتی ڕۆژانە و هەروەها بابەتە گرینگەکانی ژیانی قسەی بۆ بکات، دەتوانێت کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ڕووخانی باری دەروونی هەبێت. لە ڕاستیدا، چاوەڕوانیی گەڕانەوەی عەبدولڕەحمان و ترس لەوەیکە نەبادا ژیانی لە مەترسیدا بێت، ببووە چارەنووسی لینا. ساڵەکانی ١٩٥٠ لە ئێران، هەموو شتێک، لەگەڵ ئەو شتانەی لینا ناسیبوونی، بە تەواوی جیاواز بوو. چونکوو خۆرەتاوی بە پیت و بەرەکەت و سووتێنەر، جوانی و هەژاری لە تەنیشت یەکترەوە و لە پێش چاوی هەمووان، بەرچاو دەکەوت. بەڵام، ئەوەی قورستر و ترسناکتر بوو، لە تاریکیدا و دوور لە چاوی خەڵک بوو. لینا دەبوو بەو دنیا نوێیە ڕابێت، ئەوەی کە لە ڕوانگەی خەڵکەوە باش یان خراپ بوو، کەشف بکات و فیری بێت. ئەو نەدەبوو ببێتە هۆی بێهیوایی. لە کاتی پەروەردەبوونیدا دەردەکەوێت کە ئەو توانایەکی باشی لەو بوارەدا هەیە.

■ یەکەمین گەڕانەوەی عەبدولڕەحمان

ڕۆژێکیان، پێش کازیوە، لینا بە دەنگی تەقەیەکی بچووک کە لە پەنجەرەی ژوورەکەی درا، لەخەو ڕابوو. ئەو هێشتا ڕووی لە ژیانی نهێنی نەکردبوو. بەڵام بۆ ئەوەی کتوپڕ تووش نەبێت، لەباری دەروونییەوە خۆی بۆ دۆخێکی ئەوتۆ ئامادە دەکرد. لە حاڵی خەو و نیوە خەودا، لێدانی دڵی لینا خێراتر بووەوە و شڵەژا و دەیویست ڕابکات. بەڵام، چونکو بە هۆی تاریکییەکەوە نەیدەتوانی جلوبەرگەکانی بدۆزێتەوە، بەر شتومەکی ژوورەکە دەکەوت کە دواجار قاپێکی لە یەکێک لە ڕەفەکانەوە بەردایەوە و زرینگەی بەربوونەوەی قاپەکە زۆر

بەرز هاتەبەر گوێی.

پــاش بێدەنگییــەک، لێنا، دەنگێکــی کپی بەرگوێ کــەوت کە دەیگوت: «منم، ڕەحمان». بە بیســتنی ئەو دەنگە ئازیزە، ئەم جارەیان، دڵی لێنا لــە خۆشــیاندا ترپەکانی خێراتر بووەوە. لێنا لــە تاریکییەکەدا، بانگی لە حوســێن کرد و بە شــێوەزاری باشوورییەوە پێی گوت: «ڕاکە درگاکە بکەرەوە، ئاغا هاتۆتەوە».

عەبدولڕەحمــان بەرانبــەر لێنــا ڕاوەســتا بــوو، بــە ڕوخســارێکی ســوورهەڵگەڕاو لە خۆرەتاوی کوێســتان. لێنا کە بۆ ماوەی ٦ حەوتوو هەســتی کردبــوو لــە ماڵەکەی خۆیــدا دەستبەســەر کراوە، ئێســتا بە گەڕانەوەی عەبدولڕەحمان، هیوادار بوو بەوەی لەگەڵ خۆشەویستەکەی، هەوڵی کەشف کردنی نیشتمانە نوێیەکەی دەدات.

ئەوان حەزیان لە ڕۆشــتن بۆ ناوشــار و پیاســەکردن بــوو. بۆ ئەو مەبەســتەش، دەبوو بە پەلــە لە گردێک ســەرکەون و خۆیان بگەیەننە پاسەکە(ئۆتۆبووس)، لە ڕێدا تووشی وڵاخدارێک و کەر و جاشێک بوون کــە لە گردەکە دادەگەڕانە خوارێ. لێنا کە هەرگیز کەر و جاشــەکەری نەبینیبــوو، مەگیــن لە کتێبــەکان و باخچەی ئاژەڵاندا نەبێ، دەیویســت دەســتێک بە جاشەکەرەکەدا بێنێت و نەوازشــی بکات. عەبدولڕەحمان کــە بەپەلــە بوو، بــە بینینی ئــەو دیمەنە، هــاواری کرد: «دەســتی لێ مەدە!» و ئەوە یەکەمینجار بوو کە لێنا لەگەڵ هاوارێکی لەو چەشنەی عەبدولڕەحماندا ڕووبــەڕوو دەبوو. هاوارەکەی ئەوەندە بەرز و تەژی لــە تووڕەیی بــوو کە لێنای تۆقاند. موســافیرەکانی ناو پاســەکەش بە پرسیارەوە سەیریان دەکردن.

بەم چەشــنە لێنا تێگەیشت کە کەرەکان و تەنانەت ئەو وڵاخدارانەش کــە لە نزیکیــی ئەوانەوەن، ئەوەندە جێی ســۆز و خۆشەویســتی نین. هەربۆیــەش، ئەگــەر ئــەو جاشــەکەرەکەی نــەوازش کردبــا، دەبووە گەپجاڕی موســافیرەکان. حاڵەتی پرســۆکیی موسافیرەکانیش، گۆڕدرا بە خەمساردیی و لێنا سەرەڕای ئەو هەڵەی کردبووی، لە ناخی خۆیدا

لەو نەریتانەی کە ئاژەڵەکان و تەنانەت خاوەنەکانیشــیانی بە ناپەسەند دادەنا، گەلێک قەڵس بوو. ئەویش ئەو، ئەو لێنایەی کە دەیویست بە گژ ئەژدیهادا بچێتەوە، بەڵام هیچی لەدەست نەدەهات.

ئــەوان لــە کۆڵانی «لالــەزار» کە لەو کاتــەدا لــە دوور ودرێژترین کۆڵانەکانی پێتەخت بوو، پیاسەیان دەکرد. فرۆشیارەکانی سەر شەقام، شــتومەکەکانی خۆیان لەســەر ڕاخــەرە تایبەتەکان بــڵاو کردبووەوە. بازاڕێکی تەژی لە ڕەنگ بوو. ئۆتۆمبیلەکان زۆر بە ئەسپایی تێدەپەڕین. فرۆشــیارەکانی سەرشــەقام، بە دەنگی بەرز پەســنی کــەل وپەلەکانی خۆیــان دەدایەوە. هەندێ کەســیش بە تەندروســت و کــەم ئەندامەوە لــە ســەر زەوی دانیشــتبوون یان پاڵیان بە دیــوارەوە دابوو، و بە جل و بەرگــی دڕاو و کۆنەوە ســواڵیان دەکرد. لــە نێوانیاندا منداڵگەلێکیش دەبینــدران کە بە جل و بەرگی شــڕەوە بەئەملاوئــەولادا ڕایاندەکرد و وێــڕای باس کردنی نەهامەتییەکانیان ســواڵیان دەکرد. هەراوزەنایەکی ســەیر و سەمەرە بوو. گەلێک پرسیار بە مێشــکی لێنادا تێدەپەڕین کە نەیدەتوانی لە هەموویان بپرســێتەوە، چونکــوو عەبدولڕەحمان تاقەتی وەڵامدانەوەی نەبوو و تەنانەت لەو کاتەشدا بە پارێزەوە هەلسوکەوتی دەکرد و نەیدەویست سەرنجی خەڵک ڕابکێشێت.

پاش ماوەیەک، گەیشــتنە جووت سایدی «ئێســتامبۆل». شەقامێکی جوان و پڕ لە دار و درەخت و شــینکایی. لەوێ پیاوێکی لاواز، بە جل و بەرگی شڕ و دڕاوەوە پاڵی بە عارەبانەیەکی پڕ لە پڕتەقاڵی گەییو و بریســکەدارەوە دەنا، بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: «پڕتەقاڵی جوان، پڕتەقاڵی شیرین شیرین»، پرتەقاڵەکانی کە لە دوورەوە بە هۆی ڕەنگ و ڕوویانەوە بەرچاو بوون، مرۆڤی دەخســتەوە بیری خۆرەتاوی دەم زەردەپەڕ.

لــە ڕۆژهەڵات، کڕینــی ڕۆژانەش لە خۆیدا هونەرێکە. لە کاتی کڕیندا، خەڵــک باســی هەموو شــتێک دەکــەن، تەنانــەت هەندێ جــار لە کاتی مامەڵە کردندا بۆ دابەزاندنی نرخی شــمەکەکان، چیرۆک و بەسەرهاتی

کورت و سەرنجڕاکێشیش دەگێڕنەوە، لەو چەشنە چەلەحانێ و مامەڵە کردنــەدا، لە نێوان فرۆشــیار و کڕیاردا، کێ بــراوە دەبێت؟، دیار نییە. عەبدولڕەحمــان لــە فرۆشــیارەکە نزیک بــووەوە و پرســیاری نرخی یەکێک لە پرتەقاڵەکانی (لەو کاتەدا بە دانە دەفرۆشــرا) کرد. فرۆشــیار کــە چاوی بە لینای ئۆرووپایی «ســاماندار» کەوتبوو، میوەکانی گران کرد. عەبدولڕەحمان و فرۆشــیار لەسەر نرخەکە کەوتبوونە مامەڵە. لە ڕوانگەی لیناوە، ئەو بابەتە پڕ لە شوورەیی و سەیر بوو: شۆڕشگێڕێک کــە بــۆ دابین کردنــی مافی هــەژارەکان خەباتی دەکرد، ئامــادە نەبوو ڕێگە بدات ئەو پیاوە هەژارە چەند پەناباتێکی زیاتری دەســت کەوێت؟ هەربۆیەش بە زمانی چێکی نارەزایی دەربڕی و عەبدولڕەحمان ئەمری پێکرد کەخۆی لەو باســە وەرنەدات. پاش ئــەوەش، مامەڵە کردنی ئەو دووانــە ماوەیەکی خایاند و دواجار نەگەشــتنە ئەنجام، عەبدولڕەحمان دەســتی لینای گرت و بەڕێ کەوتن. فرۆشــیارەکە بە بینینی ئەو حاڵە، بــە دوایانــدا ڕایکــرد و ئامادەبوو بــە هەرزانتر بیانداتــێ. ئەوجارەیان عەبدولڕەحمان قبووڵی نەدەکرد، هەتا ئەوەی کە فرۆشیارەکە ئامادە بوو بــەو نرخەی کە عەبدولڕەحمان بە گونجاوی دەزانی، پێیان بفرۆشــێت. ئەوســا، عەبدولڕەحمان هەندێ پرتەقاڵی کڕی. بەڵام، لینا کە لەو دۆخە زۆر دڵگران ببوو، هاوســەرەکەی لە نارەزایەتییەکەی خۆی تێگەیاند و بەرەوڕووی نیگایەکی مێهرەبان و گاڵتەئامێزی بووەوە، ئەو کارە نەک هــەر لینای زیاتر تووڕە کرد، بەڵکوو لە دڵگرانیی خۆیدا گێنگڵی دەدا و زمانی دەیگرت؟

لــە حاڵێکــدا کــە لینا لــە مەراقی خۆیــدا هیــزی هەنــگاوی نەمابوو، عەبدولڕەحمان ڕووی تێکرد و گوتی: «نیگەران مەبە، تۆش فێر دەبی». لــەو کاتەدا، لینــا بە هیچ شــێوەیەک ئامادە نەبوو ئەو چەشــنە مامەڵە کردنە فێر بێت. بەڵام، پاش ماوەیەک، خودی ئەو، ئەویش زۆر کارامەتر هەمان کاری دەکرد.

■ ئێحسان نووری پاشا

ڕۆژێــک، عەبدولڕەحمــان و لینا ســەردانی ماڵی «ئێحســان نووری پاشــا»یان کرد. ئەو کورد و لە ئەفســەرەکانی سوپای تورکیە بوو. لە ساڵەکانی ١٩٣١ ـ ١٩٢٧ لە ناوچەی بەتلیس، هەڵکەوتوو لە کوردستانی تورکیــە، شۆڕشــێک بە ڕێبەرایەتیی «کومیتەی ئارارات بۆ دەســتەبەر کردنی خودموختاری» ســەری هەڵدابوو. ئێحســان نووری پاشــا بەو شۆڕشــەوە پەیوەســت ببوو و فەرماندەیی لقی نیزامیی شۆڕشــەکەی گرتبووە ئەســتۆ. پاش چوار ســاڵ خەبات، شۆڕشــەکە تێکدەشکێت و بەشێک لە ڕێبەرانی دەستبەسەر دەکرێن.

ئێحســان نووری پاشــا، وێڕای ڕاکردن و تێپەڕاندنی مەترسیگەلێکی زۆر، ســنوور دەبڕێــت و دەگاتــە ئێــران. پــاش گەیشــتنی بــە ئێران، هاوســەرەکەی «یاشــار خانم»یش دەگاتە لای. ئــەو توانیبووی کەڵک لــە دۆخی نێوان ئێــران و تورکیە وەربگرێت کە لــەو کاتەدا زۆر باش نەبوو.

ئێحســان نووری پاشا و هاوســەرەکەی لە ماڵێکی بچووک لە تاراندا دەژیــان. ئــەو پیاوێکــی ڕێکپــۆش، باڵابــەرز، بیرتیــژ و تاڕادەیەک لە هەڵســوکەوتدا نیزامییانە بوو. ئەو پیاوێکــی نەریتی بوو و لە ڕوانگەی ئەوەوە ژنان پلەیەکی نزمتر لە پیاوانیان هەبوو. هەربۆیەش هەرکاتێک دەیویســت بابەتێکی جیــددی لای عەبدولڕەحمان بــاس بکات، دەیبردە شوێنێک کە ژنی لێ نەبێت.

یاشــار خانــم ژنێکــی کورتەبــاڵا و وردیلە بــوو، باڵای تــا نێوقەدی مێردەکــەی دەبــوو. ســەڕای پیرییەکــەی، ئاســەواری جوانییەکــەی سەردەمیی گەنجیەتی بە سیمایەوە دیار بوو. ژنێکی میوان خۆشەویست و مێهرەبــان بوو و لینای گرتبووە ژێر باڵ و پەڕی خۆی. لەو ڕووەوە کە فارســیی نەدەزانی، لەگەڵ لینادا زمانێکی هاوبەشــیان نەبوو. بەڵام ئەو دووانە لێک تێدەگەیشــتن. چۆن؟ تەنها خودا دەزانێت. یاشــار خانم لە بواری لێنانی چێشــتی ڕۆژهەڵاتیدا گەلێــک کارامە بوو و لینا یەکەم

جار بوو لەگەڵ ئاشـپەزێکی وەها کارامەدا ڕووبەڕوو بێت. هەڵبەت، تا ئەو کاتە لینا ئاشپەزگەلێکی کارامەی دیکەی لە کورد و تورک و فارس ناسیبوو، بەڵام هیچیان نەدەگەیشتنە ئاستی یاشار خانم.

لینا، لە ماوەی ناسـین و دیدارەکانی لەگەڵ یاشـارخانمدا، هەم ڕێسا سـەرەتاییەکانی چێشت لێنان فێر بوو، هەم ئۆگری هونەری ئاشپەزیی ئەو ناوچانە بوو. بەڵام پاش سـەفەری لینا بۆ کوردسـتان، پەیوەندیی نێوان ئەو دووانە پچڕا و هەرگیز یەکتریان نەبینییەوە.

■ چوونەدەرەوەکانی لینا

مرۆڤ بە ئاسـانی فێری قسـەکردن بە زمانی فارسـی دەبێت. بەڵام هەرچی زیاتر ئەو زمانە بناسێت و بیەوێت بەسەر وردەکاریی و سووچ و پەنـا جوانەکانیـدا زاڵ بێت، ئەوسـایە کە وەکوو زمانـی بریتانیایی، ڕووبـەڕووی گرفت دەبێتەوە. لینا بە خێرایی ڕێسـا بنەڕەتییەکانی ئەو زمانـە فێـر ببوو و دەیتوانی خەڵک لە خـۆی تێبگەیەنێت. هەر ئەوەش، هانی دەدا کە لە ماڵ بچێتە دەرەوە و شاری تاران بناسێت. ئەو حەزی دەکرد نیشتمانە نوێیەکەی و هەروەها ڕۆژهەڵات بناسێت.

کاتێک عەبدولڕەحمان لە تاران بوو، لە لایەکەوە، نەیدەویست هەمیشە لەگەڵی بچێتە دەرەوە و لە لایەکی دیکەشـەوە، حەزی نەدەکرد لینا بە تەنیـا لـە ماڵ بچێتـە دەرەوە. بەڵام لەو ڕووەوە کـە لینا زۆربەی جار بـە تەنیا بوو، ئەو تەنیاییـە، هەم لەبەری گران بوو، هەم لە بەرانبەریدا وەکوو ئەشکەوتێکی ڕەش و تاریک دەمی داپچڕیبوو. لینا دەیویست ئەو ترس و هەیەجانە لە کۆڵ خۆی کاتەوە. خۆی سەرقاڵی فێربوونی زمان، داهێنانی چیرۆک، درووست کردنی لەیستۆک بۆ کچەکەی و دیاریکردنی ڕۆژەکان بە هێمای لێکدان (زەرب) لەسەر ڕۆژژمێر دەکرد. بەڵام هەموو ئەمانـە، نەدەبوونە هـۆی ئارامیی ئەو. ئەو لە بەکەڵـک نەبوونی خۆی ئازاری دەکێشـا. لەم کاتەدا، لینا، سەرەڕای باوەڕەکانی خۆی، زۆریش بـاوەڕی بەخـۆی نەبوو. بەڵام ئـەم گرێی نەبوونـی باوەڕبەخۆبوونە،

لایەنێکی ئەرێنیشی هەبوو و ئەویش ئەوە بوو کە ناچار بە فێربوونی دەکرد. ئەو بە تەواویی لە کەموکوڕیی و دەستەوەستانییەکانی خۆی بەئاگا بوو. دوورکەوتنەوەکانی هاوسەرەکەی لە تاران زۆر درێژخایەن بوون و پاش گەڕانەوەش زۆر لە تاران نەدەمایەوە. هەربۆیەش، بە مل نەدان بۆ ڕاسپاردەکانی مێردەکەی، بە تەنیایی دەچوو بۆ پیاسە لە ناوشاردا، چۆنیەتیی هاتوچۆ لە ناوشاردا فێر دەبوو، شمەکی دەکڕی و تەنانەت لە کاتی شت کڕیندا مامەڵەیشی دەکرد.

ڕۆژێکیان کە عەبدولڕەحمان لە ماڵەوە بوو، بەڵام بە هۆی ماندوویەتیی زۆرەوە ئامادە نەبوو لە ماڵ بچێتە دەرەوە، لینا، بڕیاریدا پرۆژەیەک کە ماوەیەکی زۆر بوو مێشکی داگیر کردبوو جێبەجێ بکات، سەردانی باشووری تاران و بینینی هەژارترین بەشی ئەو شارە. سەبارەت بەم بەشەی شاری تاران، قسەوباسێکی وەها تۆقێنەری بیستبوو کە حەزی دەکرد بەچاوی خۆی بیبینێت و لێکی بداتەوە. لینا پێشتر، چەندین جار داوای لە مێردەکەی کردبوو کە بیبات بۆ ئەو ناوچەیە لە شار، نەک هەر وەڵامی ڕەتی وەرگرتبووەوە، بەڵکوو هاوسەرەکەی ئەوی لە ڕۆشتن بۆ ئەوێ و مەترسیی هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی گۆڵمەزێکی وەها ئاگادار کردبووەوە و پێی گوتبوو کە گەڕەکێکی سەرنجڕاکێش بۆ پیاسە و بینین نییە و پێویستە ئەو بیرۆکەیە لە مێشکی دەرکات.

هەربۆیەش، ئەو ڕۆژە بە مەبەستی پەیبردن بەو شتە پەنامەکییانەی خۆیان لە پشت ئەم شتە قەدەغەیەوە حەشار دابوو و هەروەها درک کردن بە نەفرەتی ئەو کەسانەی باس لەو گەڕەکانە دەکەن، لینا بڕیاری دا بچێت بۆ ئەوێ. بڕیاری دابوو سەبارەت بەو بابەتە هیچ بە هاوسەرەکەی نەڵێت. بەڵام پاش گەڕانەوەی لەو گەڕەکە، لینا هەستی کرد کە پێویستە باسەکە بۆ هاوسەرەکەی بگێڕێتەوە. ئەو بە مێردەکەی گوت کە بە هەڵە سواری پاس بووە و سەری لەو گەڕەکە لە پێتەخت دەرهێناوە.

ئەوەی ئەو لە پەنجەرەی کەچە پاسەکەوە بینیبووی، باوەڕ

نەدەکرا. هەرچی خێرایی پاسەکە کەمتر دەبووەوە، هەم هەڵسوکەوتی موسافیرەکان و هەم شکڵی ماڵەکان دەگۆڕدران، دەرئەنجام، ئەو ماڵۆچکەگەلێکی هەژارانەی دەبینی کە لە ئاقاریاندا، کەسانێک بە جلوبەرگی شڕودڕ وەک مێرووڵە تێکچڕژابوون. منداڵە ڕووت و قووت و ڕەشتاڵەکان بە ئەملاوئەولادا ڕایاندەکرد و ژنەکان چارشێوی خۆڵەمێشییان بەسەرەوە بوو. لە ڕاستیدا ڕەنگی چارشێوەکان ڕەش بوو، بەڵام بە هۆی کۆنیی و تێپەڕینی زەمەنەوە ببوو بە خۆڵەمێشی. ئەو ژنانە مرۆڤیان دەخستەوە بیری ڕۆحەکان. لە حاڵێکدا کە لە باکووری شار، لینا خانمگەلێکی ناسک و دەلال و دلڕفێنی بینیبوو.

جیاوازیی نێوان ئەو دوو بەشەی شار تۆقێنەر بوو.

پاسەکە، لە پڕ وەستا و شۆفیرەکە هاواری کرد: «هەموو دابەزن، گەیشتینە کۆتایی».

لە ناو کۆڵانەکەدا و ڕێک لەبەردەم پاسەکەدا، گایەکی نێر و شەلاڵی خوێن کەوتبوو. گاکە لە کوشتارگەکەی ئەوپەڕی کۆڵانەکە ڕایکردبوو. قەسابەکان لەپێش چاوی خەڵکەکە سەرقاڵی لەت وپەت کردنی گاکە بوون. بینەرە بێئیشەکان، لە شێوەی نیوە بازنەیەک بە پێوە وەستابوون و خەمساردانە سەیری قەسابەکانیان دەکرد. لینا و منداڵەکان لەو دیمەنە تۆقیبون.

دیمەنێکی تاقەتپڕووکێن بوو.

پاشان، لینا دەستی کرد بە پیاسەکردن بەرەولای باشوور. لە باکووری تاران، جۆگەلەکانی تەنیشت شەقامەکان، وەکوو پاریس، داپۆشراون، جگە لەو کونە چوارگۆشانەی کە لە پیادەڕەوەکاندا هەن و ئەگەر مرۆڤ وریا نەبن، ڕەنگە پێیان تێیدا گیر بکات و قولاپەیان لەجێدەرچێت، لە باشووری شار ئەو جۆگەلانە سەرئاوەڵان. لە ڕێی ئەو جۆگەلانەوە، ڕۆژێ دووجار شارەوانی ئاوی بەردەدایەوە و لەو ڕووەوە کە ماڵەکان سیستمی بۆریی ئاویان نەبوو، خەڵک لەو جۆگەلانە بۆ جێبەجێ کردنی هەموو ئیش و کارەکانیان کەڵکیان وەردەگرت. لە ڕۆژە باراناوییەکاندا

ئـاوی ئـەو جۆگەلانـە دەبوونە قـوڕاو. بەڵام لـە ڕۆژانی ئاسـاییدا تا ڕادەیەک زوڵاڵ بوون. ژنێک کە چارشێوەکەی بەستبوو بە کەمەریەوە و هەڵترووشـکابوو، خەریک بوو پاشـەڵی منداڵەکەی تێدا دەشوشـت. پاش پێنج خولەک، ژنێکی چارشێوبەسەری دیکە بە کترییەکەوە هات و کترییەکەی پڕ کرد لە ئاو و ڕۆشت.

هەندێـک دوورتـر، لێنا لەگەڵ شـارێک بەرەوڕوو بوو کـە ماڵەکانی لە خشـت و کاگڵ سـازکرابوو. بەرزایی ئەو ماڵانە، تۆزقاڵێک لە باڵای مرۆڤێـک بەرزتـر بـوو و لە کەنـووی هەنگویـن دەچـوون و درگای چوونەژوورەوەیان گەلێک نزم بوو. لێنا لە ڕۆژهەڵات، گەلێک ماڵی بینی کە هەر لەو کەرەستەگەلە یان لە خشتی کاگڵیی وشکەوەبوو لەبەرانبەر خۆرەتاودا و هەروەها، هەندێجار تەنانەت داپۆشـراو بە شـیاکە سـاز کرابـوون. شـایانی گوتنە کە ئەم ماڵانە گەلێک پتـەو بوون و ئەمڕۆکە ئێمە کاولاشی باڵاخانە و تەنانەت کۆشکە کۆنەکان دەبینین کە هەر لەو کەرەسـتانە ساز کراون و لە راستیدا پیشـاندەری گەورەیی و شکۆی رابـردوون. لێنا بەئەسـپایی هەنگاوی هەڵدەگـرت و هەرچاوێکی ببوو بـە دوان بۆ بینیـن. منداڵەکان دوای کەوتبوون و بە دەسـتی ئاوەڵاوە سـواڵیان لێدەکرد، تەنانەت چەند ژنیش هەمان هەڵسـوکەوتیان دەکرد. بـەڵام، لێنا تەنیـا پارەی کڕینی بلیتی گەڕانـەوەی پێبوو و نەیدەتوانی یارمەتیان بدات.

لەو کاتەدا، سـێ ژن پێشیان پێگرت و پرسیاریان لێکرد: «خانم، لێرە چی دەکەی؟»

لێنا بە بزەوە وەڵامی دایەوە: «هاتووم ئێوە ببینم».

هەڵسـوکەوتیان دوژمنکارانە نەبوو، بەڵام پێشـیان بە چوونە پێشـی زیاتری دەگرت. یەکێک لەو ژنانە کە لە هەموویان بەتەمەنتر بوو، خۆی لـە لێنـا نزیک کردەوە و لە حاڵێکدا کە چاوەکانی پڕ لە پرسـیار بوون، دەسـتەکانی هێنایـە پێـش، وەک ئەوەی بیەوێ نەوازشـی بکات، بەڵام پەشـیمان بووەوە و تەنیا بە سـەرپەنجە دەسـتی بە ڕوومەتیدا هێنا و

پێی گوت: «خانم گیان، باش سەیر بکە...». بەڵام دواتر، هیچی نەگوت و ملی ڕێگاکەی گرت و ڕۆشت. ژنێکی دیکە کە لە هەموویان گەنجتر بوو، لینای خوڵک کرد تا بۆ خواردنەوەی چایەک بچێتەماڵەکەی. لیناش دوای کەوت و چووە ماڵی ئەو ژنە کە هەر لە کەنووی هەنگوین دەچوو. لینا تا ئەو کاتە، هەرگیز ماڵێکی نەبینیبوو کە تا ئەو رادەیە بچووک، پەڕپووت و هەژارانە بووبێت. لەوکاتەدا کە ئەو ژنە سەرقاڵی داگیرساندنی ئاگر بوو، لینا سپاسی کرد و پێی ڕاگەیاند کە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.

سێهەمین ژن لە دەرەوە چاوەڕوانی لینا بوو. بە مۆڕەوە سەیری لینای دەکرد و بە زمانێک قسەی دەکرد کە لینا لێی تێنەدەگەیی. بەڵام دیار بوو کە ئەو ژنە لە بوونی لینا لەوێ ناڕازی بوو. هەربۆیەش، لینا بەپەلە لەو ماڵە چووە دەرەوە. لەو ناوچەیە، لینا هیچ پیاوێکی نەبینیبوو. پرسیاری لە خۆی دەکرد: پیاوەکان لە کوێن؟

لینا، ئەوەی دەیویست ببینێت، بەچاوی خۆی بینیبووی و لە ناخەوە هەژاندبووی. هەژاری و سووکایەتی، مرۆڤ ناچار دەکات هەموو شتێک بکات. لە ڕاستیدا ئەوە فەقیر و هەژارەکان نین کە کۆشکەکان دەڕووخێنن، بەڵکوو بێهیوایی و بێئومێدییە کە ناچاریان دەکات ئەو کارە بکەن.

عەبدولڕەحمان لەو کارە رازی نەبوو و لەوەیکە لینا لە ناخی خۆیدا هەستی دەکرد پێویستە خراپترین شتەکان ببینێت، سەری دەرنەدەکرد. لە ڕاستیدا ئەو کارە، بەشێک لە خواستی لینا بوو بۆ ناسینی ڕۆژهەڵات. لینا بە سەرکەشییەکی تایبەتی سەردەمی گەنجیەتییەوە دەیویست هەموو شتێک فێر بێت، تێبگات و بەسەر ترسەکەیدا زاڵ بێت. ئەوەیکە فێری دەبوو، ئەوی زیاتر لە «بەکەڵک بوون» نزیک دەکردەوە. بەڕادەی تواناکانی، پارادۆکسەکانی کۆمەڵگەی هەندێ جار بە ئازارەوە و هەندێ جاریش بە سەرسووڕمانەوە وەردەگرت. دنیا بەرەوپێش دەڕۆشت و لەگەڵ پێشکەوتنەکانی، لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا تێکنۆلۆژیی کامڵ

دەکـرد. بـەڵام، لینا خـۆی لە پەرژینـی دۆخێکی تەژی لـە هەراوزەنا، ناتەکووزی، نابەرابەری و زوڵمدا دەبینییەوە. دەیانگوت کە ئێرانییەکان حەزیان لە تەکووزیی ئاڵمانییەکانە! ئەو بابەتە چلۆن شـرۆڤە دەکرێت؟ ڕەنگە مرۆڤ حەزی لەو شتە بێت کە خۆی بە کەمیی هەیەتی؟

■ جوانییەکان و دڵەڕاوکێکان

عەبدولڕەحمـان، هەر لە سـەرەتاوە، لینای لەگەڵ دڵڕفێنیی شـیعری فارسی و کوردی ئاشنا کردبوو. ئەو دوو زمانە، مۆسیقا و جوانییەکی خودایی و لەڕادەبەدەر بە شـیعر دەبەخشـن. ناوەرۆکی ئەم شـیعرانە تـەژی لە پەنـد، ورەبەرزی، تێگەیشـتن لە خاڵـە لاوازەکانی مرۆڤ و چێژی جەستەییە. لای شاعیرە کۆنەکان، نوێخوازی، بیرکردنەوە، دوور کەوتنەوە لە ئایین، داکۆکی کردن لە ئازادی و خۆشەویستیی سروشت و مـرۆڤ، باڵادەسـتە. لینا، ئەو شـیعرانەی دەپەرسـتی و هەندێکیانی لەبـەر دەکـرد. ئۆگـری عومەری خەیام بـوو. هەر لە سـەرەتاوە، لەو شاعیرە تێگەیبوو و خۆشی دەویست. هەروەها، لینا، گەلێک حەزی لەو نیگارە «مینیاتۆر»ە فارسی و هێندییانە بوو کە نێو لاپەڕەکانی دیوانی شاعیرەکانیان پێ دەڕازاندەوە.

ڕوویەکی دیکەی ئەو وڵاتەش کە لینا هەوڵی ناسینی دەدا، سەرەڕای هەژاریی لەڕادەبەدەر، مەترسـیی دەستبەسـەر بوون، ئەشکەنجە، بزر بوونی ئاوەڵان، کوشتن و ئێعدامی دەگرتەوە.

ورده ورده، لینـا تێگەیشـت کە مردن لە ڕەوتی خەبـات بۆ ئازادیدا، شـتێکی نامۆ نییە. ئەو بیرکردنەوەیە بۆ ئەو، هەم ڕێ نیشاندەر و هەم ترس ڕەوێن بوو.

ئەو، لە سـەرەتادا، داهاتـووی خۆی وەکوو ژنێکـی گەنج و پێگەییو دەبینی کە لە تەنشـت هاوسەرەکەیدا خەبات دەکات. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە هەموو شـتەکان لە مێشـکی ئەودا ئاڵۆز ببوون. پێویستی بە کات بوو بۆ ئەوەی ڕێکیان بخاتەوە. ئەو عاشـقی مێردەکەی بوو و

ئەوەش قورسایی کێشەکانی کەم دەکردەوە. خۆشەویستیی مێردەکەی و حەزی فێربوون، لە ناسین وتێگەیشتنە جۆراوجۆرەکاندا یارمەتیدەری بوون، تەنانەت تێگەیشتنگەلێک کە لە کورت ماوەدا سوودیان نابێت، بەڵام مرۆڤ دەزانێت کە ڕۆژێک پێویستی پێی دەبێت. لینا بە وریایی لەو قوتابخانەی فێربوونە بەردەوام بوو. ئەوەش بەجۆرێک دەبووە هۆی خەمساردییەکی دەروونی لەودا. بەڵام زۆری نەخایاند کە ڕاستییەکان وەخۆیان هێنایەوە و ئەو خەمساردییەیان کاڵ کردەوە. هۆکارەکەشی خەباتی مێردەکەی و هاوخەباتەکانی بوو. ئەوەی چاوەڕوانی دەکرد، بۆی ڕەخسا، ئەوان پێویستیان بە لینا بوو.

لەو کاتەدا، وەکوو هەمیشە، عەبدولڕەحمان دەبوو سەرلەنوێ سەفەر بکاتەوە، لەسەر ڕاسپاردەکانی پێداگری دەکرد و گوتبووی: « لە نەبوونی ئەودا، لینا نەدەبوو لە ماڵ بچێتە دەرەوە و ئەو کوڕە بچکۆلانە هەموو کارەکان ڕێک دەخات». بەم چەشنە، جارێکی دیکەش حوسێن دەبوو ڕۆڵی پیاوی ماڵ بگێڕێت.

وەکوو ئەوە وابوو کە: «باڵندەیەک لە ڕکەیەکی زێڕیندا ڕابگریت و دەلاقەیەکی بچووکی بۆ بکەیتەوە. هەرچەند، ڕکەکەی لینا، زێڕینیش نەبوو».

کەم واهەیە مرۆڤی هەستیار و پرسۆک خۆی بە چوارچێوەکانەوە ببەستێتەوە. لینا کە لەو کاتەدا تەمەنی ٢٠ ساڵ بوو، بە خێرایی خۆی لەگەڵ بارودۆخی ئەوێ گونجاندبوو. دیارە مل نەدان و مل کەچ نەبوونیش لەو ڕەوتەدا یارمەتیدەری بوون. هەربۆیەش، هێند گوێی نەدەدایە ڕاسپاردەکان و بۆ ناسینی دنیای نوێ، لە ماڵ وەدەر دەکەوت.

هێشتا زستان نەگەیشتبووە کۆتایی. لە باکووری شاری تاران و بناری کێوی دەماوەند، بەفر شارۆچکەکەی شوێنی ژیانی لینای داپۆشیبوو و شەوانە هەوا بەستەڵەک و سارد بوو. بەڵام لە ناوەندی شار، خۆرەتاو کۆڵانەکانی گەرم داهێنابوو و ژنەکان وردە وردە، جل وبەرگی

ناسـکیان لەبەردەکرد. ژنانی ئەورووپی و هاوتا ئێرانییەکانیان، مانتۆی سووکەڵە و کراسی قۆڵ کورتیان لەبەردەکرد و کەوشی پاژنە بەرزیان لەپێ دەکرد. ژنانێک کە جل و بەرگی مۆدەی پاریسـیان لەبەرکردبوو، لە تەنیشـت ژنە چارشـێو ڕەشـەکانی ناوشـارەوە، بە جلی ڕەنگامە و بریقـەدارەوە دەبینـدران. لە ڕۆژهـەڵات، چارشـێوی ڕەش زۆر باوە. مرۆڤ بە ئاسانی ژنی بەمێرد لە کچ جیا دەکاتەوە. ژنەکان، چاوەکانیان پڕکلە دەکرد و سووراوێکی تۆخیان دەکرد. بەڵام، کچەکان هیچکام لەو ئارایشتانەیان نەدەکرد. جگە لە لینا، کەس سەیری نەدەکردن و هەموو شتەکان بەلای خودی خەڵکەکەوە سروشتی بوو.

لە کۆڵانەکاندا، پیاوەکان زیاتر لە ژنان بەرچاو دەکەوتن. ژمارەیەکیان جـل و بەرگی مۆدەی ئۆرووپا و ژمارەیەکی دیکەشـیان جل و بەرگی نەریتیی کەمینە نەتەوەییەکان و هەندێکیشیان جل و بەرگی شڕودڕیان لەبـەردا بـوو. دووکانەکان پڕ بوون لە شـمەک و دووکانـدارەکان لە پێش دووکانەکانیان دادەنیشـتن و چایان دەخواردەوە. فرۆشیارەکانی سەرشەقامیش، بە دەنگی بەرز ڕێبوارەکانیان بۆ کڕینی شتومەکەکانیان بانگهێشـت دەکـرد. بە بوونـی جزدانێکی پڕ لە پـارەوە، دەکرا هەموو پێویسـتییەکی خۆت بدۆزیتەوە. شـار پێکهاتەیەک بـوو لە نەتەوەکان، ئایینەکان، کولتـوورەکان و زمانە جیاوازەکان و هەروەها چالاکییەکان و خـرۆش و ڕەنگە ئاڵـوواڵاکان و هەرئەوەش، ڕواڵەتێکی زیندووی بە کۆڵان و شـەقامەکان دەبەخشی، ڕێک وەکوو ئەو «هەرزان بازاڕە»ی ساڵانە لە ژێر تیشکی خۆرەتاودا بەڕێوەدەچوو، تێکەڵەیەک لە ئێستا و ڕابردوو، لە نەریت و مۆدێرنیتە و هەژاری و سـامانداری لە تەنیشـت یەکترەوە. ئەو دۆخە بۆ هیچ کەس پرسـیار خولقێن نەبوو. لینا حەزی لێبوو لە بەردەم شتومەکە سەرنجڕاکێشەکانی دووکانەکاندا بوەستێت. فرۆشـیارەکان «بـۆ خواردنەوەی چایـەک و بینینی شـمەکەکانیان و حەسـانەوە، بانگهێشـتیان دەکرد، بە بێ‌ئەوەی ناچار بێت شت بکڕێت. بـەڵام لینـا، سپاسـی دەکـردن و بانگهێشـتەکەیانی بـە بزەیەک ڕەت

دەکـــردەوە و ملـــی ڕێگای دەگرتـــەوە. هەروەها، لینا حـــەزی دەکرد لە کۆڵانە لاوەکییە چۆڵ و هێمنەکاندا بگەڕێت و بەم شێوەیە لەگەڵ دۆخی گشتیی شاردا ئاشنا بێت.

■ سەفەری لینا بۆ لای بنەماڵەی عەبدولڕەحمان

ڕۆژێکیـــان، عەبدولڕەحمان کە تازە لە مەئمووریيەت گەڕابووەوە، بە لینـــای ڕاگەیاند کە پێویســـتە بچێت بۆ ڕەزاییە، شـــاری زێد و شـــوێنی ژیانـــی بنەماڵەکـــەی. هەربۆیەش، لینـــا دەبوو بۆ هەمیشـــە ماڵئاوایی لە حوســـێن بکات، کە هەم مامۆســـتای بوو و هەم لـــە کاروباری ناوماڵدا یارمەتی دەدا.

عەبدولڕەحمان و لینا بلیتی پاسی نەفەرهەڵگریان کڕی کە لەو کاتەدا تەنیا کەرەســـتەی گواستنەوەی موسافیرەکان بوو. لینا هەرگیز سواری پاســـێکی وەها کەچە و پەککەوتە نەببوو. هەرچەند لە چێکۆسلۆڤاکیاش کەرەســـتەکانی گواستنەوە زۆر باش و ئاسوودە نەبوون، بەڵام نە بەو ڕادەیە!

لـــە تـــاران بەولاوە، هەرچەند جادەکە قیر بـــوو، بەڵام پڕ بوو لە کەند و قوڵک. پاش تەورێز، دیمەنەکە گۆڕدرا، بە شێوەیەک کە هەم جادەکە پڕ بوو لە خاک و خۆڵ و هەم پاسەکە دەبوو بە ڕێگایەکی تەسکی زاڵ بەسەر دۆڵە قووڵەکان، ئاودڕەکان و ڕەوزە تۆقێنەرەکاندا تێبپەڕێ.

کاتێک کە پاسەکەیان لەگەڵ ئۆتۆمبیلێک کە لە ڕووبەڕووەوە دەهات، ڕووبـــەڕوو دەبـــوو، ناچار دەبوو خۆی بکێشـــێتە قەراخی جادەکە. لەو کاتانەدا، مرۆڤ هەستی دەکرد کە پاسەکە بەرەو ئاسمان هەڵدەدرێت.

لـــە ڕێگادا، پاســـەکە هەندێجار لە پێش چێشـــتخانەکانی ســـەرەڕێگا ڕایدەگرت. ئەم چێشتخانەگەلە، زۆربەی جار پیس و تەڕی لە هەراوزەنا بوون. بەڵام مێزەکان و قاپ و قاچاخەکان و خواردنەکان باش بوون. لە یەکێک لەو وەستانانەدا و لە بەردەم یەکێک لەو چێشتخانانەدا کە تەڕی لە موسافیر بوو، دواجار عەبدولڕەحمان تەوانی مێز و کورسیی پێویست

دەستەبەر بکات. دواتر ماوەیەکی کورت بزر بوو. لە گەڕانەوەدا، ڕێگەی ئاودەســتەکەی نیشــانی لێنا دا و گوتی ئەگەر پێویســتت بە ئاودەستە، دەتوانی بڕۆیت، لێنــا تێگەیی کە عەبدولڕەحمان چاوەڕێی دژکردەوەی ئەوە. لە پراگ لێنا هەرگیز پۆخڵییەکی وەهای نەبینیبوو. بۆ ژنێک کە لە ئۆرووپا لەدایک ببوو، باوەڕ کردن بە دۆخی وا قورسە. بەڵام بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی ئازاری عەبدولڕەحمان، لێنا نەفرەت و قیزکردنەوەی خۆی نەدرکاند. لێنا دەیزانی کە عەبدولڕەحمان چاوەڕێیە بزانێ لێنا دەڵێ چی. ســەرەڕای ئەوەش دەیویست، هەم بەسەر بێزکردنەوەکەیدا زاڵ بێت و هەم وا بنوێنێت کە ئەوە شتێکی زۆر ئاساییە.

پێشــتر خەڵــک بە بێ کەڵــک وەرگرتن لــە کەوچک و چنــگاڵ نانیان دەخــوارد. پاروە نانێکیان هەڵدەگرت و بەوە برنج یان هەر خواردنێکی دیکــە بوایــە هەڵیاندەگرت و دەیانخوارد. لێناش وەکــوو ئەوانی دەکرد و تەنانــەت هەوڵــی دەدا وەها نیشــان بدات کە زۆریش قــورس نییە... هەنــدێ جاریش، حــەزی دەکرد ڕەخنە بگرێت، بــەڵام دەیزانی کارێکی ســاویلکانە و بێســوودە و دواجــار بە زەرەری خۆی دەشــکێتەوە. بە هەڵبژاردنــی عەبدولڕەحمان، خۆی ئەم شــێوە ژیانــەی هەڵبژاردبوو و هەربۆیــەش مەجالی گلەیــی و گازندە نەبوو. هەندێجار تووشــی هەڵە دەبوو. چارەیەک جگە لە فێر بوونی نەبوو و دەیبینی کە هاوسەرەکەی حەزی لەو ئاکارانەیەتی.

پاش ساڵانێک، عەبدولڕەحمان بە لێنای گوتبوو، ترساوە لەوەی کە لێنا بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. عەبدولڕەحمان ژنانێکی بیانیی دەناســی کە شوویان بە پیاوە ساماندارە ئێرانییەکان کردبوو و سەرەڕای ئەوەش کە هاوســەرەکانیان سەرقاڵی کاروباری سیاسیش نەبوون، بەڵام پاش ماوەیەک هاوســەرەکانیان بەجێهێشــتووە و گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان.

لێنا، تەنیا دوو خانمی چێکیی دەناســی کە شــوویان بە پیاوی ئێرانی کردبــوو. یەکێکیان، گەڕابووەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی و دووهەمیشــیان،

هاوسەرەکەی، لەگەڵ منداڵەکانی، لەماڵی باوکی خۆی بەستبوویەوە. ئەم ژنە جگە لە خودا، هیچی شک نەبردووە، نە پارە و نە کاغەز و ساڵانێکی زۆر ژیانێکی تاقەتپڕووکێنی ئەزموون کردبوو. بەوحاڵەشەوە، مێردەکەی ژنێکی دیکەشی هێناوە و منداڵێکیشی لێ بووە. تەنیا، لە دەرئەنجامی ئەو دۆخە ئاڵۆزەی کە پاش هاتنەسەرکاری خومەینی هاتەئاراوە، دەرفەتی ئەوە بۆ ئەو ژنە رەخسا کە ڕابکات و بگەڕێتەوە بۆ ئۆرووپا. بەڕاستی پێویستی بە ورە بەرزی هەبوو. بەڵام لێنا هیچ هۆکارێکی بۆ ڕاکردن نەبوو.

ڕەزاییە بەڕاستی شاری هەموو زمانەکانە. لەم شارەدا ئایین و نەتەوە جیاوازەکان، بریتی لە کورد، ئازەری، ئاسووری، تورکمان، ڕووس، موسوڵمان، مەسیحی، جوولەکە، زەردەشتی و...هتد، پێکەوە دەژیان. لەو ڕووەوە کە چەندین سەدە بوو ژیانیان تێکەڵ بوو، جۆراوجۆریی نەریتەکان و شێوازی ژیانیان، نەدەبووە هۆی سەرسووڕمانی هیچ کەس. چالاکییەکانیان تێکەڵ دەبوون و یەکتریان تەواو دەکرد. منداڵەکانیان پێکەوە دەچوونە قوتابخانە. هاتوچۆی ماڵی یەکتریان دەکرد و هەموو، شارەکەیان خۆشدەویست. ڕەزاییە شاری بێشەڵان و مێرگە دڵڕفێنەکان بوو و ڕووبارێکی جوان بە ناو شارەکەدا تێدەپەڕی. ڕۆخی ڕووبارەکە پڕە لە باخی ڕەز و میوە. کاتێک کە دەوڵەتی ئیسرائیل، جوولەکە پڕش و بڵاوەکانی سەرانسەری دنیای هاندەدا کە بگەڕێنەوە بۆ ئیسرائیل و لەوێ نیشتەجێ بن، تەنیا بەزازێکی جوولەکە بڕیاڕی گەڕانەوە بۆ ئیسرائیلی دا.

خەڵکی شار بە شلۆمۆ Shlomo بانگیان دەکرد. شلۆمۆ پاش ٦ مانگ مانەوە لە ئیسرائیل، گەڕایەوە بۆ ڕەزاییە. وسووقوددیوان کە ماوەیەکی زۆر بوو کوتاڵی هەموو بنەماڵەکەی لە شلۆمۆ دەکڕی و لە گەڕانەوەکەی زۆر خۆشحاڵ بوو، پرسیاری لێدەکات بۆچی گەڕاوەتەوە. شلۆمۆ وەڵامی دابووەوە: «لەوێ جوولەکە زۆرە و ئەوەش لە تیجارەتدا باش نییە».

خەڵک بە پێکەنینەوە، ئەم نەقڵەیان دەگێڕایەوە و لە گەڕانەوەی شلۆمۆ خۆشحاڵ بوون.

■ ماڵی باوکی عەبدولڕەحمان

پاش گەیشتنیان بۆ ماڵی باوکی عەبدولڕەحمان، بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازی کران و لە ماڵێکی بچووک کە لەوپەڕی حەوشەکە و بەرانبەر ماڵی باوک و دایکی عەبدولڕەحمان بوو نیشتەجێ بوون. ئەوان دەبوو ماڵەکەیان لەگەڵ براگەورەکەی عەبدولڕەحمان «حوسێن ئاغا» و «عەدالەت»ی هاوسەری و دوو کوڕی دیکە بە ناوی ئەردەڵان و سەعید دابەش بکەن. لێنا و عەبدولڕەحمان دوو ژووریان هەبوو. ژوورێکی گەورە کە پەنجەرەیەکی هەبوو و ژوورێکی بچووک لە تەنیشت ژوورەکەیانەوە. فەرشێکی گەورە لە ژوورەکەیان ڕاخرابوو کە تەواو پڕی کردبووەوە. مێزێک و دوو کورسی و تەختێکی خەویشی تێدا بوو. ئاو و ئاودەست و شتی دیکەش لە حەوشەکە بوون. لێنا شەو بە ئاسوودەیی خەوت و تەنیا لە کاتی چوونەدەرەوەی عەبدولڕەحمان و داخستنی درگاکەدا خەبەری ببووەوە. سەفەرێکی ماندوویی هێن بوو و هەربۆیەش، ئەو ئاستەم بتوانێ خۆی لەگەڵ ئەوێ بگونجێنێت. زەینی پڕاوپڕی هەستە سەیروسەمەرەکان بوو. وەکوو کۆتەرە دارێک لێی نوستبوو، لە پێخەفەکەیدا بە چێژەوە باوێشکی دەدا و چێژی لەو خۆرەتاوە وەردەگرت کە لە پەنجەرەکەوە خزابووە ژوورەکەوە. ڕێک لەوکاتەدا، لەپڕ، درگاکە بە زرم وکوت کرایەوە و ژنێکی بەتەمەن خۆی کرد بە ژووردا و گەیشتە لای تەختی نووستنەکە و لێفەکەی لەسەر لێنا هەڵدایەوە و لە سەرەوە هەتا پەنجەی پێی لێنای ڕووت و تۆقیوی دایەبەر نەزەر و دواتر هەر بەو شێوەیە کە هاتبووە ژوورەوە، وەدەرکەوت و ڕۆشت. ئەو ڕووداوە بۆ لێنا سەرەڕای ئەوەی بڕیاڕی دابوو هەموو شتێک تەحەمول بکات، بەدەر لە تاقەت بوو. هەبۆیەش بە پەلە جلوبەرگەکانی لەبەرکرد، منداڵەکەی کە ماوەیەک بوو لە

تەختــی نووســتنەکەیدا کەوتبــووە گــڕوگاڵ، هەڵگرت و بــۆ دەربڕینی ناڕەزایەتــی لە ژوورەکە چووەدەرەوە. عەبدولڕەحمانی بینی کە بەدەم قاقای پێکەنینــەوە گوتی: «زەڕی خانم بوو. باوکم لەمێژە تەڵاقی داوە. بــەڵام ئــەو مافی ئەوە بــە خۆی دەدا کە ســەر لە هەموو شــتێک لەم ماڵەدا دەربکات. زەڕی خانم ویســتی بزانێ تۆ بیچمت چۆنە. ئێســتاش تێگەیشــتووە. چونکوو زەڕی خانم هــاواری دەکرد کە هەڵبژاردنی من لــە ژن هێناندا باش بــووە! ئەگەر دەتهەوێ زیاتریش بزانی، باوکیشــم دەیوست بزانێ کە تۆ خوشکت هەیە؟». لێنا کە هەم توورە بوو و هەم خۆشــحاڵ، سەرسووڕماو ســەیری مێردەکەی دەکرد. عەبدولڕەحمان کە باش دەیزانی لێنا نە خوشکی هەیە و نە برا، ئاوا بۆی شی کردەوە: «لێرە، ئەم شــتە، بەو مانایە کە باوکم ئەوەندە تۆی بەدڵە، کە ئامادەیە خوشکت بێنێ.»

ئەم شتە، بۆ لێنا، ڕازێکی دیکەی لە خۆ دەگرت و پرسیاری لە خۆی دەکرد کە چۆن دەبێ پیاوێکی «ڕیش ســپی» و بەڕێز، بە ئامادەبوونی ژن و کــچ و بووکەکانی، وەها شــتێک بڵێت؟ هەمــوو بە دەم وچاوێکی پڕ لە گاڵتە و پێکەنینەوە سەیری لێنایان دەکرد. لێنا سەیرێکی نانەخانم دایکــی عەبدولڕەحمانــی کرد. نانە خانم، خۆی بە شــتێکەوە ســەرقاڵ کردبــوو و وای دەنوانــد کە هیــچ ڕووی نەداوە (ماوەیەکــی خایاند تا نانــە خانــم، بۆ لێنای بگێڕێتــەوە کە چەندە لەو گاڵتــە و دەمتەڕییانەی مێردەکەی، ســەرەڕای ئەوەی چەند ژنی هەبوو، دڵگران و بێزار بووە). لێنا ســەیری هاوسەرەکەی دەکرد و چاوەڕوان بوو ئەو دۆخەکەی بۆ ڕوون کاتــەوە. بەڵام عەبدولڕەحمان ســەرقاڵ بوو و لە ناخی دڵەوە و شەیدایانە پێدەکەنی.

■ بەرکەوتنی کولتوورەکان

لێنا لە شارســتانیەتێکەوە هاتبوو کە لەودا، چەندین ســەدە بوو تاک هاوســەری چەســپا بوو. ڕێز گرتن لە ژنان، لە ســەردەمی شەڕەکانی

هووسـیتەکانەوە (سـەدەی پازدەهەمی زایینی) لە زەینـی ناخودئاگای کۆمەڵگـەدا جێگر بووە. لـە ماوەی ئەم جەنگانەدا، پیـاوەکان دەچوون بـۆ شـەڕ و ژنان لە هەمـوو بوارەکاندا جێی پیاوەکانیـان دەگرتەوە و بـەم شـێوەیە، ژنان توانییان پیـاوەکان ناچار بکـەن ڕێزیان لێ بگرن. هەرچەند دواتر، پیاوەکان سـەرلەنوێ باڵادەستی و سەروەریی خۆیان جێگـر کردەوە، بەڵام مێـژوو توانا و لێهاتووییەکانـی ژنانی بە پیاوان سەلماندبوو و ئەوەش، فەرامۆش نەکرابوو.

لـە کۆمەڵگەیەکدا کـە عەبدولڕەحمانی تێدا گـەورە ببوو، هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندی بە پەیوەندییە مرۆییەکان و بە تایبەتی بە ژنانەوە هەبوو، لەگەڵ ئەو شـتانەدا کە لێنا دەیناسـین، جیاواز بوو. دیارە ئەو بـەراورد کردنەش لە شـوێنی خۆیـدا نەبوو، چونکوو سـووکایەتی بە هەردوولا دەکرا. هەر لە سەرلەبەیانیی یەکەمین ڕۆژدا، لێنا فێر بوو کە فرەژنی، چەشـنە جیاوازەکانی هاوسەرگیری، ڕوانگەی خەڵک بەرانبەر بە ژن، دۆخی ژنان لە کۆمەڵگەدا، لە سـەردەمی پێش لە بە ئیسـلامیی بوونـی ئێـران ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆی بەسـەردا نەهاتووە و سـەرەڕای هەمـوو ئەو دڵنیاییانەی کـە عەبدولڕەحمان لە پراگ، پێش لە پێکهێنانی ژیانە هاوبەشـەکەیان پێی دابوو و سـەرەڕای ئەوەیکە عەبدولڕەحمان نادادپەروەریی دژ بە نەتەوەی کورد و بە تایبەت ژنانی ڕەت دەکردەوە و خەباتـی عەبدولڕەحمان ڕێـک لە ڕەوتی ئاڵوگۆڕ لـەو ڕوانگەگەلەدا بوو، بەڵام دیسانەوەش لێنا ترس هەڵیگرتبوو.

لـە پێوەندی لەگەڵ پرسـیاری خەزووریدا، لێنـا دەیزانی کە بابەتەکە جیددی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەڵگری ڕاستیگەلێک بوو و واتاکەی ئـەوە بوو: «تۆ کـوڕی منت بـردووە، منیش دەتوانم خوشـکی تۆ بۆ خۆم هەڵگرم!» و ئەم چەشـنە ژیانە هاوبەشـە لە زمانی کوردیدا «ژن بە ژنە»ی پێدەگوترێت. بەم چەشـنە کە دوو پیرە پیاو دەتوانن سـات وسـەودایەک لە شکڵی «شمەک لە بەرانبەر شمەک»دا ئەنجام بدەن و بە وتەیەکی دیکە: «کچێکی گەنج لە بەرانبەر کچێکی گەنجی دیکەدا».

چەشــنێکی دیکــەش لــە هاوســەرگیری هەیــە و ئەویش «ســیغە» (هاوسەرگیریی کاتی)یە. ئەم چەشنە هاوسەرگیرییە، کاتێک ڕوودەدات کــە پیاوەکە لە ســەفەر بێت و لە هاوســەرەکەی دوورکەوتبێتەوە. لەو حاڵەتــەدا، پیاو ژنێک هەڵدەبژێرێت و لەگــەڵ ئەو ژنە دەچێتە لای مەلا و هاوســەرگیرییەک بە شــێوەی «ســیغە» (کاتی) لە لایەن ئەو مەلاوە و بــۆ ماوەیەکــی دیاریکراو گرێ دەدرێت. ئەو ماوەیــە دەتوانێت پاش نیوەڕۆیەک، هەفتەیەک یان چەند مانگ بێت و ئەوەش لە ڕاستیدا چەشنێک لەشفرۆشییە کە لە لایەن ئیســلامەوە شەرعیەتی پێبەخشراوە. لەوێ، لە تەنشت حەوزی ناوەڕاست حەوشەکەدا و بە ئامادەبوونی ڕێژەیەکی زۆر لە ئەندامانی بنەماڵە، وســووق ئاغا بەو گاڵتەیە، ڕەزامەندیی خۆی لە هەڵبژاردەی کوڕەکەی دەردەبڕی و هەموو باش لە مانای قســەکانی ئەو تێدەگەیشــتن و ئەوە تەنیا لێنا بوو کە ئەو گاڵتەیە بە لایەوە جوان نەبوو.

زەڕی خانم زۆرجار دەهات بۆ ئەو ماڵە. لێنا دەیبینی کە هەڵترووشکاو، پاڵی بە دیواری تەنیشت چێشتخانەکەوە دەدا و بە دەنگی بەرز دەستی دەکرد بە قســە کردن و لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن. بۆ خەڵکی ئەو ماڵە، ئەو دیاردەیەک بوو کە پێویست نەبوو وەدەربنرێت. خەڵکی ئەو ماڵە بە نیسبەت ئەوەوە خەمسارد بوون. بەڵام هیچ کینەیەکیشیان لێی نەبوو و ئەگەر سنووری خۆی ببەزاندایە، تێیان دەگەیاند. ژنێکی سەرکەش بوو و خۆی لە قســە کردن و لێکدانەوە و شــرۆڤە کردن بێبەش نەدەکرد. بــەڵام هێندەشــی نەدەخایاند کــە بێدەنگ دەبوو و بــۆ ماوەیەکی زۆر متەقی لێوە نەدەهات. زەڕی خانم دەیزانی کە نابێ مێشێ بکاتە گامێش و زێدەڕۆیی بکات.

لێنــا و مینــای بچکۆلانە لە لایەن هەمــوو ئەندامانــی بنەماڵەوە زۆر ئاســایی وەرگیرابــوون، دەتگوت لە مێــژە پەیوەندییان بــەو بنەماڵەوە هەبــووە. لێنــا لەو بابەتەوە، بە قووڵی هەســتی بە ئەمەگداری دەکرد و هــەر ئەوەش یارمەتیی لێنای دابوو کە زۆر ســاناتر خۆی لەگەڵ خوو

و خدەکانــی بنەماڵــە و نەریتەکانی کۆمەڵگەدا بگونجێنێت. لە ڕاســتیدا شــتێک زیاتر لە ئەمەگداری بوو. هەم کیژۆڵەکەیان خۆش دەویســت و نازیان دەکێشــا و هــەم کوڕەمام و کچەمامــەکان، لێنایان بۆ گەڕان و پیاســە دەبردە ناوشــار. بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا، لێنا، بەختەوەریی ناوبنەماڵەی دەبینی. لێنا، هەرچەند ژنێکی پێگەیشــتوو بوو و ئیتر دایک بوو، بەلام لە ملکەچ بوون بۆ دایک و بابی مێردەکەی لاریی نەبوو. ئەو دەیزانی کە بۆ ئەوەی بە تەواویی و بە شــێوەیەکی ڕاستەقینە لە لایەن بنەماڵەی هاوســەرەکەیەوە وەربگیرێت، هێشتا زۆر شت هەیە کە دەبێ فێریــان بێت، هەربۆیەش، گوێڕایەلیی دەنواند، ئەو نەیدەویســت وەکوو ئۆرووپاییەک تووشــی هەڵەگەلێــک بێت کە ببێتە هــۆی بریندارکردنی هەســتی ڕۆژهەلاتییــەکان. هەربۆیــەش تەنانەت لەو کاتانــەدا کە هەوا گەرم بوو، گۆرەوی لە پێ دەکرد و قۆڵی تا ئانیشــک دادەپۆشــی (لەو کاتەدا داپۆشــینی باسک تا ئانیشــک بەس بوو، بەڵام پاش بەدەسەڵات گەیشــتنی خومەینی، دەبوو باســک هەتا مەچەکی دەســت داپۆشــراو بێت!). کاتێکیش دەیویســت لە ماڵ بچێتە دەرەوە، دەبوو هەمیشــە نانە خانم ئاگادار بکاتەوە.

لــەو خووگەلــەی کە لێنــا دەبوو فێــری ببێت و دەروونیــی بکانەوە، پەیوەندیی بە پێکەنینەوە هەبوو، ژنێکی هاوســەردار نەدەبوو بە دەنگی بــەرز پێبکەنێــت. ئــەو دەیتوانی پێبکەنێــت و ددانەکانیشــی دەربخات، بەڵام بــە هێمنی. کچەمامەکان و کچەخاڵەکان و کچەپوورەکان، خۆیان لــە پێکەنین بێبەش نەدەکــرد. بەڵام، ئەوان مێردیان نەبــوو. ئەگەر لێنا جارجارە لە بیری کردبایە، ئەگەر عەبدولڕەحمان لە تەنیشــتیەوە بوایە، بە توندی دەســتی دەگوشــی و ئەگەریش دوور بوایە، بە نیگایەک تێی دەگەیانــد. وردە وردە، وەکوو بابەتەکانــی دیکە، لێنا، ئەو بابەتەش فێر بوو. دیارە ئەو خووە دژی سروشــتی ئەو بوو و هەربۆیەش پێویستی بــە هەوڵێکی زۆر هەبوو لە لایەن لێناوە. بە شــێوەیەک کە دواجار ئەو پێکەنینی بە شێوەی پێشووی خۆی بە تەواوی لەیاد کرد.

هەنــدێ جار، شــتی ســەیر وســەمەرە ڕووی دەدا: ڕۆژێکیــان، لێنا لە حەوشــیماڵەکە تووشــی بوونەوەرێکی سەیر و ســەمەرە بوو کە تۆقاندی. قژەسەری، لێنای دەخستەوە بیری کۆمەڵە بزمارێکی ڕەش و تێکچڕژاو و درێژ و کورت. قەپۆزی لە کەروێشــک دەچوو و زاری پڕ لە کونی ڕەش بوو. یەکێک لە چاوەکانی خێل بوو و چاوەکەی دیکەشی بە پەڵەیەکی ســپی داپۆشــرابوو. هەموو دەموچاوی پڕ بوو لە شــوێن برینگەلێــک کە بەهۆی دمەڵی کیماوییەوە دروســت ببون و ئێرانییەکان پێیــان دەگــوت «زەردە برین» و لــەو وڵاتەدا بــە زۆری بەدی دەکرا. جگە لەوەش، ئەو پشــتی کووڕ بوو و لاقیشــی دەشەلی. لێنا، سەبارەت بەو بوونەوەرە پرســیاری لە هاوســەرەکەی کرد. عەبدولڕەحمان بۆی شــی کردەوە کە ئەوە قەرەواشــی دایکیەتی و هۆکاری هەڵبژاردنی لە لایەن دایکیەوە ئەوە بووە کە هاوســەرەکەی شــاکاری دڵداریی زۆری نواندووە و ئەم بوونەوەرە بەو ڕواڵەتە تۆقێنەرەوە جێی تەماح تێکردنی هاوسەرەکەی نەبوو.

عەلی خانی هێوەری کە پزیشک بوو، ڕۆژێکیان بۆ لێنای گێڕابووەوە کە بۆخۆی شــاهێدی هۆکاری ڕۆشتنی قەرەواشێکی ئەو ماڵە بووە کە کچێکی گەنج و دەلالیش بووە. نانە خانم، بۆ دوورکەوتنەوە لە گەرمای هاویــن، چووبوو بۆ یەکێــک لە گوندەکان (ئەو خاوەنــی چەندین گوند بوو) بەڵام وسووق ئاغای هاوسەری لە شار مابۆوە. ڕۆژێک وسووق داوای لە کوڕەکانی خۆی حســێن و عەلی کردبوو کە بۆ چارەســەری کێشەیەک بڕۆن بۆ شار.

«لــە نیوەی ڕێــگادا تێگەیین کە یەکێک لــە بەڵگەنامەکانمان نەهێناوە. حســێن داوای لێکردم بگەڕێمەوە و بەڵگەنامەکە بهێنم. کاتێک دەرکەی ماڵەکەم کردەوە و هەموو حەوشــەکەم دایە بەر نەزەر، بینیم کە باوکم (لــەو کاتەدا ئەو هەشــتا ســاڵ تەمەنی هەبــوو) لە ژێــر دارگوێزەکەدا وەستاوە ڕووی لە سەرەوە کردووە و بەدەم ڕاوەشاندنی گۆچانەکەیەوە بــە دەنگی بــەرز دەڵێت: «مەترســە! وەرە خوارەوە، ئــازارت نادەم!»

قەرەواشـــەکە پەنـــای بردبووە بـــەر لقێکی بەرزی دارەکـــە و بە دەنگی بەرز داوای لە ئاغا دەکرد وازی لێبێنێت».

لەبـــەر ئەوەی زۆریەک لە قەرەواشـــەکان گازندەیـــان لە ئاکاری ئاغا هەبوو، نانەخانم تەنیا ژنانی ناشیرینی بە قەرەواشی وەردەگرت.

خزمەتکارێکـــی پیاویش هەبوو بە ناوی مەمەد قولی (محەممەد قولی) کە هەر لە منداڵییەوە لە خزمەتی بنەماڵەدا بوو. لە کاتی گەیشتنی لێنادا، مەمەد قولی ئیدی پیر ببوو. ئەو وەکوو ڕابردوو نەیدەتوانی کار بکات. بەڵام بەو حاڵەشەوە، بەقەدەر توانا یارمەتی بنەماڵەی دەدا و ئەندامانی بنەماڵەش قەدریان دەگرت و وەکوو ئەندامێکی بنەماڵە هەڵسـوکەوتیان لەگەڵ دەکرد و ئەوەش یەکێک لە باشـــییەکانی بنەماڵە فیئۆداڵەکان بوو کە ڕێزی بەساڵاچووانیان دەگرت و لە کاتی پیریدا ئاگایان لێیان دەبوو و چاوەدێرییان دەکردن.

مەمەد قولی نەخۆش کەوتبوو و کەســیش نەیدەزانی نەخۆشینەکەی چییـــە. نانـــە خانم دەیگوت کە زۆری بە تەمەنـــەوە نەماوە. مەمەد قولی لە حەوشـــی ماڵەکەدا و لە ماڵدا خۆی بۆ ئەملاوئەولا ڕاکێش دەکرد و دەیناڵاند. ئازارێکی زۆری دەکێشا. لێنا پرسیاری کرد کە بۆچی نایبەن بۆ لای دوکتور. وەڵامیان دایەوە کە: «مەمەد قولی خۆی نایەوێ». لێنا چـــوو بۆ لای مەمـــەد قولی بۆ ئەوەی لەو بارەوە قســـەی لەگەڵ بکات. مەمەد قولی دەستی ڕاوەشاند و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، تەنیا بە شێوەیەکی سەیر و سەمەرە سەیری لێنای کرد و ئیتر هیچ.

لێنا، بۆ چوونەدەرەوە لەو ماڵە بچووکە، ناچار بوو لە چەند پلیکانێک کە لەبەردەم ماڵەکەدا بوو داگەڕێتە خوارێ. سەرداوەکەش ڕێک کەوتبووە ژێر ئەم پلیکانانەوە. ڕۆژێکیان، لێنا دەنگی ناڵەناڵێکی لە نزیکەوە بیست. دەنگـــی ناڵەناڵی مەمـــەد قولی بوو. ئەو لەپێش دەرکەی ســـەرداوەکەدا دانیشتبوو و شەڵوارەکەی لە قولەپایەوە هەتا ئەژنۆی هەڵکردبوو و لە ئەژنۆیەوە بەرەوخوار، زەرووی گەورە گەورەی نابوو لە گۆشتی لاقی کە بە هۆی مژینی خوێنی زۆرەوە ڕەش هەڵگەڕابوون. ئەوە یەکەمجار

بــوو کە لێنا زەرووی «لە کاتــی مژیندا» دەبینی. لێنا تۆقیبوو. ڕواڵەتی پیرەپیاو، وەکوو کەسێک کە لەگیانەڵڵادا بێت، بۆر هەڵگەڕابوو.

لێنا هاواری کرد و گوتی: «ئەوە چی دەکەیت!»

پرەپیاو وەڵامی دایەوە: «بڕۆ، وازم لێ بێنە».

لێنــا بەرەو مــاڵ ڕایکرد بۆ ئەوەی داوای یارمەتــی بکات و پیرەپیاو ڕازی بــکات زەرووەکان لــە لاقی بکاتەوە. تەنیــا نانەخانم لە ماڵ بوو. ئەو باســکی لێنــای توند گرت و ناچاری کرد چوارمشــقی لەبەردەمیدا دانیشــێت، لێنا کە بەو شێوە دانیشتنە ڕانەهاتبوو، زۆر زوو هەستی بە ماندوویەتی و ئازار کرد.

نانە خانم کە بە ئاسووری و ئازەری دەدوا و تا ڕادەیەکیش کوردی دەزانــی، لەو کاتەدا، هیچ زمانێکی هاوبەشــی لەگەڵ لێنادا نەبوو. بەڵام ئەوان لە یەکتر تێدەگەیشــتن. هەم شی کردنەوەی ئەم بابەتە قورسە و هەم ئەوەیکە ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ، ئەو دووانە زیاتر لە یەکتر تێدەگەیشتن. نانــە خانــم کە لێنای لەبەردەم خۆیدا دانیشــاندبوو، گوتی: «تۆ خوو و خدەکانی ئێمە نازانی. مەمەد قولی دەزانێ چی دەکات، هەربۆیەش تکات لێدەکــەم وازی لێبێنە». نانە خانم ڕێک وەک مامۆســتایەک، بە هێمنی قســەی دەکرد. هەندێجار لێنا بە زمانی فارســی، قســەکاتی پێدەبڕی و داوای لێدەکرد تا مانای وشەیەک کە لێی تێنەگەییوە بۆی ڕوون بکاتەوە و خەســووی بە تاقەتەوە وتەکانی دووپــات دەکردەوە تا لێنا بەجوانی لێیان تێبگات.

جارجارەش، نانە خانم دەیگوت کە عەبدولڕەحمانی وەکوو بچووکترین کوڕی خۆی زۆر خۆشدەوێ. عەبدولڕەحمان بۆ درێژەدان بە خوێندن بۆ شوێنێکی دوور سەفەری کردبوو و نانە خانم هەمیشە لەبیری ئەودا بــوو. نانەخانــم دەیگوت کــە عەبدولڕەحمان تا تەمەنی پێنج ســاڵانیش دەهات بۆ لای و لە مەمکی دایکی شیری خواردووە.

نانەخانــم زۆر گەنــج بووە کە شــووی کردووە و ناچــار بووە ببێتە موسوڵمان و هاوکاتیش جەختی لە لێنا دەکردەوە کە تۆ نابێت بە خراپ

لــەو بابەتــە تێبگەیت، چونکوو بــۆ هەموومان تەنیا یــەک خودا بوونی هەیە، ئێســتا مەســیحی بیت یان موســوڵمان یان جوولەکە، جیاوازیی نییــە. نانەخانم بە شــێوەی نهێنی عەبدولڕەحمانــی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ کڵێســە، چونکوو دەیویســت کوڕەکەی لە هاوئایینەکانی دایکی واتە مەســیحییەکان تێبگات و قبووڵیان بــکات و عەبدولڕەحمان کە تەنانەت پاش پێگەیشــتن و گەورەبوونیشی هەمیشە ئەوەی لە یاد بوو، هەرگیز ئەو ڕازەی ئاشکرا نەکرد.

نانــە خانم، هەموو خۆشەویســتیی خۆی دابوو بە وســووقوددیوان، بەڵام خۆشەویســتیی وســووق بەوڕادەیە نەبوو. نانە خانم پەنجەکانی هەڵدەگلۆفــی و دەیگوت: « ئاخ...ئاخ، تۆ نازانی ئەم پیاوە چەند بە هۆی ژنانەوە ئازاری داوم».

لێنا پرسیاری کرد: «ژنی زۆری هەبووە؟»

نانە خانم، ناوی ٢٥ ژنی بۆ هەڵدابوو، بە زیاد کردنی هاوسەرگیرییە کاتییەکانەوە و ...هتد.

قورعــان مافی ئەوە بە موســوڵمانەکان دەدا کە هــاوکات چوار ژنی فەرمییــان هەبێت. وســووق ئاغا، دانــی بەوەدا دەنا کــە ٩ ژنی هێناوە (بەڵام جەختی لەوە دەکردەوە کە هەرگیز لە چوار ژنی فەرمی زیاتری نەبــووە). ئەو هــەرکام لە ژنەکانی لە گوندێک نیشــتەجێ دەکرد تا لەو ڕێگەوە، دوور لە یەکتر بژین.

ڕۆژێــک نانــە خانم بە لێنای گــوت: «ئێمە، هەردووکمــان لەم ماڵەدا غەریبیــن». بــەڵام لێنا لە واتای قســەکانی ئەو تێنەدەگەیــی. نانەخانم قۆڵ کراســی خۆی و لێنای هەڵکرد و بە پەنجەی شــایەتیمان ئاماژەی بە پێســتی قۆڵی هەردووکیان کرد و گوتی: «ســەیر بکە، منیش وەکوو تۆ سپیم و ئەگەر ڕەنگی دەست و دەموچاوم هەندێ تۆخترە، بە هۆی خۆرەتاوەوەیە».

بەڵام لێنا دیســانەوەش تێنەدەگەیشــت. دواجار، ئەو ژنە کراسەکەی هەڵدایەوە و زگە خڕ و ســپییەکەی خۆی نیشــانی لێنا دا. ئەوسا لێنا لە

واتای قســەکانی تێگەیشــت و ئەوەش ئەوە بوو کە ڕەنگی پێســتی ئەو دوانە وەکوو یەکە. پێدەچوو خەسووی نیگەرانی بووکەکەی بووبێت کە وەکوو خۆی لە شوێنێکی دوورەوە هاتبووە ئەو بنەماڵەیەوە.

لێنــا حەزی دەکرد خەســووی لە ئامێــز بگرێت، بەڵام لــەو ڕووەوە کە تووشــی ورووژان ببوو، دەســتی خەســووی ماچ کرد. لە ڕاستیدا، نانەخانم لێنای وەکوو بووکی خۆی قبووڵ کردبوو و بە بێ پەردەپۆش کردن، باســی ئــازار و چەرمەســەرییەکانی خــۆی بۆ دەکــرد. لێناش هــەر لە منداڵیەوە ئازاری بێدایکیی کێشــابوو. ئەو هەرگیز هەســتی بە کاریگەرییەکــی وەهــا ورووژێنەر نەکردبوو کە لەوکاتــەدا لە بەرانبەر نانەخانــمدا هەســتی پێکردبوو. ئەو کــە دایکی خۆی بــە کردەوەیەکی یەکجار توند و تیژ لەدەست دابوو، ئێستا لە ناخی نانە خانمدا، زڕدایکێکی دۆزیبووەوە کە ئەوی قبووڵ کردبوو.

ســەرەڕای ئــەوەش، لێنا دەیزانی کــە ئەوان بە زوویــی ناچار دەبن لێــک دابڕێــن. لێنا تێگەیشــتبوو کە دایکــی عەبدولڕەحمــان لە هەڕەتی گەنجیەتیدا شــووی بە پیاوێک کردبوو کە ســی ساڵ لە خۆی گەورەتر بــوو، ســەرەڕای نەخوێندەوارییەکەی، ژنێکی باش و تێگەیشــتوو بوو. ئەم ژنە، بە تێپەڕینی زەمەن فێر ببوو کە هاوســەرەکەی خۆش بوێت، هەرچەند کە هاوسەرەکەی زۆری ئازار دابوو و ئێستاش لە ماڵدا، تەنیا پێویستی بە کاری ئەو هەبوو.

کــوڕ و کچەکانــی ژیانی هاوســەرییان پێکهێنابــوو و وەدوای ژیانی خۆیــان کەوتبــوون. نانەخانم، بە تەنیا لە ناو کەســانێکدا مابووەوە کە تەنیا پێویســتیان بە کار و لەخۆبووردوویــی ئەو هەبوو و لە بەرانبەر کار و فیداکارییەکانــی نانەخانمدا هیــچ ئەمەگدارییەکیان دەرنەدەبڕی. نانەخانم لەو بێڕێزییە ئازاری دەکێشا. هەربۆیەش، بڕیاری دابوو چیدیکە خزمەت بە کەس نەکات. ئەوەش ببووە هۆی ئەوەی کە ئەوان خۆشیان نەوێــت. لەو کاتــەوە، زەمەنێکی زۆر تێپەڕیوە، بەڵام بۆ لێنا ئەســتەمە قســە وباســەکانی نێوان خۆی و خەســووی فەرامۆش بکات. ڕەنگە بە

هۆی ئەوەوە کە ئەندامانی بنەماڵە پاشـــملە زەمی نانە خانمیان دەکرد و لێناش دەیویســـت وێڕای داکۆکی کردن لە خەســـووی، پێیان بڵێت کە ئەو نانەخانمەی ئەو ناسیویەتی، کەسێکی دیکەیە و ئەو نانەخانمە نییە کە ئەوان باسی دەکەن.

وســـووقوددیوان لە تەمەنی نزیک بە سەتساڵیدا کۆچی دوایی کرد. پاش دوو ساڵیش نانەخانم کۆچی دوایی کرد (ئەو کاتە لێنا دە ساڵ بوو لەگــەڵ ئەوان دەژیا). نانەخانم کە نەخۆش بوو، ڕازی نەدەبوو دەرمان بکرێت. لە ڕاســـتیدا، ئەو چیدیکە نەیدەویست بژی. بنەماڵەی بە شکۆی وســـووقوددیوان، بۆ لێنا وەکوو جێگرەوەی بنەماڵەیەکی ڕاســـتەقینەی لێهاتبـــوو. لـــەم بنەماڵەیەدا، لێنا هەســـتی بە خۆشـــی و ئارامی دەکرد. ئـــەوەش، پێی ســـەلماندبوو کە مرۆڤ دەتوانێ لە هـــەر دۆخێکدا، بگاتە ئۆخژنی دەروونی، تەنانەت لە وڵاتێکی دواکەوتووی وەکوو ئێرانی ئەو سەردەمەدا. لێنا هەرگیز بەختەوەریی ئەو سەردەمە و ئەو ساڵانەی لە یاد نەکردووە.

بـــەڵام تەنانـــەت لە ڕەزاییـــەش، لێنـــا ڕووبەڕووی ســـاتە دژوارەکان بووەوە. لە بنەماڵەیەکی گەورە و بەربڵاودا، هەمیشـــە جیاوازیی بیروڕا و ناتەبایی بوونی هەیە. بۆ لێنا، بەشێک لە نەریتەکان جێی قبووڵ کردن نەبـــوون. بەڵام، ئـــەو ئاگایانە ڕەچاوی دەکردن. چونکـــوو، لە ڕوانگەی ئـــەوەوە گۆڕینـــی کوتوپڕی ئـــەو نەریتانەی کە بە تێپەڕینی ســـەدەکان لـــە کۆمەڵگەیەکـــدا جێگیر ببوون، کارێکی بێهوودە بوو. دیارە، شـــایانی وەبیرهێنانەوەیـــە کـــە خـــودی زەمـــەن، وردە وردە لـــە زەینـــی خەڵکدا گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی دروســـت دەکرد. ســـەرەڕای ئەوەش هەبوون کەســـانێک کـــە نارەزایەتییـــان دەردەبـــڕی و لـــە بەرانبـــەر نەریتەکاندا خۆڕاگرییان دەکرد.

بە تایبەتی، گەنجەکان سەردانی لێنایان دەکرد و سەبارەت بە ئورووپا، سۆســـیالیزم و کۆمۆنیزم پرســـیارگەلی جۆراوجۆریان لێدەکرد. ئەوان حەزیـــان دەکـــرد هەموو شـــتێک بزانن و لێنا بۆ ئـــەوان ڕۆڵی نوێنەری

«داهاتووە شـادی هێنەرەکانی» هەبوو، داهاتووگەلێک کە ئەم گەنجانە ئامادە بوون لە پێناوی وەدی هاتنیاندا خەبات بکەن.

لێنا لە وڵاتێکەوە هاتبوو کە لەوێ بە فەرمی، خەڵک سەرقاڵی بنیاتنانی سۆسـیالیزم و کۆمەڵگەی دێموکراتیک و دادپەروەر بوون. سـەرەڕای ئەوەش، لێنا هاوسـەری یەکێک لە خۆیان بـوو. هەربۆیەش، متمانەیان پێـی هەبـوو و لێنـاش هەروەهـا. لێنا لەگەڵیـان دەچوو بۆ شـار و لە کۆبوونەوەکانیانـدا بەشـداریی دەکرد. لێنا خەباتـی لەگەڵ گەنجەکانی ڕەزاییە دەست پێکرد.

لێنا ئێشـکی بۆ دەگرتن. لەو ڕووەوە کە ڕەنگی پێسـتی سـپی بوو، پۆلیـس گومانـی لێ نەدەکرد و پێیان وانەبـوو ئوورووپاییەک کە لەگەڵ گەنجی ناوچەکە سـەرقاڵی پیاسـەکردنە، کاری سیاسـی بکات. لێنا لە سووچێکی کۆڵانەکەوە ئێشکی دەگرت و لە ئەگەری هاتنی پۆلیسدا، بە دانی ئەو هێما و ئاماژانەی پێشتر دەست نیشانیان کردبوون، هاوڕێکانی خۆی کە سـەرقاڵی هەڵکەندنی دروشمی دژی ڕێژیمی پاشایەتی بوون ئـاگادار دەکـردەوە. لەو کاتەدا، چ لە ڕەزاییـە و چ لە تاران، دیوارەکان لـە کەرەسـتەی بیناسـازیی بۆش و ناپتـەو سـازدەکران و مرۆڤ بە سـانایی دەیتوانی دروشـمی لەسـەر هەڵکەنـێ. ئەم دروشـمانە، هەم ژیانەوەیەکـی دەکـرد بەبەر کۆڵانەکانـدا و هەم تـا ڕادەیەکیش مادده بوون بۆ خوێندنەوە.

■ بردنەسەری پشوو لە گەلی قاسملوو

لەگـەڵ گەڕانـەوەی عەبدولڕەحمـان، هەمـوو ئەندامانـی بنەماڵـە، هاوڕێکانیـان و هاوخەباتەکانیـان، بـە مەبەسـتی سـەردانی گەلـی قاسـملوو و گوندی قاسملوو، گالیسگەیان بەکرێ گرتبوو. گالیسکەکان ئاخنرابـوون. هەمـوو گەنـج بوون. لەوەیکـە پێکەوە بوون و لە شـار دەچوونە دەرەوە شـاد و سەربەسـت بوون. پاش گەیشتنیان بە گوند، عەبدولڕەحمان و بنەماڵە بچووکەکەی لەماڵی کوێخا و ئەوانی دیکەش

لە ماڵی گوندنشینەکان جێگر بوون. گوندەکە کەوتبووە سەرەولێژییەکی نەرمــەوە. خانــووەکان لــە هەمــان کەرەســتەی بۆش ســازکرابوون. کۆڵانــەکان باریــک و خاکی بوون. گوندێکی ئاســایی کــە نموونەیەک بوو لە گوندەکانی ئەوســای کوردســتان. شــینکایی زۆر کەم بوو و لە خــوارەوەی لێژاییەکە، لە نێوان بێشــەڵانە دڵڕفێنەکانــەوە، ڕووبارێکی بچــووک ســەری دەرکردبوو. ســەرەڕای ئەوەی نێوەڕاســتی وەرزی بەهار بوو، هەوا گەرم داهاتبوو. یەکەم بەیانی، کاتێک لینا لەخەو ڕابوو، ســەیری کــرد دەموچــاوی کچەکەی پڕ بــووە لە زیپکەی ســوور. لینا تۆقیبوو، پێی وابوو کچەکەی تووشی سووریژە بووە و لەو نزیکانەش دوکتوری لێ نەبوو. لینا هاوسەرەکەی هەستاند. عەبدولڕەحمان، کاتێک سەیری ژن و منداڵەکەی کرد، لە قاقای پێکەنینی دا، پاشان بە ژنەکەی گوت: «سەیری خۆت بکە لە ئاوێنەدا». لینا لەتە ئاوێنەیەکی بچووک و پەڵەداری هەڵگرت و سەیری ڕوخسار و شان وملی خۆی کرد و بینی کە خۆیشی هەر لەو زیپکە سوورانەی دەرداوە. زیپکەکان دەخوران. لە ڕاســتیدا، ئەو زیپکانە شــوێنی پێوەدانی مێشوولە بوون. لینا حەپەساو ئــاوڕی بــۆ لای مێردەکــەی دایــەوە و گوتــی: «هەرســێکمان لە ژێر کوللەبەندێکدا نووستووین، دەکرێت پێمان بڵێیت تۆ چیت کردووە وا بە تۆیانەوە نەداوە؟» پێکەنینی عەبدولڕەحمان هەمیشــە لینای دەخستەوە بیری دەنگی زەنگی ناقووســـە کۆنەکانی کەنیسە. دەنگی دەزرینگایەوە، شــادیهێن بــوو و دەیتەنییــەوە. دەنگی پیاوانە و لە هەمــان کاتدا نەرم و هێمــن و لەتیــف بــوو. کاتێک پێدەکەنــی، لینا هەموو شــتێکی لە یاد دەکرد، لە هەڵەکانی خۆش دەبوو و زویربوونەکانی کۆتاییان پێدەهات. عەبدولڕەحمان کە لە گێڕانەوەی چیرۆک و بەســەرهاتەکاندا دەستێکی باڵای هەبوو، دەستی کرد بە شرۆڤە کردن سەبارەت بە مێشوولەکان و گوتی: «وەک دەبینی، مێشوولەکان بە جوانی ڕێکخستنیان بۆ کراوە. پێش ئەنجامدانی هەر کردەوەیەک، پێشەنگێک بەڕێ دەکەن بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکــە. ئەم پێشــەنگە، پاش گەڕانەوە لــە مەئموورییەتەکەی، بە

وردبینییەکـی تەواوەوە نیشـان دەدات کە ئەو کەسـانە لـە خۆمانن و ئەوانـی دیکە، بێگانـە و بیانین. با هێرش بەرین و دەسـتێکی باش لەو بێگانانە بوەشێنین».

ئەم دوو بێگانەیە کەوتبوونە بەر هێرشی سوپایەک لە مێشوولەکانەوە، بە شـێوەیەک کە شوێنی ساخ بە جەستەیانەوە نەمابوو. بە چاو پۆشی لەو ڕووداوە ناخۆشـە، ئەوان کاتوسـاتێکی خۆشـیان دەبردەسـەر. نانیان دەخوارد، دەنووسـتن، قسەی خۆشـیان دەکرد، باسی جیددیان دەکرد، پیاسـەی ئەو دەوروبەرەیان دەکرد و لە ڕووبارەکەدا مەلەیان دەکـرد. کوڕەکان لـە نزیکیی بێشـەڵانەکەدا و کچـەکان و ژنەکانیش، نزیکەی دە میتر خوارووتر، لە لۆفەیەکی چەمەکەدا کە بە دار و درەخت داپۆشرابوو. بە ڕاستی پشوویەکی چێژبەخش بوو.

■ منداڵەکە و تریاک

ڕۆژێکیـان، ئـەوان سـەردانی گوندێکـی دیکەیـان کـرد. چونکـوو عەبدولڕەحمـان بەنیاز بوو سـەردانی هاوڕێیەکی سـەردەمی منداڵیی خۆی بکات. دیارە، هەر بەناو گوند بوو، دەنا لە ڕاستیدا، کوێرەدێیەکی پێکهاتوو لە سێ ماڵ بوو.

لینا کە دەر ودەشتی کوردستانی باش نەدەناسی، زۆرجاران، تووشی سەرسـوورمان دەبوو. ئەوان دەشـت و گردە وشـک و برینگەکانیان تێدەپەڕانـد، جگـە لە خـاک و خۆڵ هیـچ نەدەبینرا. ئاسـەوارێکیش لە سـەوزەڵانی و بـاخ و درەختیش نەبوو. لە پـڕ، دارتوویەکی بەرگرتوو وەک ئەوەی لە ئاسمانەوە بەربووبێتەوە، هاتەسەر ڕێیان. تووی ڕەش و شـیرین. هەموو بە پەلە دایان بەسـەریدا، ڕنییانەوە و دارەکەیان لەو بارە شیرین و قورسە سووک کرد. پاش نیوەڕۆ ڕووی لە کۆتایی نابوو. بێدەنگی زاڵ ببوو. تەنیا دەنگی میوانەکان دەهاتەبەرگوێ. مینا، بە شادی لە ئامێزێکەوە بۆ ئامێزێکی دیکە باڵی دەگرتەوە و هەموو شـاد بوون. گوندەکە بریتی بوو لە سـێ ماڵی بچووک، پەڕپووت، خەمبار و بێدار

و درەخت و شــینکایی. ســەرچاوەی ئاوەکەیان لە مەودایەکی دوور لە گوندەکەوە بوو. دەرکەی هەرســێ ماڵەکە ئاوەڵا بوو. هەرچۆنێک بێت، خۆ ئەگەر دزیشــی لێ کرابا، کابرای دز بە دەســتی بەتاڵ دەگەڕایەوە. چونکوو هیچی دەست نەدەکەوت لە گەڵ خۆی بیبات. خەڵکی گوندەکە هەموو چووبوون بۆ مەزراکانیان. لێرە، لە سەرەتای بەهارەوە تا کۆتایی پاییز، هەموو خەڵکەکە بە ژن و پیاوەوە، لە بەیانییەوە هەتا زەردەپەڕی ئێــوارە، بۆ کار دەچوونە مەزراکانیان کە زۆربەشــیان گەلێک دوور لە گوندەکە هەڵکەوتبوون. تەنانەت منداڵە پێڕەوکەکانیشیان لەگەڵ خۆیان دەبرد.

میوانەکان لە ماڵی هاوڕێکەی عەبدولڕەحمان وەژوور کەوتن، هەموو ماڵەکــە یەک ژوور بوو. ڕێک لە نێوەڕاســتی میچــی ماڵەکەدا، کونێکی گەورە زاری داپچڕیبوو. لە ڕێی ئەو کونەوە، لینا ســەیرێکی ئاســمانی کــرد و بیرەکانی بەرەو شــاری «کەنووەکانی» تــاران باڵیان گرتەوە. بەڵام ئەم ماڵە، بە بەراورد لەگەڵ ماڵەکانی ئەو شــارە، بەرینتر بوو. لە نزیکــەی ئەو کونەوە، دوو پەتــی درێژیان لە ئاڵوداری بنمیچەکە توند کردبوو و بە دوو جەمســەرەکەی دیکەی پەتەکانیشەوە، هەلۆرکێکیان هەڵبەســتبوو. هەلۆرکەکــە، منداڵێکــی بچووکی تێدا بــوو و بۆ ئەوەی نەجووڵێــت، بە شــریتێک لە هەلۆرکەکەدا شــەتەکیان دابــوو. منداڵەکە پارچە قوماشــێکی بەدەســتەوە بوو و دەیمژی، دەستی کرد بە ورینگە ورینگ. کاتێک لینا بە وردی سەرنجی دایە، بینی کە لە ژێر هەلۆرکەکە، ڕێک لە ژێر سمتی منداڵەکەدا، کونێکی خڕی تێکرابوو، لە ژێر کونەکەدا، لەسەر زەوییەکە تەشــتێکی گەورە دانرابوو. لینا، لە بێدەنگیی منداڵەکە کــە نیوە خەو ببــوو و بوونی میوانەکان هیچ کاریگەرییەکی لەســەری نەبوو، ســەری سووڕمابوو و هەربۆیەش پرسیاری لە دەوروبەرەکەی کرد : «بۆچی ئەو منداڵە ئەوەندە بێدەنگە؟» وەڵامیان دایەوە: «منداڵەکە دەبێــت هەتــا گەڕانەوەی دایکــی خۆڕاگر بێت. هەربۆیــەش لە نێو ئەو پارچــە کوتاڵەدا تریاکیان داناوە، بۆ ئــەوەی منداڵەکە بە مژینی خەوی

لێبکەوێت».

بیرکردنەوەی مرۆڤ بێسنوورە. بەڵام لێنا، لەوکاتەدا، پێش لە هەموو شتێک، بیری لە بێبەزەیی بوونی مرۆڤ دەکردەوە، لە زوڵم و ستەم بەرانبەر بە منداڵان و ئەوەیکە منداڵێکیان، ئاوا، بەبێ سەرپەرەشت بەڕەڵڵا کردووە، بۆ ئەوەی ئەگەر بەرگە بگرێت، بژیێ و ئەگەر نا با بمرێت، هەروەها ئەو ستەم و چەوسانەوەی بەرانبەر بە ژنان دەکرێت، ژن دەبوو چێشت لێبنێت، ماڵ خاوێن کاتەوە، جل و بەرگ و قاپ و قاچاخ بشوات، خزمەتی باوکی منداڵان بکات و پاشان منداڵەکەی بکاتە باوەش و بیخەوێنێت، شەوانەش چەندجار هەستێت و شیر بە منداڵەکەی بدات. پاشان هاوسەرەکەشی سواری سەری دەبێت و نوتفەیەکی دیکەش لە ڕەحمیدا دەگوورێ. بەیانیی زووش دەبێ لەخەو هەستێ، نانی بەیانی بە مێردەکەی بدات و دواتر، خواردنی ڕۆژانەیان ئامادەبکات و دواجار، منداڵەکەی بە برە تریاکێکی ڕۆژانەوە لە هەلۆرکەکەیدا بەجێبهێڵێت. ئەم ژنە هێشتا تەمەنی نەگەیشتۆتە سی ساڵ، ڕەنگ و ڕووی پیرەژنێکی لێ دەنیشێت ودواتریش ژنێکی گەنجتر شوێنی دەگرێتەوە.

لێنا: «مینا گیان! سەیرکە! لە هەلۆرکەکەدا منداڵێکی تێدایە».

مینا پێدەکەنی. منداڵێکی هار و هاژ بوو، بە بێ هیچ گرفتێک لەباری خۆراکەوە، بە پەنجە ئاماژەی بۆ منداڵی ناو هەلۆرکەکە دەکرد کە بە زەبری تریاک خەواندبوویان.

لێنا هەستی بە شەرمەزاریی و گوناە دەکرد. جیاوازیی نێوان ئەو دوو منداڵە، ئەرز و ئاسمان بوو. ئەو منداڵەی لە هەلۆرکەکەدا نوستبوو، لە منداڵێک دەچوو لە گیانەڵڵادا بێ. ئەو لە ڕاستیدا حەوت مانگان بوو و مینا تەنیا چەند مانگێک لەو گەورەتر بوو..

لێنا گوتی: «ئەم منداڵە دەمرێت». عەبدولڕەحمانیش کە سەیری منداڵەکەی دەکرد، وەڵامی نەدایەوە. بە ڕوونی دیار بوو کە عەبدولڕەحمانیش ڕێک بیری لە هەمان شت دەکردەوە. هەربۆیە وەڵامێکی نەبوو بە لێنای بداتەوە.

پاش چوار ساڵ، جارێکی دیکەش، عەبدولڕەحمان بۆ بینینی هاوڕێکەی، سەردانی ئەو گوندەی کرد. پاش گەڕانەوەی، بە لینای گوت: «ئەو منداڵەی ئەو کاتە بینیمان، ئێستا کچێکی تەندرووست و شادمانە! من بە چاوی خۆم بینیم کە قاپێک برنج و شلەی بە خێرایی برووسکە هەڵمەقوت کرد».

سەبارەت بە کوردەکان، زۆرجار دەگوترێت، ئەوانەی لە کێوەکان دەژین جەستەیەکی پتەویان هەیە. بەڵام، لینا بە چاوی خۆی کۆرپەگەلێکی زۆری دەبینی کە لە کاتی لەدایک بوونیاندا لاواز بوون، بەرگەی نەخۆشینیان نەدەگرت و دەمردن. ئەوەش ڕاستییەکە، کە تەنیا ئەوانە دەژیان کە پتەو بوون و لە باری جەستەییەوە بەخۆوە بوون. هەربۆیەش، لیناش گەیشتە ئەو دەرئەنجامە کە ئەو کیژۆڵەیەش، لە تۆرەمەی هەمان کێونشینە پتەو و بەهێزانەیە.

لینا، بەهۆی بینینی دۆخی ئەو منداڵە کە دەبوو بە درێژایی ڕۆژ بە تەنیا بمێنێتەوە و هەروەها بینینی چارەنووسی ژنی کورد، نەیدەتوانی سەردانەکەی بۆ ئەو کوێرەدێیە فەرامۆش بکات. بینینی ئەو دۆخە وەها لە بیرگەی لینادا نەخشی بەستبوو کە لەو کاتانەدا کە ڕووبەڕووی گرفتێک دەبووەوە و دەیویست ناڕەزایەتی دەرببڕێت، وەکوو یاریدەدەرێک، توانا و ئیلهامی لەو بیرەوەرییانە وەردەگرت.

■ چیرۆکی ڕووبەڕوو بوون لەگەڵ مار

گەنجەکان لە گەڕان و پیاسە کردن لە مێرگێکدا کە ڕووبارێک پێیدا تێدەپەڕی دەگەڕانەوە. خۆرەتاو بە دوا تیشکەکانیەوە ڕووی لە ئاوابوون نابوو. تەمەد و لینا، سەرقاڵی قسەکردن بوون و لەوانی دیکە دواکەوتبوون. ئاوازەکانی سرووشت، جوانییەکانی، سەرەتاتکەی تیشکی خۆر لە نێوان لق و پۆپی دارەکانەوە بۆسەر گەڵا زەردە کەسکباوەکان و هەروەها ئۆخژنی شنەی بەهاری، لینایان سەرمەست کردبوو و هەستی بە تەناهییەکی تاهەتایی دەکرد.

لەپڕ، تەمەد قۆڵی لینای توند گوشـی. ڕواڵەتی تەمەد کە تا ئەو ســاتە گەش بوو، وەها گۆڕدرابوو کە لینا، سەرەتا ویستی پێبکەنێت، بەڵام بە بینینی ڕوخساری تۆقیوی هاوڕێکەی، پێشی خۆی گرت. لە یەک میتریی ئەودا، مارێک قیت لەسەر کلکی چەقیبوو. کەللەی مارەکە لە مەڕمەڕێکی کەندەکاری کراوی جوان دەچوو، باڵای بەقەدەر لینا دەبوو. هەڵبەت لینا لــە تەمەد باڵابەرزتر بوو. هەردووک ژن، بەچاوی ئەبڵەقەوە، ســەیری جووڵەی زبان و فیکەی مارەکەیان دەکرد. مارێکی ئەستوور و تۆقێنەر و گەورە بوو.

تــا ئەو کاتە، لینا تەنیا جارێک و ئەویش مارێکی ئەفعیی بینیبوو. لەو ســاڵەدا، لە پۆلی خوێندن، مامۆســتاکان وانەیەکیان بۆ مارشێوەکان و ئێســقاندارە پوولەکەدارەکان تەرخان کردبــوو. لینا فێر ببوو کە تا ئەو کاتە، لە دنیادا، زیاتر لە هەزار چەشــن لەو گیانلەبەرانە دۆزراونەتەوە و ئەوەش فێر ببوو لە بووهم (چێک) تەنیا شەش چەشن لەوانە بوونی هەیە و مەترسیدارترینیشــیان ئەفعییە. بەڵام، لینا سەبارەت بەو مارەی سەرەڕێی لێ گرتبوون هیچ زانیارییەکی نەبوو. بە پێی ئەو زانیارییانەی لە قوتابخانە فێری ببوو، پێدەچوو مارەکە ژەهراوی نەبێت. بەڵام، ئەوە تەنیا بیرۆکەیەک بوو، کوا دەکرا متمانە بەو بیرۆکەیە بکرێت؟

بە دڵنیابیەوە، هەم مارەکە و هەم ئەو دوو ژنە لە یەکتر دەترسان. لینا دەســتی تەمەدی گوشی بۆ ئەوەی تێی بگەیەنێت کە ئەوان بۆ هەمیشە ناتوانن وەکوو بەرد لەو شــوێنە بچەقــن. دژکردەوەی هاوڕێکەی جێی تێگەیشتن بوو و ئەویش ئەوە بوو کە: ئەو مارەکە دەناسێت. دواجار، لینا ســەرنجی‌دا خەتێکی ڕەشی ئاڵۆز لەسەر کلکی مارەکە بوو. نە ژنەکان دەجووڵان و نە مارەکە. مارەکە لە سەگێک دەچوو چاوەڕوانی جووڵەی دوژمنەکەیەتــی بۆ ئەوەی هێرش بکاتە ســەری. کات و ســات چەند و چۆن تێپەڕیبوو، دیار نەبوو. بەڵام کاتژمێری سروشتیی جەستەی لینا، باسی لە تێپەڕینی زەمەنێکی زۆری دەکرد. هاوڕێکانیان، ماوەیەک بوو لــە مێرگەکە چووبوونەدەرەوە و پــاش تێپەڕاندنی هەورازەکە، بەرەوە

گوندەکـە بایاندابـووەوە و تەنیـا، لێرەدابوو کە هەسـتیان بە نەبوونی ئـەو دوو ژنە کردبـوو. عەبدولڕەحمان گەڕابووەوە و بەدوای ژنەکاندا دەگـەڕا. لە دوورەوە ئەوانی بینیبـوو و ئاماژەی بۆ کردبوون کە خێرا کـەن. بـەڵام کاتێک بینیبووی لە شـوێنی خۆیان ناجووڵێن پێی سـەیر ببـوو و بەرەولای ئەوان چووبوو. لێنا کە لەوکاتەدا، چاوەکانی وەکوو چـاوی پڵینگێک تیژ ببوون، لە دوورەوە گۆڕینی هێڵەکانی ڕوخسـاری هاوسـەرەکەی دەبینی. ڕواڵەتی ئەو سـەرەتا تووڕە و دواتر حەپەساو بوو، بە بینینی مارەکە ڕێنیشت. پاشان بەردێکی گەورەی لە زەویەکە هەڵگرت و بە ئاسپایی و بە وردی لێیان هاتە پێش.

لەوکاتەدا، لێنا دۆخێکی هەسـتیاری هەبوو. بیری لەوە دەکردەوە کە: «لـەو مەرگە قوتاری نابێت». چوونکوو بـاوەڕی نەدەکرد مارێک بەو گەورەییـە بە بەردێک بکوژرێت. ئەژنۆکانـی دەلەرزین. دۆخی مارەکە گۆڕدرابوو. بە شـێوەیەکی باوەڕپێنەکراو خـۆی قیت کردبووەوە و لە ئاژەڵێکی دڕندە دەچوو لە دۆخی هێرش کردندا بێت. عەبدولڕەحمانیش بـە بەردەکەوە دەسـتی هەڵێنابۆوە و وادیار بـوو هەوڵدەدات مەودای نێوان خۆی و مارەکە هەڵسەنگێنێت. ڕێک لەوکاتەدا کە لێنا لە ترسی ئەو مەترسییە گەورەیەی هەڕەشـەی لێدەکرد، دەیویست چاوی بنووقێنێ، عەبدولڕەحمـان بەردەکەی گرتە مارەکە. بەردەکە بەر سـەری مارەکە کەوت و دەسبەجێ کوشتی.

مـارە تۆپیوەکـە لەبەر پێیانـدا کەوتبـوو، مارێکی جـوان، گەورە و ئەسـتوور. مەترسـی ڕەویبـووەوە، بەڵام ئـەو دوو ژنە هێشـتاش لە ناخەوە هەڵدەلەرزین.

عەبدولڕەحمـان، سـەرەتا سـەیرێکی مارەکـەی کـرد و دواجـار لە قاقای پێکەنینی‌دا. ژنەکانیش دەسـتیان کرد بـە پێکەنین، بەڵام هاوکات کوڵەگڕوویان لە ئەوکیدا مابوو. ڕەنگ و ڕووی تەمەد سـوور و لێناش زەرد هەڵگەڕابوو.

لێنا کە هێشتا شڵەژاو بوو، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە بە هاوسەرەکەی

گـوت: «بیرت لـەوە نەکردبووەوە کـە ئەگەر مارەکـەت نەپێکایە، چی ڕوویدەدا؟» عەبدولڕەحمـان وەڵامـی دایـەوە: «ئەگـەر بەردەکـەم نەهاویشتبا، ئەزانی ئێستا لە کوێ بووی؟»

پاشـان عەبدولڕەحمان بۆ هاوسـەرە خۆشەویسـتەکەی کە سەگ و پشـیلەکانی خۆشدەویسـت و هەسـتی بۆ جوانیی مارەکە ورووژابوو، ڕوونـی کـردەوە کـە هەنـدێ پـەروەردەی تایبـەت بە کـوڕان لە ناو کوردانда هەیە و گوتی: «لە کوردستان هاوکات لەگەڵ پێڕەوکە بوونی کـوڕان، فێریـان دەکەن چلـۆن بەرد بهاوێژن و بە تایبەتی سـیلە لە چ شـوێنێکی ئاژەڵەکان بگرن. ئەگەر مەبەسـت تەنیـا بێهۆش کردن بێت، شـوێنی سـیلە و شـێوازی هاویشـتنەکە جیاوازە. پاش بێهۆش کردن، بـە زەربەیەکـی بچووک ئاژەڵەکە هۆشـی وەبەر دێتـەوە. وردە وردە کـوڕان لـە بەردهاوێژییدا کارامـە دەبن و دەتوانن لـە بەرانبەر ئاژەڵە مەترسیدارەکان، وەک مار و دووپشک بەرگری لەخۆیان بکەن و یان بە مەبەسـتی ڕاوی ئەو گیانلەبەرانەی گۆشتیان بۆ خواردن دەبێت، وەک کەروێشک و ماسیی چەم، کەڵکی لێوەربگرن. گوتیشی: «بۆ ڕاهێنان و کارامە بوونی خۆم ڕێژەیەکی زۆر سـەگ و پشـیلە و مار و شتی وام کوشتووە. ئێستا تێدەگەی کە بۆچی هێند متمانەم بە خۆم هەبوو؟»

لێنـا کەوتبووە گێژاوی خەیـاڵات و مێردەکەی دەهێنایە پێش چاو کە سـەگ و پشـیلان دەکوژێ. ئەو دیمەنە بە خەیاڵیش ئازاری دەدا. بەڵام هاوسـەرەکەی هێز و چاونەترسیی لەخۆی نیشـان دابوو و ئەوانی لە مەرگێکی چاوەڕوانکراو ڕزگار کردبوو، هەربۆیەش شایسـتەی سپاس و ئەمەگـداری بـوو. ئـەو مارەی لەسـەر زەوییەکـە گینگڵـی دەدا، لە مەترسـیدارترین مارەکانی ئەو ناوچە بوو و پێوەدانەکەی هاوسـەنگی مـەرگ بوو. پاش ئەو ڕووداوە، سـۆزی لێنا بە نیسـبەت ئاژەڵەکانەوە ڕووی لە کزی ناو و ئاسایی بووەوە.

■ هەڵە زمانییەکان

لەم کاتەدا، هێشتا لینا بە باشی زمانی فارسی فێر نەبووبوو. بەڵام بە باشــی لێی تێدەگەیشــت و ورەی ئەوەی هەبوو کە بە یارمەتی ژێست، جووڵەی دەســت و پــێ و تەنانەت دەنگەکان و هەنــدێ جاریش کەڵک وەرگرتن لە زمانی ئینگلیســی قسەی خۆی بکات، هەڵسوکەوتێک کە تا ڕادەیەکی زۆر ورەبەرزی پێوە دیاربوو، بەڵام هەمیشەش سەرکەوتوو نەبــوو. لینا، بۆ ئەوەی هەرچی زووتر زمانە فارســییەکەی پاراو کات، هەوڵــی دەدا بــە وردی گوێ لــە هەموو قسەوباســەکانی دەوروبەری بگرێــت. جگــە لــەوەش، عەبدولڕەحمانیش بەو بیرۆکــەوە کە ئەوان لە ناوچــە فارس نشــینەکان یان لە تــاران دەژین، داوای لــە لینا کردبوو کە ئەو زمانە فێر ببێت. هەربۆیەش، لە ماڵەوەش بە فارســی قســەیان دەکرد.

مینای چکۆلانە هەمیشە لە گەڵ دایک و بابی بوو. عەبدولڕەحمان یاری لەگەڵ دەکرد و هەندێ جاریش بە مەبەستی پێشگرتن بە هاروهاژییەکانی، پێی دەگوت «ســەگ باب»، «سەگبابۆکە»، «بێشەرەف» و لەو جۆرە وشــەگەلە. بەکارهێنانی ئەو وشــانە لە لایەن عەبدولڕەحمانەوە، لینای بــە هەڵەدا بردبوو و وایدەزانی ئەو وشــانە، کۆمەڵە وشــەیەکن کە بۆ دەربڕینی خۆشەویســتی یان ئەوپەڕەکەی وشەگەلێکی سەرزنشکارانە بەڵام تێکەڵ بە سۆز و خۆشەویستیین. ئەو نەیدەزانی ئەو وشانە ڕەنگە مانای دیکەشیان هەبێ.

لە گوندی قاسملوو، گەنجەکان بە هەرشتێک کە لەبەردەستیان‌دا بوو، خۆیــان ســەرقاڵ دەکرد. هەندێ جــار، کاتی خۆیان بــە یاریی وەرەق (پاســوور ـ کۆنکەن و...) دەبردەســەر. لینا کە ئەو یارییانەی نەدەزانی، دەرفەتەکانی بۆ فێربوون دەقۆستەوە. ئەوان بە شێوەی بازنەیی لەسەر فــەرش دادەنیشــتن و یارییان دەکرد. شــەوێکیان، یەکێک لە نەوەکانی بنەماڵــە بــە نێوی حەســەن، کاڵ وکرچ و ١٣ ســاڵە، لە تەنشــت لیناوە دانیشــت. نەریــت و باوەکانــی ئــەم ناوچانەش بۆ هەمــووان ڕوونە و

ئەویش ئەوەیە کە: ژنان بە پیر و گەنجەوە، ناچارن بە بێ ئەملاوئەولا ڕێز لە پیاوان بگرن، جا ئەو پیاوانە لەهەر تەمەنێکدا بن هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ. حەســەن کە لە تەنشت لینێاوە دانیشــتبوو، دەیویست زیرەکی بکات و بەدزییەوە سەیری وەرەقەکانی دەستی لینێا بکات. بۆ لینێا گرینگ نەبوو کە حەسەنی بچکۆلانە دەیویست قۆپی بکات، چونکوو ئەو وەکوو یاری و کات بەســەربردن سەیری بابەتەکەی دەکرد. لینێا هەندێ خۆی دوور خســتەوە و وەرەقەکانی خۆی لەچاوی حەســەن دزییەوە. بەڵام لەو ڕووەوە کە حەســەن لە قۆپی کردنەکەی بەردەوام بوو و ئەوەش ببووە هــۆی ڕابواردنی هاوبارییەکانی دیکەش کە لە لایەنی بەرانبەری لینێــادا بوون، لینێا بە کەڵک وەرگرتن لەو وشــانەی کــە عەبدولڕەحمان بۆ سەرزەنشــت کردنی مێهرەبانانەی مینا بــەکاری دەهێنان، ڕووی لە حەسەن کرد و گوتی: «ئەی بێشەرەف!»

بە بیســتنی ئەم وشــەیە، بێدەنگییەک بەســەر ژوورەکەدا زاڵ بوو و هەموو ســەیری لینێا و حەســەنیان دەکرد. حەسەن سوور هەڵگەڕابوو. لینێاش حەپەســا بوو. دیاربوو کە لینێا ســووکایەتی بەو گەنجە کردبوو، بــەڵام نەیدەزانــی چ ســووکایەتییەکی کــردووە. لینێا بــە چاوێکی پڕ لە ســکاڵاوە ئاوڕی لە هاوســەرەکەی دایەوە و چاوەڕوانی یارمەتیی ئەو بــوو. بەڵام هاوســەرەکەی متەقی لێوە نەهات و تەنیــا پاش ماوەیەک، ڕووی لە هەمووان کرد و ڕایگەیاند کە لینێا واتای ئەو وشەیەی بەکاری هێنــاوە نازانــێ. هــەر ئەوە و هیچی دیکــە. بۆ یەکەمین جــار لە ژیانی هاوبەشــیاندا، لینێا حەزی دەکرد دەســت بنێتە بینەقاقای هاوسەرەکەی، چونکــوو ئــەو لینێای لە بەردەم هەمووواندا بە ســووکی و حەپەســاوی هێشــتبووەوە. لەوکاتەدا لینێا دەیویســت ڕابکات، بــەڵام کچانی بنەماڵە فریــای کەوتــن و لە قاقای پێکەنینیان‌دا. لە ڕاســتیدا ئەوان لەوەیکە لینێا بەوشــێوەیە لەبەرانبەر پیاوەکاندا وەســتابووەوە خۆشحاڵ بوون. ئەو هەڵوێســتەی کە خۆیان بە خەویــش نەیاندەتوانی بینوێنــن. دواجار لە نێو پیاوەکانیشــدا چەند کەسێکیان شەرمنانە دەستیان کرد بە پێکەنین.

بەڵام عەبدولڕەحمان وەک بەردی مەڕمەڕ لە شوێنی خۆی بە بێدەنگی مابـووەوە. ئەو شـەوە تـازە جێی خۆی نەگرتـەوە و هەموو بڵاوەیان لێکـرد. پاش ئەوەی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، عەبدولڕەحمان سـەبارەت بە بێدەنگییەکـەی هیچی نەگوت و تەنیا ماناکانی سـەگباب و سـەگبابۆکە و بێشـەرەفی بـۆ لینـا ڕوون کـردەوە و ئەوەیکە ئەگەر بـە پیاوێک بڵێی بێشـەرەف زۆری لەسـەر دەکەوێ و سـووکایەتییەکی گەورەت پێکـردووە. پاش چەنـد ڕۆژ هەموو ئەو ڕووداوەیـان لەبیر کردبوو و پشووش کۆتایی پێهاتبوو. هەربۆیەش باروبنەیان پێچایەوە و گەڕانەوە بۆ ڕەزاییە.

پـاش ئەو هەڵـە زمانییە، لینا لەکاتی قسـە کردن لەگـەڵ پیاوەکاندا، ژیرانەتـر دەجووڵایەوە و لەگەڵ ژنەکان هەسـتی بە ڕەهاییەکی زیاتر دەکرد. چونکوو ژنەکان لە پیاوەکان نیانتر و سینگ فراوانتر بوون.

پاش گەڕانەوە بۆ تاران و دەسـتپێکردنەوەی ژیانی نهێنی، لینا چیدی هەرگیز هاوقسـەی ژنان نەبوو، بەڵکوو زیاتر پیاوان دەوریان گرتبوو. هەندێ جار لە دڵناسکیی و هەژموونیخوازیی ڕەگەزی نێر تووڕەدەبوو و بە بێ سڵەمینەوە، ڕێک و ڕاشکاوانە بۆچوونەکانی خۆی پێدەگوتن.

ئەوان دەبوو چ چاوەڕوانییەکیان سەبارەت بە فێر بوونی زمانەکەیان لـە کەسـێک هەبێت کە ناچار بـە ژیانی نهێنی کرابوو؟ لە کەسـێک کە دەرەتانـی هیچ پرسـیارێکی ئـازاردەری لەوان نەبوو، بـۆ گونجاندنی دروسـتی خـۆی، یـان ئـەو کارەی بـە نیازە بیـکات، دەبـوو چی لێ چاوەڕوان بکەن؟ سـەرەڕای ئەوەش کێ دەبوو هەڵەکانی ئەو ڕاسـت کاتـەوە، هەڵەگەلێـک کـە دەکـرا هەڵچوونێکی وەهای لـە ناخی خۆیدا حەشار دابێت؟

لە ژیاندا، خراپ تێگەیشـتن لە زمانێک، دەتوانێ ببێتە کەمایەسییەکی جیددی و تەنانەت لە دۆخێکی وەهادا مەترسیداریش بێت. کەمایەسی و خراپ تێگەیشتن لە زمانێک، دەتوانێت تەنانەت مرۆڤ بەرەو بەرتەسک بوون لە بیرکردنەوە و بۆچووندا بەرێت.

بە هەموو ئەمانەشەوە، دوو پیاو هەبوون کە زیاتر لە هەموو کەسێک لــە لێنا تێدەگەیشــتن و لێناش گونجانێکی زیاتــری لەگەڵ ئەوان هەبوو کە ئەو دووانەش بۆیتی بوون لە: ئیســماعیل و سدیق کە هەردووکیان کۆچی دواییان کردووە.

■ دووگیان بوونی دووبارەی لێنا

چــوار مانگ بــوو لێنا دووگیان بوو و دڵی بــەو دووگیانییەی گەلێک خــۆش بوو. پــاش گەڕانەوەیان لە گوندی قاســملوو، لێنا بۆ دڵنیایی لە تەندرووســتیی خۆی و منداڵەکەی، دەیویســت ســەردانی دوکتورێکی ژنــان بــکات. دوکتور «ژێرمــەن» کە پزیشــکێکی بەناوبانــگ بوو، بە عەبدولڕەحمانی ڕاگەیاند کە پێویســتە لێنا منداڵەکەی لەبارخۆی بەرێت و لە ئەگەری لەبارنەبردنی ئەو منداڵەدا، مەترسیی گیانیی لەسەردەبێت. لەباربردنی منداڵەکە ٣٥ خولەکی خایاند و ئەویش بە لێدانی دەرزییەکی مۆرفین و کەرەســتەگەلێکی کۆنی تایبەت بە چەند دەیە لەوەپێش. لێنا، پاش هەشــت ڕۆژ، لەســەر چرپای خەوەکەی لەماڵەوە چاوی کردەوە و بینی دوکتورەکەی بەســەریدا چەماوەتــەوە و پێی دەڵێ: « هیچ نییە تەنیا چەند تەقەڵێکم لێداوە!» لێنا پرســیاری کــرد: «عەبدولڕەحمان لە کوێیە؟»

نانەخانم، ئاخێکی هەڵکێشــا و وەڵامــی دایەوە: «هەر ئەو ڕۆژەی کە تۆی بردبووە لای دوکتور، ڕۆشــت». لێنا دووبارە پرســیاری کردەوە: «کەی دەگەڕێتەوە؟» کەس نەیدەزانی.

لێنــا پەلەی بوو زوو بکەوێتەوە ســەرپێ، کچە بچکۆلەکەی تووشــی ســکچوون ببوو. لەو هەشــت ڕۆژەدا کــە لێنا لەنێوان مــان و نەماندا، شــەڕی مانەوەی دەکرد، لە ماڵەوە ئابوگۆشــتیان بە منداڵە تەمەن یەک ساڵانەکەی دابوو، ئەویش بە گۆشت و باینجان و نۆکەوە.

عەبدولڕەحــان لەوێ نەبوو و لێناش پارەی نەبوو. منداڵەکەش لەگەڵ سکچوونەکەی خوێنی دادەنا.

نانەخانم پێشـنیاری کرد: «ماسـت و برینجی بدەینێ». بەڵام هیچی لە دۆخی منداڵەکە نەگۆڕی. لێنا سـوور بوو لەسـەر ئەوەی منداڵەکەی بەرێتـە لای پزیشـک. بـەڵام کەس گوێـی نەدەدایـە. لێنا، شـەوانە بۆ دەستەوەسـتانیی خۆی دەگریا. پاشـان، لە ئان و ساتێکدا، بڕیارەکەی خۆی بۆ ڕەچاوکردنی داب و نەریتەکان نایە ژێرپێ.

لە ئێران بە کەسانی لاسار دەڵێن: هەردوو پێی دە کەوشێک کردووە و ئـەوە، هەمـان کار بوو کە لێنا کـردی. ئەو پێی چەقاند کە ئیللا دەبێ دوکتورێک کچەکەی ببینێت. بۆ دڵنیایی لەوەی خەسـووی لە قسەکانی تێـدەگات، لێنـا داوای لـە ئیسـماعیلی ئامـۆزای عەبدولڕەحمـان کرد قسـەکانی بۆ خەسـووی بکاتە کوردی. لێنا دەرپێکەی مینای داکێشا و سمتە سوورهەڵگەڕاوەکەی منداڵەکەی نیشانی خەسووی دا.

دژکـردەوەی خەسـووی، هەناسـەی لێنای قەتیس کرد. خەسـووی چەپکێکی ئەسـتوور لە پرچە درێژەکەی خۆی گرت بە دەستیەوە و بە دەسـتەکەی دیکەی ئاماژەی بۆ لێنا کرد کە بیبڕێتەوە و پاشـان گوتی: «تۆ دەبێ ئەو پرچە بسـووتێنی و خۆڵەمێشـەکەی بخەیتە سەر سمتی منداڵەکـە بۆ ئەوەی سـاڕێژ بێتـەوە». لێنا لە تووڕەییـدا گێنگڵی دەدا. لە دەستەوەسـتانیی خۆی دایـە پڕمەی گریان و ڕووی لە ئیسـماعیل کـرد و گوتـی: «پێی بڵێ من ئەوە دەکەم. بەڵام من هێشـتا لەگەڵ داب و دەسـتووری ئێوە ڕانەهاتووم و لـەوەش تێناگەم و دواجار دەمەوێ منداڵەکەم بەرمە لای دوکتور». لە کاتی گوتنی ئەو قسانەدا، دەنگی لێنا دەلەرزی، فرمێسکەکانی لووزەویان بەستبوو و دڵەکوتەی گرتبوو. لەم بێنەوبەرەیەدا، دەنگێک هاتەبەرگوێ کە گوتی: «لێرە چی ڕووی داوە؟» ئەو دەنگە هێمن و نیانە، دەنگی وسووقوددیوان بوو.

لێنا ڕووی لە ئیسماعیل کرد و داوای لێکرد: «پێی بڵێ! بڵێ! من ئەمەوێ کچەکـەم بەرمە لای دوکتـور». لێنا لە بیری کردبوو کە خەزووری، لە هەموو قسەکانی ئەو تێدەگات.

خـەزووری ڕووی لـە لێنا کرد و گوتی: «داوا دەکەی ئەو چی بە من

بڵێت؟ بۆچی ئەتەوێ بچیتە لای دوکتور؟»
ئەوانی دیکە دۆخەکەیان بۆ ڕوون کردەوە.
دواتـر وسـووقوددیوان گوتی: « بڕۆ بۆ لای دوکتور، پێویسـتت بە پارە نییە. بە دوکتور بڵێ پارەکەی لە سەر من بنووسێ».
لێنـا تێنەگەیی، تـا لەوەی دوکتورێک وەکوو بەقاڵـەکان بە قەرز کار دەکات، سەری سوڕبمێنێت. ئەو بە بیستنی دوا ڕستەی خەزووری، بە پەلە لەگەڵ ئیسماعیل بەڕێ کەوتبوو.
دوکتورەکـە لەوەی منداڵەکەیان وا درەنـگ بردۆتە لای، دەمەبۆڵەی دەهات. پاشان داودەرمانی بۆ منداڵەکە نووسی. بە خواردنی دەرمانەکان، مینا چاک بووەوە. لە ماڵەوە، لەوەیکە لێنا بۆ نەخۆشییەکی وا سادە، کە زۆربەی منداڵەکان تووشـی دەبن و هەر بۆخۆشـیان چا دەبنەوە، بەو ڕادەیە تۆقیوە گاڵتەیان پێدەکرد.
لێناش وەڵامی دەدایەوە: «باشە! باشە!»

■ ترێ وەکوو دەرمان

لەبارچوونی منداڵ و گرفتە تایبەتییەکاتی، ببوونە هۆی لاوازیی زۆری لێنا. ئەو گەلێک لاواز ببوو و ڕەنگ و ڕووی هەڵبزرکا بوو. ڕۆژێکیان، لێنا و تەمەد و ئیسماعیل فایتوونێکیان (گالیسکە) بە کرێ گرت بۆ ئەوەی بچـن بۆ یەکێک لـە گوندەکانی نانەخانم. ئیسـماعیل و تەمەد یەکتریان خۆشدەویسـت و بیریان لە ژیانی هاوبەش دەکردەوە. هەربۆیەش بەو پـەڕی حـەزەوە هاوڕێیەتی لێنایـان دەکرد و لەو سـۆنگەیەوە لە ژێر چاوەدێریی دایک و بابەکانیان ڕزگاریان دەبوو.
ئاقـاری گوندی «خزرئاوا»، پڕ بوو لە باخـە ڕەز کە ڕەزی هەرکام لەو باخانە چەشنێک ترێی پێوە دەهات. لە کوردستان، ترێ بە دەرمانی هەمـوو دەردێک دەزانـن. لەو ڕووەوە کە لێنا زۆری حەز لە ترێ بوو، هەربۆیەش لەو شێوە چارەسەرییەی بۆ ئەویان ڕەچاو کردبوو گەلێک ڕازی بوو. بەڵام ئاگای لەوەی بڕیاڕ بوو بەسەری بێت نەبوو.

ژنــی کوێخای ئاواییان ڕاســپاردبوو بە تەندرووســتی لێنــا ڕابگات. ئــەو ژنێکی دلۆڤان و بە بەزەیی و لــە هەمانکاتدا، زۆر بەزاکوون بوو. بــۆ ئــەوەی خــەوی ئەوانی دیکە تێک نــەدات بە هێواشــی و بە گوتنی «پســت» لێنای لە خەو هەڵدەســتان و بە ژێســتێکەوە فرمانی پێدەکرد کاســەیەک ترێــی تازە کە هەمــان بەیانی لە باخە ڕەزەکــە چنیبوویان، بخوات. بۆخۆشــی لە تەنشــتیەوە دادەنیشــت و چاوەدێریی دەکرد لێنا هەموو ترێکان بخوات. دواتر عاشــقە شــەیداکانی لەخەو هەڵدەستان و هەموو پێکەوە کاتژمێر ٦ی بەیانی دەچوون بۆ ناو ڕەزەکان. شەونمی بەیانــی لــە هێشــووە ترێکان نیشــتبوو و بەم چەشــنە بوو کــە لێنا لە باخە ڕەزەکانی نانەخانم، دار هەنجیرەکانیشــی دۆزییەوە. لێنا هەنجیرە تازەکانــی لێدەکردەوە و دەیخواردن. بن ددان کەوتن و شــکانی ناوکە وردەکانــی هەنجیــرەکان، بۆخۆی چێژێکی تایبەتی بە لێنا دەبەخشــی. پاشان، ئەوان بۆ خواردنی بەرچایی دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە.

بەرچاییەکی تێر و تەســەل، بریتی لە: چا، نانــی تازە، پەنیر، مرەبای خۆماڵــی و هێلکــەی دەڵەمە و کاســەیەک پڕ لە ترێ کــە لێنا دەبوو تا دوا دەنکــی ترێکان بخوات. مل بــادان و خۆدزینەوەش لە ئارادا نەبوو، چونکوو هەموو لێنایان خســتبووە ژێــر چاوەدێرییەوە. پاش بەرچایی، ڕوویان لە گەڕان و پیاســەی دەوروبەری گوندەکە دەکرد. لە ڕەزەکان کە وەدەر دەکەوتی، سرووشــتی ئەو ناوە زۆریش بە پیت و بەرەکەت نەبوو. دەشتێکی وشک و جاروبارەش لێرە و لەوێ تاقەدارێک بەرچاو دەکەوت. کاتژمێر یازدەی بەیانی، خۆرەتاو سووتێنەر بوو و خاکی ژێر پێی لێنا وەک مەڵهەمێکی گەرمی لێدەهات. پاش گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوە، لێنا دەبوو کاســەیەکی دیکەش تــرێ بخوات و دیارە لەژێر چاوەدێریی چاوەدێرە بەزاکوونەکاندا.

پاش نانی نیوەڕۆ، کاسەیەک ترێ
پاش خواردنی ئێوارە، کاسەیەک ترێ
پاش نانی شەو، کاسەیەک ترێ

لە کاتی نوستندا، کاسەیەک ترێ و
پاش کاتژمێر پێنجی بەیانی ڕۆژی دواتر، ئەو ڕەوتە دووپات دەبووەوە.

پاش سێ ڕۆژ، لینا وەڕەس ببوو. هەربۆیەش، ڕاسپاردەی چاوەدێری، بڕی ترێکانی کەم کردەوە، بەڵام ژەمەکان لە جێی خۆیاندا مابوونەوە. ئەو خولە دەرمانییە، ماوەی دە ڕۆژی خایاند. لینای گەنج، کاتێک گەڕایەوە بۆ شار، قەڵەو ببوو و تەندرووستیشی زۆر باشتر ببوو.

■ پێویستیی بەجێهێشتنی ڕەزاییە

عەبدولڕەحمان بۆ جێبەجێکردنی کاروباری حیزبی سەفەری کردبوو و کەسیش نەیدەزانی کەی دەگەڕێتەوە و هەموو بەو دۆخە ڕاهاتبوون. ڕۆژێکیان لینا کۆبوونەوەی لەگەڵ شۆڕشگێڕە گەنجەکاندا هەبوو، هەواڵێکیان بۆ هێنا کە ژیانی لینای گۆڕی. لیناش وەکوو هەمووان، چوارمشقی لەسەر زەوییەکە دانیشتبوو و هەوڵی دەدا لەوەی دەگوترا تێبگات. هەندێ جاریش، کەسێک کورتکراوەی باسەکەی بۆ وەردەگێڕایەوە. لە پڕ ڕاسپاردەیەک، بە هانکە هانک هاتە ژوورەوە و بەدەنگی بەرز گوتی کەسێک دەیهەوێ لەگەڵ لینا قسە بکات. کاتێک لینا وەدەر کەوت، بینی پیاوێک خۆی لە یەکێک لە حوجرەکانی حەسارەکەدا شاردۆتەوە و چاوەڕێیەتی. ئەو پیاوە بە بینینی لینا، گوتی: «تۆ دەبێ خێرا عەبدولڕەحمان بدۆزییەوە. ئەو نابێ بگەڕێتەوە بۆ ناوشار. پۆلیس بەدوایدا دەگەڕێ و چاوەڕوانی گەڕانەوەیەتی لە تەورێز». پاشان دەسبەجێ بزر بوو.

لینا دەیتوانی بۆ دۆزینەوەی عەبدولڕەحمان، یارمەتی لە ئەحمەدی براگەورەی عەبدولڕەحمان وەربگرێت. بەڵام، بە بێ پارە، بە بێ شارەزاییەکی تەواو لە زمانی فارسی و ڕواڵەتێکی بیانییەوە، ئەو چلۆن دەیتوانی لە شار بچێتە دەرەوە، چونکوو پێش لە هەموو شتێک هەموو یەکتریان دەناسی، دواتریش ژاندارمەکان، هات و چۆی پاسە

نه‌فه‌رهه‌ڵگره‌کانیـــان ـ کـه‌ لـه‌و کاته‌دا تاکه‌ که‌ره‌ســـته‌ی گواســـتنه‌وه‌ی موســـافیره‌کان بوون ـ کۆنترۆڵ ده‌کرد. سێهه‌میش، ئامۆژگاری کرابوو که‌ له‌و باره‌وه‌ هیچ به‌ دایک و بابی عه‌بدولڕه‌حمان نه‌ڵێت.

هه‌ربۆیـــه‌ش، لێنـــا به‌ بیرێکـــی ئاڵـــۆزه‌وه‌ گه‌ڕایه‌وه‌ و بڕیـــاڕی دا که‌ بابه‌ته‌کـــه‌ ته‌نیـــا لای ئـــه‌و ئه‌ندامانـــه‌ی بنه‌ماڵه‌ باس بکات کـــه‌ له‌ ڕیزی شۆڕشـــگێڕه‌کاندا بوون. یه‌که‌مین که‌ســـه‌کان که‌ ئاگادار کرانه‌وه‌ بریتی بوون له‌ سێ که‌س له‌ ئامۆزاکان، به‌ نێوه‌کانی ئه‌بوو، ئیسماعیل و ته‌مه‌د. چونکـــوو به‌ بێ یارمه‌تیی ئه‌وان، لێنـــا هیچی پێنه‌ده‌کرا. به‌ڵام به‌داخه‌وه‌ ئه‌وانیـــش وه‌کـــوو لێنـــا، نه‌ پاره‌یان هه‌بـــوو و نه‌ زانیاریی پێویســـت بۆ جێبه‌جێ کردنی کارێکی ئه‌وتۆ.

دواجـــار، لێنـــا ڕووی لـــه‌ ئامۆزاکان کـــرد و گوتی: تاقه‌ که‌ســـێک که‌ ده‌توانێـــت فریـــای عه‌بدولڕه‌حمان بکه‌وێـــت، وســـووقوددیوانه‌. چونکه‌ ئه‌و هه‌موو کاربه‌ده‌ســـته‌کانی ئه‌و ناوچه‌یه‌ ده‌ناســـێ، پاره‌شـــی هه‌یه‌ و عه‌بدولڕه‌حمانیش کوڕیه‌تی. ئێوه‌ ده‌ڵێن چی؟ ئامۆزاکان به‌ دوودڵییه‌وه‌ سه‌یری لێنایان کرد.

لێنا گوتی: «ئێوه‌ ڕێگه‌چاره‌یه‌کی دیکه‌تان پێ شک دێت؟ ژیانی ڕه‌حمان له‌ مه‌ترسیدایه‌. من ده‌بێ بچمه‌ ته‌وریز و ناتوانم لێره‌ بمێنمه‌وه‌».

ئامـــۆزاکان وه‌ شـــوێن جێبه‌جێکردنـــی پـــاره‌و ناونیشـــانی ئه‌حمه‌د که‌وتـــن. لێناش بـــه‌ په‌له‌ گه‌ڕایه‌وه‌ بـــۆ ماڵه‌وه‌. نانه‌خانم له‌ حه‌ســـاره‌که‌ چاوه‌ڕێی ده‌کرد. ئه‌و حه‌زی نه‌ده‌کرد لێنا به‌ ته‌نێ له‌ ماڵ بچێته‌ ده‌ره‌وه‌ و هه‌ربۆیه‌ش به‌ ده‌نگی به‌رز پرســـیاری لێکـــرد: «له‌کوێ بووی؟» لێنا وه‌ڵامـــی دایـــه‌وه‌: « له‌گه‌ڵ ته‌مه‌د و ئه‌بوودا بووم». دیاره‌ لێنا ڕاســـتی ده‌گـــوت، به‌ بێ ئه‌وه‌ی باســـێکی له‌ کۆبوونه‌وه‌کـــه‌ کردبێت. له‌و کاته‌دا، ئامۆزاکانیش گه‌یشتنه‌ به‌ره‌وه‌. نانه‌خانم به‌ بینینی ئه‌وان هێور بووه‌وه‌. پاشان لێنا ڕووی له‌ خه‌سووی کرد و پرسیاری کرد: «بابه‌ئاغا (باپیره‌) له‌کوێیه‌؟»

نانه‌خانم گوتی: «چ ئیشت به‌وه‌؟»

لێنا: «دەمەوێ داوایەکی لێ بکەم».

نانەخانـم: «چ داواکارییەکـت لێی هەیە؟» دیـارە بینینی بابەئاغا بەو ساناییەش نەبوو.

لێنا: «دواتر خۆی بۆت باس دەکات».

سەرەڕای ئەوەی بە ڕوونی دیار بوو وەڵامەکەی لێنا بەدڵی نانەخانم نەبـوو، بـەڵام گوتی: بابەئاغا هەر ئێسـتا نانی نیـوەڕۆی خوارد و بۆ نوێژی نیوەڕۆ چووەتە ژوورەکەی خۆی.

وسـووقوددیوان، پیاوێکـی تـەواو ئیمانـدار بـوو. بـەڵام هەرگیـز باوەڕەکانی خۆی بەسەر منداڵەکانیدا نەسەپاند. لەم سەردەمەدا هیچکام لـە کوڕەکانی وەک خـۆی باوەڕدار نەبـوون. عەبدولڕەحمان لائیکێکی تەواو بوو. ئەحمـەد ئاغایش وەکوو عەبدولڕەحمان بوو. عەلی خانیش گاڵتـەی بە بـاوەڕە ئایینییەکان دەکرد. لێنا هەرگیـز نەیتوانی تێبگات کە ئایا ئەو بەڕاسـتی باوەڕی بە دین نییە، یان ئەوەیکە بە شـێوازی خۆی باوەڕمەنـدە. بە ڕواڵەت لـە مرۆڤێکی باوەڕدار دەچـوو، بەڵام هەندێ گاڵتەشـی دەکرد کـە لێنای دەخسـتەوە بیری مامێکی خـۆی بە نێوی فرانتس frantz کە پیاوێکی ئانارشیست بوو.

زیبـای ئامۆزایـان، خاتوونێکـی زۆر باوەڕمەنـد بـوو و عەلی خان هەمیشـە بە گاڵتە، سەری دەخستە سـەری. ڕۆژێک، پرسیاری لە زیبا کـرد کە ئایا بەڕاسـتی خودا توانای ئەنجامدانـی هەموو کارێکی هەیە. زیباش ڕاشکاوانە وەڵامی دایەوە کە بەڵێ، خودا توانای هەموو کارێکی هەیە. پاشـان، عەلی خان گوتـی: «کەواتە، ئـەو دەتوانێت بەردێکی وا بخولقێنێت کە بۆخۆیشی بۆی هەڵنەگیرێت».

زیبا گوتی: « بەڵێ، دەتوانێت».

ئەوسا، عەلی خان گوتی: «چۆن زیبا! تۆ نەتگوت خودا توانای هەموو کارێکی هەیە، ئەی چۆنە ناتوانێ ئەو بەردە هەڵگرێت؟»

عەلـی خان لە قاقـای پێکەنینی دەدا و زیبای تـووڕەش، پێی دەگوت تۆ کافری.

بەڵام سـەبارەت بە حسـێن ئاغا کە گەورەترین کوڕی وسووق ئاغا بـوو، دەبێ بڵێـم تەنیا ئەو کاتەی کـە لە سـۆنگەی عەبدولڕەحمانەوە کەوتبووە زیندانەوە و لە چاڵەڕەشەکانی ڕێژیمی خومەینیدا بوو، ڕێسا ئاینییەکانی جێبەجێ دەکرد و قورعانی دەخوێند (شایانی وەبیرهێنانەوەیە، پۆلیسـی ڕێژیمی ئیسـلامیی ئێران لەو کاتەدا بەدوای عەبدولڕەحماندا دەگەڕا، چونکوو ئەو سـکرتێری گشتی حیزبێکی نایاسایی، واتە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوو).

حسێن و عەلی، براکانی دوکتور قاسملوو، هیچیان نوێژیان نەدەکرد. ڕەنگە ئەوان بە شێوەیەکی دیکە لە دینەکەیان تێگەیشتبێتن.

لەوکاتانـەدا کـە وسـووقوددیوان نوێژی دەکرد، هیچ شـتێک و هیچ کەس نەدەبوو لێی تێک بدات. لەکاتێکدا کە ئامۆزاکان سەرقاڵی خواردنی نانـی نیوەڕۆ بوون، لینا کە ئیشـتیای نانخواردنی نەمابوو، لە تەنشـت ژووری خەزووریەوە دانیشت. لینا بە هۆی ئەو مەترسییەی هەڕەشەی لـە عەبدولڕەحمان دەکرد، ئاگای لە خـۆی نەمابوو. ئەو کە لە منداڵیدا، لەگەڵ دەستەوەسـتانی دەستەویەخە ببوو، نەیدەویست لەم تەمەنەشدا تەسلیمی بێت.

لینـا ناچار بوو تا کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆ، واتە تا کۆتایی نوێژ و دوعاکانـی خـەزووری چاوەڕوان بێت. کاتێک خـەزووری درگاکەی کردەوە و لینای هیوابڕاوی لەبەردەم درگاکەدا بینی کە بەهۆی دانیشتنی زۆرەوە لاقەکانـی تەزیبوون، گوتی: « گوێ بگرە، هەتا من مابم، ناچی بـۆ هیچ کوێ و کەسـیش ورەی ئـەوەی نییە کوڕی من دەستبەسـەر بکات.» ئەو باوەڕی بە قسـەکانی خۆی هەبوو و بە دڵنیاییەوە قسەی دەکرد. بەڵام لینا دەیزانی سەردەمی دەسترۆیشتوویی ئەو لە ناوچەکەدا بەسەر چووە. هەرچەند کە هێشتاش خەڵک ڕێزیان لێدەگرت، بە تایبەت ئەوانەی کە ئەویان لە لووتەکەی دەسـەڵاتداری و دەسترۆیشـتووییدا بینیبـوو. کـەس، تەنانەت کاربەدەسـتانی ناوچەکـەش، ورەی دژایەتی و ڕووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ ئەویـان نەبـوو. بەڵام، لـەم کاتەدا ئەو

دەسەڵاتەکەی جارانی نەمابوو.

لێنا ورەی دایەبەر خۆی و داوای لێکرد بە زووترین کات، بۆ وەرگرتنی زانیاریی پێویست سەردانی کاربەدەستەکان بکات، چونکە ئەگەر فرمانەکە لە ناوەندەوە هاتبا، پۆلیسی ناوچە نەیدەتوانی جێبەجێی نەکات. خەزووری کە سکاڵا خنکاوەکانی لێنای نەدەبینی، بە تووڕەییەوە سەیری کرد. لێنا پێشی بە خەزووری گرتبوو بۆ ئەوەی هەرچی لەدڵیدا بوو، پێی بڵێت. بەڵام ئەو لێنای لادا و لەکاتی چوونەدەرەوەدا بە بۆڵەبۆڵ و تووڕەییەوە ئەمری پێکرد: «تۆ لە ماڵ ناچیتە دەرەوە!»

لێنا هەموو هیوای بڕابوو. ئەمر دەرچووبوو، ئەمری پیرەپیاوێک بوو کە سووکایەتی پێکرابوو، بووکەکەی ڕێی لێگرتبوو، ڕێی بەخۆی دابوو ئامۆژگاریی بکات، لەوەش زیاتر، دەسەڵات و کاریگەریی ئەوەی بەرەوڕووی پرسیار کردبووەوە و دواجار، بەقووڵی غرووری ئەوی بریندار کردبوو.

لێنا کە مابۆوە خۆی و ترسەکەی، بەدوای ڕێگەچارەیەکدا دەگەڕا و ئەوەیکە دەبێ چی بکات؟ پرسیاری لەخۆی دەکرد و دواجار بڕیاریدا: «دەست لەسەردەست دانانیێم و ناهێڵم عەبدولڕەحمان دەستبەسەر بکەن. داوام لێدەکەن لە ماڵەوە دانیشم! ئیتر چی!» بەڵام لاقەکانی تەزیبوون و بەدوایدا نەدەهاتن. جووڵەی لێ بڕابوو. هێزی خستەسەری، وردە وردە هەنگاوی هەڵدەگرت و چووە نێو ماڵەکەی خۆی، چەمەدانێکی بچووکی هەڵگرت و ئەوەندەی بۆی هەڵدەگیرا، شتومەکی سەفەری کۆکردەوە. هەرچەند خۆیشی نەیدەزانی دەبێ چی بکات، بەڵام بڕیاری ڕۆشتنی دابوو.

لەم کاتەدا ئامۆزاکان، ڕێک وەک ئەو یارمەتیدەرانەی لە ساتە قەیراناوییەکاندا دەبنە هۆی بێ هیوایی، گەیشتن و بە بینینی چەمەدانەکە، یەکسەر پرسیاریان کرد: «توانیت بابەئاغا ڕازی بکەیت؟»

لێنا وەڵامی دایەوە: «نەخێر نەمتوانی».

هەموو شڵەژاو و دڵنیگەران، تووشی شۆک و دڵەڕاوکێ ببوون،

پێیان گوت: «تۆ ناتوانی لەدژی ئیرادەی بابەئاغا هیچ بکەیت و ناتوانی بڕۆیت! جگە لەوەش، پارەشــت پێ نییە و پۆلیسیش دەستگیرت دەکات و بە کورتی سەرئەنجامێکی باشت نابێت».

لێناش دەیزانی ئەوان ڕاســت دەکــەن و تەنیا موعجیزەیەک دەیتوانی گیانی عەبدولڕەحمان ڕزگار بکات و ئەو موعجیزەیەش ڕوویدا!

شــەو داهاتبــوو، لێنا دانیشــتبوو، کچەکەی لەســەر ئەژنــۆی بوو و چەمەدانەکەشی لە تەنشــتییەوە، چاوەڕوانی ڕۆشتن بوو. بێدەنگییەکی تــەژی لــە بێهیوایــی باڵی بەســەر هەمــوو لایەکدا کێشــا بــوو. لەپڕ، وسووقوددیوان، خۆی کرد بە ماڵەکەیاندا. ئەمە یەکەمجار بوو کاری وا بکات. وا باو بوو کە باوکی بنەماڵە سەردانی بنەماڵەی نەدەکرد، بەڵکوو هەمــوو بنەماڵەکە دەچوونە خزمەتی ئەو. لێنــا بە تەواوی لەو کردەوە نائاســاییەی وســووق ئاغا و گرینگیی ئەو سەردانە تێدەگەیی. وسووق ڕووی لــە بووکەکەی کرد و پێی گوت: «ئێســتا بڕۆ بنوو. بەیانی زوو دەبێ وەڕێ بکەوی». نە وشــەیەک زیاتر و نە کەمتر. پاشان پاکەتێکی دایە دەســت لێنا و «شەوشاد»ی لێکرد و ڕۆشت. لە پاکەتەکەدا، بڕێک پارە و بلیتێکی پاسی تێدا بوو.

بەری بەیان، لێنا ساز ببوو. مەمەدقولی چارشێوێکی هێنا و بە لێنای گوت: «چارشــێوەکە دەدەی بە ســەرتدا و بە دەســت لە بن چەنەگەت توند دەیگریت و هەرگیز بەری نادەیت!»

مەمەدقولی، مینای کردە باوەش و بە دەستەکەی دیکەی چەمەدانەکەی هەڵگرت و ئاماژەی بە لێنا کرد دوای کەوێت. لێنا ڕووی لە مەمەدقولی کرد و گوتی: «دەبێ ماڵئاوایی لە نانەخانم بکەم!» مەمەدقولی بەئاماژە ئەمری پێکرد پێدەنگ بێت و بەم شێوەیە لێنا، ماڵی باوکی عەبدولڕەحمانی جێهێشت و ئیتر هەرگیز نەیبینییەوە.

لــەم کاتــەی بەیانییدا، کۆڵانەکان چــۆڵ بوون. ڕۆژ تــازە هەڵدەهات و ســێبەری دەخســت. شۆفێری پاســەکە، پاڵی بە پاســەکەوە دابوو و چاوەڕوانی دەکردن. هەموو کورسییەکان جگە لە کورسیی پشتەسەری

شۆفیرەکە گیرابوونەوە. مەمەدقولی چرپاندی بە گوێی لێنادا: «بابووش لە تەورێز، لە نزیکەی دیواری پشت وێستگەی پاسەکان چاوەڕوانی تۆ دەکات». لێنا ئەویشی هەرگیز نەبینییەوە.

لێنا لەوەیکە وسووقوددیوان وەکوو شۆڕشگێڕێکی کارامە، سەفەری ئەو بۆ تەورێزی ڕێکخستبوو، حەپەسابوو. لێنا هەرگیز تێنەگەیی خەزووری، چۆن بە شەوێک هەموو ئەو کارانەی ڕێکخستبوو. بەڵام، لەخۆڕا نەبووە کە سەردەمانێک خەزووری ڕاوێژکاری شازادەی جێنشین بووە؟

■ تەورێز

لێنا هەرگیز وەکوو گەشتیار سەفەری بۆ ناوەندی ئازەربایجان نەکردبوو. نە سروشتە جوانەکەی دەناسی و نە جوانییەکانی بیناسازییەکەی کە هەموو باسیان دەکرد و بەسەریاندا هەڵدەدا و هەرگیزیش نەیتوانی بیناسێت. تەورێز شارێکی کۆنە بە مێژوویەکی سێ هەزارساڵەوە کە چەندین جار بوومەلەرزە لێی داوە. هەروەها ئەو شارە، پێتەختی کۆمارە تەمەن کورتەکەی ئازەربایجان بووە لە ساڵی ١٩٤٦دا. لێنا دوو جار و ئەویش بە نهێنی چووە تەورێز و ئەمە یەکەم جاری بوو. لێنا ئاگای لە مەترسییەکە هەبوو ـ لە ڕاستیدا ئەمە یەکەمین مەترسییەک بوو کە لەگەڵی بەرەوڕوو دەبووەوە ـ بە ڕەچاوکردنی ڕێنماییەکانی مەمەدقولی، بە وردی ئاگای لێ بوو چارشێوەکەی نەکرێتەوە و نەخزێتە خوارەوە. دەستەکانی تەزیبوون و مێرووڵەیان دەکرد، لە بن چارشێوەکەوە، مینای لە ئامێز گرتبوو، مینا منداڵێکی هێمن و دلۆڤان بوو، نە دەگریا و نە بێتاقەتیشی دەکرد. بەڵام لەگەڵ خایاندنی سەفەرەکەیان، لێنا هەستی دەکرد مینا قورستر دەبوو، کاتێک گەیشتە تەورێز، هەم لە باری جەستەییەوە و هەم لە باری دەروونییەوە کوترا بوو و هەرەسی هێنابوو. چونکوو هەم نیگەرانی عەبدولڕەحمان بوو و هەم لەوە دەترسا موسافیرەکان کۆنترۆڵ بکرێن

و دەرکەوێت کە ئەو هیچ پێناسێکی پێ نییە، زمانی فارسیش نازانێت و سەرەڕای ئەوەش، بیانییشە...

بەڵام، سەبارەت بە بەڵگەنامە و پێناسەکان، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لە ماڵی خەزووری بڕیار درابوو هەموو بەڵگەنامە پەیوەندیدارەکان بە عەبدولڕەحمان و لێنا، بریتی لە ناسنامە، پاسپۆرت، بڕوانامەی خوێندن و تەناتەت کتێبەکانیان، دەبوو لە ماڵی باوکی عەبدولڕەحمان ڕابگیرێن، چونکوو هیچ شتێک نەدەبوو شوناسی ڕاستەقینەی ئەوان ئاشکرا بکات.

ڕۆژێکیان وسووقوددیوانیان ئاگادار کردبووەوە کە پۆلیس بە نیازە ماڵەکەی بپشکنێت. هەموو بەڵگەنامەکان، بریتی لە بەڵگەنامە پێناسەکان و بڕوانامەکانیان لە عەمباری ژێرخانی ماڵەکەیان شاردبووەوە. ئەم پشکنینە هەم وسووقوددیوانی تووشی شۆکێکی گەورە کرد و هەم دەرخەری ئەو ڕاستییە بوو کە سەردەمەکە گۆڕدراوە.

دیارە شوناسی لێنا وەکوو ژنێک، دەکرا لە ڕێی بنەماڵە یان مێردەکەیەوە پشتڕاست بکرێتەوە، بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو کە بەدوای مێردەکەیەوە بوون و هەربۆیەش، لێنا نەیدەتوانی ناوی ببات و بنەماڵەش لە ڕەزاییە بوون. لێنا ببووە کەسێکی بێ شوناس و دەبوو لەوەبەدوا، بە بێ شوناسی بژی. بە پێی ڕێککەوتنی پێشوو، عەبدولڕەحمان چاوەڕێی بوو. چاویلکەیەکی دژەخۆری کردبووە چاوی و ڕوخساری لە پشت ڕۆژنامەیەکی «ئیتلاعات»ی کراوەدا شاردبووەوە. لێنا منداڵەکەی نایە سەر زەوی و بە هێمنی بۆ پێشەوە پاڵی پێوە نا و گوتی: «سەیر کە، بابە لەوێیە، بڕۆ ماچی بکە». مینا کە لە ڕاستیدا نەک ڕۆشتن، بەڵکوو لەتری دەدا، لەو بەرەوپێش چوونەدا، هەندێ جار بە قوونەوە دەکەوت و هەندێ جاریش بە سەر دەستی خۆیدا بەردەبووەوە، بەڵام لە خۆشییاندا دەیقیژاند. عەبدولڕەحمان مینای لە ئامێز گرت و ڕووی کردە لێنا و گوتی: «بە دوامدا وەرە. سەرەتا دەچین بۆ لای هاوڕێکانمان بۆ ئەوەی بمانشارنەوە. تا ئەو کاتەی کە هاورێیەک کە پەیوەندیی بە

تارانەوە هەیە، بێت و بەرەو تارانمان ببات».

شەو لە ماڵی هاوڕێکەیان، خواردنێکی تێر و تەسەل و بە چێژیان خوارد. بەڵام لینا، لە هیلاکیدا خۆی بە پێوە نەدەگرت. پاشان عەبدولڕەحمان و پیاوی خانەخوێ، چوونە ژوورەکەی تەنشتەوە و لینا گوێی لێ بوو بە دەنگێکی زبرەوە مشتومڕیان بوو. لە ڕواڵەتی تێکچڕژاوی ژنی خانەخوێش ڕا دیار بوو کە دۆخەکە ئاسایی نییە. مینا خەوی لێکەوتبوو و لیناش چاوەڕێی کۆتایی هاتنی مشتومڕی ئەو دوو پیاوەی دەکرد. کارەکان، هەمیشە، وەک پێشبینی کراون ناڕۆنە پێش.

پیاوەکان لە ژوورەکە وەدەر کەوتن، بە بێ پێکەنین و تەنانەت وتنی وشەیەک. عەبدولڕەحمان ڕووی لە لینا کرد و فرمانی پێکرد: «منداڵەکە و چەمەدانەکە هەڵگرە، لێرە دەڕۆین». دواتر، چووە دەردەوە و لە نزیکەی درگاکەوە چاوەڕێی لینای کرد. لینا بەپەلە، ئەو شتومەکەی لە چەمەدانەکە دەری هێنا بوون، کۆی کردنەوە و بە زەحمەت تەپاندنیە نێو چەمەدانەکەوە.

لە دەرەوە شەو بوو. کۆڵانەکە، تەسک و ترووسک و نووتەک بوو. لە بێدەنگیدا ملی ڕێگایان گرتبوو. لینا خۆی لە زەوی کێش دەکرد و بە هەموو هێزی خۆیەوە کەوتبووە دوای عەبدولڕەحمان، هەستی دەکرد پێویستە هاوسەرەکەی ڕوونکردنەوەیەکی بۆ بدات بەڵام، نەک هیچ ڕوونکردنەوەیەکی بۆ نەدرا، بەڵکوو هاوسەرەکەی بەخێرایی دەڕۆشت و داوای لەویش دەکرد پێ هەڵگرێت.

کۆڵانەکەش نەدەبڕایەوە، لینا کە چیدیکە هێزی هەنگاوی نەمابوو، ڕووی کردە مێردەکەی: «یارمەتیم بدە، ناتوانم هەم منداڵەکە هەڵگرم و هەم چەمەدانەکە».

عەبدولڕەحمان وەڕەز بوو و هەر وتەیەک بێتاقەتی دەکرد. لە ناوەندی شار نزیک دەبوونەوە. ڕووناکایی کز و زەردی شار، بۆ ئەوان کە لەو کۆڵانە نووتەکەوە هاتبوون ئازاردەر بوو. لینا بە سرتە لە هاوسەرەکەی پرسیاری کرد کە ئایا تێپەڕین لە ناوەندی شارەوە

بۆ ئـــەوان مەترســـیدار نییـــە؟ عەبدولڕەحمان وەڵامی دایـــەوە: «بەڵێ، مەترســـیدارە، بەڵام ناچارین بە شـــوێن هۆتێلێکـدا بگەڕێین.» چۆڵی و بێدەنگـــی گەڕەکەکـــە، لێنای وەخـــۆ هێنایەوە. ئەوان بـــە پێدزکێ بە پاڵ دیوارەکاندا تێدەپەڕین. لێنا کە چاوەڕوانی هێرشـــی پۆلیسی دەکرد، بە وردی چاوەدێریـــی هەموو ســـێبەر و ســـووچێکی دەکـــرد. دواتر وردە وردە هێمن بووەوە. دواجار خۆیان بە ڕێڕەوی هۆتێلێکی بچووکدا کرد. لـــە هۆڵەکەدا، پیاوێکی بەخۆ و تۆکمە بە ئاســـوودەیی ســـەیری کردن. داوای لێکردن هەموو کرێی ژوورەکە بدەن. عەبدولڕەحمان، کرێی دوو ڕۆژی پێدا. ئەو پیاوە خاوەنی هۆتێلەکە بوو و ژن و کچەکەشـــی هەر لەو هۆتێلە کاریان دەکرد. ژوورێکی لە دوا نهۆمی هۆتێلەکە کە نهۆمی سێهەم بوو پێدان.

لـــە کاتێکـــدا عەبدولڕەحمـــان بە قووڵی خـــەوی لێکەوتبـــوو و مێنای بچکۆلانەش کەوتبووە هاروهاژی، دڵی لێنا بە توندی لێیدەدا، وەها کە گوێیەکانی ژانیان دەکرد (خەریک بوو تووشـــی ئاوســـانی گوێ (otite) دەبوو). لێنا هەستی دەکرد کارەساتێک بەڕێوەیە.

لێنا بە چارشـــێو خۆی دادەپۆشـــی و ڕۆژانە لە بەقاڵی سەر کۆلانەکە شـــتی دەکڕی. چیدیکە توانای قووتدانی ئەو خواردنە سارد و سڕانەی نەمابـــوو. عەبدولڕەحمان، شـــەوانە وەدەر دەکەوت و هەر شـــەو ماتتر و داگیراوتـــر لە شـــەوی ڕابردوو دەگەڕایەوە و متەقـــی لێوە نەدەهات. ئـــەو دۆخی دڵەڕاوکێ و گومانە بۆ لێنا تاقەت پڕووکێن بوو. لە منداڵیدا زۆر جار بە ئازاری ئاوســـانی گوێیەکانیەوە ناڵاندبووی. لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا، لەوزەکانیان بە نەشتەرگەری دەرهێنا بوو و لەو کاتەوە چیدیکە لێنا تووشی ئازاری گوێ نەبووبووەوە.

بەڵام، ئێســـتا ئازاری گوێی برســـتی لێ بڕیبوو. عەبدولڕەحمانیش لە تەورێز هیچ دوکتورێکی نەدەناسی. سەردانی دوکتوری نەناسراویش بۆ ئەوان مەترسیدار بوو. جگە لەوەش، پارەیەکی ئەوتۆشیان پێ نەمابوو. لە لایەکی دیکەشـــەوە، خـــاوەن هۆتێلەکە تێگەیبوو کە مشـــتەرییەکانی

ئاســایی نین. ئەم بابەتە عەبدولڕەحمانی زیاتر تووڕە دەکرد و لێناشی زیاتر دەترســاند. ئەوان نەیاندەتوانی بە دوای هۆتێلێکی دیکەدا بگەڕێن چونکوو پارەی پێویستیان پێ نەبوو. ئەو کەسەش بڕیار بوو پەیوەندی بە عەبدولڕەحمانەوە بگرێ، هیچ هەواڵێکی نەبوو.

ڕۆژێکیان، پیاوێکی بە تەمەن هاتە ژوورەوە و گوتی: «من پزیشــکم و هاوڕێــی خاوەن هۆتێلەکەم». پشــکنینی بۆ لێنا کرد و گوتی: «گوێی ناوینت گەلێک ئاوســاوە و لە دۆخێکی باشدا نییە». لەوە بەدوا، هەموو ڕۆژێــک دەهــات و دەرمانی لەگەڵ خۆی دەهێنا، بــە بێ ئەوەی داوای پارەی پشکنین و دەرمانەکانی بکات. خاوەن هۆتێلەکەش، چا و سووپ و خواردنــی گەرمی بۆ دەهێنان. دواجار، ئەو کەســەی عەبدولڕەحمان و لێنا چاوەڕێیان دەکرد، هات. خاوەن هۆتێلەکە و پزیشــکەکە، بەڕێیان کردن و هیوای سەفەرێکی سەرکەوتوویان بۆ خواستن. خاوەن هۆتێل و دوکتورەکــە، نــە بۆ کرێی هۆتێلەکە و نە بۆ پشــکنین و دەرمانەکان، پارەیــان لــێ وەرنەگرتــن. لێنا، دواتر زانــی کە ئەوانیش لــە دژبەرانی ڕێژیمی شا بوون. ئەوان دوو مرۆڤی دڵ فراوان بوون.

■ ژیانی نهێنی

وەها بوو کە لێنا ژیانی نهێنی دەســت پێکرد و مینای بچکۆلانەشــی تێکەڵ بەو ژیانە کرد. هەر ڕۆژێک کە تێدەپەڕی، لێنا باشتر هاوسەرەکەی خۆی دەناســی. لێنا، هەڵسوکەوت، شــێوازی کار و هونەری دەربڕینی بۆچوونەکانی هاوسەرەکەی دەبینی. لە ڕوانگەی لێناوە، ئەو زێڕی خالس بوو و ڕاســت و دروستیی هەڵسەنگاندنەکان و بڕیارە سیاسییەکانی لە ڕێــی دەرئەنجامەکانییــەوە دەســەلما. بەو بڕوا قووڵەی کــە بە خەباتە دادپەروەرانەکــەی هەیبوو، بۆچــوون و باوەڕەکانی بۆ هاوخەباتەکانی دەگواستەوە. لێنا لە هەڵبژاردنی ئەودا هەڵەی نەکردبوو و هەر ڕۆژێک کــە تێدەپەڕی، عەشــقەکەی بۆ ئەو قووڵتر دەبــووەوە. عەبدولڕەحمان لــەو دەســتە شۆڕشــگێڕانە بــوو کــە دوو تایبەتمەندیــی، فرەزانــی و

ناخێکی ســاف و پاکیان پێکەوە هەیە. ئەو بۆ چارەســەری هەر گرفت و کێشــەیەک، ئەوەی بەربەســتی ســەر ڕێی بوو، لای دەبــرد. ئەو بە شــێوەیەکی لۆژیکی سەبارەت بە هەموو ئەو چالاکیانەی کە پێویستیی ڕۆژانــە بوون، وەها بەرنامەی دادەڕشــت، کە هــەم لەباری مرۆییەوە گونجــاو بێــت و هەم هەموو لێــی تێبگەن و ئارمانجــی خەباتەکەش لە یاد نەکرێت. هاوخەباتەکانی بە وردی گوێیان لە بۆچوون و قســەکانی دەگرت و بە حەزەوە باس و گفتوگۆیان لەگەڵ دەکرد. لە ڕاســتیدا ئەو مامۆستا و ڕاهێنەرێکی باش بوو.

لــەو ماوە زەمەنییەدا، لینا بە تەواوی خۆی لەگەڵ داب و نەریتەکانی کۆمەڵگەدا گونجاندبوو، تەنانەت لەگەڵ زۆرێک لەو نەریتانەش کە وردە وردە خەریــک بــوون لەبیر بکرێن. لــە لایەکی دیکەشــەوە، ڕێژەیەکی زۆر لــە ئێرانییــەکان، بریتی لە فارس و غەیری فارس، لە دژی ڕێژیمی شــا هەســتابوونەوە و ڕێژیمیــش زۆر دڕندانــە لەگەڵ ئۆپۆزیســیون دەجووڵایەوە و زەبری لێ دەوەشاندن.

شۆڕشــگێڕانی ڕێــگای ئازادی دەترســان، بــەڵام باســیان نەدەکرد. لیناش دەترســا، بەڵام نەیدەویست دان بە ترسەکەیدا بنێت. لەو کاتەوە گەیشــتبوونە تــاران، بــەردەوام حەشــارگەیان دەگــۆڕی و بــە ناوی خوازراوی جۆراوجۆرەوە دەژیان. هەندێ ئەرکیان خستبووە ئەستۆی لینا و دەرفەتی سەرخوراندنی بۆ نەمابووەوە. لاپەڕەبەندیی ڕۆژنامەی کوردســتان و لکاندنی وتارەکان بە لاپەڕەکانی لە ئەســتۆ گرتبوو. لەم کاتــەدا، عەبدولڕەحمان و هاوکارەکانی، ئەم ڕۆژنامەیەیان چاپ دەکرد و بۆخۆشــیان وتارەکانیان دەنووســی. لینا، پاش چــاپ، ڕۆژنامەکانی دەبرد بۆ کەسانێک لە تاران کە ئەوانیش بە نهێنی دەژیان و بەرپرسی بــڵاو کردنەوەی ڕۆژنامەکان بوون. هەروەها، لینا پەیامیشــی دەهێنا و دەبرد و هەندێ جاریش کێشکی دەکێشا و نیگابانیی دەدا، دیارە هەموو ئەمانەی بە خۆشــاردنەوە لەژێر چارشــێوێکی ژنانــەدا دەکرد. ئەو لە لاپەڕەی ئەو شەترەنجەدا ڕۆڵی مۆرەیەکی گرینگ و بەکەڵکی دەگێڕا.

ژیان، بە تایبەتی ژیانی شۆڕشــگێڕەکان، شتێک جگە لە تێکچڕژاویی شکۆی ڕۆژانی درەوشاوە و شەوانی بێهیوایی و بێدەرەتانی نییە.

■ ژیان لە ماڵی زەردەشتییەکدا

یەکێــک لــەو ئاپارتمانانــەی کە ئــەوان تێیــدا دەژیان، لــە جیرانەتیی کەلانتەریــی ژمــارە (١) دا هەڵکەوتبــوو و هــی پیاوێکی زەردەشــتیی ســاماندار بوو. ئەوان لە نهۆمی ســەرەوەی ئەو خانووەدا دەژیان و لە بەرهەیوانەکەیەوە دەیانتوانی باخی یەکێک لە کۆشــکە سەڵتەنەتییەکان ببینن. ئەوە بۆ ئەوان چەشــنێک چاوقایمی بوو. ئەوان لەســەر بنەمای پەندێکــی کۆن کە دەڵێت «بنی دارتێلی کارەبا تاریکە» ئەو شــوێنەیان هەڵبژاردبــوو. جگە لە عەبدولڕەحمان، لێنا، مینا و ئیســماعیلی ئامۆزای عەبدولڕەحمــان، حەوت کەســی دیکەش لەو ماڵەدا خۆیان شــاردبۆوە و هەمووشــیان لە بەرپرســانی حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران بوون. تەنیا ئیســماعیل دەیتوانی بە بێ مەترسی لە ماڵ بچێتە دەرەوە، چونکە بەدوای ئەوەوە نەبوون و ئەو لە قوتابخانەی باڵای ئەندازیاریدا خوێنــدکار بوو. بەو پێیــە، کاروباری کڕیــن، مەئموورییەت و هێنان و بردنی پەیامی بەڕێوە دەبرد. ئیســماعیل لای بەقاڵی ســەر کۆڵانەکەش متمانەی دروســت کردبــوو و زۆرجار بە قەرزیش شــتی دەهێنایەوە. بەگشتی هەرکاتێک بۆیان بڕەخسایە، قەرزەکانیان دەدایەوە. بەڵام، ئەو ڕۆژەش هات کە چیدی توانای دانەوەی قەرزەکانیان نەما و هەربۆیەش بەقاڵەکە لە دانی شت بە قەرز خۆی دەبوارد و شۆڕشگێڕەکان چەندین هەفتــە بــە بێ ئەوەی دەســتیان بــە خواردەمەنییەکی ئاســایی ڕابگات مانــەوە. کەوتنــە خواردنی ئەو ورکەنانانەی لێنا لــە ڕۆژانی فەرعانەدا هەڵیگرتبوون و ئەو برینج و دانەوێڵەی پاشەکەوتی کردبوو.

ســەری هەمــوو مانگێک، خــاوەن ماڵەکە بە هیــوای وەرگرتنی کرێ خانووەکەی دەهاتە بەردەرکی ئاپارتمانەکە. هەمیشەش، عەبدولڕەحمان قســەی لەگــەڵ دەکرد، لــە کاتێکدا کــە پیاوەکانی دیکە، بــە بێدەنگی لە

ژوورەکەی دیکەدا، خۆیان دەشـــاردەوە. لینا و میناش، خۆیان نیشـــان دەدا. کاتێک عەبدولڕەحمان داوای لێدەکرد هەندێکی دیکەش لەسەریان بوەســـتێت، خـــاوەن ماڵەکە، ملـــی ڕێگای دەگرتە بەر و دەڕۆشـــت. ئەو نـــەک هەر جوابی نەکـــردن، بەڵکوو تەنانەت هەڕەشەشـــی لێ نەکردن. ئایا ئەویش لە دژبەرانی ڕێژیمی شـــا بوو؟ بە هەر حاڵ، ئەوەش خۆی موعجیزەیەکی دیکە بوو. ڕەنگە بەکار هێنانی ئەو وشـــەیە زۆر گونجاو نەبێت، بەڵام ڕاســـتییەکەی ئەوەیە کـــە زۆریەک لە ئێرانییەکان دژبەری ڕێژیم بوون.

لینـــا، ســـەرلەنوێ دووگیان بـــووەوە. ژیانێکی دیکە لـــە زگیدا بیچمی دەگرت. لینا، بە درێژایی ڕۆژ لە ماڵەوە کاری دەکرد. لە ڕاستیدا، ئەو بە تەنیا هەموو کاری ئەو ماڵەی دەکرد. ئەو پێش لە هەموو شتێک دەبوو ئـــاگای لە کچەکەی بێت بۆ ئەوەی ســـەرەڕای نەبوونـــی خواردەمەنی، برســـیەتی نەکێشـــێت. کچەکەی هێشتا دوو ســـاڵی پڕ نەکردبۆوە. ژیان لـــە نهێنییەکی تـــەواودا گەلێک بە ئـــازار و تاقەتپڕووکێن بوو. ئەوان بۆ ڕەواندنـــەوەی ئـــەو حاڵە، خۆیان بە زۆر شـــتەوە ســـەرقاڵ دەکرد. لینا بۆ ڕەواندنەوەی بێتاقەتی، بیســـتنی «کۆنسێرت»ی مۆسیقای کلاسیکی بەسەر هاوڕێیاندا دەسەپاند. ئەوان تەنیا چوار قەوانینان هەبوو کە بریتی بوون لە: ڕاوێل Ravel، ڕیمســـکی ـ کۆرســـاکۆڤ Rimski – Korsakov، بێتهۆڤێن Bethoven وبۆرۆدین Borodine. بە وەرەق یارییان دەکرد، بەڵام چون پارەیـــان نەبوو، لەبری ئەوە کەڵکیان لە دانەوێڵەی وەک لووبیای ســـەوز، نۆک، لووبیای سپی و لووبیای ســـوور وەردەگرت. کاتێکیش، هەموو دانەوێڵەکەیان خوارد، لە یاری وەرەقدا چیلکە شەمچەیان بەکار دەهێنا. پاشـــان، لەتە کاغەزیان هێنا و بڕی پارەیان لەســـەر نووســـی و بەو پێیە لە یارییەکەدا بەکاریان دەهێنان. مۆسیقا ژیانی وەبەر ماڵەکەدا دەهێنایـــەوە. یاری بە وەرەق و بردنەوەی ئـــەو هەموو دەنکە لووبیایە لەبـــری پارە، خۆی ســـەرقاڵی دەکـــردن و مایەی پێکەنینیـــش بوو. لینا، تەنانەت توانی مۆدێلێکی نوێی ئاکار و هەڵســـوکەوت بەسەر پیاوەکاندا

بسـەپێنێت و لە ئەگـەری ڕەچاونەکردنیـدا، بەرهەڵسـتیان بێتەوە. بۆ ئەو مەبەسـتە، زۆرجار پێویسـتی بە یارمەتیی عەبدولڕەحمان دەبوو. هەرچەند عەبدولڕەحمان لەو کاتەدا ئەو پلەیەی نەبوو کە دواتر لە حیزبی دێموکراتدا بەدەسـتی هێنا، بەڵام ڕۆڵی بەرپرسـی دەگێڕا و بۆ ئەوەی ئاواڵەکانی ڕێزی بگرن، دەیگوت کە ئەو نابێ خەریکی ورکەکاری ژنانە بێ. لەبەر ئەوەی ئەو کارانە قەدری ئەو لای هاوڕێکانی کەم دەکاتەوە. هەربۆیـەش، لێنا هەموو کارەکانی نێومالّی بەڕێوە دەبرد. لە ماڵەوە، ٩ پیـاوی لێ بوو، هەرکام بە خوو و خدە، بەرژەوەندی و هەڵسـوکەوتی تایبەت بە خۆیانەوە. ئەوەش هەندێ جار دەبووە هۆی تێکهەڵچوونیان. دواجـار داوای یارمەتییـان لە لێنا دەکرد و ئـەوەش ئەو دەرفەتەی بۆ لێنا دەڕەخساند بۆ ئەوەی داوایان لێ بکات ڕەچاوی هەندێ ڕێوشوێن بکەن. دیارە، کاتێک عەبدولڕەحمان کە ڕۆڵی بەرپرسـی هەبوو، هەمان داواکاریی لێیان دەبوو، ساناتر دەچوونە ژێر بار.

سەرەڕای ئەوەی لێنا بە تەمەن لە هەموویان بچووکتر بوو، بۆ هەموو پیاوەکان وەک خوشـکی گەورەیان وابوو. لانیکەم، ئەوە بە ئاکاریانەوە دیار بوو. بۆ نموونە هەموو لەسەر لێنا دەوەستان هەتا لە کاری ناوماڵ ببێتـەوە، ئەوسـا لەگەڵ ئەو یاریـی وەرەقیان دەسـت پێدەکرد. کاتێک لێنا سـەرقاڵی کاری ناوماڵ بوو، ئەوان بێزار دەبوون، بەم حاڵەشەوە، ئامـادە نەبـوون داهێنانێکیان هەبـێ و یارمەتی بـدەن زوو لێ بێتەوە، بەڵکوو لە نێو ماڵەکەدا دەهاتن و دەچوون هەتا ئەو لە کار دەبووەوە.

بە پێچەوانەوە، مینا هەڵکەوتە بوو. ئەو کە منداڵێکی دلۆڤان و دەم بە پێکەنین بوو، بە بێ ئەوەی مەبەسـتی بێت، بە چەشـنێک یارمەتیدەری دایکی بوو. بەم چەشـنە کـە پیاوەکانی ناچار دەکرد یاری لەکەڵ بکەن و ئەوانیـش بەگوێیـان دەکرد. ڕۆژێک لێنا لە چێشـتخانەکە سـەرقاڵی کار بـوو، چـاوی لە دووی مینا گێڕا و دیتی بەسـەر لێـواری دیواری بەرهەیوانـی ئاپارتمانەکـەدا دەڕوات. ئاپارتمانەکەی ئـەوان لە نهۆمی پێنجەمدا بوو. ئەحمەد. ت، دەستی خستبووە پشت کەمەری و بە دوای

مینادا دەڕۆشت و دەیدواند و میناش وەڵامی دەدایەوە. لێنا بە دیتنی ئەم دیمەنە زراوی چووبوو، بە ئەسپایی خۆی لە مینا نزیک کردەوە و لە ئامێزی گرت. پاش ئەوەی ترسەکەی ڕەوییەوە و توانی بێتەگۆ، دەنگی ئەحمەدی دا (ئەحمەد لە هەموویان زیاتر دەبووە هۆی تووڕە بوونی لێنا). ئەحمەد. ت، بە پێکەنینەوە بە لێنای گوت کە پێویست ناکات دڵنیگەران بێت، چونکە ئەگەر ئەو منداڵە بکەوتایەتە خوارەوە ئەو بەرپرسایەتییەکەی وەئەستۆ دەگرت. لێنا لەو وەڵامەی ئەحمەد حەپەسا بوو، شەرمی وەلا نا و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: «نەفام! ئەگەر ئەو منداڵە بمردایە، بەرپرسبوونی تۆ چ کەڵکێکی بۆ من دەبوو!»

عەبدولڕەحمان دەسبەجێ خۆی گەیاندە لێنا و ویستی هێوری بکاتەوە. بەڵام، لێنا نەیدەویست هێور بێتەوە. چونکە بەدەست ئەم شۆڕشگێڕە تەوەزەلانەی تەنانەت خەباتیشیان نەدەکرد و ژیانی منداڵەکەشیان خستبووە مەترسییەوە، وەڕەز ببوو.

■ هاتنی کیانووری

شەوێکیان، کات لە نیوەشەو تێپەڕیبوو و هەموو نووستبوون، زەنگی ئاپارتمانەکە لێدرا. دەتگوت تەقینەوەیەک ڕوویداوە. تەنیا کەسێک کە ئەو زەنگەی لێدەدا، خاوەن ماڵەکەیان بوو، بەڵام ئەو هەرگیز لەو کاتەی شەودا، سەردانی ئەوانی نەکردبوو.

هەموو حەپەسابوون و بە جلی ناوماڵەوە، لەسەر پەنجە هاتووچۆیان دەکرد و لە درگای ماڵەکە نزیک دەبوونەوە و لەوێ، واق و وڕ، گوێیان هەڵدەخست، بەڵکوو دەنگی پێیەک بەرگوێیان کەوێ. بەڵام، لەو دیوی درگاکەوە تەنیا بێدەنگی بوو. هەربۆیەش، هەموو بیریان لەوە دەکردەوە کە پۆلیس لە پشت دەرکەکەیە! بۆ جاری دووهەم زەنگەکە لێدرایەوە. ئەم جارەیان، عەبدولڕەحمان ورەی دایە بەر خۆی و بە ئەسپایی پرسیاری کرد: «کێی لێیە؟»

ئەوەی لە پشت دەرکەکە بوو، بە ئەسپایی وەڵامی دایەوە. ئەمجارەیان،

عەبدولڕەحمان دەرکەکەی کردەوە و بە بینینی کەســی پشــت دەرکەکە حەپەسا. ئەفسەرێک هاتە ژوورەوە و بە هەنگاوگەلێکی دڵنیاوە یەکسەر بەرەو ژووری دانیشتنەکە ڕۆشت. کەس بەدوایدا نەڕۆشت. کورسییەکی هەڵگرت و لەســـەری دانیشــت و دواتر کڵاوی ئەفسەرییەکەی هەڵگرت. ئەو پیاوە، کیانووری، ئەندامی دەفتەری سیاســی حیزبی توودە بوو کە بۆ ئەوەی نەناســرێتەوە، جل و بەرگی تایبەت بە ئەفسـەرێکی ڕێژیمی شاهەنشــایی لەبەر کردبوو، هەموو هەناسەیەکیان بەبەردا هاتەوە. ئەم بابەتــە لە مــاوەی چەند ڕۆژدا، بوو بە گەپجــاڕی نێوان پیاوەکان و لە ڕاستیدا، ورەی ئەوەی پێدەبەخشین بە سەر ئەو ترسەدا زاڵ بن کە تا سەر ئێسقانیان گەیبوو.

پاش ڕۆشــتنی کیانووری، هەموو چوون بنوونــەوە. بەڵام، لینا خەو نەدەچووە چاوی. ترســی دەستبەسەر بوون و چارەنووسی منداڵەکەی نــاو سـکی و مینای بچکۆلــە ئۆقرەی لــێ هەڵگرتبــوو. دەیزانی هیچی لەدەســت نایە، هەوڵی دەدا خەیاڵ و ختــووره لەخۆی دوورکاتەوە. بە هاتنی کیانووری، شــاڵاوی خەیاڵ و ختووره سەریان کردەوە جەرگی. عەبدولڕەحمان و کیانووری ماوەیەک دووبەدوو لە ژووری دانیشتنەکە مانــەوە و دواجــار، کیانــووری چــۆن هاتبــوو، هەرواش بــە بێدەنگی ڕۆشــتەوە. بۆ سبەی شەو، باسی پێویستیی گۆڕینی شوێنی نیشتەجێ بوونــی خۆیانیان دەکرد، دەبوو بڵاوەی لێبکــەن. دەڵێن پاش دۆڕاندنی شــەڕ، ڕەخنەگرتن ئاســانە. بەڵام زۆر بێمانا بوو کە بەرپرسانی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، ماوەیەکی زۆر، هەموو پێکەوە لە ماڵێکی نهێنیدا بمێننــەوە. ئەگەر پۆلیــس ئەوانی لەو کاتەدا دەستبەســەر کردبا کاری حیزبــی دێموکــرات تەواو کرابوو، کەوایە پێویســت بوو شــوێنی دیکە بۆ خۆ شــاردنەوە بدۆزنەوە. بەڵام، بە گیرفانی بەتاڵ، چییان لەدەســت دەهات؟ دواجار، بڕیاریاندا ماوەیەکی دیکەش هەر لەو ماڵەدا بمێننەوە، بە تایبەت کە لە باری ڕێکخســتنەوە، پۆلیســی شا لە حیزبی دێموکرات و ڕێکخراوە دژبەرەکانی دیکە کاراتر نەبوو.

■ کۆکەڕەشە

مینــای بچکۆلانە نەخــۆش کەوتبوو. لە لایەکــەوە، چوونەدەرەوە بۆ هەموو قەدەغە بوو، لە لایەکی دیکەشەوە گیرفانیان بەتاڵ بوو. پیاوەکان بە جەخت کردن لەسەر ئەوەی مینا خۆی چاک دەبێتەوە، هەوڵیان دەدا لێنا هێور کەنەوە. لێنا، لەو چەشنە قسانەی لە ڕەزاییە زۆر بیستبوو. تا ئەو کاتە، ســەرەڕای کەمیی خواردەمەنی، توانیبووی بە خۆشەویستیی دایکانە و خەوی ڕێکوپێک، ئاگای لە تەندرووستیی کچەکەی بێت. بەڵام ئەمجارەیان نەخۆشینی کچەکەی جیددی بوو. مینا، لەبەر زۆریی کۆکە ڕەش و شین هەڵدەگەڕا. هەناسەی دەبڕا. دۆخی منداڵەکە تاقەتپڕووکێن بوو و پیاوەکانیش هەمان قســەیان دووپات دەکردەوە. لێنا مانی گرت، گوتی یان دوکتور بۆ منداڵەکەم دەهێنن، یان دەســت لە ڕەش و ســپی نادەم. دواجار، عەبدولڕەحمان داوای لە ئیســماعیل کرد بۆ دۆزینەوەی پارە و دوکتورێکی هەرزانبایی بچێتە ناوشار.

ئیســماعیل پارەی دەســت نەکەوتبوو، بەڵام ناونیشــانی دوکتورێکی مرۆڤدۆســتیان پێدابــوو کــە ئامادەبوو، بــە بێ بەرانبەر، پشــکنین بۆ منداڵەکە بکات و دەرمانی پێویستی بداتێ.

هیچ کام لەو پیاوانە، تەنانەت ئیســماعیلیش ئامادە نەبوون لەگەڵ لێنا بچنــە دەرەوە و دەیانگــوت: «لەو ڕووەوە کە لێنا خۆی لەســەر بردنە دەرەوەی مینــا ســوورە، دەبێ بە تەنێــش بڕوات». لێنا لە ترسـنۆکی ئــەو پیاوانە وەڕەز ببوو، ئەوەی بە زاریدا دەهات نەیدەگێڕایەوە. بەڵام بژاردەیەکی دیکەشــی نەبــوو. لە لایەکەوە زگی حــەوت مانگان بوو و لە لایەکی دیکەشــەوە، دەبــوو مینا بکاتە باوەش و مــاوەی کاتژمێر و نیوێــک، هەتــا لای دوکتورەکــە بە پێ بــڕوات، تەنانەت پــارەی کڕینی بلیتــی پاسیشــیان نەبــوو. لە تاران، تینــی خۆرەتاو لە مانگــی ژوئەندا تاقەتپڕووکێنــە. هەربۆیــەش، لێنــا بەیانــی زوو لە مــاڵ وەدەر کەوت. دوکتورەکــە کاتژمێر ٩ی بەیانی لە شــوێنی کارەکــەی دەبوو. پیاوێکی بەتەمەن دەهاتە بەرچاو. لەبەرانبەریدا، لێنا هەســتی بە شڵەژان دەکرد.

دوکتورەکە منداڵەکەی پشکنی و گوتی کۆکەڕەشەیەتی.
نوسـخەکەی بـۆ نووسـی و سـەرەڕای ئـەوەی لێنـا لـە کاتـی چوونـەژوورەوەدا داوای لێکردبـوو پـارەی لـێ وەرنەگرێـت، داوای حەقدەسـتی کرد. هەسـتی شـەرمەزاری سـەراپای لێنـای داگرتبوو، سـەرلەنوێ بە شـەرمەوە داواکارییەکەی دووپات کردەوە. پزیشکەکە بە ناباوەڕییەوە سـەیری لێنای کرد و نوسـخەکەی دایە دەسـتی. لێنا نوسـخەکەی وەرگرت و نایە سـەر میزەکە و ئەمجارەیان بە دەنگێکی پتەوەوە نوسـخەکەی گەڕاندەوە و گوتی پێویسـتم پێی نییە. ئاخر ئەو پارەی دەرمانەکانی پێ نەبوو.
لێنـا، تـا ئەو کاتە بە هێمنـی و لە ژێر لێوەوە قسـەی کردبوو، بەڵام دواجـار بـە دەنگـی بەرز و پتەو قسـەی خۆی کـرد. ئایا ئەو شـێوە قسـەکردنەی کاریگـەر ببوو؟ بـە هەرحـاڵ، پزیشـکەکە ڕووی کردە قەفەسـەی دەرمانەکان و پێویسـتییەکانی لێنای دایە دەستی و گوتی: «ماڵئاوا خانم!»
لێنـا، بە بێ ئەوەی سپاسـی بـکات لە ژوورەکە چـووە دەرەوە. بەو سـووکایەتییەوە کـە لە لایـەن پیاوەکانی ماڵـەوە پێی کرابـوو و ئەم سووکایەتیە نوێیەش کە لای دوکتور پێی کرابوو، خۆی بە ئەمەگداری کەس نەدەزانی.
کۆڵانەکان قەرەباڵغ و پڕ لە هاتوچۆی خەڵک و فرۆشیارە گەڕۆکەکان بـوون. لێنـا دۆخەکەی پێ خـۆش بوو. ماوەیەکی زۆر بـوو لە ماڵەوە قەتیس ببوو، هەستی بە ئازادی دەکرد. بۆخۆی کەوتە گەڕان. لە تەنشت پیادەڕەوەکە دانیشـت، بـە بێئەوەی بیر لە مەترسـی پۆلیس بکاتەوە. لای ئێـوارە لەگەڵ منداڵەکەی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. تەندرووسـتیی مینا گەڕایەوە و ژیان بە هەموو تەنگ و چەڵەمەکانیەوە بەردەوام بوو.

■ «هاوڕێیان بە یارمەتیتان...»

کۆبوونــەوە حیزبییــەکان لە ماڵــەوە دەگیــران. لە کاتــی گونجاودا، هەندێ جــار کۆبوونەوە فەرمییەکانیش کە بــە بۆنەی بۆنموونە هاتنی هاوڕێیەکەوە یان بۆنەیەکەوە بەڕێوە دەچوو، لە ماڵەوە ڕێکدەخرا. لەم کاتانەدا لەگەڵ خواردن مەشــرووبیش دەخورایەوە. هەموو جارێ کاک سدیق بە وتەیەک، کۆبوونەوەکانی دەست پێدەکرد. هەموو بە وردی و بە چێژەوە گوێیان لە وتەکانی کاک سدیق دەگرت. کاک سدیق، بە بای هەوا قســەی نەدەکرد. لە ڕاستیدا بە شێوەیەکی سروشتی لە وتەبێژی و گوتاردانددا کارامە بوو.

هــاوڕێ غ. زۆری دەخواردەوە. ئەگەر گیرفانیشــی بیبڕیایە ڤۆدکای دەخــواردەوە، ئەگــەر نەشــبووایە، بــە عارەقــە هــەرزان بابیەکــەش ڕازی دەبــوو. کاک ســدیق، هەمیشــە وتەکانی خۆی بــە «ئەزانی کاک ڕەحمان...» دەســت پێدەکــرد. دواتر، گوێگرەکان خۆیــان بۆ وتارێکی دوور ودرێژ ئامادە دەکرد. هاوڕێ غ. بە حەسرەتەوە سەیری ئیستکانی ڤۆدکاکــەی دەکرد (ئیســتکانی ڤۆدکاکەیان پاش وتەکانی کاک ســدیق هەڵدەدا)، جووڵەجووڵی پێدەکەوت، دەکۆکی و بەم شــێوەیە دەیویســت کاک ســدیق ناچار بکات کۆتایی بە قســەکانی بێنێت. بەڵام کاک سدیق گوێی نەدەدایە. هاوڕێ غ. دۆش دادەما و نەیدەزانی چ بکات بۆ ئەوەی بــە بــێ تێکدانی بۆنەکە، ئیســتکانەکەی خۆی هەڵدات. بــە ڕوونی دیار بــوو دۆخەکە ئازاری دەدات. ڕۆژێکیان هاوڕێ غ. دواجار ڕێگەچارەی بــۆ دۆزییەوە. ڕێک لەو کاتەدا کە کاک ســدیق ڕســتە بە ناوبانگەکەی خۆی «ئەزانی کاک ڕەحمان..»ی بەزاردا هات، هاوڕێ غ. بە ئیستکانی ڤۆدکاکەیەوە هەســتایە ســەر پێ و بە دەنگی بــەرز گوتی: «هاوڕێیان بــە یارمەتیتــان، دەخۆینەوە بە ســەلامەتی، بژی». بە بــێ ئەوەش کە چاوەڕێــی دژکــردەوەی هاوڕێکانی بێــت، ئیســتکانی ڤۆدکاکەی خۆی هەڵــدا. لــەو ڕووەوە کە هاوڕێ غ. لــە هەموو بەتەمەنتــر بوو، هەموو دەبــوو ڕێزی بگرن. لە کۆبوونەوەکانی دیکــەدا، ئەو کارەی هاوڕێ غ.

بوو بە بەشێک لە ڕێوڕەسمەکە و وتەکەی هاوڕێ غ. واتە «هاوڕێیان بە یارمەتیتان»یــش، دواتر وەک فۆرموولێکی لێهات کە زۆرجار بەکاریان دەهێنا و هەموو پێدەکەنین.

■ ... خۆ بە زل زانین

هــاوڕێ غ. پیاوێکــی کــەم دوو بوو، بــە دەگمەن لەگــەڵ هاوڕێکانی قسەی دەکرد، لەگەڵ لینا هەر قسەی نەدەکرد و لە بەرانبەرەوە سەیری نەدەکــردن و بە گشــتی پیاوێکی مەشــرەفخۆش و کۆمەڵایەتی نەبوو. یــازدە کەس لە بــن میچێکدا پێکــەوە دەژیان. خواردەمەنــی کەم بوو. ســەرەڕای ئــەوەش، هاوڕێ غ. بــڕوای بەوە هەبوو کــە مافی خۆیەتی زیاترین و باشــترین پشکی خواردنی بەرکەوێت. سەرەڕای ئەوەش بە چووکەتریــن بیانوو دەڕەنجا. ئەم هەڵســوکەوتەی هــاوڕێ غ. دەبووە هۆی تــوورە بوونی لینا. بــەڵام عەبدولڕەحمان ســەرکۆنەی دەکرد و دەیگوت ئێمە بە هۆی تەمەنیەوە دەبێ ڕێزی لێ بگرین و داوای لە لینا دەکرد گوێی نەداتێ. دیارە گوتنی ئەم بابەتە سانا دەهاتەپێش چاو. لینا، گەلێک هەوڵی دەدا کارەکان بە باشــی بڕۆنە پێش و بەرگەی ئەو ژیانە هاوبەشە بگرن، بەڵام هاوڕێ غ. لەم بارەوە چووکەترین هەوڵی نەدەدا. ڕووداوێکــی شــڵەژێنەر، کۆتایی بــەو تۆزقاڵە ڕێزەش هێنــا کە لینا لە هاوڕێ غ.ی دەگرت. لینا، سەرەڕای دووگیان بوونی، جلوبەرگی هەموو ئەو پیاوانەی دەشوشــت. جلەکانی ژێرەوەیانی سەرەتا دەکوڵاند، دواتر دەیشوشــتن و ئاوی دەکێشان. بۆ ئەوەی دەر وجیرانیش گومانیان لێ نەکــەن، جلوبەرگەکانی لەماڵەوە هەڵدەخســت و جێگۆڕکێی پێدەکردن بۆ ئەوەی ئێشک ببنەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی جێگایان تەنگ بوو، کراسە پیاوانەکانی دەدا بەســەر یەکتردا و ژێر شەڵوارەکانیشــیانی بە هەمان شــێوە دەخســت بەســەر یەکتردا. هاوڕێ غ. نەخۆشــیی سووزەنەکی هەبــوو و کەس ئاگاداری ئەوە نەبوو، ڕۆژێــک عەبدولڕەحمان لەکاتی بەکارهێنانــی دەرمانــدا دەیبینێــت و هــاوڕێ غ. ناچــار دەبێــت بەلای

عەبدولڕەحمانەوە دان بە نەخۆشییەکەیدا بنێت.

عەبدولڕەحمان پاش ماوەیەک ئەو بابەتە بە لینا دەڵێت و دیارە دواتر لەو کارەی خۆی پەشـیمان ببووەوە و گوتبووی ترسـاوە لینا هاوڕێ غ. لـەو ماڵـە وەدەر بنێت. لیناش پێی گوتبـوو : «هەرگیز بە بێ ئیزنی تـۆ ئـەوەم نەدەکرد». بەڵام هەموو لە مەترسـیی تووشـبووندا بوون و هەروەهـا مینای بچکۆلەش. ڕەنگیشـە کار لـەکار ترازابێت و هەموو تووش بووبێتن. لینا گەلێک تووڕە بوو، لەگەڵ کەس قسەی نەدەکرد و بـۆ ئەوەش هەموو لە تووڕەییەکی تێبگەن، ئەوەی دەهاتە دەسـتی، بە عەرزیدا دەدا. عەبدولڕەحمان ناچار ببوو هۆکاری تووڕەبوونی لینا بۆ هەموو شـیکاتەوە و داوایان لێبکات هەموو جلوبەرگەکانیان داکەنن و بە وردییش خۆیان بشـۆن. خودی لیناش هـەر وایکرد. دواتر خۆی لە چێشـتخانەکە قەتیس کرد و دەسـتی کرد بە کوڵاندنی هەموو جلەکانی ژێرەوەیـان و شوشـتیانی و ئوتـووی کـردن و دواجاریـش هەمـوو ماڵەکـەی خاوێـن کردەوە. ئـەم کارانە چەند ڕۆژی خایانـد و دواجار لینا گەشـتە ئەو دەرئەنجامە کە لەوە زیاتر هیچی بۆ تەندروسـتی ئەو جەماعەتە پێناکرێت. پاشان لە بێدەنگیدا چاوەڕێی دەکرد بزانێ کەسیان نەخۆش دەکەون؟ هەموو ورەیان بەردابوو. لەسـەر پەنجە دەرۆشـتن و هەندێجـار، یەکێـک لە پیاوەکان دەچووە چێشـتخانەکە و بێدەنگ بە پێوە دەوەسـتا و بە چاو دەیویسـت بە لینا بڵێت لێی تێدەگات. بەڵام لینا وەها تووڕە بوو کە نەیدەویست ئەو ئیشارە و ئاماژانە ببینێت و دەری دەکردن.

کاتێک عەبدولڕەحمان دەچووە چێشتخانەکە و دووپاتی دەکردەوە کە هیـچ نەبـووە و بابەتەکە ئەوەندەش ئاڵۆز نییە، لینا زیاتر تووڕە دەبوو و عەبدولڕەحمانـی ناچار دەکرد لە چێشـتخانەکە بچێتـە دەرەوە. لینا زانیارییەکی ئەوتۆی لە مەترسـیی ڕاسـتەقینەی ئەو نەخۆشییە نەبوو. بـەڵام بەهەرحـاڵ، ئـەوەی دەیزانی، لـە زانیارییەکانی هاوسـەرەکەی لەوبارەوە کە تەنیا لە زاری ئەم و ئەوەوە هەندێ شتی بیستبوو،زیاتر

بـوو. لـەم وڵاتەدا، بابەتـی لەو جۆرە، بۆ باس و گفتوگـۆ نابن و نە لە قوتابخانە و نە لە ماڵەوە کەس باسی ناکات.

هـاوڕێ غ. هەرگیـز داوای لێبوردنـی نەکـرد. لێنـا ناچـار بـوو لە ماڵـەوە تەحەمولی بـکات. ڕێگاچارەیەکی دیکە نەبـوو. چار نییە، دەبێ چەرمەسەرییەکانی دۆخە تایبەتەکان قبووڵ بکرێت.

پۆلیسەکان بە یۆنیفۆرم و بێ یۆنیفۆرم، لە کۆڵانەکاندا دەسووڕانەوە و گەنجەکانیـان دەگـرت و بـۆ سـەربازییان دەنـاردن. ئیسـماعیلیان گرتبـوو. بەڵام ئەو بە نیشـاندانی پێناسـی خوێنـدکاری، خۆی دەرباز کردبوو. پێویسـت بوو خانووەکە بگۆڕن. بۆ ئەوەی هەڵەکەی پێشـوو دووپـات نەکەنەوە و هەموو بەرپرسـانی ناوچەکە لـە بن میچێکدا کۆ نەکەنـەوە، بڕیاریان دا بڵاوەی لێبکەن، بە تایبەت کە بەشـێک لە گرفتە ماڵییەکەشـیان چارەسـەر ببوو و ئەوە تا ڕادەیەکـی زۆر ببووە هۆی هێور بوونەوە و ئارامیی لێنا.

لە ماوەی چەند ڕۆژدا هەموو شـتێک جێبەجێ بوو. هەموو شـەوێ دوو کەسـیان دەردەچـوون و دواتـر لـە کۆڵانەکاندا لێکتـر دادەبڕان. هیچکامیان نەدەبوو شوێنی ژیانی ئەوی دیکەی بزانیبا. عەبدولڕەحمان و بنەماڵەکـەی بـەر لە دوا کەس لـەو ماڵە چوونـە دەرەوە. دوا کەس ئیسماعیل بوو. تەنیا ئەو شمەکەیان برد کە بۆیان هەڵدەگیرا و بەڕاستی پێویستیان پێی هەبوو. ئەوەی مابووەوە لە بری ئەو کرێیەی نەیاندابوو، بەجێیان دەهێشت. ئاستەمە بتوانیت ژمارەی جێگۆڕکێکانیانت لە دەستدا بێت. جێگۆڕکێکانیان پەیوەندی بە چڕبوونەوەی خەبات، کەم بوونەوەی چالاکیەکانیان یان دۆخی چاوەڕوانیەکانیانەوە هەبوو. ماوەی مانەوەیان لـە شـوێنێک، گرێدراوی بـارودۆخ بوو. بەڵام لەوە بـەدوا، نەدەبوو لە چەند حەوتوو زیاتر تێپەڕێت.

■ گەنجیەتی

لە تەمەنی گەنجییەتیدا، مرۆڤ نازانێت کە ڕۆحسووکی و شادیی ژیانی خۆی ئەمەگداری تەندرووستیی جەستەیەتی. هەروەها گەنجەکان، لە دنیای بەتەمەنەکان ڕازی نین و بە نیازن بیگۆڕن. جیلی عەبدولڕەحمان و لێنا، دەیانویست جێگای هەژاری و نادادپەروەری بە نان و بەختەوەری بۆ هەمووان بگۆڕنەوە، ئەویش بە هێز و خرۆشی لەبن نەهاتووی جوانەگایەکی شەڕانییەوە. بەڵام بە تێپەڕینی زەمەن، جوانەگاکان یان پیر بوونە یان لە پشت میلەکانی زنداندا وەختە بڕزێن، هەڵبەت ئەگەر لە دەرئەنجامی پیری و لە ژێر باری توند و تیژیدا نەمردبێتن. ئەوەی ماونەتەوە، لە سەرانسەری دنیادا و دوور لە وڵات و زێدی خۆیان بڵاو بوونەتەوە. ئەوانە، برینی جەنگە دۆڕاوەکانیان دەلێسنەوە و لە هەمان کاتدا هیوادارن کە ئەو گەنجانەی جێگای ئەوانیان پڕ کردۆتەوە، سەرکەوتن لە ئامێز بگرن.

عەبدولڕەحمان و لێنا لەو جیلە بوون کە بڕوایان بەوە هەبوو لە کۆمۆنیزمدا چەکێکی دژ بە ئازار و چەرمەسەری دەدۆزنەوە. بەڵام ئەم دژە ژارە ڕێک بە پێچەوانەوە، شتێکی بە زەرەر و کوشندەی لێ دەرچوو، بە ڕادەیەک کە بوو بە بکوژی خەڵکەکەی خۆی. پاش تێپەڕاندنی ئەزموونێکی لەم دەستە، ئایا دەکرێ، بە بێ هیچ دواهاتێک بە زیندوویی بمێنیتەوە؟

■ ماڵی ئاغای ئابراهام

ئەو ماڵەی ئەمجارەیان عەبدولڕەحمان و بنەماڵەکەی وەکوو حەشارگەیەک دۆزییانەوە، لە گەڕەکێکی هەژارنشینی تاران هەڵکەوتبوو. خاوەنی ئەم خانووەش زەردەشتی بوو. بەڵام ئەم یەکەیان، هەم هەژار بوو، هەم خوێندەوارییەکی ئەوتۆی نەبوو، تەنانەت ئاوێستاشی نەخوێندبووەوە کە دەڵێن کتێبی پیرۆزی زەردەشتی پێغەمبەرە، بەڵام بڕوای بە هێزی خێر هەبوو. نێوی ژنەکەی زولەیخا بوو و پێنج منداڵیان

هەبوو کە لە نێوان سێ بۆ حەوت ساڵدا بوون. ئەم ژنە، دەنگێکی نێری هەبوو و بۆ کار یا شەپازللە لێدانی منداڵەکانی دەستێکی کارای هەبوو. ئاغــای ئابراهام لەوەیکە توانیبــووی نهۆمی یەکەمی ماڵەکەی خۆی کە دوو ژووری هەبــوو بەکرێ بدات زۆر خۆشـــحاڵ بــوو، بە تایبەتی کە ئەو کرێچییانە تەنیا منداڵێکیان هەبوو و چاوەڕوانی منداڵێکی دیکەشیان دەکرد(ئەمە لە باشـــتر بوونی دۆخی ژیانی بنەماڵەکەیدا کاریگەر بوو). ئەوەش خۆی دەبووە هۆی دروست بوونی هەستی باوەڕبەخۆبوون.

ژن و مێردێکی دیکەی کرێچیش کە هیندی و خەڵکی بەمبەیی بوون، لە ژوورێکی دیکەدا و لە تەنشـــت کرێچییە نوێکاندا دەژیان. ئەم ژوورە لە ماڵەکەی عەبدولڕەحمان و لێنا، تەنیا بە جامخانەیەکی شووشەبەندی ڕەنگ کراوەوە جودا دەبووەوە. بەڵام چێشتخانەکەیان هاوبەش بوو.

هــاوڕێ حیزبییەکان، بە بیانووی خواردنی نانــی ئێوارە، کۆبوونەوە حیزبییەکانیان لە ماڵی ئەوان بەڕێوە دەبرد. بابەتی باسی کۆبوونەوەکان، ســـەرەڕای ئەرکە پێویست و دەســـبەجێکان، بریتی بوو لە: ڕێکخستنی خەباتی سیاسی، وەکوو ڕاکێشانی ئەندامانی نوێ، دیاریکردنی تاکتیکی دروســـتی خەبــات و ئەو چالاکییانـــەی کە دەرئەنجامەکـــەی ڕووخانی ڕێژیمی شـــا و جێگر بوونی سیســـتمی دادپەروەرانە بۆ هەموو خەڵک بێــت. لـــەم قۆناغەی خەباتدا، هێشـــتا کەس بیری لـــە خەباتی چەکداری نەدەکردەوە.

لێنــا ببووە ئاواڵی ژنە هیندییەکەی دراوســـێی. ئـــەم ژنە هیندییە پێی ســـەیر بــوو کە لێنا لـــە چوونەدەرەوەدا چارشـــێو دەدا بە ســـەریدا، لە حاڵێکــدا ئـــەم ژنە هیندییـــە و زۆرێک لـــە ژنانی ئێرانیش چارشـــێویان بەسەردا نەدەدا.

لێنــا بۆی ڕوون کــردەوە کە ئەو خووی بەوە گرتــووە و بە تایبەت دەیەوێ بەڕاســـتی نیشـــان بدات کە بووەتە موســـوڵمان. لە ڕاســـتیدا، یەکەمیــن جــار کە لێنا بە بێ چارشـــێو لەگەڵ مێردەکـــەی چووبوو بۆ حەمامی گشـــتی، حەمامچییەکە بە بیانووی ئەوەی لێنا موسوڵمان نییە،

نەیهێشتبوو بچێتە ژوورەوە. بەڵام عەبدولڕەحمان بۆی شی کردبووەوە کە ئەگەر لینا کافر بووایە، شووی بەو نەدەکرد و حەمامچییەکەی ڕازی کردبوو ڕێگری لە لینا نەکات. بەڵام حەمامچییەکە زۆر بە جیددی ئامۆژگاریی عەبدولڕەحمانی کردبوو کە ژنەکەی ناچار بکات چارشێو بەسەردا بدات. عەبدولڕەحمانیش، هاوکات کە بەڵێنی بە حەمامچییەکە دەدا، پێی گوتبوو بۆ بردنە پێشی هەموو کارێک پێویستە پشوودرێژ و لەسەرخۆ بێت. لیناش بەو ژنە هیندییەی دەگوت: «من لە پاش ئەوەوە توانیم بە بەردەوامی بچمە حەمام و لەم وڵاتەدا هەموو شتەکان وەکوو حەمام کردنن. من مێردەکەمم خۆشدەوێ و نامەوێ بە هۆی چارشێوێکی نەفرەتییەوە تووشی کێشەی بکەم.» لێکدانەوەکانی لینا، نەک هەر ئەو ژنەی تێگەیاند، بەڵکوو ئەویش دەیگوت، ئەگەر پێویست بکات لەبەر هاوسەرەکەی ئامادەیە هەمان کار بکات.

■ ئامادەکاری بۆ گەڕانەوەی لینا بۆ ئورووپا

عەبدولڕەحمان خۆی بۆ سەفەری ئورووپا و بەجێگەیاندنی ئەرکی حیزبی لەوێ ئامادە دەکرد. پێش ڕۆشتنی ئەو، حیزب بڕیاڕی دابوو کە لینا و منداڵەکانیشی دەبێ لە ئێران بڕۆن. عەبدولڕەحمان ئەم بابەتەی لەبەردەم هاوکارەکانیدا بە لینا ڕاگەیاند. هاوکارەکانیشی هەریەکەو شتێکی لێ زیاد کرد و بە تایبەتی جەختیان لەوە دەکردەوە کە پێویستە لینا منداڵەکانی بە هەستێکی نیشتمانی و کوردانەوە پەروەردە بکات. لینا حەزی لەو زێدەڕۆییانە نەبوو. لە لایەکەوە، ڕاگەیاندنی ئەو بڕیارە لە لایەن عەبدولڕەحمانەوە بە بێ ئەوەی ڕاوێژی لەگەڵ لینا کردبێت، و لە لایەکی دیکەشەوە، زێدەڕۆییەکانی هاوکارەکانیان لە ئامۆژگاری کردنیدا، لینای بێزار کردبوو و هەربۆیەش، ڕووی لە هەموویان کرد و گوتی: «ئەگەر بەڕاستی حەزتان لێیە کە منداڵەکانمان وەکوو کوردەکان پەروەردە بن و لەم ناوەدا من بوومەتە هۆی مەترسی بۆ ئێوە، باشتر وایە لە یەکێک لە گوندە دوورەدەستەکانی ناو شاخەکانی کوردستان

بژین. ئاوا منداڵەکان بە کولتووری کوردەواری پەروەردە دەبن. بەڵام لە ئورووپا و بە بێ ئامادەبوونی باوکیان، هەر بیریشی لێ مەکەنەوە».

گەر دەتانهەوێ بڵێن لینا ئیتر ژنێکی پێگەیشتوو و تێگهیشتوو بوو، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە لەم بارەیەدا وا نەبوو. ئەو باش دەیزانی ئەم دابڕانە بۆ منداڵەکان کە چیدیکە باوکیان نابیننەوە، زۆر بە زەرەریان دەبێت. لە لایەکی دیکەشەوە، دەیزانی کە ڕۆشتن بۆ ئۆرووپا، واتە کۆتایی چالاکییەکانی لە بزووتنەوەی بەرگریدا. دیارە لەوەش ئاگادار بوو کە شوێنی ئەو لەو بزووتنەوەدا بە ئاسانی پڕ دەبێتەوە. باش دەیزانی کە لە سیستمی ئاڵۆزی کاری نهێنی دا، ئەو چەرخێکە لە چەرخەکان و ئەوەش کە لەم سیستمەدا، کەس نابێ ئاگای لە چالاکییەکانی ئەوی دیکە بێت و لە نەبوونی کەسێک دا، یەکێکی دیکە بە سانایی جێگەی دەگرێتەوە. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە بۆ لینا، دەست هەڵگرتن لە چالاکییەکانی زۆر ئەستەم بوو. ئەم چالاکییانە ببوونە هۆی ئەوەی کە لینا هەست بکات کەسێکی بەکەڵکە. هەروەها باوەڕی بەوەش هەبوو کە بوونی ئەو بۆ بەرگری کردن لە هاوسەرەکەی پێویستە. سەرەڕای ئەوەش، ئەو گەلێک ئۆگری ئێران و کوردستان ببوو. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، لە بەرانبەر بڕیاری دەرچوودا، هیچی پێ نەدەکرا. هەربۆیەش، لینا بە مەبەستی وەرگرتنی پاسپۆرت سەردانی سەفارەتی چێکۆسلۆڤاکی لە تارانی کرد. سەفیر کەسێک بوو بە ناوی ئاغای زاهۆرا (zahora). ئەو کەسێکی کۆنە کۆمۆنیست، پیاوێکی مرۆڤدۆست، دێموکراتێکی ڕاستگۆ و بە ورە بوو. لەو پیاوانە بوو کە توێژی نومانکاتوری چێکۆسلۆڤاکی بە ناردنیان بۆ پۆستە دوورەدەستەکان، لەملی خۆیان دەکردنەوە. سەفیری چێکۆسلۆڤاکی، یەکێک لەو پیاوانە بوو. ئەو زۆر نەژیا بۆ ئەوەی قووڵایی گەندەڵی و داڕزاویی ئەو سیستمە ببینێت کە هەموو تەمەنی خەباتی بۆ کردبوو و باوڕی بە درووستییەکەی هەبوو.

جەنابی سەفیر دەستبەجێ دەستی کرد بە تۆمار کردنی پاسپۆرت بۆ لینا و مینا. بەڵام گرفت ئەوکاتە دەستی پێکرد کە ئەوان لەگەڵ کێشەی

ڕێکەوتی ڤیزای هاتنەژوورەوەی ئێران لە پاسـپۆرتەکەیاندا ڕووبەڕوو بوون. لەو کاتەدا، بزووتنەوەی بەرگریی ئێرانیش لە ئیدارەی پاسپۆرت خەڵکی خۆیان نەبوو کە ئەو ئاستەنگە چارەسەر بکات. بەم چەشنە یەکەمین هەوڵی لینا بۆ چوونە دەرەوە لە ئێران شکستی هێنا.

ئەوان لە ڕێی پارێزەرێکەوە کە بە پارێزەری هەزاران ناوبانگی دەرکردبوو، هەوڵێکی دیکەیان دا. ئەم پارێزەرە کۆمۆنیستەش، بە کەڵک وەرگرتن لە پیشەکەی، لە ڕێگە یاسایی و نایاساییەوە هەوڵی زۆری دا و توانی پاسپۆرتێکی فەرمی بۆ لینا دەربکات، بەڵام بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی تاران لە پێدانی ئەو پاسپۆرتە بە پارێزەرەکە خۆی دەبوارد و دەیگوت کە خودی لینا دەبێ بۆ وەرگرتنەوەی پاسپۆرتەکەی سەردانیان بکات و لە ڕاستیدا ئەوە تەڵەیەک بوو بۆ لینا.

لە کار و چالاکیی نهێنی دا، زۆرجار مرۆڤ ناچار بە کردەوەی داهێنەرانە و دەستبەجێ دەبێت. خەباتکارە ئێرانییەکان، بە کورد و غەیرە کوردەوە، لەو بابەتە بێبەری نەبوون. ئەوان، سەرەڕای ئەوەی مەرگ ئاقاری تەنیبوون، باوەڕیان بە ژیان هەبوو.

عەبدولڕەحمان و هاوکارە کوردەکانی کە پلانیان بۆ ڕۆشتنی لینا لە ئێران دادەڕشت، لە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکدا بوون کە لینا لەو داوە داڕێژراوە ڕزگار بکەن. دواجار بڕیاریان دا کە لینا بە مەبەستی وەرگرتنی پاسپۆرتەکەی سەردانی بەڕێوەبەرایەتی پاسپۆرت بکات و لەوێش هەوڵ بدات دووگیانییەکەی و زگە بەرزەوە بووەکەی بنوێنێ. چەنکوو پۆلیس نەیدەوێرا ژنێکی دووگیانی بیانی دەستبەسەر بکات.

لینا پێی گوتن: «بەڵام نابێ ئەوە لە یاد بکەن کە من بیانی نیم.»

وەڵامیان دایەوە: «بەڵام هەیت».

لینا پرسیاری کرد: «چۆن؟»

وەڵامیان دایەوە: «سەفیری چێکۆسلۆڤاکی لە سەردانەکەی تۆ بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس ئاگادارە و ئەگەر تۆ لە گەڕانەوەی خۆت ئاگاداری نەکەیتەوە، ئەو ئەرکی خۆی جێبەجێ دەکا.»

چیرۆکێکی ساختەشیان بۆ لێنا ساز کرد و پێیان گوت کە دەبێ جەخت لەوە بکاتەوە کە هاوسەرەکەی بایەخێکی ئەوتۆ بەو و منداڵەکەی نادا و کاتێکیش دێتەوە، لەگەڵ هاوڕێکانی دێتەوە و کاتی خۆی بە یاری وەرەق لەگەڵ ئەوان دەباتە سەر، مەست دەکات و لە کاتی سەرخۆشیدا، بیانوویان پێ دەگرێت و توندوتیژی بەرانبەریان دەنوێنێت و هیچ ڕێزێک بۆ ژن و منداڵەکەی دانانێت و دواجار ئەوەیکە، تینی بۆ هاتووە و دەیهەوێ بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی و لە کۆتاییشدا بڵێت کە فارسی نازانێت و سەر لە سیاسەت دەرناکات و بە گشتی لەو ژیانە هاوبەشە پەشیمان بۆتەوە.

بڕیاردرا هەفتەیەک پاش ڕۆشتنی عەبدولڕەحمان، لێنا سەردانی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس بکات و هۆیەکەشی ئەوە بوو کە ئەوان دەبوو لەوە دڵنیا بن عەبدولڕەحمان لە سنوور پەڕیوەتەوە.

لێنا ڕووی تێکردن و گوتی: «ئەی ئەگەر لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس باوەڕ بە چیرۆکەکەم نەکەن و دەستبەسەرم کەن، ئەوسا چ دەبێت؟ مینا چی لێ بەسەر دێت؟ و ئایا ئێوە دەتانهەوێ من لە زینداندا منداڵەکەم ببێت؟»

لە وەڵامیدا گوتیان: «ڕێگە چارەیەکی دیکەمان نییە. دەبێ ئەو ڕیسکە بکەین».

هەموویان و تەنانەت هاوسەرەکەشی ڕازی بوون. ترس لێنای داگرتبوو. کاک سدیق هەوڵیدا دڵی بداتەوە و گوتی: «مینا لای زولەیخا (ژنی خاوەن ماڵ) دادەنێین. ئەو ئاگای لێی دەبێت. ئەگەر دۆخەکە تێک چوو، کچەکەت دەبەمە لای دایکم».

لێنا بەدڵیدا هات: «ئەشا ئەو دڵدانەوەیە؟! بە دڵنیاییەوە دۆخێکی بێ بەزەییانە بوو. بەڵام چاریش نەبوو. هەربۆیەش، لێنا قبووڵی کرد. لێنا گەنج، عاشق و تێگەیشتوو بوو، بەڵام ترسەکەی وای لێدەکرد پەنا بۆ پووشێکیش بەرێت. هەربۆیەش ڕووی تێکردن و گوتی: «ئێوە لەوە دەترسن من خەیانەتتان پێ بکەم؟»

ڕاســتییەکەی ئەوەیە کە ئەوان هیچ ترسێکیان نەبوو: عەبدولڕەحمان لەو کاتەدا، مەترسیی تێپەڕاندبوو و لینا‌ش، نە ناو و نە ناونیشانی هیچ کام لەو خەباتکارانەی نەدەزانی. لە ڕاســتیدا، چالاکیی نهێنی پارێزەری ئەوان بوو. پاشــان، ئــەوان هەمووماڵەکە گــەڕان و هەموو بەڵگەنامە مەترســیدارەکانیان نایــە کارتۆنێکی گــەورە و جانتایەکەوە. لینا دەبوو پــاش ڕۆشــتنی عەبدولڕەحمان، ئــەو بەڵگەنامانە بداتە دەســت ئاغای زاهورا، ســەفیری چیکۆسلۆڤاکی. جەنابی ســەفیر بەڵێنی دابوو ئەوانە لە ســەفارەت بشــارێتەوە. هەموو شــتێک ئامادە بوو و مابووەوە لینا یارییەکە بەرێتە پێشەوە.

■ سەفەری عەبدولڕەحمان بۆ ئورووپا و ڕۆشتنی لینا بۆ زاینگە

ســەرلەبەیانیی چوارشــەممەیەک، دەمــی بەیــان، بــە پەلەپــڕووزە ماڵئاواییــەکان کــران. عەبدولڕەحمــان و دوو هاوڕێــی بــەڕێ کەوتن. لــەم کاتەدا، پۆلیس زۆر بە جیددی و بە شــێوەیەکی کەم وێنە بەدوای عەبدولڕەحمانــەوە بوو. ئەو دەبوو ســەرەتا بــە پاس و دواتر بە پێ لە ڕێی شــاخەکانی کوردستانەوە ســەفەر بکات. لینا هەوڵی دەدا سەفەرە مەترسیدارەکەی عەبدولڕەحمان بێنێتە پێش چاوی خۆی، ئەو سەفەرەی کە لــە زەینی ئەودا، هەمیشــە بــە دەستبەســەربوونی عەبدولڕەحمان کۆتایــی پێدەهــات. هەربۆیەش لە کاتــی ماڵئاواییدا بــەدەم پاڕانەوەوە داوای لێکــرد: «هەر دەرفەتێکت بۆ هەڵکەوت، لە دۆخی خۆت ئاگادارم کــە». (دیارە عەبدولڕەحمان ئــاگاداری کردەوە، ئەویش، ئەو کاتەی کە خۆی لە ئورووپا گەڕایەوە و منداڵی دووهەمی ساڵەوەختە بوو!).

ئێــوارەی هەمان چوارشــەممە، منداڵەکەی نێو زگــی مینا، تەنگی پێ هەڵچنی. ســدیق هەوڵی دەدا هێوری کاتەوە و گوتی: «ســەیرە، هێشــا مانگێکی ماوە بۆ لەدایک بوونی!»

منداڵەکــە خەریــک بوو پێــش وەخت لەدایک بێت. بــەڵام لینا هەرچی دەکــرد ئەو پیاوەی بۆ تێنەدەگەیی. دواجار، لینا توانیی نیوە ســازانێک

لەگەڵ ئەو پیاوە بکات و ئەویش ئەوە بوو کە دەبوو سدیق مێنا بەرێتە لای دایکی و ئەگەر هیچ ڕووی نەدا، بیگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەوە. لە سەر نیشانەیەکیش ڕێک کەوتن و ئەویش ئەوە بوو کە ئەگەر لێنا کراسە سوورەکەی مینای لە دەرەوەی پەنجەرەکە هەڵواسی، واتاکەی ئەوە بوو کە لێنا خەریکە دەچێت بۆ زاینگە.

لێنا شمەکی پێویستی کۆکردەوە. سروشت خەریک بوو هەموو پرۆژە و بڕیارەکانی خەباتکارەکانی دەکردە بلقی سەرئاو. لێنا دەبوو پێش چوونی بۆ زاینگە، هەموو بەڵگەنامەکان بگەیەنێتە سەفارەتی چێکۆسلۆڤاکی. ئەو بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی ئەو بەڵگەنامەگەلە لە ماڵەوە بەجێ بهێڵێت. هەربۆیەش چاوەڕوانی دەکرد تا ئەو کاتە منداڵەکەی لەدایک نەبێت.

لای چواری بەیانی، لێنا ئاغای ئابراهامی لە خەو هەستان بۆ ئەوەی تاکسییەکی بۆ بگرێت. لەو کاتەدا، زۆربەی ماڵەکان تەلەفۆنیان نەبوو و لێناش نەیدەزانی تاکسییەکان شەوانە کار ناکەن. کاتژمێر شەشی بەیانی، ئاغای ئابراهام بە تاکسییەکەوە گەڕایەوە و پۆلیسێکیشی لەگەڵ بوو. لێنا کە چاوەڕوانی ئاغای ئابراهامی دەکرد، لە پشت دەرکەی ماڵەکە بە چەمەدان و کارتۆنەکەوە وەستا بوو. بەڵام ڕەوتی ڕووداوەکان ئاسایی نەدەچوونە پێش.

ئاغای ئابراهام (کە ئاگاداری دۆخەکە بوو) دەستبەجێ لێنای تێگەیاند کە بۆ دۆزینەوەی تاکسی ناچار بووە سەردانی ژاندارمێری بکات. ئەو پۆلیسە دوای ئابراهام کەوتبوو بۆ ئەوەی دڵنیا بێت بەڕاستی ژنێک ژان گرتوویەتی و هەروەها دەیویست بزانێ دەچێتە کام نەخۆشخانە. هێشتا لێنا زاری نەکردبووەوە کە بڵێت دەچێتە نەخۆشخانەی «ئامریکایی»، پۆلیسەکە ماڵئاوایی کردبوو و ڕۆشتبوو. تاکسییەکە چاوەڕوانی لێنا بوو.

لێنا بەخۆی دەگوت: «بیرۆکەی نەخۆشخانەی ئامریکاییم لە کوێ هێنا!» لەم گەڕەکە هەژارە، هیچ ژنێک لە نەخۆشخانەی ئامریکایی منداڵی

نابێت. ئەوان لەماڵەوە یان لە نەخۆشـــخانەی حکومەتی منداڵیان دەبێت. لـــە کاتێکدا کە لینا لە خۆی توورە بوو، شـــۆفیری تاکســـییەکە کارتۆن و چەمەدانەکـــەی دەخســـتە پشـــت ئۆتۆمبیلەکە. دواتـــر ئۆتۆمبیلەکەی پێکـــرد و ڕێـــی نەخۆشـــخانەی «ئامریکایـــی» گرتەبەر. ئێســـتا، دەبوو ورە بداتـــە بەر خۆی و داوا لە شـــۆفیرەکە بکات کە ســـەرەتا بیبات بۆ سەفارەتی چێکۆسلۆڤاکی و لەوێش چاوەڕوانی بکات و دواتر بیبات بۆ نەخۆشخانەی شـــۆرەوی. لە ڕاستیدا، لە ساڵەکانی ١٩٥٠دا، ژمارەیەک لە شۆفیر تاکســـییەکان هاوکاریی پۆلیسیان دەکرد. دواجار، لینا ورەی هەبووایـــە یان نە، بژاردەیەکی دیکەی لەبەردەســـتدا نەبوو. هەربۆیەش داخوازەکەی درکاند. شـــۆفیرەکە، لە ئاوێنەکەوە ماوەیەک سەیری کرد و ســـەرتا هیچی نەگوت. لینا تێگەیی کە شـــۆفیرەکە بیر دەکاتەوە و بە دڵنیاییـــەوە بـــە لای خۆیەوە دەڵێـــت ئەم ژنە دووگیانە کـــە ژان و ژۆر هەڵیپێچـــاوە، گوماناویی دێتە بەرچاو و هەربۆیەش باشـــتر وایە بیباتە ژاندارمێـــری، لـــەوێ پارەشـــی ئەدەنێ، با لەوێ لێـــی بپێچنەوە و خۆی بەرگـــری لـــە خۆی بکات، بەڵام ئەگەر ئەم ژنە لە ژاندارمێری تەنگی پێ هەڵچنرێـــت و منداڵەکـــەی ببێت، کەس باریقەڵای بـــۆ ناکات و پاش ئەم هەموو بێنە و بەرەیە، ئەو برە پارە کەمەی بۆ ئەو کارە دەیدەنێ، ئەوە ناهێنێت خۆی تووشی ئەو سەرئێشەیە بکات و ئەوسا هاوکارەکانیشی کـــە هەموویان کۆمۆنیســـت بـــوون، چییان پێ دەگوت؟ ئـــەوان چیدیکە نەیاندەدوانـــد و هەواڵی ئـــەم ڕووداوە بە خێرایی با بڵاو دەبووەوە و... هتد...

دواجار شۆفیرەکە ڕووی لە لینا کرد و گوتی: «بەسەر چاو خاتوون» و ڕێڕەوەکەی خۆی گۆڕی. پاش ئەوەی گەیشتنە سەفارەتی چێکۆسلۆڤاکی، لینا ماوەیەکی زۆر لە زەنگی درگای بەشـــی خزمەتگوزاریی سەفارەتی دا. لـــە چەمـــەدان و کارتۆنە پڕ لـــە بەڵگەنامەکانی بەر پێی تۆقیبوو. لەو بێدەنگییەی بەرەبەیانەدا، زەنگی سەفارەت دەزرینگایەوە و پۆلیسیش لە هەموو شوێنێک هەبوو. سکرتێرە پیرەکەی سەفارەت لاقی کێش دەکرد

و بــەرەو درکەکە دەهات، کاتێک دەرگاکەی کردەوە، هێشــتا چاوی بە خەوەوە بوو. دیار بوو بە پەلە کراسەکەی کردۆتە بەری، چونکە هێشتا بەشێک لە کراسەکەی لە دەرەوەی شەڵوارەکەیەوە بوو و دانەخرابوو. سکرتیرە پیرەکە، نەیدەهێشت لینا بچێتە ژوورەوە و پرسیاری هۆکاری سەردانەکەی لێکرد. لینا دەسبەجێ کارتۆنە گەورەکە و چەمەدانە پڕ لە بەڵگەنامەکانی دایە دەســت ســکرتێرەکە و داوای لێکرد بە پەلە سەفیر لە خەو هەســتێنێت. پاشــان، لەگەڵ ئەوەدا چاوی بڕیبووە سەرکەوتنی ســکرتێرەکە لە پلیکانەکان، لەسەر مۆبلێک دانیشت. بەرەژان تەنگی پێ هەڵدەچنــی، لینا دەســتی بــە زگیدا دەهێنا و دەیگــوت: « خۆڕاگر بە و تۆزێکــی دیکــەش دان بەخۆتــدا بگرە! مــن دڵنیام تۆ کوڕیــت و دەبیتە فتبۆلیستێکی ڕاستەقینە».

منداڵی یەکەمی لە دۆخێکی ئاساییدا ببوو و منداڵەکەش بۆ بوون هیچ پەلەیەکــی لێ نەکردبــوو. ئەمجارەیان، ڕێک بە پێچەوانــەوە، منداڵێکی تۆقە ئێخەی پێگرتبوو و دیارە لیناش بۆ لە ئامێز گرتنی بەپەلە بوو.

دۆخەکــە نائاســایی دەهاتــە بەرچــاو. لینــا بــە تەنیــا، لــە ڕێڕەوی ســەفارەتێکی کۆمۆنیســتی لــە وڵاتێکــدا کــە بــە شــێوەیەکی دڕندانە ڕاوەدووی کۆمۆنیستەکانیان دەنا، دانیشتبوو و سروشتیش بەپەلە بوو. ســەفیری بەڕێزیش کە هیچ پەلەیەکی نەبوو و بەکاوەخۆ لە پلیکانەکان دەهاتە خوارەوە، بە دەنگێکی برووسکەئاســا پرســیاری لە لینا کرد کە تۆ لەم کاتەی بەیانیدا لێرە چ دەکەیت و پاشان گوتی: «دیارە بە بینینت خۆشحاڵم».

لینــا لــە وەڵامدا گوتــی: «تکایە چاکــەم لەگەڵ بکە و بــە پێی بەڵێنی پێشــووترت ئەمانــە لێرە ڕابگرە! مــن دەبێ بە خێرایی خــۆم بگەیەنمە زاینگە.»

ئاغای سەفیر کە سەرەتا دوودڵ بوو، گوتی:»دەبوو هەر لە سەرتاوە بــە منت گوتبا، چونکوو من کاتێکی زۆرم داناوە بۆ ئەوەی جێی متمانە و ناساندن بم...».

لینا چیدیکە چاوەڕوان نەبوو. شکور بۆ خودا، تاکسییەکەش چاوەڕوانی دەکرد. سواری تاکسییەکە بوو و بە دەنگێکی پڕمتمانەوە داوای لە شۆفێرەکە کرد بیبات بۆ نەخۆشخانەی شۆرەوی. کرێی تاکسییەکە زۆر گران لەسەری کەوت. شۆفێرەکە کە نزیکەی کاتژمێرێک چاوەڕوانی کردبوو، لە بری یەک تمەن، پێنج تمەنی لێ وەرگرت، واتە هەموو ئەو برە پارەیەی کە لینا پێی بوو. عەبدولڕەحمان، پێش سەفەرەکەی، ڕێک پارەی منداڵبوون و مانەوەی یەک حەوتوو لە زاینگەی بۆ دانابوو، پێنج تمەنیش بۆ کرێ تاکسی و پارەی گیرفان (لەو کاتەدا کرێی تاکسی لە تاران یەک تمەن بۆ سەرێک بوو). عەبدولڕەحمان بە وردی حیسابی کردبوو و هەروەها بڕیاری دابوو کە سدیق، دواتر بڕێکی دیکە پارە بۆ لینا بهێنێت. هاوکات لەگەڵ گەیشتنی بۆ نەخۆشخانە، لینا دەستەوداوێنی هەموو خوداکان دەبوو و لێیان دەپاڕایەوە لە حەوشەکەدا منداڵەکەی نەبێت!

دەستبەجێ بردیانە ژووری منداڵبوون. منداڵبوونی پێش وەخت، ئاستەم و لە ڕاستیدا بۆ دڵی مەترسیدار بوو. پێشتر، لە ڕەزاییە، دوکتور ژێرمەن پێی گوتبوو کە دڵی لاوازە و بە بچووکترین گرفت، لەوانەیە بوەستێت. دواجار، منداڵەکە لەدایک بوو (کچ بوو). منداڵێکی ئاسایی و تەندروست، بەڵام دۆخی دایکی باش نەبوو. پاش منداڵبوونەکەی بە درێژایی ئەو ڕۆژە، دوکتورەکان بە پسپۆڕەکانی بواری دڵ و منداڵبوونیشەوە، هەموو شێوازە سەرەتاییەکانی پزیشکییان بۆ ڕزگار کردنی بەکار هێنابوو و لە پەستا پێیان دەگوت: «بەخەبەر بمێنەوە، نابێت بنوویت!» بەڵام، ئەو دەستبەجێ خەوی لێدەکەوت. دوکتورەکان سەرلەنوێ دووپاتیان دەکردەوە: «خانم هەستە، نابێ بنوویت، ئەگەر بنوویت، هەڵناسیتەوە» و بۆ ئەوەی نەهێڵن بخەوێت، چەندین کاتژمێر بە شەقازلە لێیاندا بۆ ئەوەی نەنوێت و تا ٧٢ کاتژمێر پاش ئەوەش نەنوێتەوە. ژنێک کە تازە سکوزای کردووە و کەسیش سەردانی نەکردووە بۆ ئەوەی بەشداریی لە شادیەکەیدا بکات، دەبێ چ هەستێکی

هەبێـت. ئەمــە جــاری دووهەم بوو کــە لینا خۆی لــە دۆخێکی وەهادا دەبینییەوە. جاری یەکەمیش، عەبدولڕەحمان لەوێ نەبوو! لینا هەســتی بە دەستەوەستانی و بێهێزی دەکرد.

(«لینــا دڵی خــۆی دەدایەوە و دەیگــوت: تۆ دەزانی بۆچــی تەنیایت! تۆ هاوســەری کەسـێکی شۆڕشـگێری: هەموو کەسـێک دەبێت خۆی لەگەڵ ئەو بەرپرسـایەتیەی لــە ژیانیدا هەڵیبــژاردووە، بگونجێنێت!» ـ پاشــان بە خۆی دەگوت: دیارە تۆ مافی خۆتە. هێرش مەکەرە ســەرم. لانیکــەم، مافی ئەوەم بــدەرێ کە ئاواتەخواز بــم دەرکەکە بکرێتەوە و عەبدولڕەحمان لە ئامێزم بگرێت و منیش هەندێ لە ئازار و ماندویەتیم بە شانی بسپێرم.») بەڵام درگاکە نەدەکرایەوە.

لەو نەخۆشــخانەیە لینا و ژنێکی ئەرمەنی هاوژوور بوون. ئەو ژنە دوازدە سـکی کردبوو و لەو کاتــەدا دوازدەهەمین کچی ببوو. لە پێش پەنجــەرەی ژوورەکەیــان لە نهۆمــی یەکەم، نەردە لێدرابوو و بەشــی منداڵبوونەکەشیان قۆرخ کردبوو. ئەندامانی بنەماڵە و کەس و کاری زۆر و زەبەن، ســەردانیان دەکرد و لەو دیو نەردەی پەنجەرەکەوە قسەیان لەگەڵ دەکرد. خواردن و شــیرنەمەنییان بۆ دەهێنا. بەڵام هەمووشــیان بە هۆی ئەوەوە کە کوڕی نەببوو، سەرزەنشــتیان دەکرد. پیاوەکان لە دەرەوە تفیان ڕۆدەکردە ســەر بنچکەکان و ژنەکانیش گۆنایان دەڕنی، وەک بڵێی کارەســاتێک ڕووی دابێت. ئەو ژنە بەســتەزمانەش، شەوانە بــۆ بێتاوانیی خۆی دەگریا و لەو ڕۆژە دەترســا کــە دەبوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.

ئەرمەنییەکان مەسیحین. بەڵام کەسانی سەر بە کەمینە ئایینییەکانیش لە نێو موسوڵمانەکانی ئەم ناوچانەدا دەژین، دەبێ خۆیان لەگەڵ ئایینی ئیســلام کە ئایینی زۆرینەی خەڵکە و هەروەها نەریتەکانیان بگونجێنن. بە هەرحاڵ، لە دەرئەنجامی ژیانی هاوبەشــی چەندین ســەد ســاڵەیان لەگەڵ موسوڵمانەکان، ئەم مەســیحیانەش کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی نەریتــەکان و شــێوازی ژیانــی ئایینی باڵادەســت. ئــەم بابەتە پێش بە

قەومانــی کێشــە و گرفـت دەگرێ. بــەڵام، کاتێک کە کەمینــە ئایینی و ئاینــزاکان بیانەوێ بەرگری لە شوناســی تایبەتیــی خۆیان بکەن، ئازار دەدرێن و هەندێ جاریش ســەرکوت دەکرێن و یان وەها دەکەونە ژێر گوشــارەوە کە ناچــار دەبن وڵات بەجێ بهێڵــن و دەکرێت لەو بارەوە ئامــاژە بە دۆخــی بەهاییــەکان و جوولەکەکان بکرێت. لە ڕاســتیدا، چ لــە ئێــران و چ لە وڵاتە ئیســلامییەکانی دیکــەدا، لە بیانییــەکان، بریتی لەوانەی وەکوو توریست بۆ ئەو وڵاتانە سەفەر دەکەن و یان ئەوانەی دەیانهــەوێ لەو وڵاتانە نیشــتەجێ بن، چــاوەڕوان دەکرێت کە خۆیان لەگەڵ داب و نەریتەکانی ئەوێ بگونجێنن و ڕێز لە ئایینی ئیسلام بگرن. وەک دەگوترێ: «چوویتە شاری کوێران، دەست بگرە بە چاوتەوە».

■ دەرچوون لە زاینگە

لێنا لەبەر خۆیەوە دەیگوت، تۆ بڵێی شۆفیری ئەو تاکسییەی هێنابووی بۆ نەخۆشخانە، دواتر چی کردبێت؟ لە لایەکی دیکەشەوە، چون پارەی نەبــوو، خەمی گەڕانەوە بۆ ماڵەکەی لەو ســەری تــاران دایگرتبوو. لە دۆخی ژیانی نهێنیدا، دەســتکورتی دەردێکی گرانە. سەرەڕای ئەوەش، لەدایک بوونی منداڵ لە نەخۆشــخانەی شــۆرەوی، لە ئێرانی ئەوسادا، کردەوەیەکــی ژیرانە نەبوو. ڕێژەیەکی بەرچاو لەو دژبەرانەی ڕێژیمی شــا کــە بەدوایانــدا دەگەڕان، لــە ڕزگار بوونــی خۆیانــدا ئەمەگداری شــۆفیر تاکسییەکانی تاران بوون. تۆ بڵێی ئەو شۆفیرِ تاکسییەی لێنای گەیاندبووە نەخۆشخانە، بە هۆی ئەوەوە کە لێنا ژن بووە و بایەخێکی ئەوتۆی نەبووە نەیدابێ بەدەســتەوە؟ یان بە هۆی ئەوەوە بووبێت کە بۆ بەدەســتەوە دانی درەنگ وەخۆ کەوتبوو؟ یان ڕەنگبێ، بەدەستیەوە دابێ و پۆلیس لە دەرەوەی نەخۆشخانە چاوەڕوانی دەکرد؟

پاشان، تاکسییەکی گرت و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و داوای لە خاوەنماڵە دەستکورتەکەی کرد کرێی تاکسییەکە بدات و دواجار تێگەیی شۆفیرەکە نەیداوە بەدەستەوە.

لــە مانگی ژووئیەدا، هــەوا لەڕادەبەدەر گەرم بــوو. هەربۆیەش، لێنا کۆرپەلەکەی بە تاقە کراسێکی تەنکەوە نایە زەمبیلی تایبەت بە منداڵەکە. خاتــوو زولەیخا هاتــە ژوورەوە و بــە بینینی کۆرپەکە هــاواری کرد: «وەی، چەنــدە بچووک و لاوازە!» زولەیخا ژنێکی دلۆڤان و مێهرەبان بــوو و بیری لــە منداڵەکە دەکردەوە، ئامۆژگاریــی لێنای دەکرد و پێی دەگوت بۆ ڕێک بوونی لاقی منداڵەکە، پێویستە مەلۆتکەی بکات. لێنا ملی نــەدەدا و لەو گەرمایەدا مەلۆتکەی پێ گونجاو نەبوو. زولەیخا ســوور بوو و دەیگوت: «پێویستە تێکەڵەیەک لە کولاوی زەردێنە هێلکە و ڕۆنی گوڵــە زەردە و گوڵەبەهــارەی بدەیتێ بۆ ئەوەی گەدە و ڕیخۆڵەی پاک کاتەوە». پاشانیش گوتی: «بوەستە، خۆم بۆتی ساز دەکەم» و بە پەلە چووە دەرەوە. لێنا کە متمانەیەکی وەهای بەو شــتانە نەبوو، نەیدەزانی چۆن ئەو پێشنیازە ڕەت کاتەوە و زولەیخاش زویر نەبێت.

هێندەی نەخایاند زولەیخا بە قاپێک کولاوی زەرد ڕەنگەوە گەڕایەوە و تەنگــی بە لێنــا هەڵچنیبوو: «گیانەکــەم، بیدەرێ بــا بیخوات». پاش ئەوەی هەســتی بە دوودڵی لێنا کرد، گوتی: «چاوەڕوانی چیت؟» بەڵام کۆرپەکە خەوی لێکەوتبوو و هەر ئەوەش فریای لێنا کەوت. هەربۆیەش ڕووی لە زولەیخا کرد و گوتی: «با هەستێ لە خەو، دەیدەمێ».

دواتــر، لێنــا قاپەکــەی بردەوە بۆ ژنــی خاوەن ماڵ و پێــی گوت کە کۆرپەکەی هەمووی خواردووە.

بۆ بەیانییەکەی، هاوڕێیان لە خەو هەســتان و ســدیق میناشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. مینا بە دەوری زەمبیلی خوشــکە بچووکەکەیدا ســەمای دەکرد و چەپڵەی لێدەدا و... پاشــان کراســەکەی دایکی هەڵدەدایەوە و ســەیری ســکی دەکرد. ئەمە، هەمان یاری بوو کە دایک و کچ لە کاتی دووگیان بوونی لێنادا دەیانکرد: وردە وردە کە سکی خڕ دەبووەوە، ئەو مینای بۆ ڕۆژی لەدایک بوونی منداڵەکەی ئامادە دەکرد. مینا پرسیاری لە دایکی دەکرد، منداڵەکە لە کوێیە؟ و دایکی لە کاتی جووانی ســکیدا، دەستە بچکۆلەکەی کچەکەی لەسەر سکی دادەنا و ئەو کردەوەیە مینای

سەرقاڵ و شاد دەکرد و گوێی دەنا بە سکی لێناوە و ئاواتی دەخواست هەرچی زووتر بیبینێت. یارییەکی سەرقاڵکەر و بەشکۆ بوو. ئەو ڕۆژە، کاتێک مینا سەری کردبوو بە ژێر کراسەکەی دایکیدا، پرسیاری لێکرد: «ئیتــر لێرە نییە؟» دایکی وەڵامی دایەوە: «نە، چیدیکە لەوێ نییە، ئەها لێرەیــە، لەناو زەمبیلەکەدایە». پاشــان هەردووکیان پێدەکەنین. میناش بە پەنجە ئاماژەی بۆ کۆرپەکە دەکرد، ســەری ڕادەوەشاند، وەک بڵێت تێگەییوە.

هاوڕێیان کە چەندساتێک لەبەر شەرم و حەیا خۆیان دوور گرتبوو، لــە لێنــا نزیک بوونەوە و پێیان گوت کە ئیشــیان پێیەتی. ئەوان بابەتی چوون بۆ بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسیان لەبیر نەکردبوو. بەڵام، لێنا لەبیری کردبــوو. لــەم کاتەدا، لێنا هەســتی بە شــەکەتی و لاوازی دەکرد و بە تایبەت دەیویســت کاتەکانی لەگەڵ منداڵەکانی بەرێتەسەر و سەرقاڵیان بێت. هەربۆیەش، بابەتی ڕۆشــتن بــۆ بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، چیدیکە سەرنجی ڕانەدەکێشا.

ئــەوان پێیان گــوت کە ڕواڵەتێکــی تۆقێنەری هەیــە. وتەکەی ئەوان، وەکــوو وتەکانی زولەیخا بۆ ئەوە نەدەبوو کە ورەی لێنا بەرز کاتەوە. لە ڕاســتیدا، ئەوان دەیانویســت لێنا تێبگەیەنن کە بەو ڕواڵەتەوە، کاتی ئەوەیە بۆ وەرگرتنی پاســپۆرتەکەی سەردانی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس بکات. ڕوویان لە لێنا کرد و گوتیان: «بەیانیی زوو، بە کۆرپەکەتەوە بچۆ بۆ بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس. بەم حاڵەتەوە، پۆلیس ناتوانن پاسپۆرتەکەت نەدەنێ. لە ترسی ئەوەی نەوەک لە زینداندا بمری ناوێرن دەستبەسەرت بکەن. پۆلیس ناچارە ئورووپایی بوونی تۆش ڕەچاو بکات». (لێنا برێک ڕاما و بە زەینیدا هات: «جوانە! ئەویش بەم پۆلیسەوە») بەڵام، ئەوان وازیــان نەدەهێنا و بــەردەوام ورەی لێنایان بەرز دەکردەوە. لێنا خۆی لە ئاوێنەدا بینیبوو، ئاوێنەکەی لابردبوو و چیدیکە ســەیری نەدەکرد تا ئەو ڕۆژەی هەست بکات هێزێکی بە بەردا هاتۆتەوە و ڕەنگ و ڕووی گەڕاوەتەوە. لێنا، بەڕاســتی شــێوەی پیرێژنێکی نەخۆشی لێ نیشتبوو.

دواجــار، لێنــاش قبوولــی کرد کــە پلانەکەیان عەقڵ دەیگــرێ و ئەوان لەو باشتر شارەزای باری دەروونناسی و کارکردی پۆلیسن. سەرەڕای قبــوڵ کردنی پلانەکەیان، لێنا لە ناخی خۆیدا حەزی دەکرد ئەوانیش لە جێی ئەو بوایەن، تا ئەوەی ئەو هەســتی پێدەکرد، ئەوانیش هەستی پێ بکەن. ئەو هەســتی دەکرد لە ماوەی چەند ڕۆژدا، هەموو هێز و ورەی چەند ساڵەی لەدەست دابوو، ئەو هێز و ورەی لەم کاتەدا پێویستییەکی زۆری پێی هەبوو! دواجار ڕووی تێکردن و گوتی: «من پەناباتێکیشــم لــە گیرفاندا نییە و تەنانەت کرێی تاکســییەکەش بە ژنی خاوەن ماڵەکە قــەرزدارم. چۆن دەتانهەوێ بچــم بۆ بەڕێوەبەرایەتیــی پۆلیس؟» لێنا دەیزانی دێر یا زوو، هەر دەبێ بچێ بۆ ئەو بەڕێوەبەرایەتییە. دەیویست هەندێ کات بدزێتەوە و سەرەڕای دڵنیا نەبوونی، چاوەڕوان بوو ئەوان ئەو دیدارەی کە لێنا لە دەرئەنجامەکانی دەترسا، هەندێ دوا بخەن.

هاوڕێکانــی بەڵێنیــان پێــدا کــە هەرچــی پارەیان لــە گیرفانــدا بێت، دەیخەنەسەریەک و دەیدەن بە سدیق بۆ ئەوەی هەر ئەو شەوە بیهێنێت بۆ لێنا. هەژاری شوورەیی نییە، بەڵام کاتێک لێنا بیر لە هەژاریی گرووپە خەباتکارەکەیان دەکاتەوە، هێشــتاش بڕبڕەی پشتی دەلەرزێ. بە هۆی ئەم هەژارییەوە، ئەگەر ڕۆژێک مەترسییەک بهاتبایەتە پێش، هاوڕێکانی تەنانەت بۆ ڕزگارکردنی خۆیان نەیاندەتوانی ســواری پاسی گشتی بن. هــەر ئەو هەژارییەش بــووە هۆی تێداچوونی زۆربــەی ئەندامانی ئەم گرووپە. زۆربەیان بە مەرگێکی توندوتیژ گیانی خۆیان بەخت کرد.

بڕیاریاندا لێنا سبەی، پێش چوونەدەرەوە لە ماڵ، قوماشێکی سوور لە پەنجەرەکەوە شــۆڕ کاتەوە. لە گەڕانەوەیدا لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، لێنا دەبوو ئەو قوماشە سوورە هەڵگرێت و ئەگەر گرفتێکی ئەمنیەتیی لە ئارادا بووایە، دەبوو قوماشێکی ڕەنگ پەمۆیی شۆڕ کاتەوە و هەروەها وەکــوو جاران، کاتژمێر ٣ی بەیانی، لە کۆڵان چاوی بە ســدیق کەوتبا و ئەگەریش دۆخەکە هێور و جێگر بوایە، لێنا دەبوو قوماشــێکی ســپی شــۆڕ کاتەوە. بڕیار وابوو ســدیق، لە پاشنیوەڕۆوە هەتا شەو، هەموو

سەری سەعاتێک لەبەردەم ئەو پەنجەرەوە تێپەڕێت و ئاگای لە ڕەنگی قوماشـــەکان بێت. هەڵبـــەت، هاوڕێکانـــی دڵنیایان کردبـــووەوە کە هیچ گرفتێک نایەتە پێش. بەڵام لینا ئەو گەشبینییەی ئەوانی نەبوو.

سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر، پێش ڕۆشتن بۆ بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، لینا مینای دابووە دەســـت زولەیخا و دەســـتبەجێ منداڵە هاروهاژەکانی زولەیخـــا تێـــی ورووکابـــوون و ســـەریان دەخستەســـەری. هـــەرا و هوریایەکیان نابۆوە کە لینا لە قسەکانی زولەیخا تێنەدەگەیی. بەڵام زۆر گوێـــی نەدەدایە، چونکوو منداڵەکەی بە ژنێکی مێهرەبان ســـپاردبوو و دەیزانی شەڕوقڕەی نێوان منداڵە کچ و کوڕەکان، بابەتێکی سروشتییە. هەربۆیەش خێرا چووە دەرەوە و دەرکەکەی لە پاش خۆی داخست. بۆ سەردانی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، لینا دەبوو لە یەکێک لە وێستگەکان، پاسەکەی بگۆڕێت و ئەوەش هەمان وێستگە بوو کە ماوەیەک لەوەپێش لینـــا لەوێ دیمەنێکی بینیبوو کە لەبیری نەکردبوو. ئەو ڕۆژە، خەڵک لە ڕیزێکـــی دوورودرێژدا چاوەڕوانی پاس بوون. دوو منداڵی دەوری ١٠ ســـاڵ، خۆیان لـــە ڕیزەکە نزیک کردەوە و ســـواڵیان دەکرد. یەکیان کە دەست و لاقێکی نەبوو، بە چێوشەق دەڕۆشت و ئەوی دیکەشیان بەدەم گریانەوە، نەهامەتییەکانی ئەوی یەکەمی بۆ خەڵکەکە روون دەکردەوە. ئەم بابەتە، ســـۆزی لینای جووڵاندبوو. کاتێک لینا سواری پاسەکە بوو و پاسەکە ڕێکەوت، چاوی بە دیمەنێکی سەرسوورهێنەر کەوت و بینی کە منداڵە ناتەواوەکە، خۆی ڕاوەشـــاند و باســـکی لە قۆڵ کراسەکەی و لاقە نوقوستانەکەشـــی لە دەرەلینگی شـــەڵوارەکەی هاتەدەرەوە. دواتر، هاوڕێکـــەی بە گاڵتەوە چێوشـــەقەکەی تێگرت و پاشـــان، هەردووکیان بەدەم پێکەنینەوە ڕایانکرد و ڕۆشتن. لینا بە بینینی ئەو دیمەنە، خەیاڵ بردیـــەوە و ئـــەو کردەوەیەی وەکوو چیرۆکەکانی تایبەت بە دەســـتەی بەڕەڵڵا و دزەکانی ناو هەزار و یەک شەو هاتەپێش چاو.

چونکە نەیدەزانی لە تارانیش تاقم و گرووپی ســـواڵکەرانی «کارامە» بوونیـــان هەیـــە کە منداڵان بە مەبەســـتی ســـواڵێکی ورد و کاریگەر و..

پەروەردە دەکەن. بیرهێنانەوەی ئەم بیرەوەرییە، بۆ ســاتێکیش بووبێ، لێنای لەو دڵەڕاوکێیەی بەربینگی گرتبوو، ڕزگار کرد.

■ لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس

بەڕێوەبەرایەتیــی پۆلیــس لە ناوەندی شــار هەڵکەوتبــوو، بینایەکی بەرفراوانی داگیر کردبوو. کاتی چوونەژوورەوە لە دەرکەی سەرەکییەوە، پۆلیســێک پێشی بە لێنا گرت و هۆکاری سەردانەکەی لێ پرسیار کرد. پاشــان داوای لێکرد چاوەڕوان بێت. لێنا کە لە پێش دەرکەی ژوورێکی گەورەدا وەستابوو، سەیری دوور کەوتنەوەی پۆلیسەکەی دەکرد، هەتا لە ڕێڕەوەکەدا لە چاو ون بوو. بە درێژایی ئەو ڕێڕەوە دوور و درێژە، مێــزی بچووکیــان ڕیز کردبــوو. کارمەندەکانی پۆلیس بــە جلوبەرگی مەدەنییەوە لە پشت مێزەکان و لە لایەکەی دیکەش، خەڵک دانیشتبوون. دۆخێکی ئاڵۆز و تەژی لە گوشار و دڵەڕاوکێ ئەو ناوەی تەنیبوو.

لێنــا، کۆرپــە دووڕۆژەکەی لە ئامێــز گرتبوو. کۆرپەکــە بە زرمە و تەپــەی پێیــەکان لە خەو هەڵدەســتا و ســەرلەنوێ دەنووســتەوە. لێنا هەوڵی دەدا بەســەر ترس و دڵەڕاوکێکەیدا زاڵ بێت. سەرەڕای ئەوەش کــە لێنــا لە باوەڕبەخۆ هێناندا کارامە بوو، لە ئانوســاتێکدا هەســتی بە دەستەوەستانی و بێ هێزی کرد. جەستە لەڕ و لاوازەکەی لێ ببوو بە بار. ئەژنۆی ســســت ببوو، هەســتی دەکرد پێویستی بە دانیشتنە. بەڵام هەموو کورسییەکان گیرابوون. لە زەینی خۆیدا، بە شوێن بیرۆکەیەکدا دەگەڕا تا خۆی پێوە سەرقاڵ کات و بێ هێزییەکەی لە بیر بکات.

هەربۆیەش، بەدەم سەیر کردنی کۆڵانەوە، بیری کەوتەوە زۆرجاران بەوێــدا تێپەڕیــوە و هەڵگــری پەیامگەلێک بووە یــان بڵاوکراوەکانی لە ژێر چارشــێوە ڕەشەکەیدا شاردبووەوە بۆ ئەوەی بیانگەیەنێتە هاوڕێ حیزبییەکانیان و ئەوەش کە لەو کاتانەدا، بە تەواوی لە خۆی دڵنیا بووە و هەرگیــز ئامادە نەبــووە خەیانەت بە هیچ کەس بــکات یان نهێنییەک ئاشــکرا بکات. کاتێــک بیری لەو بابەتانە دەکــردەوە، بە خۆی دەگوت،

دۆخـــی ئەو کەســـەی لەوێوە تێپەڕیـــوە، لەگەڵ دۆخـــی ئەمڕۆکەی، بە ســـەرنجدان بە زەیستانییەکەی و قەتیس بوونی لەم چواردیواریگەلەدا، زۆر جیـــاوازە و دواجـــار بەم ئەنجامە دەگەیشـــت: «باشـــە، ئێســـتا تۆ لێرەیت، زۆرجار بیرت لەوە کردۆتەوە کە ڕەنگە دەستبەســـەر بکرێیت و ڕاپێچی ئەم شوێنە تەژی لە نەهامەتی و خەفەتەت بکەن. هەربۆیەش، هەڵمەلەرزە، هێور بەرەوە و ئەو سناریۆیەی بۆت داڕێژراوە، دووپاتی کەرەوە و...».

دواتـــر، وەڵامـــی ناخـــی خۆی دایـــەوە: «باشـــە» و دەســـتی کرد بە دووپات کردنەوەی ســـێناریۆکەی: «پێش هەموو شـــتێک، تاقە زمانێک کە دەیزانی، زمانی ئینگلیسییە، مێردەکەت نەک هەر پێت ڕاناگا، بەڵکوو هەڵسوکەوتی خراپیشت لەگەڵ دەکات، زۆربەی کاتەکان بەبێ خەرجی و پـــارە بەجێـــت دەهێڵێت. کاتێکیش دێتەوە، هەمیشـــە چەند هاوڕێیەکی لەگەڵە و بەردەوام سەرخۆشـــە و سەرقاڵی خواردنەوە و یاری وەرەق دەبن و تۆش لێرە بێکەسیت و دەتهەوێ بگەڕێیتەوە بۆلای دایک و باوک و کـــەس وکارەکەت. ئەگەر پرســـیاری ناوی هاوڕێکانـــی مێردەکەتیان کـــرد، وا بنوێنە بیر لە ناوەکانیان دەکەیتـــەوە و دواجار بە بێ دوودڵی و خۆگنخانـــدن، لـــە خۆتەوە هـــەروا چەند ناوێک بڵـــێ و دواجار، خۆت ساویلکە و تەنانەت تا ڕادەیەک گێلۆکە دەربخە».

دواجـــار، پۆلیســـەکە گەڕایەوە و داوای لە لینا کـــرد دوای کەوێت. لە کۆتایـــی ئەو داڵانە دووروودرێـــژەدا، مێزێکی گەورەی لێبوو کە پیاوێکی ڕێکپۆش لە پشـــتی دانیشتبوو و پاســـپۆرتەکەی لینای بەدەستەوە بوو، ڕووی لە لینا کرد: «خاتوون، ئەمە پاسپۆرتی بەڕێزتە. دەبێ چاوەڕوان بیت هەتا بەڕێوەبەر بێتەوە و واژۆی بکات و خۆی پێتی بداتەوە».

لینا ئەژنۆی شـــل ببوو، هەربۆیەش، بە قورسی، وەک بەربووبێتەوە، لەسەر کورسیی بەردەم مێزەکە، بەرانبەر پیاوی پشت مێزەکە دانیشت و خۆی ڕێک و پێک کرد. هەســـتی دەکرد هەواکە قورســـە و هەناسەی بـــۆ نادرێت. کۆرپەکـــەی لە ئامێزیدا ڕادەژەند، ڕاژەندنێکی لەســـەرەخۆ

کـە لـەو دۆخـەدا دەبووە هـۆی ئارامیی خۆیشـی. بەڵام، ترسـەکەی نێو مێشـکی دەسـتی لە بەرۆکی بەرنەدەدا و سـات بە سـات پەرەی دەسـەند و لینا بـە دووپـات کردنـەوەی وتەکانی پیاوە ڕێکپۆشـەکە «بەڕێوەبـەر.. واژۆ.. بۆخـۆی...» بەخۆی دەگوت، گومـان لەوەدا نییە کە بەم سـانایيە لێرە دەرباز نابێت و دەگەیشـتە ئەو ئاکامە کە ئەوان يارییەکیان لەگەڵ ئەم دەست پێکردووە کە ئەم نە ڕێساکانی دەزانێ و نە چارەسەرییەکەشی و ئەوەش کە ئەوان لەو شارەزاتر و کارامەترن. لـەم کاتەدا، لینا جووڵەیەکی کرد، وەک بیەوێ پاسـپۆرتەکە هەڵگرێت. ئەو پیاوە نەیهێشـت. پاشان، لینا سەیری کرد و بە ئینگلیسی پێی گوت کە لە فارسی تێناگات. پیاوەکەش بە ئاماژە تێی گەیاند کە دانیشێت.

ڕێژیمـی دوا پاشـا، تـەژی لـە ناهاوئاهەنگی بوو. ئـەم ڕێژیمە مافە بنەڕەتییەکانی خەڵکی ئێرانی پێشێل دەکرد. هەربۆیەش، خەڵک لە دژی ئەم سیسـتمە خوێنڕێژە هەڵدەستانەوە. پاش ئەم سەردەمی ناڕەزایەتی دەربڕینە، ڕێژیم بۆ بێدەنگ کردنی خەڵک، دەستی دایە کۆمەڵێک کردەوە لە بواری گەشەی کولتووریدا، هەندێ مافی بۆ ژنانی ئێران ڕەچاو کرد و تەنانەت هەنگاوگەلێکیشی لە بواری بە پیشەیی کردنی وڵات هەڵگرت و ئەوەش لە دۆخێکدا بوو کە خۆڕاگریی خەڵک پەرەی دەسەند. ڕێژیم لە ڕێی بەهێز کردنی دام ودەزگای سـەرکوت و زوڵم و زۆری خۆی، دژکـردەوەی نیشـان دەدا. لـە سـاڵەکانی ١٩٥٠ دا زیندانەکانی ئێران ئاخنرا بوون.

تـرس لە ئـازار، هەندێجار لـە خـودی ئازارەکە تۆقێنەرتـرە. بەڵام، ئەوەش ڕاسـتە کـە ئازار، هەندێ جار زمان وەگـەڕ دەخات. هەبوونی ئیرادەیەکی پتەو، لە نەدرکاندنی زانیاری لە ژێر ئەشـکەنجەدا، ڕۆڵێکی کارا دەگێڕێ. بەڵام کاتێک ئێش و ئازار تاقەت پڕووکێن دەبێ، پێدەچێ کار لە ئیرادەش بکات و سستی بکاتەوە، سەرەڕای ئەوەش، زۆر بوون ئـەو پیـاو و ژنانەیش کـە لە ژێر ئەشـکەنجەدا گیانیـان بەخت کرد و ڕۆحیان سـپارد، بـەڵام متەقیان لێوە نەهات. بۆ گەیشـتن بە قۆناغێکی

وەها لە سڕ بوونی جەستە، پێویستە ئیرادە و ورەیەکی یەکجار بەرزت هەبێ.

هیــچ کەس ناتوانێت خــۆی ڕابنێ و بڵێت لە ژێر ئەشــکەنجەدا خۆی ڕادەگرێــت. لەگەڵ ئەوەشــدا، شۆڕشــگێڕانی ئەو ســەردەمە، ئەوەیان نەدەزانــی و هەربۆیەش، ئەگەر کەســێک لەژێر ئەشــکەنجەدا شــتێکی بدرکاندایــە، بەچــاوی خائیــن و دۆڕاو ســەیر دەکرا. بــەڵام، ئەوانەی شــارەزای ڕاستییەکە بوون، ئەشکەنجەگەرەکان بوون. ئەوانەی بۆ ئەو کارە، هەموو ڕۆژێک ڕادەهێنران، فێر ببوون چلۆن ئاســتی خۆڕاگریی ئەو کەسەی دەیانهەوێ قسەیەکی لێ دەرکێشن، بە هاسانی هەڵسەنگێنن. لە لایەکی دیکەشــەوە، ئەوان خۆیان بە باڵاتــر دەزانی و بڕوایان بەوە هەبــوو کە هیچ کەس بە بێ ئەوەی بێتەگۆ، لەبن دەســتیان دەرناچێت. ئەوەش ڕاســتە کە ڕێژیمی شــا توانــی بە گرتن و کوشــتن، ڕێژەیەک لــە خەباتکاران لەنــاو بەرێت و دواتر، لەگەڵ شکســت و نیشــتنەوەی کــەف و کوڵــی بزووتنــەوەدا، وردە وردە قورســایی دام و دەزگاکانی ســەرکوتی کــەم دەکــردەوە. لە دۆخێکــی وەهادا بوو کە ئــەوان مافی ئەوەیان بە خۆیان دەدا ســەبارەت بە بەکارهێنانی ئەشــکەنجە لەســەر زیندانییەکان هەڵسوکەوتی جیاواز بگرنە بەر. زیندانییەکان، بە پێی پێگە و گرینگییــان، پۆلین دەکران و هەر بەو پێیەش، شــێوازی ئەشــکەنجە کردنیان، شــکڵێکی «کەســیی»بە خۆیەوە دەگرت و ئەم ڕەوشــە هەتا سەرهەڵدان و ڕابوونێکی دیکە بەردەوام دەبوو.

لێنا، چاوەڕوان بوو بێن و بیبەن و دڵنیا بوو کە چیتر چوونە دەرەوە لەو شــوێنە نابینێتەوە. هەربۆیەش، مێشکی ســەرقاڵی زۆر شت ببوو: («بۆچی بەقســەی ئەو هاوڕێیانــەم کرد؟ هیچیان زیندانیــان نەبینیوە. هیچیان ئەشــکەنجە نەکراون...هیچیان لە هەستی «دایکایەتی» تێناگەن. بۆچــی بیــرم لــەم بابەتانە نەکــردەوە؟ تۆ بڵێــی من شــێت بووبم کە منداڵەکەمــم لەگەڵ خۆم هێنــاوە» کەس ناتوانێت منداڵەکەم لێرە ڕزگار بــکات و بۆچیــش بێــن؟ بێن بۆ ئەوەی بە دەســتی خۆیــان، خۆیان بە

گرتــن بــدەن؟ منداڵەکــەم مەحکوومە بــەوەی لەگەڵ مــن بمێنێتەوە و بەکرێگیراوانــی ڕێژیــم منداڵەکــەم دەکەنە ئامرازی ئەشــکەنجەی من. خودایا، بۆچی منداڵم بوو؟ چۆن توانیم ئەم هەڵە گەورەیە بکەم؟ بە بێ دایک مینای بچکۆلانە چ چارەنووســێکی دەبێت؟». لینا لە شەرمەزاریی خۆیدا هەڵدەلەرزی.

بــە پێــی کاتژمێــرە دیوارییەکــە، دەوری چــل خولــەک دەبــوو کــە چاوەڕوان بوو و ئەوەش بەلایەوە ســەیر بوو. هەســتی دەکرد ماوەی چاوەڕوانییەکەی زۆر زیاتر لەوە بووە. بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا، لینا سپاسی شێوازی سەخت و توندی پەروەردەی خۆی دەکرد. بەردەوام پێیــان گوتبوو: «هەرگیز مەناڵێنە! ئەوەی هەســتی پێدەکەی مەیدرکێنە! نابــێ ئازارەکانت دەربخەیــت و...» هەرگیز کەس نــازی هەڵنەگرتبوو، دەستێکیان بەسەریدا نەکێشا بوو و بە بالایدا هەڵیان نەدابوو. ئەو گەلێک جار بەو کەمتەرخەمییانەوە ئازاری کێشابوو. ئەمڕۆکە، هەموو ئەمانە، بــە هانایەوە هاتبوون. لە ســەردەمی منداڵیدا لە بێبەشــییەکانی ئازاری کێشــابوو و هــەر لەو ســەردەمەوە گەلێک لە ئێش و ژانی جەســتەیی تۆقیبوو. ئەو خۆی بۆ ئەشــکەنجەکران ئامادە دەکرد و لەو بۆشــاییەی بەرەوڕووی بوو، تۆقابوو.

لەو ســەردەمەدا، ڕێژیمی سەڵتەنەتی هەندێ ســەرکەوتنی بەدەست هێنابوو. موســەدیقی دێموکراتی لە ساڵی ١٩٥٣دا لە پەلوپۆ خستبوو و ڕێکخراوی ئەفسەرەکانی حیزبی توودەی لە نێوخۆیدا هەڵوەشاندبووەوە (١٩٥٦). ئــەم بابەتە بۆ شــای ئێــران ســەرکەوتنێکی چاوەڕواننەکراو بــوو. نزیکەی ٦٥٠ کەس لە ئەفســەرە پایەبەرزەکان و هەروەها ١٥٠٠ کەس لە ئەفسەرە پلە نزمەکانی خستبووە پشت میلەکانی زیندان و یان لەنــاوی بردبــوون. هەندێکیان توانیان فریای خۆیــان بکەون و ڕاکەن. بەڵام لەوانەی دەستبەســەر کرابوون، تەنیا ڕێژەیەکی کەمیان لە مردن ڕزگاریــان بــوو. پاش ئەم «ســەرکەوتنە»، شــا بیری لــە لەناوبردنی ڕێبەرانــی حیزبی تــوودە و ڕێبەرانــی بزووتنــەوە ڕزگاریخوازەکانی

کەمینــەکان، بە تایبەتــی ڕێبەرانی بزووتنەوەی کــوردی دەکردەوە. بە کورتی، مەبەستی ئەو، لەناوبردنی هەموو خەباتکارانی ڕێگای ڕزگاری بوو و تەنیا ئەو کاتە بوو کە هەســتی بە ئارامی دەکرد. دیارە ئەوەش خەونی هەموو مرۆڤە سەرەڕۆکانە.

لینا، دیســانەوە خەیــاڵات هەڵیگرت و لە بەرخۆیەوە قســەی دەکرد: «دەکرێ پۆلیس چ شــتێک ســەبارەت بە ئێمە بزانــێ؟ چیمان کردبێت، لەوپەڕی نهێنیکاریدا بووە. ئەگەریش پۆلیس، شوێنی ئێمەی هەڵکردبێت، دەبــوو ئێســتا هەموومــان گیراباین. بەو پێیە، مەبەســتی ســەرەکییان عەبدولڕەحمانــە!. عەبدولڕەحمــان هەمیشــە لە ســەفەردا بوو و منیش بەردەوام حەشــارگەی خۆمم گۆڕیوە. بە ســەرنجدان بــەو ئاڵۆزیی و گۆڕینی حەشارگەیە، بە هیچ شێوەیەک ڕێی تێنەدەچوو کە بماندۆزنەوە. ئێســتا کە بــە پێی خۆمان، خۆمان خســتۆتە کونی گورگــەوە، هەلێکی چاوەڕواننەکراومان بۆ ڕەخساندوون. شوکور بۆ خودا عەبدولڕەحمان وڵاتی بەجێهێشتووە!». لینا سەری لەگێژەوە دەهات.

عەبدولڕەحمــان و لینــا، هەردووکیــان دڵنیا بــوون کە لــە ژیانیاندا، هیــچ شــتێک گرینگتر لــەو ڕێگایە نییە کــە بــۆ ڕزگاری خەڵکی کورد گرتوویانەتەبــەر. ئــەوان پێداگر بــوون کە درێژە بــە ڕێگاکەیان بدەن: ئەوان دەیانویســت ئاڵوگۆڕ لە دنیادا پێــک بهێنن و بە کەمتریش ڕازی نەبوون.

ئێســتاش، لینــا کەوتبــووە داوێکــەوە کــە ڕزگاربوونی بــۆ نەبوو و هەربۆیــەش، چیدیکە نەیدەتوانی وەکوو مرۆڤێکــی بەکەڵک و کاریگەر ڕۆڵ بگێڕێت.

لەم کاتەدا، کەسێک دەستی خستە سەرشانی لینا و لە دنیای خەیاڵات دەریهێنا. ئەو پیاوە داوای لێکرد دوای کەوێت. هەربۆیەش، لینا هەســتا و دوای ڕێنماکــەی کەوت. پــاش تێپەڕاندنی دالانــی زۆر، پیاوی ڕێنما لە بەردەم دەرکەیەکی بەرزدا وەســتا و بە پیاوێکی دیکە کە لە پشــت مێزێــک دانیشــتبوو، ڕایگەیانــد: «بەڕێز، ئەمەش ئــەو خانمەی داواتان

کردبــو». دواتر خــۆی لادا و ڕێگەی چوونــە ژوورەوەی بۆ لێنا چۆڵ کرد. پیاوی پشــت مێزەکە پێی نابووە تەمەنەوە، بە ئاماژە داوای لێکرد بچێتە پێشــەوە. زۆری نەخایاند بۆ ئەوەی لێنــا تێبگات لەبەردەم کێ‌دا وەســتاوە. ئەژنۆی سســت ببــوو. لێنا لــە لایەکەوە چنگی لــە مێزەکە گیرکردبوو و لە لایەکی دیکەشەوە، کۆرپەکەی لکاندبوو بە سینگییەوە. بەردەنگەکــەی « تەیمــوور بەختیار» بوو. تەیمــووری بەختیار لەگەڵ هیــچ خاوەن پلەیەکی دیکە بەراورد نەدەکرا. ئەو بەرپرســی هێزەکانی شاهەنشایی، پۆلیســی دەوڵەتی، ساواک (پۆلیسی نهێنی) و ڕۆکنی ٢ی (بەشی تایبەت لە ئەرتەشی شاهەنشایی دا، بۆ بەدواداچوونی دژبەران، واتە پۆلیسی سیاسی) لە ئەستۆ بوو. لە ڕاستیدا، واژۆ کردنی پاسپۆرت ئەرکی ئەو نەبوو. لە تەمەنی حەوت ســاڵاندا، واتە ساڵێک پاش مەرگی دایکی کە وەکوو برینێکی ناســۆر ئازاری پێوە دەکێشــا، لێنا بەڵێنی بە سپیدارە خۆشەویستەکەی خۆی دابوو کە هەرگیز نەبێتە هۆی ئازاری هیــچ کەس. بــەڵام ئەمرۆکە بە ڕۆشــتنی بــۆ بەرێوەبەرایەتیی پۆلیس، خەریــک بوو زوڵمی لــە منداڵەکانی خۆی دەکرد و ئیــدی بۆ گەڕانەوە گەلێک درەنگ بوو.

ڕەنگە هۆکاری ئەم ڕیوایەتەش هەر ئەمە بێت.

بۆ تێگەیشتن لە ئێستا و پڕناوەرۆک کردنی داهاتوو، ڕابردوو گەلێک گرینگە.

هەندێ کەس ئامۆژگاری دەکەن کە گوایە، بە مەبەستی ڕەچاوکردنی بــاری دەروونیــی مرۆڤــەکان، دەبــێ ئەوەی ڕوویــداوە، بــە بێدەنگی تێپەڕێنیــت. بەڵام پێویســتە بزانیت کە کردەوەیەکــی وەها دەبێتە هۆی خراپ تێگەیشــتن لە ڕووداوەکان و بابەتەکان. سەرپۆش دانان لەسەر ئــەوەی لە ژیانــی مرۆڤەکاندا ڕوویانداوە، ئەوپــەڕی بێ ورەییە. ژیان، وەک ئــەوەی مــرۆڤ لــە منداڵیدا بیــری لێدەکاتەوە، ئەوەندەش ســانا نییە. ژیانی لێنا بە شــێوەیەکی تایبەت ئاڵۆز بوو. لە بەرانبەر بەرپرسی ســاواک، نــاوی هاوڕێکانیان بە مێشــکیدا تێدەپەڕی و ئەو پرســیاری

لــە خــۆی دەکرد کە ســەرەتا خەیانەت لــە کامیــان دەکات و ناوەکەی دەدرکێنێــت. دیارە، بە تەواوی لەبیری کردبوو کە نە ناوی ڕاســتەقینە و نــە ناونیشــانیان نازانێت. ئــەو لە بەرانبەر تەیمــووری بەختیاردا، لە کەروێشــکێکی عەبەسراوی بەرانبەر مارێکی کوبرا دەچوو. بەختیار بە زمانی فارسی قسەی لەگەڵ دەکرد. لینا، ڕواڵەتی مرۆڤێکی گێژ و وڕی بە خۆ گرتبوو و ســەیری دەکرد. بە پێی ئەو ســیناریۆیەی هاوڕێکانی بۆیان داڕشتبوو، ئەو پێویستی بە «ڕۆڵ گێڕان» نەبوو. بەڵکوو دەبوو لــە ناخەوە، هەوڵ بدات ئەوەی دەبوو بیــکات و بیڵێت، وەبیر بێنێتەوە. هەربۆیەش بە زمانی ئینگلیسی وەڵامی دایەوە: «من فارسی نازانم» و ئەو ڕستەیەی بە وەستان لەسەر وشە بە وشەی دەربڕی.

پــاش ئــەوە، لینا هەســتی بــە ئاســوودەییەک کــرد. چونکــە بابەتە ســەرەکییەکەی لەبیر نەکردبوو و ئەوەش ئــەوە بوو کە نابێت بە هیچ شــێوەیەک دان بەوەدا بنێت کە فارسی دەزانێت. بەختیاریش، ئینگلیسی نەدەزانی. ئەو زمانی فەرانسەی خوێندبوو و لیناش شارەزای ئەو زمانە نەبوو. تەیمووری بەختیار ســەرلەنوێ هەوڵی دایەوە و گوتی: «خانم، من دەزانم کە تۆ فارسی دەزانی».

ئەو لە جێی خۆی نەجووڵا و هەروا سەیری بەختیاری دەکرد. بەڵام، هــەر چۆنێــک بێت، ئەو وتەیــەی بەختیار بووە هۆی سەرســووڕمانی لینا و پرســیاری لە خۆی دەکرد: ئەو چۆن دەزانێت کە لینا دەتوانێ بە زمانی فارسی قسە بکات؟ پێویست بوو لینا بیر لەو بابەتە نەکاتەوە و لە یارییەکەی بەردەوام بێت. بەختیار چاوی بڕیبووە پەنجەکانی خۆی و بە ورتەورت گوتی: «دواتر دەردەکەوێت». پاشان ئاماژەی بە کورسییەک کرد لە چەند میتریی مێزەکەی خۆیدا. لینا لەسەر کورسییەکە دانیشت و بە دەم بزەوە بە زمانی ئینگلیسی گوتی: «سپاس». هەوڵێکی ساویلکانە بوو بۆ بەبێتاوان و پاک نواندنی خۆی. بەڵام، سەبارەت بە بزەکەی لینا، دەبێت بڵێین ئەو هەوڵە ساختەیە وەک نازێکی ژنانە، هیچ کاریگەرییەکی لەسەر بەختیار نەبوو. ئەو دێوێک بوو لە شکڵی مرۆڤدا.

کورسـییەکە ڕەق بـوو. بەڵام بە نیسـبەت پەنجەرەکـەوە کەوتبووە شـوێنێکی سـێبەرەوە و لینا بیری لەوە دەکردەوە کە ئەو سـێبەرە لە بەرژەوەندیی ئەوە و خۆرەتاوەکە کار لە ڕادەی بینینی چاوی بەختیار دەکا. بـەڵام، ئـەو هەڵە بـوو. چوونکوو خۆرەتـاو کار لە چاوی ڕەش ناکات و چاوی بەختیاریش ڕەش بوو.

بەختیار زەنگی لێدا و کارمەندێک هاتەژوورەوە. دەستی بە نووسینی هەندێ شت لەسەر لاپەڕەیەک کرد و دایە دەست کارمەندەکە و گوتی: «خێـرا ئـەم فایلانەم بۆ بێنـن». دیار بوو کە خووی بـە فرمان کردن کردبـوو، هەرچەند ئەو فرمانەی بە شـێوازێکی بەئـەدەب دەربڕیبوو. ئـەو کارمەندە بە دوو فایلەوە گەڕایەوە. یەکێک لە فایلەکان ئەسـتوور و ئەویدیکەیـان ناسـک بوو. بەختیار فایلە ناسـکەکەی کردەوە و پاش هەڵدانـەوەی لاپەڕەکانـی، ڕووی لە لینا کرد و گوتـی: «لێرە، بە ڕەش لەسـەر سـپی نووسـراوە کە جەنابت زۆر بە ڕەوانی بە فارسـی قسە دەکەیت».

لینا هەروا کە سەیری تەیمووری بەختیاری دەکرد، وەڵامی نەدایەوە. تەیمـوور سـاتێک وەسـتا و بەردەوام بـوو: «هەر ئێسـتاکە، بە هۆی پەیوەسـت بوونـت بـە بزووتنـەوەی تاوانبارانەی هاوسـەرەکەتەوە، دەتخەمە زیندانەوە». لینا سەیری ئەو پیاوەی دەکرد کە چارەنووسیان لە دەستەکانیدا بوو، وەکوو قوتابییەکی زیرەک و بە ئەدەب کە لەبیری کـردووە وانەکانـی جێبەجێ بکات، وێڕای داوای لێبـووردن، بە زمانی ئینگلیسی گوتی: «لە وتەکانتان تێناگەم».

لێنـا پرسـیاری لە خـۆی دەکرد: «ئـەو فایلـەی ئەسـتوورییەکەی دەوری پێنـج سـانتیم دەبـوو، کام بەش لە چالاکییەکانـی ئەوی لەخۆ گرتـووە؟ مەیلی بینینـی ئەو فایلە ئاگری لە ناخـی بەردابوو. پێدەچوو فایلە ئەسـتوورەکەی دیکە، فایلی عەبدولڕەحمان بێت. بەردەسـتەکە لە ژوورەکەدا، چاوەڕوان بوو. بەختیار ڕووی لە بەردەسـتەکە کرد و بە ئاماژەی پەنجە لینا و کۆرپەکەی نیشـانی دا و گوتی: «سـەربازەکانی

«گارد» بانگ بکە و بە زیندانەوانەکە بڵێ چاڵەڕەشـێک بۆ ئەو دووانە ئامادە بکات».

لینـا دڵی خـۆی ئەدایەوە: «لەســەرەخۆبە، دان بەخۆتدا بگرە! ورەت دانەبەزێت!» پاشان بە هەموو هێزییەوە، پشتی لە پشتەوەی کورسییەکە توند کرد. هەموو ئەندامانی جەســتەی، وەکـوو لێدانی دڵی، کەوتبوونە ترپەتـرپ و پاشــان بەخۆی گـوت: «ئەو نابێ تێبگات مـن لە وتەکانی تێگەییوم، نابێ هەســت بە دڵەڕاوکێکەی من بکات». بۆ خۆ دزینەوە لە نیگای بەختیار، ڕووی کرد بە لای کۆرپەکەیەوە.

لــە دەرکــە درا. لینا کە لە ترســاندا ڕچا بوو، بینــی دوو پیاوی گەنج بــە یۆنیفۆرمی ســەربازییەوە هاتنــەژوورەوە. هەریەکەیــان چەکێکی سەرنێزەداریان بە دەستەوە بوو.

بەختیار ئەمری کرد: «لەوێ چاوەڕوان بن». هەربۆیەش، ئەو دووە، لــە ئەملاوئەولای دەرکەی ژوورەکەوە جێگــر بوون. ئەو دووانە کە لە ڕێنمای جەهەننەم دەچوون، ڕێکپۆش و تەندروست بوون و ڕواڵەتێکی پــاک و بێتاوانیان هەبوو! ڕەنگە لە ژیانی ئاســایی خۆیاندا، کوڕان یان براگەلێکی مێهرەبان بووبن. لینا ماوەیەکی زۆر بە وردی سەیری کردن و دواتر بە چاوێکی پڕ لە پرســیارەوە ســەیری بەرپرســەکەیانی کرد. ئەم دۆخە، ڕوویەکی دیکە لە تواناکانی لینای ئاشــکرا دەکرد و ئەویش توانای ڕۆڵگێڕان بوو. لەو کاتەدا، ئەو تەمەنی تەنیا ٢١ ساڵ بوو.

بەختیار هێرشی دەستپێکرد و گوتی: «دەست لەم گاڵتەجاڕە هەڵگرە. بە من بڵێ هاوسەرەکەت لە کوێیە و ئێمەش ئیزنی گەڕانەوە بۆ ماڵەوەت پێدەدەین». داو بوو. هەربۆیەش، هەستی بەرگری لە لینادا گەشەی کرد و لەگەڵ ئەوەدا کە خۆی شلەژاو و ورووژاو نیشان دەدا، بە پەلە دەستی کرد بە قسە کردن و بە زمانی ئینگلیسی ئەو چیرۆکەی دەگێڕایەوە کە هاوڕێکان بۆیان داڕشتبوو. لە ڕاستیدا، بەم فێڵە، لینا هەوڵی دەدا بەڵکوو بتوانێت ئەو دۆخە مەترســیدارە بگۆڕێت، بەو هیوایەی ڕێگەچارەیەکی موعجیزە ئاســا بدۆزرێتەوە. لەم کاتەدا، ئەو هێشــتا نەیدەزانی کە ئەو

ڕێگەچارەیــەی دۆزیوەتەوە. بەختیــار ئەو بابەتەی وەکــوو دانپێدانان وەرگــرت و بە بێ ئەوەی چــاو لە لینا بترووکێنێــت، دەرکەی کردەوە و ئەمریکــی کــرد و گەڕایەوە پشــت مێزەکەی خۆی. لــەو کاتەوە لینا پێــی نابــووە ئــەو ژوورەوە، ئەمە یەکــەم جار بوو کە بــە جوانی ئەو پیــاوە مەترســیدارەی دەبینــی. پیاوێکی باڵابــەرز و لاواز بوو. لاقی بە عەردەکــەدا دەکوتا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا مرۆڤێکــی گورج‌وگۆڵ بوو. ئــەو ڕواڵەتی یەکێک لە کارەســات خولقێنەکانــی کۆتایی دنیای هەبوو. لینا، هەســتی دەکرد بەو زووانە ئەو کارەساتە ڕوودەدات. بەڵام هێشتا نەیدەزانی چلۆن ڕوودەدات. لینا لە ئینگلیسی قسەکردن بەردەوام بوو. لە کاتە زۆر هەستیارەکاندا، ئەو بێبڕانەوە و تەنانەت بەو زمانانەی کە زۆریش بەســەریاندا زاڵ نەبوو، قسەی دەکرد. وشەکان بە بێگرفت بە زمانیدا دەهاتن. ئەم بابەتە، بۆ خودی لیناش سەیر و سەمەرە بوو.

بەختیار بە ئارامی ســەیری دەکرد. دیار بوو چاوەڕوانی شتێک بوو. بەڵام، لینا هەستی دەکرد جەزم بووە و ئاگای لەخۆی نەماوە و ئەوەش، دەرفەتی ئەوەی بۆ دەڕەخســاند کە بیری بەردەنگەکەی بخوێنێتەوە و هەوڵ بدات ڕێگایەک بۆ دەربازبوون بدۆزێتەوە.

ڕەنگــە هەنــدێ کەس ئــەو ئیرادە بگــرن کە پاش چەندیــن دەیە لەو ڕووداوە، موومکین نییە ئەو هەســتانە، ئەو باری جەســتەیی و ڕۆحییە لە مرۆڤدا ســەرهەڵبداتەوە. ڕەنگە، بەڵام، دەتوانین بڵێین، ئەو وشــە و گوتراوانەی ئەو کاتە هاتوونە ئاراوە، لەوانەیە وردبینیی خۆیان لەکیس بــدەن. بەڵام، هەموو ئــەوەی ڕوویدابوو، هەمووی، بە هەمان ڕوونی و توندیی خۆیەوە لەجێی خۆیان مابوونەوە. ئەو ترسەی لەو کاتەدا لە لینا نیشــتبوو، وەکوو وشــەگەلێک لە بەردەبیرۆ هەڵکەندرابێت، لە مێشکیدا جێگیر بووە. لینا لە ترســاندا هەستی دەکرد ئیفلیج بووە، بە بێ ئەوەی هێــزی لێکدانەوە و بەرگری خۆی لەدەســت بــدات، ڕێک وەک حاڵەتی جــەزم بوون و خەون. ســەرەڕای ئــەوەش، کاتێک مرۆڤ هەســتێکی هەیە کە لە «ترس»ێکی ئاســایی زۆر زیاترە، دەکرێت بە دوو وشــەی

«ترس» یان ته‌نانه‌ت «تۆقین» ئه‌و حاڵه‌ته‌ لێکبده‌ینه‌وه‌؟ ده‌بێ بۆ ئه‌و دۆخه‌ ڕۆحییه‌ که‌ مرۆڤ له‌ جێی خۆیدا وشک ده‌کات و ده‌یچه‌قێنێ، وشه‌یه‌کی دیکه‌ بدۆزینه‌وه‌.

لینا له‌ چی ده‌ترسا؟ ئه‌و بیری له‌وه‌ ده‌کرده‌وه‌ که‌ ئه‌وان بۆ ناچارکردنی به‌ دانپێدانان، ئازاری کۆرپه‌که‌ی ده‌ده‌ن. پاش ئه‌وه‌ش نۆره‌ی مینا ده‌بێت که‌ ئه‌وان وه‌کوو شانتاژێکی نوێ که‌ڵکی لێ وه‌رده‌گرن. هه‌روه‌ها له‌ ئازاری فیزیکی تۆقیبوو و له‌وه‌ش که‌ خه‌یانه‌ت بکات و ترس له‌و دۆخه‌ نه‌ناسراوه‌...

ورده‌ ورده‌، ئه‌م ترسه‌ جۆراوجۆرانه‌ که‌ کاریان ده‌کرده‌ سه‌ر کۆی بیره‌کردنه‌وه‌ی و له‌ ناخه‌وه‌ تووشی داڕمانیان ده‌کرد، له‌یه‌کتردا قاڵ بوونه‌وه‌ و به‌ چه‌شنێک ئارامیی گه‌یاند، ڕێک له‌ هه‌وڵه‌کانی که‌سێک ده‌چوو که‌ له‌ ده‌ریایه‌کی خرۆشاندا له‌ نوقم بووندایه‌ و دواتر له‌گه‌ڵ نوقم بوونی له‌ قووڵایی ئاوه‌که‌دا، خۆی له‌ ئارامیی و بێده‌نگییه‌کی ڕواڵه‌تیدا ده‌بینێته‌وه‌. لێناش وازی له‌ به‌فیڕۆدانی وزه‌ی خۆی له‌ دژی شتێک که‌ توانای نه‌بوو به‌سه‌ریدا زاڵ بێت هێنا. پێویستیش نییه‌ مرۆڤ ئه‌و ساتانه‌ وه‌بیر بێنێته‌وه‌، چونکوو ئه‌و ساتانه‌ له‌ ناخی مرۆڤدا جێگیر ده‌بن، ڕێک وه‌ک به‌رجه‌سته‌ییه‌کانی سه‌ر به‌ردێکی هه‌ڵکه‌ندراو که‌ به‌ تێپه‌ڕینی زه‌مه‌ن سواون، ڕێک وه‌ک سواوییه‌کانی شێره‌که‌ی بابل و پیاوه‌ نووستووه‌که‌ی نێوان په‌نجه‌کانی که‌ له‌ سێ‌هه‌زار ساڵ له‌وه‌به‌ره‌وه‌ وه‌ک خۆی ماوه‌ته‌وه‌.

لێنا که‌ له‌ ژووری کاره‌که‌ی به‌ختیاردا قه‌تیس ببوو، هه‌ستی به‌ ته‌نیایی ده‌کرد. له‌ دڵی خۆیدا، له‌گه‌ڵ ئه‌و هاوڕێیانه‌ی ژیانی کۆرپه‌که‌یان خستبووه‌ مه‌ترسییه‌وه‌، ئاشت ببووه‌وه‌. بێمانا بوو که‌ هێشتاش بیریان لێ بکاته‌وه‌. ته‌نانه‌ت وازی له‌ شه‌ڕه‌ ده‌روونیه‌که‌ی خۆیشی هێنا بوو. کاتی لۆمه‌ کردن نه‌بوو، کاتی ئه‌وه‌ نه‌بوو که‌ به‌ هۆی ساویلکه‌یی، نه‌زانی و ئه‌و خه‌مساردییه‌ی نواندبووی، قوڕ بپێوێت. ماندوو و شه‌که‌ت، ته‌نیا حه‌زی له‌ نووستن و له‌بیرکردنی هه‌موو شتێک و گه‌یشتن به‌ عه‌ده‌م

بوو. هەستی دابڕان لەم دنیایە دایگرتبوو.

■ ڕزگارکەر

دواجار دەرکی ژوورەکەی تەیمووری بەختیار کرایەوە و ئەفسەرێکی پلەبەرز هاتەژوورەوە. ڕواڵەتێکی سەرنجڕاکێشی هەبوو، باڵابەرز و بەخۆوەبوو. لێنا هەرگیز نەیزانی ناوی چبوو و لەو ڕۆژە بەدواوەش هەرگیز نەیبینییەوە.

ئەم پیاوە، ژیانیانی ڕزگار کرد.

لێنا ئامادەبوو. هەڵبەت، بەکارهێنانی ئەم وشەیە لەجێی خۆیدا نییە. چونکە ئامادەبوون، بەو مانایە کە مرۆڤ دەزانێ چی لەپێشە. بەڵام، لێنا لەوەی لێرە (ساواک) دەگوزەرا، تەنیا لێکدانەوەیەکی زەینیی هەبوو و ئەویش ئەو زانیارییانە بوو کە لە ڕێی خەڵکانی دیکەوە سەبارەت بە چارەنووسی شۆڕشگێرە دەستبەسەرکراوەکان بیستبووی. لێنا، شۆڕشگێڕێک نەبوو کە پڕ بە پێستی وشەی شۆڕشگێر بێت. ئەو لە وڵاتێکی بیانییەوە هاتبوو و بە بینینی نادادپەروەریی و ئەو زوڵمانەی لەم خەڵکە دەکرا، پەیوەست بە ڕیزەکانیان ببوو و وەکوو لایەنگرێک هاوکاریی دەکردن.

لێنا دەسکەوتێکی چاوەڕواننەکراو بوو کە دەست پۆلیس کەوتبوو و دەیانویست بەکاری بێنن و لە ڕێی ئەوەوە تۆڕەکانی بزووتنەوەی کورد هەڵوەشێننەوە.

لێنا دەیزانی هەوڵەکانیان بێسوودە، چونکوو خودی لێنا، لەوەی پۆلیس دەیویست دەستی بخات بێئاگا بوو. هەربۆیەش، بە نووشتانەوە بەسەر کۆرپەکەیدا، بە وردی گوێی دەدایە وتەکانی نێوان بەختیار و ئەو ئەفسەرە. بەختیار ناوەرۆکی فایلەکەی بۆ ئەفسەرەکە شی دەکردەوە، بڕوای بەوە هەبوو کە وتەی لێنا سەبارەت بە بێتاوانی و پێداگریی لەسەر ئەوەی تەنیا زمانی ئینگلیسی دەزانێت ڕاست نییە، هەربۆیەش ئەو ئەفسەرە دەبوو وەکوو دیلمانج یارمەتی بدات. ئەو ئەفسەرە بە

ڕوانینێکــی بێلایەنانەوە ســەیری لینای دەکرد و گوتــی: «وەک بە من گوتراوە، بەڕێزت تەنیا زمانی ئینگلیسی دەزانی؟»

ـ «بەڵێ ئاغا». لینا بڕیاری دابوو بە کەمترین وشە وەڵامی بداتەوە و لەو سۆنگەوە، زیاتر لە وتراوەکان سەردەربکات.

ـ «ئاغای عەبدولڕەحمانی قاسملوو هاوسەری تۆیە؟»

ـ «بەڵێ ئاغا».

ـ «حەزمان لێیە چەند پرســیارێکیش لــەو بکەین. دواتریش دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. تۆ دەتوانی پێمان بڵێیت لە کوێ دەتوانین چاومان پێی بکەوێت؟»

ـ «نەخێر ئاغا».

ـ «بۆچی ناتوانیت؟»

ـ «چونکە بۆخۆشم نازانم لە کوێیە».

ـ «خانم تۆ هاوسەری ئەویت و لەگەڵی دەژیت، مەگین وا نییە؟»

پاشــان، ئەفسەرەکە بە بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵامدانەوەی لینا بێت، ڕووی کردە بەختیار و هەموو قسەکانی بۆ وەرگێڕایەوە. ئاگر لە چاوی بەرپرســی ســاواک دەباری، چەنکوو ئەوەی دەیبیست، ئەوە نەبوو کە چاوەڕێی دەکرد. هەربۆیەش، ڕووی لە ئەفسەرەکە کرد و گوتی: «بەو خانمە بڵێ تا ئەو کاتەی پێمان نەڵێت هاوســەرەکەی و دارودەستەکەی لە کوێ خۆیان شاردۆتەوە، لە زینداندا دەمێنێتەوە».

وتەکانــی بەختیار لــە ژوورەکەدا دەنگی دەدایەوە و پاشــان، وێڕای ئاماژەکردن بۆ دوو ســەربازی «گارد» لە ژوورەکەدا، گوتی: «ئەوانە چاوەڕێی خانم دەکەن».

لینا، سەیری خوارەوەی دەکرد و گوێی گرتبوو. دیلمانجەکە وتەکانی بەختیــاری وەرگێڕایەوە. ئەوســا لینا هەســتایە ســەرپێ و لــە کاتێکدا کۆرپەکەی بەرەو لای ئەفسەرەکە ڕاگرتبوو، بە توندی گوتی: «وادیارە، بە هۆی ئەوەوە کە نازانم ئەوان لە کوێن، دەبێ بۆ هەمیشــە لە زیندان بمێنمەوە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە من هیچ نازانم».

لێنا یاریی نەدەکرد، ئەوەی دەیگوت، ڕاست بوو.

دواتریش گوتی: «لەو ڕووەوە کە نازانم لە کوێیە، لێم گەڕێن با لەگەڵ منداڵەکەم بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە. من هیچ مەترسییەک نیم بۆ ئێوە. ئەوەش دەبێ بزانن کە بالوێزی چێکۆسلۆڤاکی ئێستا سەرقاڵی ئامادەکردنی ڤیزاکانی ئێمەیە و ئەویش دەزانێ من لێرەم و بۆچی هاتووم. سەیری منداڵەکەم بکەن (لێنا خۆی لە ئەفسەرەکە نزیک کردەوە)، ئەم منداڵە پێشوەخت لەدایک بووە و بۆخۆشم تەندروستیم جێگیر نییە. ئەگەر بمانخەنە زیندانەوە، زۆر ناخایەنێت کە هەردووکمان دەمرین!».

لێنا بێبڕانەوە قسەی دەکرد، هێندەی نەمابوو هەناسەی ببڕێت. هەربۆیەش، هاوسەنگیی خۆی لەدەستدا و بە ئاستەم کشایە دواوە و سەرلەنوێ لەسەر کورسییەکە دانیشتەوە. هەڵسوکەوتێکی چاوەڕواننەکراو بوو و لێنا بە باشی دەرەقەتی هاتبوو.

کۆرپەکە کە تا ئەو ساتە بێدەنگ بوو، کەوتە جم وجۆڵ. لێنا بە بوێرییەکەوە کە تایبەتی هەر دایکێکە بۆ چاوەدێریی منداڵەکەی، ڕووی تێکردن و گوتی: «دەبێ شیر بە منداڵەکەم بدەم. تکایە ڕوو لەولا کەن». پاشان هەستا، لە بەرانبەر ئەواندا دەستی کرد بە کردنەوەی قۆپچەی کراسەکەی. دیلمانج، دەسبەجێ وتەکانی وەرگێڕایەوە. بەختیار هەستا و لە ڕقدا، قەڵەم دارەکەی دەستی تووڕدایە سەر زەوی و پاشان هەردووکیان ڕوویان کردە درگاکە و بەرەو ئەو شوێنەی سەربازەکانی «گارد» لێی وەستا بوون ڕۆشتن.

لێنا بەدەم شیردانەوە گوێی بۆ قسەکانی نێوان ئەو دوو پیاوە هەڵخستبوو.

ئەو ئەفسەرە پلە بەرزە پشتڕاستی دەکردەوە کە ئاستەمە بزانین قسەکانی لێنا چەندەی ڕاستن، بەڵام، ئەو ئەگەرەش لە ئارادایە کە زیندانی کردن یان مردنی ئەو دووانە، لە دەرەوەی وڵات دەبێتە هۆی ڕیسوایی و هەراوزەنا و قاوی لێ دەکەوێتەوە».

لێنا لەبەرخۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە کە ئەمە چ جۆرە ئەفسەرێکە؟

سەرەڕای ئەوەش، کاتێک لینا سەیری کرد بەختیاریش وتەی ئەو ئەفسەرەی وەک قسەیەکی بێمانا ڕەت نەکردەوە، سەری سووڕ ما. وای لێکدایەوە کە ڕەنگە ئەو ئەفسەرە، یەکێک بێت لە ئەفسەرە کۆمۆنیست و ورەبەرزەکان (کە هێشتا کەشف نەبووە). بەڵام لە ناخی خۆیدا، هێشتاش هیوای بە کرانەوەی ئەو گرێیە لە لایەن ئەو ئەفسەرەوە نەبوو. ئەو دەیزانی کە یەکێک لە کۆنڤانسیۆنە نێونەتەوەییەکان، زیندانی کردنی ژنی دووگیان و هەروەها ژنی زەیستان و شیردەری قەدەغە کردووە. بەختیار بە ئەفسەرەکەی گوت کە لینا شارۆمەندی ئێرانییە و هەربۆیەش مەترسیی ڕیسوایی و ئابڕووچوونی لێ ناکەوێتەوە.

ئەو ئەفسەرە، وێڕای پشتڕاست کردنەوەی وتەکانی بەختیار، گوتی: «بەڵام ئەو بە ڕەگەز ئورووپاییە و سەفارەتی چێکۆسلۆڤاکیش ئاگادارە کە لێرەیە!».

کاتێکیش ئەفسەرەکە لە درێژەی قسەکانیدا گوتی کە سەرەڕای ئەوەش دەترسێت ڕیسواییەکی ئەوتۆ، هەڵوێستی «ئەعلاحەزرەت»ی بەدواوە بێت، بەختیار بە دوو سەربازەکەی «گارد»ی گوت لە دەرەوە چاوەڕوان بن.

پاشان، ئەفسەرەکە گوتی: «تەیموور، تۆ هەر ئێستاش پێگەیەکی باشت بەلای شاوە نییە!»

بەختیار و ئەو ئەفسەرە، یەکتریان بە «تۆ» ناو دەهێنا. هەرچەند کە لە نیوان بەختیار و ئەفسەرەکەدا، هاوڕێیەتییەکی نزیک هەبوو، دیسانەوەش ورەی دەویست کە نێوان ناخۆشیی ئەو و شا کە فەرماندەیی گشتیی هێزەکانی لە ئەستۆ بوو، بەبیری بەرپرسی ساواک بێنێتەوە. دواجار، ئەو ئەفسەرە بیرۆکەیەکی دیکەی هێنایە ئارا و ئەوەش ئەوە بوو کە لینا و منداڵەکەی لە ماڵەکەی خۆیاندا بخەنە ژێر چاوەدێری، ئەوسا بە سانایی دەستتان بە عەبدولڕەحمان و هاوکارەکانی ڕادەگات و پێداگریی کرد کە دیارە نابێت بهێڵن لە خاکی ئێران بچنە دەرەوە و لەو بوارەدا دەبێ زۆر بە وریایی بجووڵێنەوە.

پێدەچوو دۆخەکە لە بێهیوابییەوە بەرەو باشتر بوون دەڕۆشت. پاش تێر بوونی منداڵەکە، لینا قۆپچەکانی کراسەکەی داخستەوە و بە ئارامی لەسەر کورسییەکە دانیشت و سەیرێکی مێزەکەی بەرانبەری کرد. ئەو نەدەبوو سەبارەت بە گوتراوەکانی نێوان بەختیار و ئەفسەرەکە هیچ دژکردەوەیەکی هەبێت. ئەو ترسەش کە لینای وەک پەیکەرەیەکی بەمێشک لێکردبوو، وەک خۆی مابووەوە. پاشان، بەختیار بە دیلمانجەکەی گوت: «تا ئەو کاتەی هاوسەرەکەی خۆی بە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس نەناسێنێت، پاسپۆرتی نادرێتێ و لە ماڵەکەی خۆیدا دەستبەسەر دەکرێت. ئێستاش بینێرە با ڕۆتیناتی ئیداریی کارەکەی بۆ بکرێت».

لینا، ئەوەی کە بیستبووی، هێشتاش بۆی نەدەچووەوە سەر یەک، وەک دەڵێن : دووقڕانییەکەی گیری کردبوو! ئەفسەرە پلە بەرزەکە، وتەکانی بەختیاری بۆ وەرگێڕایەوە و پاشان ڕۆشت. پاش ڕۆشتنی ئەو، لینا بیری لەوە کردەوە کە : پێویستە سەبارەت بە قەدەغە بوونی چوونەدەرەوەی لە ئێران نارەزایەتی دەرببڕێت. ئەوسا، بە زمانی ئینگلیسی سەبارەت بەو بڕیارەی بەختیار هەڵوێستی گرت، بەو هیوایەی کاریگەر بێت. بەڵام نارەزایەتییەکەی هیچی لێ شین نەبووەوە. بەختیار بە بێ گوێدان بە وتەکانی لینا، هەتا بەر دەرکەکە بەڕێی کرد و پاشان بە دوو سەربازەکەی «گارد»ی گوت: «ئەم خانمە بەرن بۆ لای سەرهەنگ زیبایی».

■ سەرهەنگ زیبایی

ئەگەر ڕۆژێک یەکێک لەو ئێرانییانەی کە ئەو سەردەمەیان بینیوە، ئەم دێڕانە بخوێنێتەوە، تێدەگات کە بۆچی چۆکی لینا شکا و ئەژنۆی شل بوو؟ و بۆچی سەرلەنوێ مەترسی چنگی خستە دڵیەوە. لە نێو خەڵکدا، تەنانەت هێنانی ناوی سەرهەنگ زیبایی، دەبووە هۆی ترس و خۆف. ئەوە سەرهەنگ زیبایی بوو کە بڕیاری دەدا کام زیندانی، کەی و چلۆن ئەشکەنجە بکرێت. هەندێ جار بۆخۆی ئەم ئەرکەی بەجێ دەگەیاند.

لەو سەردەمەدا، بەوە ناسرابوو کە تەنیا زیندانییە خۆڕاگرەکان لە ژێر ئەشکەنجەکانی بە زیندوویی دەردەچن، نەک هەموویان.

لینا لە نێوان دوو سەربازی «گارد» بە چەکە سەرنێزەدارەکانیانەوە، دەڕۆشت. ئەو تەنانەت ئەمڕۆکەش ناتوانێت ئەوەی ئەو ڕۆژە لە دڵ و مێشکیدا گوزەرا لە بیر بکات (دیارە هەموو ئەوانەش یاری نەبوون و لە ڕاستیدا، بەختیار لەگەڵ ئەفسەرەکە درۆی کردبوو) ئاوەزی لینا لەکار کەوتبوو و ئەشکەنجەی ڕۆحی سەرلەنوێ سەری کردەوە جەرگی. لەو کاتەدا، بیری لەوە دەکردەوە کە: هەرچۆنێک بێت، جەستەی ئەو ماوەیەکی زۆر بەرگە ناگرێت و ماوەیەکی زەمەنیی کورت خۆی پێڕادەگیرێت.

ئەو دوو سەربازە، لە پێش دەرکەیەکی شەق وشڕدا ڕاوەستان کە لەگەڵ دەرکەی ژوورەکەی بەختیار زۆر جیاواز بوو (تۆ بڵێی ئەو دەرکەیە، ڕاستەوخۆ بەرەو ژێرخان بکرێتەوە؟). ژوورێکی تاریک و بچووک بوو، لەسەر مێزەکە گڵۆپێک پێکرابوو و لە پشت مێزەکەش، بوونەوەرێکی سەیر و سەمەرە دانیشتبوو.

ئەو دوو سەربازە، فایلەکەیان دایە دەستی. ئەویش پاش هەڵسەنگاندنی فایلەکە، لە جێی خۆی هەستا و دوو سەربازەکەی گەڕاندەوە. دەم وچاوی تێکنابوو و توورەیی بە ڕواڵەتییەوە دیار بوو. نە بۆخۆی دانیشت و نە داوای لە لینا کرد دانیشێت.

زیبایی، پیاوێکی کورتەباڵا بوو، کەللەی لە هێلکە دەچوو و لکابوو بە شانییەوە. ملی هەر نەبوو. جەستەشی لە هێلکەیەکی گەورە دەچوو. لە توورەییدا، ئاگر لە ڕوخساری دەباری و ڕەنگە هەر بەو هۆیەشەوە بوو کە لینا بیری نەمابوو سەری تاس بوو یان مووی پێوەبوو. ئەو کاری خۆی بە پرسیارێکی هیچ و پووچەوە دەست پێکرد: «چ سیحرێکت دەکار کرد، وا بەرپرس ئیزنی گەڕانەوە بۆ ماڵەوەی پێدای؟» و بە بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بکات، دەستی کرد بە هات و هاوار و لەگەڵ تێپەڕینی ساتەکان، هاوارەکانی بەرزتر و بوغزاویتر دەبوو. ڕواڵەتی لە

ســوورییەوە، ڕەش هەڵگەڕابوو. دەیگوت تەحەمولی ئەو ئیزنە ناکات و پێی قبووڵ ناکرێت. لە ناواخنی ڕستەکانیشــیدا هەڵیدەکوتایە سەر لینا، ئەوەی دەیگوت، نەیدەگێڕاوە، لینا لە مانای ئەو وشــەگەلە تێنەدەگەیی. لینا تا ئەو کاتە، هەرگیز، نە وشەگەلی ئاوەهای بیستبوو و نە مرۆڤێکی وەها دەمهەراش و دەمپیسی بینیبوو(هەربۆیەش، بیری لەوە دەکردەوە کە سەرەڕای فەرمانی بەرپرس، ئەم پیاوە، دەیخاتە بەندیخانەوە!).

لینــا، لەگــەڵ ئــەوەدا کە چــاوەڕێ بوو ئەو پیــاوە لانیکــەم بۆ نوێ کردنــەوەی هەناســەش بێــت دمی لێک نێــت، هەوڵــی دەدا جوێنەکانی نەبیسێت. بەڵام نەیدەتوانی لاق بە عەرددا کوتانەکان، کەف چڕنینەکانی، پفە پف کردنەکانی، دەست ڕاوەشاندن و مستە قونجاوەکانی ئەو پیاوە «هێلکەیی شــکڵە» لە پشت مێزەکەی، نەبینێت. لینا لەوبەری مێزەکەوە وەستا بوو.

ئــەدا و ئەتــواری ئــەو پیاوە، تێکەڵەیــەک بوو لــە یارییەکی تەژی لە پانتۆمیــم و هــات و هــاوار و ئەویش لــە دنیایەکی ناڕاســت و بەدەر لــە زەمەن و شــوێن. ئــەو ڕواڵەتە بچووکەی ڕووبــەڕووی لینا بوو و پێدەچــوو هیچ پێویســتی بە نوێکردنەوەی هەناســەی نەبێ، ڕواڵەتێکی ســاختە بوو. وەکوو بووکەڵەیەکی قورمیشــکراو بوو کە بۆ ترساندنی خەڵــک، جووڵە و ژێســتی گەپجــاڕی لە خۆ دەنواند. لینای حەپەســاو، دۆخــی خــۆی لە یاد کردبوو (وەکوو لە خەوێکی ناخۆش هەســتابێ و وەخۆ بێتەوە).

لەپڕ، فەنەرەکانی بووکەڵەکە لە ئیش وەســتان. سەرهەنگ زیبایی، کە چاوەکانــی زەق کردبــووەوە، هێمن بــووەوە. بێدەنگییەکی قورس باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا. لینا وەخۆ هاتەوە و دەسبەجێ چووەوە سەر یارییەکەی خۆی، گوتی: «لە زمانی ئێوە تێناگەم».

زیبایی کە خافڵگیر ببوو، لەســەر کورسییەکەی دانیشت. هێلکەکەمان، لە کەف و کوڵ کەوت. پاشان، «گارد»ەکانی بانگ کرد. دەرکە کرایەوە و کەللە سەرێک دەرکەوت و گوتی : «بەڵێ گەورەم!»

زیبایی ناردی بە دوای دیلمانجدا.

لێنـا، سـەیری ئەو پیـاوەی دەکرد کە لـە زەڕین کەوتبوو، هەسـتی بـە ماندوویەتی و بێهێزی دەکرد. هەسـتی دەکـرد منداڵەکەی ئامێزی قورسـە. ورەی ئـەوەی نەبوو ئیزنی دانیشـتن لە زیبایـی وەربگرێت. زیبایی سـەرقاڵی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی فایلەکە بوو، هەندێ جاریش دەیبۆڵاند. لێناش هەوڵی دەدا، نەکەوێتە بەرچاو و بەتایبەت نەبێتە هۆی وروژاندنی هێلکەکە!.

سـەیر ئـەوە بوو لە هەموو ئـەو ماوەدا، کۆرپەکـە بێدەنگ بوو. ئایا هەسـتی بیسـتنی بە تەواویی خۆی نەگرتبوو؟ یان لـە ئامێزی دایکیدا هەسـتی بـە تەناهـی دەکرد؟ لـە نیشـتمانە نوێیەکـەی لێنـادا، کچان و ژنانێکـی زۆر کـە خەونیـان بـە ئـازادی و بەرابەرییـەوە دەبینـی، چووبوونە ڕیزەکانی خەباتەوە. ئەوان بە چاوقایمییەکی بێوێنەوە لەگەڵ مەترسـیی زیندان، ئەشـکەنجە و مردن ڕووبەڕوو دەبوونەوە. لە ژێر ئەشکەنجەدا، ئەشکەنجەگەرەکان لە هیچ کردەوەیەکی قیزەون بەرانبەر بـەوان نەدەپرینگانـەوە. ڕێک بـە پێچەوانەوە، بە دەسـتدرێژی کردنە سەر ناموسیان، ئەشـکەنجەگەلێکی تاقەتپڕووکێنیان بەسەر دەهێنان. سـەرەڕای قیزەونی کردەوەکەیان، ئەوان ئەو ژنانەیان لە ناموسـیان بێبـەری دەکرد کە ئەو بابەتە لە ڕۆژهەڵاتدا گرینگیی زۆری پێدەدرێت، لێنا چاوقایمیی ئەو ژنانەی ستایش دەکرد، لەو دۆخەدا و لەو ساتەدا و لەبەرانبەر یەکێک لە بێشەرمترین ئەشکەنجەگەرەکاندا، زیاتر لە هەموو کاتێک هەستی بە نزیکایەتی لەو ژنانە دەکرد.

تا هاتنی دیلمانج، زەمەن بۆ لێنا زۆر بە قورسـی تێدەپەڕی. دیلمانج کە هەمان ئەفسـەری پێشوو بوو، بەحاڵ سەیری لێنای کرد. ئەو ڕۆڵی خۆی بە باشی دەگێڕا. زیبایی، تەنانەت وەڵامی سڵاوی ئەفسەرەکەشی نەدایەوە و ئاماژەی بۆ لێنا کرد، بە هەڕەشەوە لەگەڵ ئەفسەرەکە قسەی دەکرد و گوتی: «پێی بڵێ، هەتا شـوێنی حەشـارگەی مێردەکەیمان پێ نەڵێت، ناهێڵین بڕواتەوە بۆ ماڵەوە».

ئەفسەرەکە بە ساردی وەڵامی دایەوە: «جەنابی تەیموور بەختیار ڕای وایە ئەم خانمە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و بەردەوام بێتە ئێرە و خۆیمان پێ بناسێنێت و ئەم خانمە دەبێ ناونیشانەکەشی بە ئێمە بدات بۆ ئەوەی بتوانین چاوەدێریی بکەین. ئیشی بەڕێزیشت، پڕکردنەوەی پرسیارنامە هەمیشەییەکەیە. زیبایی بە ڕێزەوە سەیری ئەفسەرەکەی کرد، بەڵام وازی نەهێنا و گوتی: «ئەی ئەگەر ڕای کرد و بزر بوو چی؟»

ئەفسەرەکە وەڵامی دایەوە: «ئەمری جەنابی تەیمووری بەختیار جێبەجێ بکە، ئەو دەزانێ چی بکات.»

زیبایی ملکەچ بوو و گوتی: «کە واتە، پێی بڵێن دەبێ هەموو ڕۆژێک، کاتژمێر ٩ی بەیانی خۆی بە من بناسێنێت».

ئامادەبوونی دیلمانجەکە، ورەی بە لینا بەخشی. بۆ بزر بوون، پێویستی بە کات بوو و گەر بۆی بلوایە، پێی باش بوو هەر ئەو شەوە خۆی دەرباز بکات. بەڵام نەیدەزانی بۆی دەگونجێت یان نە. هەربۆیەش، بە ئینگلیسی بە دیلمانجەکەی گوت: «تکایە بە جەنابی بەرپرس بڵێن کە من بە دوو منداڵەوە بە تەنیا دەژیم، ماڵەکەمان لێرەوە زۆر دوورە و ئەمنیش تازە منداڵم بووە و گەلێک شەکەت و ماندووم. جگە لەوەش، هەرگیز ناتوانم هەموو ڕۆژێک بێمە ئێرە، چونکە بۆم جێبەجێ نابێت، پارەم نییە.»

دیلمانجەکە پرسیاری لێکرد: «بە سەرنجدان بە دۆخی ئێستاتان، لە حەوتوویەکدا چەند جار دەتوانن سەردانی ئێرە بکەن؟»

لینا ورەی دایە بەر خۆی و گوتی: «زیاتر لە جارێک لە حەوتوویەکدا بۆم ناکرێت».

زیبایی کە بە تەواوی تووڕە ببوو، گوتی: «ئەشا چەند بێحەیاشە! وەک گوتم، هەموو ڕۆژێک کاتژمێر ٩ی بەیانی دەبێ لێرە ئامادە بێت. ئەویدیکەی دەبێت بۆخۆی چارەسەری بکات! دیلمانجەکە، جگە لە وشەی بێحەیا، هەموو وتەکانی زیبایی وەرگێڕایەوە. بەڵام لینا کۆڵی

نەدا و دواجار، توانی بە دوو ڕۆژ سەردانی ساواک لە حەوتوویەکدا، واتە دووشەممە و پێنج شەممە و ئەویش کاتژمێر ١٠ی بەیانی ڕازییان بکات. ئەو ڕۆژە، دووشەممە بوو. هەربۆیەش لینا دوو ڕۆژ کاتی لەبەردەستدا بوو بۆ بزر بوون.

زیبایی پرسیاری کرد: «کێی لەگەڵ دەچێت بۆ پشکنینی ماڵەکەی؟»

دیلمانجەکە وەڵامی دایەوە: «خەمتان نەبێ، جێبەجێمان کردووە».

پاشان، ئەفسەرەکە بە پەلە داوای لە لینا کرد دوای کەوێت. بەم چەشنە، ئەو ئەفسەرە بووە هۆی ڕزگاربوونی لینا و کۆرپەکەی لە زیندان. لینا بڕوای نەدەکرد و بەخۆی دەگوت ڕەنگە داوێکیان بۆ نابێتەوە؟

■ گەڕانەوە لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس

لینا لەگەڵ ئەفسەرێکی لاوی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، لە بینای بەڕێوەبەرایەتییەکە چووە دەرەوە. ڕۆژ پاڵی دابوو بە شەوەوە.

لینا لە نێوان شۆفیرەکە و ئەفسەرە گەنجەکەدا دانیشتبوو و ڕێگاکەی بە ئەفسەرەکە نیشان دەدا و ئەفسەرەکەش بۆ شۆفیرەکەی وەردەگێڕاوە. لینا بە ئەفسەرەکەی گوت: «ماڵی ئێمە لەو کۆڵانەی دیکە، لای ڕاستەوەیە».

ئەفسەرە لاوەکە ئەمری بە شۆفیرەکە کرد ئۆتۆمبیلەکە ڕاگرێت و چاوەڕوانیان بکات. پاشان لینا و ئەفسەرەکە بە پێ درێژەی ڕێگاکەیان بڕی. پشیلەیەکی ڕەش بە نیاز بوو بەسەر دیوارەکەدا پاز بدات، بە بینینی ئەمان، ڕای خۆی گۆڕی، هەندێ بەولاوەتر، سەگێک سەیری دەکردن. لە نێوەندی کۆڵانە تەسکەکەدا، جۆگەلەیەکی بچووک، کە بەیانییان ئاوی شاری پێدا تێدەپەڕی، ئیشک هەڵگەڕابوو. لەو ڕووەوە کە خەڵکی گەڕەکەکە بەیانییان بەردەرکەی خۆیان گەسک دەدا، کۆڵانە خاکییەکە خاوێن بوو. عەردەکە بەردی زۆری لەسەر بوو، لەو چەشنە بەردانەی کە مرۆڤ تێی هەڵدەنگووت.

کچە گەورەکەی خاوەنماڵ دەرکەکەی کردەوە. زولەیخا خانم یارمەتیی

کوڕەکەی دەدا مینا لە حەوزەکە دەربێنن، حەوزێکی پۆخڵ، قوڕاوی، پڕ لە لیتە و داپۆشراو بە قەوزە، کە تایبەتمەندیی ئاوە مەندەکانە. ئێستاش بەهۆی شـڵەقانییەوە، ڕەنگەکەی بەرەو قاوەیی هەڵگەڕابوو. لێنا بوونی ئەفسـەرەکەی لەبیـر کرد، کچەکەی دایەدەسـت کچـی خاوەنماڵ و بە پەلە خۆی گەیاندە مینا کە تروسـکایی ژیانـی پێوە نەمابوو. زولەیخا خانـم هاواری دەکرد: زۆرم پێگوت بـەلای حەوزەکەدا نەچێت. لێنا، بە مەبەستی هۆشیارکردنەوەی مینا، ناچاری کرد بڕشێتەوە. بە دڵنیاییەوە ئەگەر لێنا تەنیا چەند سـاتێک درەنگتر بگەیەشـتایە، مینا تێدا چووبوو. لێنا، چاو بە فرمێسـک، کیژۆڵەکەی بە سینگییەوە دەگوشی. وەڕەس و بێزار بوو. ئەفسـەرە گەنجەکە لە تەنشـت دەرکەکەوە ڕاوەسـتا بوو و سـەیری دیمەنەکەی دەکرد. لێنا چاوەڕوان بوو ئەفسـەرەکە شـوقەکە بپشکنێت. ئەندامانی بنەماڵەی خاوەنماڵەکەیان کە هەمیشە بە جموجۆڵ بوون، بە تەواوی بێدەنگ ببوون. ئەفسـەرە گەنجەکە پرسیاری لە ژنی خـاوەن مـاڵ کرد کە لێنا لەوماڵەدا دەژی؟. ژنەکەش بە سـەر وەڵامی ئەرێی دایەوە. پاشان، ئەفسەرەکە ڕووی لە لێنا کرد، سڵاوێکی نیزامیی لێکرد و بە هێمنی بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە و ڕۆشت.

موعجیـزە بـەردەوام بوو. ئێسـتاش ئەوە ئەرکی لێنا بـوو کە بیباتە سـەر. لە ڕاسـتیدا، تا ئەو کاتە، جگە لە بردنەسـەری ڕۆژێکی تۆقێنەر، هیچ شـتێکی تراژیـک ڕووی نەدابوو. لێنا پرسـیاری لـە خۆی دەکرد کە ئەو ئەفسـەرە لاوە چ ڕاپۆرتێک سـەبارەت بە پشکنینی ماڵەکەی بە باڵادەستەکانی خۆی دەداتەوە و بۆچی شۆفیرەکەی لە خانووەکە دوور ڕاگرت. پاشـان، لێنا مینای بردە حەمام و سـەر وملی بۆ شوشت و بە کۆرپەکەشی ڕاگەیشت و نانی پێدان. هێندەی نەخایاند منداڵەکان خەویان لێکەوت. لێناش دەرفەتێکی بۆ ڕەخسـا و دووشـێکی گرت و دواتر، بە پێی ڕێککەوتنەکەیان، کراسـە سوورەکەی لێنای لە پەنجەرەکەوە شۆڕ کـردەوە، بۆ ئەوەی سـدیق لە کاتی تێپەڕین بـە کۆڵانەکەدا، بیبینێت و بزانێت کە دۆخەکە خراپە.

بێدەنگــی ماڵەکەی تەنیبــوو. ئامادەبوونی ئەو ئەفســەرە لەو ماڵە بە گوێی هەموو دراوسێکانیان گەیبوو (لینا بەخۆی دەگوت، ڕەنگە بەختیار ڕای خۆی بگۆڕێت و پیاوەکانی خۆی لە هەموو شوێنێک بۆ چاوەدێری کردنی ئەم دانابێت. هەربۆیەش، پێویستە بە زووترین کات خۆم شوێن بزر کەم. لەگەڵ ئەوەشــدا، بیری لەوەش کردەوە کە کاتێک ئەفسەرەکە ڕۆشــت، کاتــی کاری ئیــداری بەســەرچووبوو. هەربۆیەش، ســبەینێ ڕاپۆرتــی خۆی دەداتەوە. دەبێ دەســت بجوولێنین). بەو هۆیەشــەوە، کراســە ســوورەکەی مینای هەڵگرتەوە و کراسێکی سپی شۆڕ کردەوە و ماناکەشی ئەوە بوو کە دۆخەکە هێورە و مەترسییەک لە ئارادا نییە، بۆ ئەوەی سدیق هەرچی زووتر سەردانی بکات.

کەســێک بە ئەســپایی لە دەرکەی دا. خاوەن ماڵ بوو. لینا دەیویست خــۆی شــاد و دەم بــە پێکەنین پیشــان بــدات. بــەڵام نەیتوانــی و بە ڕواڵەتێکی گەچڵاوەوە لە بەردەمیدا ئامادەبوو. لینا باش دەیزانی بۆچی لەو درەنگانی شەوەدا لە دەرکەی داوە.

خاوەن ماڵەکە نەیدەزانی لە کوێوە دەست پێبکات. لینا ویستی یارمەتی بدات، بەڵام وشــەکانی بۆ نەدەچووەوە ســەریەک. دواجار خاوەن ماڵ هاتەگۆ و گوتی: «خانم دەبێ ماڵەکە چۆڵ کەیت».

لینا بە ئاماژەی سەر تێی گەیاند کە دەزانێت.

خــاوەن ماڵەکە گوتــی: «نابێت لە من دڵگران بیــت، من دەبێ بژیوی پێنج منداڵ پەیدا بکەم».

لینا قسەکەی پێ بڕی و گوتی: «لە ڕاستیدا، تۆ نابێ داوای لێبووردن بکەیــت، بەڵکــوو ئەوە منم کە دەبێ داوای لێبووردن بکەم. ئێمە زۆر بە خێرایی ماڵەکەت چۆڵ دەکەین و لێرە دەڕۆین». ئەو پیاوە هیچ باســی ئەو بڕە پارەیەی نەکرد کە لینا بۆ کرێ خانوو پێی قەرزداربوو.

لینا کە چاوەڕوانی سدیق بوو، چەمەدانە بچکۆلەکەی دەرهێنا. سدیق دوای نیوەشــەو هــات. لینا دەســتبەجێ ڕووداوەکانی ئــەو ڕۆژەی بۆ گێڕایەوە. پاشــان هەریەکەیــان، یەکێک لە منداڵەکانــی کردە باوەش و

چوونــە خوارەوە. خاوەن ماڵەکەیان لە ژووری میوان دانیشــتبوو، لەو بێدەنگیــی شــەوەدا، لینــا بە ســرتە، ماڵئاوایی لێ کــرد و پێی گوت کە ئــەوەی لە ماڵەکەدا ماوەتەوە بیبات بۆ خــۆی. ئەو پیاوەش لە وەڵامدا گوتی: «ئینشائەڵڵا خوا یارتان بێت!»

کەس لە دەرەوە نەبوو. ئەوان لە ســووچی هەر کۆڵانێکدا دەوەستان و خۆیــان دەلکانــد بــە دیــوارەوە و گوێیان هەڵدەخســت. پاشــان بۆ هەڵســەنگاندنی دۆخەکە، سدیق ملی دەکێشا بۆ ئەوەی دڵنیا بێت کەس لە کۆڵانەکەدا نییە و ئەوســا، وەکوو گورگ لەســەر پەنجە دەڕۆشــتن. گڵۆپی کارەبا لەو ناوە نەبوو. کۆڵانەکان، تەنیا لە ڕێی ڕووناکایی مانگ و ئەســتێرەکان ترووســکاییەکییان تێکەوتبــوو. ڕێگە ڕۆشــتنی ئەوان، وەکوو ڕۆشــتن لە ســەر تابلۆیەکی نیگاری رەش و شەفاف، هەموار و بێڕوانگە بوو.

لینا پرسیاری کرد: «بۆکوێ دەڕۆین؟»

سدیق: « دەچینە لای ئێمە، دەبێ هەوڵ بدەین دایکم خەبەری نەبێتەوە. پێش کازیوەی بەیانی، دێمەوە بە دواتاندا.»

لینا: «پێتوایە بتوانی، ئەمشەو، حەشارگەیەکمان بۆ بدۆزیتەوە؟»

سدیق: «دەبێ وا بکەم، چار نییە!»

لەو ســەردەمەدا، شەوانی تاران، لە شاری مردووان دەچوو. شەوان، شــار دەبووە گۆڕەپانی تەڕاتێنی ســەگ و پشــیلەکان. بێدەنگی، شتێک جگە لە ڕاستیی بەدوای خۆیدا کێش دەکرد.

لینا کە لەگەڵ کازیوەی بەیان گەیشــتبووە حەشــارگە نوێیەکەی، ئەو کەمە شمەکەی هێنابووی لە چەمەدانە بچووکەکەی، دەرهێنا.

بە درێژایی ئەو ساڵانەی لینا بە بەردەوامی ماڵەوماڵی دەکرد، هەرگیز هیچکام لە شوێنە گەشــتیارییەکانی ئێرانی نەبینیبوو کە تووریستەکان ســەردانیان دەکردن. ناوی سەرســووڕهێنەر و جوان وەکوو شــیراز، ئێســفەهان و تەختی جەمشــید (پێرســپۆلیس)، تەنیا وەکــوو ناوێک لە بیرەوەریی ئەودا مانەوە. ئەو لە ئێران، تەنیا ئاپارتمانی شــوێنی ژیانی،

حەســار، کۆڵانەکانی ئــەو دەوروبەرە و هەندێ لــە بەقاڵەکانی کۆڵانی ناســی. ئەوانــەی لێنا هاموشــۆی دەکردن، هەموو لە ڕیــزی دژبەرانی ڕێژیمــدا بوون. ئەو لە دنیایەکی بچووک و تەســکدا دەژیا، دنیایەک کە لەودا ڕاســتیی ژیان، ئاســایی، ناسروشــتی و یەکنەواخت دەهاتە پێش چاو.

■ فێربوونی خوێندن و نووسین

سدیق و هاشــم، لە نەبوونی عەبدولڕەحماندا، بەرپرس بوون لەوەی ئــاگاداری لێنا و منداڵەکانی بــن. هەروەها، دەبوو دەرەتانی گەڕانەوەی لێنا و منداڵەکان بۆ ئورووپا برەخســێنن. بەڵام، پاش ڕۆشــتنی لێنا بۆ بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، هەموو بەرنامەکانیان گۆڕدرا.

هاشــم، ئەندامێکی فارســی حیزبی توودە و مامۆســتای قوتابخانەی سەرەتایی بوو.

ســدیق، کــورد و ئەندامــی حیزبــی دێموکراتــی کوردســتانی ئێران، مامۆستای دواناوەندی و هەروەها شاعیریش بوو.

نیوەڕوان، کاتێک خەڵک ســەرقاڵی نــان خواردن بوون ودووکانەکان چــۆڵ دەبوون، لێنا بــۆ کڕینی پێداویســتییەکانیان دەچووە دەروە. فێر ببوو چۆن بە کارامەیی ژنانی ئێرانی چارشــێو لەســەر بکات. ئەو بەو چوونــەدەرەوە کورتخایەنانەش دڵخۆش بــوو، چونکە، یەکەم دەرفەتی هەنــدێ جووڵــەی بــۆ دەڕەخســا و دووهەمیــش، دەرەتانێــک بوو بۆ گۆڕینەوەی چەند وشــەیەکی «ئاســایی» لەگەڵ فرۆشیارەکان. لێنا کە پێویســتی بــە هاتوچۆ و جموجۆڵ هەبوو، لــە چواردیوارییەکدا قەتیس ببوو و چالاکییەکانی بەو ماڵەوە کورت کرابووەوە.

پــاش چوون بــۆ بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، تووشــی دڵەڕاوکێ ببوو، خەوی لێ زڕا بوو و کاتێکیش دەنوست، مۆتەکەی دەبینی. ئەو کتێبانەی بــە زمانی چێکیی و ئینگلیســی هەیانبــوو، لە ڕەوتی شــوێنەگۆڕکێ و گۆزەڵگۆزەکاندا، بەجێ مابوون، چونکوو بە هۆی پەلەپەلەوە، دەرەتانی

گواســتنەوە و بردنــی ئەوانەیــان نەبــوو. لێنــا ئۆگرییەکــی زۆری بۆ خوێندنــەوە هەبوو، بەڵام لێی بێبەش ببوو. دیارە، هەمیشــە شــتگەلێک وەک ڕۆژنامــە و کتێبــی شــیعر و.. بە زمانی فارســی بــۆ خوێندنەوە هەبوون. لێنا، هەرچەند لەو کاتەدا دەیتوانی بە جوانی بە فارســی قســە بکات، بەڵام خوێندنەوە و نووســینی فارســیی نەدەزانی. جگە لەوەش، ئەو وشە و دەستەواژانەی ئەو فێری ببوو، زمانی قسەکردنی دژبەرانی ڕێژیم بوو، نەک زمانی ڕۆژانەی خەڵکی ئاسایی یان زمانی منداڵان.

تــا ئــەو کاتە، دۆخەکــەی لە خوێندن و نووســین بێبەشــی کردبوو. ســەرەڕای ئــەوەش، لەگــەڵ زیاتر بوونی مەترســییەکان، ئــەو دەبوو زمانی چێکی لە بیر بکات و لەگەڵ منداڵەکان بە فارسی قسە بکات. لێنا چاوەڕوان بوو سدیق و هاشم کە هەردووکیان مامۆستا بوون، خوێندن و نووســینی فێر کەن. بەڵام ســدیق خەریک بوو خۆی بۆ ســەفەرێکی حیزبی ئامادە دەکرد و هاشمیش بە بیانووی ئەوەی کە کتێبی دەرسیی نییە، خۆی لەو کارە دەدزییەوە. لێنا پێشنیاری کرد کە هاشم لەو کتێبە دەرســییانەی لــە قوتابخانە دەیوتنەوە، کەڵک وەربگرێت. بەم چەشــنە، سەرەڕای ئەوەی هاشــم بە ڕێکوپێکی بۆ گوتنەوەی وانەکان نەدەهات و لە ڕاســتیدا هەرکاتێک بۆی بلوایە وانەی پێ دەوتەوە، لێنا لە ماوەی ســێ مانگدا، ئەوەی منداڵان لە ماوەی چوار ساڵ خوێندنی سەرەتاییدا فێری دەبوون، فێر بوو.

کاتێک دەستیان کرد بە خوێندنی کتێبی پۆلی پێنجەم، خوشکی هاشم بە شێوەیەکی تراژیک گیانی لەدەست دا و چیدیکە نەیانتوانی بەردەوام بن. بەم چەشنە فێرکاریی خوێندن و نووسینی لێناش کۆتایی پێهات.

■ مەرگی جەلیلە

ســاڵێک پێــش دەســتپێکردنی خوێندنەکــەی، لێنــا و منداڵەکانی دوو حەوتوویــان بــە ئارامیــی و بە نهێنی لــە نهۆمی یەکەمی ماڵی هاشــم بردبووەسەر. لەو ماوە کورتەدا، لێنا و جەلیلەی خوشکی هاشم ببوونە

هاوڕێ. جەلیلە لە خەباتدا بەشدار و چالاک بوو.
کارەساتەکە لە کاتێکدا قەوما بوو کە ژنان سەرقاڵی لێنانی شێوی ئێوارە بوون. لێنا، لەپڕ دەنگی قریشک و هۆڕێکی لە نهۆمی یەکەمەوە بیست. بە پەلە لە پلیکانەکان چووە خوارەوە و بینی جلوبەرگەکانی جەلیلەی هاوڕێی گڕی تێبەربووە و باوکە پیرەکەشی هەوڵ ئەدات جلەکانی لەبەر داماڵێت. بەڵام گڕەکە پەرەی دەسەند. لێنا لێفەیەکی دا بەسەر جەلیلەدا و بەم چەشنە گڕەکەی کوژاندەوە. ژنە گەنجەکە لە ئازاردا دەینالاند و بەدەم قیژە و هاوارەوە بانگی لە دایکی دەکرد. ئازارێکی زۆری دەکێشا. جەلیلە پەڕەمێزە نەوتییەکەی پێکردبوو و کاتێک ویستبووی شوێنەکەی بگوێزێتەوە، بەڕووی خۆیدا هەڵگێڕابووەوە.
ژوورەکە بەخێرایی پڕ بوو لە دەروجیران. هەریەکەو بە جۆرێک هاواری دەکرد و ئامۆژگاریی جیاوازیان دەکرد. هەموو شپرز ببوون. ژنان بەسەر خۆیاندا دەکێشاو گۆنای خۆیان دەڕنی.
جیرانەکان کە نیوەی ژوورەکەیان داگیر کردبوو، وەها هەراوزەنایەکیان وەڕێ خستبوو کە تەنانەت بۆ مرۆڤێکی ئاساییش تاقەتپڕووکێن بوو.
لێنا کە خولی یارمەتیی پزیشکیی سەرەتایی بینیبوو، دەیزانی لە دۆخێکی ئەوتۆدا چی بکات، خۆی خستە نێوان خەڵکەکە و جەلیلە و داوای لە جیرانەکان کرد بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان.
جیرانەکان لە دڵیان گران هات و گوتیان: «تۆ بۆت نییە وەدەرمان نێی و ئەم کارەت شیاو نییە». بەڵام لێنا، بەرەولای دەرگاکە پاڵی پێوەنان و دواجار ناچاری کردن بڕۆنە دەرەوە.
لە نەخۆشخانە گوتیان لەسەتا هەشتای جەستەی جەلیلە سووتاوە و لە هەندێ شوێنی جەستەشی سووتانەکە گەیشتۆتە ئەوپەڕی خۆی. تەنیا سەر و دەم وچاو و ڕکەی سینگی بە سەلامەت دەرچووبوو.
پاش ڕوودانی ئەو کارەساتە جەرگبڕە، زۆر کەس لێنایان لەو ماڵە بینیبوو، هەربۆیەش ناچار بوو ئەویش بەجێبهێڵێت. هەر بەو هۆیەشەوە نەیدەتوانی زۆر لە نەخۆشخانە سەردانی جەلیلە بکات. لەوەیکە دەیبینی

هاوڕێکەی ئازار دەکێشـێت و ڕۆژ بە ڕۆژ هێز و توانای کەم دەبێتەوە و دوکتورەکانیـش چییان لەدەسـت نایە، خەمێکی قورس لەسـەر دڵی بـار بوو. بنەماڵـەی جەلیلە، تەنانەت توانای جێبەجـێ کردنی تێچووی ئـەو حەمامی ڕۆنەیان نەبوو کە بۆ کەم کردنەوەی ئازاری جەسـتەی پێویسـت بوو. تەنیا بۆ دانی تێچووی نەخۆشـخانە، چارەسەری و داو ودەرمان، بنەماڵە ناچار ببون ئاڵتوون، فەرش و هەرشتێکی کە پارەیان بۆ بکات، بفرۆشن و دواجاریش خانووەکەیان نایە گرەو.

جەلیلـە، پـاش نۆ مانگ ئازار و ژان، کۆچی دوایـی کرد. بنەماڵەکەی تەنانـەت بەشـی بەڕێوەبردنـی سەرەخۆشـیی و بەخاکسـپاردنێکی گونجاویان بۆ نەمابووەوە.

ئەوان، لینایان بە هۆکاری چارەڕەشیی خۆیان دەزانی. سەرزەنشتیان دەکرد کە نەیهێشـتووە جەلیلە بمرێت و بە ڕزگار کردنی، بووەتە هۆی درێژخایەن بوونی ڕەوتی چارەسـەرییەکەی و لـەو ماوەیەدا ژیانێکی تەژی لە ئازاری کێشاوە و بنەماڵەکەشی مایەپووچ کردووە. سەرەڕای ئەم کارەساتەش، هاشم ماوەیەک وانەی بە لینا گوتەوە. پاشان چیدیکە نەهاتەوە. پاش گەڕانەوەی سـدیق لە سـەفەری حیزبی، لینا سـۆراخی هاشمی لێ کرد.

سـدیق وەڵامی دایەوە: «ئەو چیدیکە نەهاتەوە، چونکە سەرزەنشـت دەکرا بە هاتووچۆ و سەردانی تۆ کە پۆلیس بەدواتەوەیە». جگەلەوەش، ئەو دەبوو پێداویسـتی بنەماڵەکەی دابین بکات و لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو مەترسییەش لەئارادا بوو کە بەسەردان کردنی لینا، ئەوانیش بخاتە مەترسییەوە.

■ گەڕانەوەی عەبدولڕەحمان لە ئورووپا

عەبدولڕەحمان کە چاوەڕێ بوو تا کاتی گەڕانەوەی، ژن و منداڵەکانی لـە ئێـران چووبێتنـە دەرەوە، ئەوانـی لە تـاران و لە ژیانێکـی نهێنیدا بینییـەوە. هەروەهـا، «هیـوا» کچی دووهەمی خۆیشـی بینـی. بابەتی

چوونــەدەرەوەی لینــا و منداڵــەکان لە ئێران ببــووە گرفتێکی گەورە و هەمــوو چاوەڕوان بوون عەبدولڕەحمان چارەســەری بکات. لە لایەکی دیکەشەوە، ڕاوەدوونانی دژبەران، سەرلەنوێ هەڵەسوونی هێنابووەوە و ئــەو ڕووداوانەش کە لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس ڕوویاندابوو، لینا و بنەماڵەکەی ناچار دەکرد نهێنی کاریی زیاتر بکەن.

■ هاوکارەکانی عەبدولڕەحمان

تــا ڕادەیــەک چالاکییــەکان ڕاگیرابــوون، ئــەوەش دەرفەتــی بۆ لینا ڕەخساندبوو لە هاوکارەکانی مێردەکەی ورد بێتەوە. لەو ڕۆژەوە، لینا بەردەوام بیر لــەوە دەکاتەوە. ڕێژەیەکی زۆر لەوانە، قارەمانێتی وایان لەخۆیــان نیشــان داوە کە کەس جگە لە لینا باســیان نــاکات. هەریەک لەوان بە شــێوازی تایبەت بەخۆیان خەباتیان کرد و بەرەوڕووی تەنگ و چەڵەمەی زۆر بوونەوە.

بــۆ نموونە، یەکێک لەوانە، عەزیز یووســفی بوو. ئــەو هاوخەباتێکی بەئاگا و شــاد بوو. هەموو خۆشــیان دەویســت. زۆر تەمبەڵ بوو. بۆ وێنــە لەبری ئــەوەی وەکوو هەمووان، لە دەوری ســفرە چوارمشــقی دابنیشــێ، وەکوو ڕۆمییە کۆنەکان، ڕادەکشــا. گەر پێویســتی بە خوێ بوایە، ســەرەڕای ئەوەی خوێدانەکەی لەبەردەســتدا بوو، لە هاوڕێکەی تەنشــتی داوا دەکرد بیداتە دەســتی و ئەوەش بۆ ئەوە بوو لە شــوێنی خۆی نەجووڵێت و شــێوازی دانیشــتنەکەی تێک نەدات. تەمبەڵیی کاک عەزیــز ببووە هــۆی گاڵتە و گەپی هەمــوان و هەرکاتێک بەو بۆنەوە گاڵتەمان دەکرد و پێدەکەنین، ئەویش بۆخۆی لەو ڕووەوە کە پیاوێکی ڕووخۆش بوو لەگەڵمان دەکەوتە پێکەنین.

ماوەیــەک پــاش ئــەو پشــووەی کــە پێکــەوە لــە گوندی قاســملوو بردمانەســەر، عەزیز دەستبەســەر بوو و کەوتە زیندان و ئەشــکەنجە کرا. ڕژێمی پاشــایەتی بە تاوانی هەڵسووڕانی پیلانگێڕانە بەدژی شا و ئەندامەتی لە حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران، ٢٥ ســاڵ زیندانی

بەسەردا سەپاند.

عەزیز مرۆڤێکی دروستکردار و بەئاگا بوو. لە زیندان فێری زمانی ئینگلیسی بوو و هەندێک کتێبی لە نووسەرە بریتانیاییەکان وەرگێڕایە سەر زمانی فارسی. شایانی باسە کە لە زیندانەکانی شادا، زیندانییەکان دەستیان بە کتێب و ڕۆژنامە دەوڵەتییەکان ڕادەگەیشت. عەزیز زۆری دەخوێندەوە. پێش دەستبەسەربوونی، کۆمۆنیستێکی باوەڕمەند بوو. لە ساڵەکانی مانەوەی لە زینداندا، گۆڕانکاری بەسەر باوەڕەکانیدا هات. پاش ئەوەی کە لە زیندان ئازاد بوو، لە سای خوێندنەوەکانیدا، بە سانایی توانیی بەسەر ئەو ئاستەنگانەدا کە لە سۆنگەی ئاڵوگۆڕەکانەوە پێک هاتبوون، زاڵ بێت.

دوو ساڵ پێش ئازاد بوونی، ڕێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی عەزیزی وەکوو «زیندانیی ساڵ» ڕاگەیاند و لەو سۆنگەوە توانی ساڵێک زووتر لە زیندان ڕزگاری بێت. پاش ئازاد بوون، عەزیز لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران نزیک بووەوە. ئەو و عەبدولڕەحمان کە هاوڕێیەتییەکی لەمێژینەیان هەبوو، باش لە یەکتر تێدەگەیشتن. مەخابن، یازدە مانگ پاش ئازاد بوونەکەی، دڵی لە لێدان کەوت و کۆچی دوایی کرد.

«غ»، یەکێکی دیکە لە هاوکارەکانی عەبدولڕەحمان بوو. لەگەڵ عەزیزیش هاوڕێ بوو و ڕێک هەمان چارەنووسیشی پەیدا کرد. ئەو هەموو ماوەی زیندانەکەی خۆی بردەسەر. لە دەرئەنجامی بێکاری و ڕەنگە بەهۆی بێهیواییشەوە، لە زیندان پەنای بردبووە بەر مەشرووب و یاریی وەرەق. پاش ئازاد بوونی لە زیندان، چاوەڕوانیی پێزانین و ئەمەگناسیی لە هاوڕێکانی هەبوو. چاوەڕوان بوو بە هۆی هەموو ئەو ساڵانەوە کە لە زیندان بردوویەتە سەر، بگاتە بەرزترین ئاستی بەرپرسایەتی لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کوردستاندا، واتە سکرتێریی گشتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ئەو بەرپرسایەتییەی لە ئەستۆی عەبدولڕەحمان بوو.

ئەو لەم سـۆنگەیەوە داخڵەدڵ ما و لە ڕیزی هاوڕێکانی جیا بووەوە و وازی لـە حیـزب هێنـا. ئەو خۆی بـە قارەمان دەزانـی و پێی وابوو هەموو نەتەوەی کورد پەیڕەویی لێ دەکەن. دواجار توانیی لەگەڵ چەند ئەندامێکی ناڕازیی کومیتەی ناوەندی، حیزبێک دابمەزرێنن. بەڵام شانس یاوەری نەبوو و ماوەیەکی زۆرە کۆچی کردووە بۆ ئورووپا.

عەبدولڕەحمان هاوکارێکی دیکەشـی هەبوو بە ناوی «ئەحمەد. ت». گەنجێکـی گونـدی و زیـرەک بوو. بـەڵام زانیاری گشـتی و بەتایبەت قاڵبوونەوەی سیاسـیی زۆر باش نەبوو. ئەو کە بەڕێکەوت و لە سـای قـەزا و قەدەردا، خۆی لە دەوروبـەری ڕێبەرایەتیی حیزب بینیبووەوە، پێگـە و ڕاگرتنـی باڵانس سـەبارەت بـە بابەتەکانی لەدەسـت دابوو و پێـی وابوو دەتوانێ ڕۆڵـی ڕێبەرێک بگێڕێت (بـۆ ماوەیەکی کورت بە ئاواتەکـەی گەیشـت) بـەڵام چونکە توانـای هاوڕێکانی نەبـوو، کەوتە پیلانگێـڕان و ڕەوتی گـۆڕی و کۆتایی بە خەباتی خـۆی لە ڕیزەکانی حیزبـی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێرانـدا هێنـا و پەیوەسـت بە مەلا مسـتەفای بارزانی، ڕێبەری پارتی دێموکراتی کوردستانی عەراق بوو. کەمن ئەو ڕێبەرانەی هاوکارە دەسـەڵاتخوازەکانیان تەحەممول دەکەن و بارزانیـش کە بـۆ لایەنگرانی خۆی قارەمانێکی ڕاسـتەقینە بوو، لەو بوارەوە جیاواز نەبوو.

ئـەو زۆر زوو بـە نییەتـی ئەحمـەد. ت ـ ی زانـی و ئەحمـەد. ت، ئەمجارەیان ڕووی لە حیزبی بەعس واتە ڕێژیمی سەددام کرد. ئەحمەد. ت، سـەرەڕای دەسەڵاتخوازیی سیاسـی، تەماحی کۆکردنەوەی ماڵ و سامانیشـی هەبوو و دەسـتی کرد بە کڕین و فرۆشـتنی مەڕ و ماڵات و بەرپرسـەکانی ڕێژیمی بەعس، ئەمری دەستبەسـەرکردنیان دا و بە تاوانی کڕین و فرۆشتنی نایاسایی زیندانییان کرد. لە زیندانیشدا کوژرا. لە لایەن چ کەسێکەوە؟ وەڵامەکان جیاوازە.

حەسەن چاو کوێر (حەسەنە کوێرە). پیاوێکی مێهرەبان، بەورە و کارا بوو. ئەویش لە ڕیزی ئەو یازدە کەسـەدا بوو کە پێکەوە لە ئاپارتمانی

پیاوە زەردەشتییەکەدا لە نزیک کەڵانتەریی ژمارە یەک، دەژیان.

کاتێـک بڕیاردرا لێـک جیا ببنەوە، ئەویش بزر بـوو. قاو داکەوت کە لە جەنگەی شـەڕێکدا لە کوێسـتانەکانی کوردستان شەهید بووە. پاش ساڵانێک، لێنا زانی کە سەلامەتە و لە وڵاتێکی ئورووپایی دەژی.

یەکێکـی دیکـە لـە هاوکارەکانـی عەبدولڕەحمـان، نـاوی پەرویـز حێکمەتجوو بوو. ئەو تاکە کەسـی غەیـری کوردی گرووپەکەیان بوو. پەرویز، فارس و دەرەجەداری هێزی ئاسـمانیی شاهەنشـایی بوو. لێنا ماوەیـەک پێش هاتنی بـۆ ئێران، لەگەڵ بنەماڵەی پەرویز ئاشـنا ببوو. لێنا لە زەماوەندی پەرویزدا بەشـداریی کردبوو و هەرکاتێکیش پەرویز لەگەڵ هاوسەرەکەی تووشی کێشە دەبوو، دەردەدڵی بۆ لێنا دەکرد. لێنا لەگەڵ دایکی پەرویزیش نێوانی خۆش بوو. خوشکی پەرویز جارێکیان لە تاران عەبدولڕەحمانی لە گرتن ڕزگار کردبوو. پاش ساڵانێک، لێناش، فریای کوڕی ئەو ژنە کەوتبوو. کوڕەکە لەمردندا بووە و باوکی بەڕێی کردووە بۆ پراگ و لەوێ لێنا بەهانایەوە هاتبوو.

ئەوان، سەرەتا لە تاران و دواتر لە بەغدا پێکەوە لە ماڵێکدا ژیابوون. لێنا پێی وابوو بە باشی دەیناسێت. بەلای لێناوە، پەرویز پیاوێکی نەوسن، تەمبەڵ و خۆهەڵکێش بوو. وەکوو جەستە، هێرکوولێکی ڕاستەقینە بوو. تۆنی دەنگی گەرم بوو و کاتێک پێدەکەنی، دەنگی قاقاکەی شووشەکانی دەلەراندەوە. زۆریش پێدەکەنی، کاتێکیش بەو دەنگە گەرم و پوختەیەوە تەنانەت بە سـرتەش قسـەی دەکرد، لە ژوورەکەی تەنشتییەوە دەنگی دەبیسـترا. لەم دنیایەدا، جگە لە کۆمۆنیسم، هیچی دیکە بەلایەوە پیرۆز نەبـوو. ئەو گاڵتەی بە ئەشـکەنجەگەرەکان و پیاوانـی ڕێژیم دەکرد و هەمیشـە دەیگـوت کە دەتوانـێ لەبەرانبەریاندا خۆڕاگـر بێت، تەنانەت ئەگەر بەنرخی لەکیسدانی گیانیشی بێت. بەلای لێناوە ئەم قسانە زیاتر وەکوو فڕوفیشـاڵ و خۆهەڵکێشـان دەهاتەبەرچاو، چونکە کێ دەتوانێ بڕیارێکی لەم چەشـنە بدات؟ کاتێک لێنـا، ئەو خۆ بە پاڵەوان زانینانەی بـەو دەنگە گڕەوە لە پەرویز دەبیسـت، خوداخودای دەکرد کە هەرگیز

نەگیرێت و نەکەوێتە ژێر ئەشکەنجەوە. چونکوو لێنا بڕوای بەوە هەبوو کە زۆربەی ئەو مرۆڤانەی ئاوا خۆیان هەڵدەکێشن، زۆریش خۆڕاگر دەرناچن. ڕۆژێک لێنا، هەرلەو پەیوەندییەدا، بیرکردنەوەی خۆی بۆ پەرویز باس کرد. پەرویز بە قینەوە سەیری کرد و پاشان بۆ ئەوەی نیشان بدات خۆی هەڵناکێشێت، جگەرەکەی لەسەر دەستی کوژاندبووەوە، بە بێ ئەوەی ئاخێک هەڵکێشێت یان جووڵەیەک بکات، بۆکڕووز هەمووماڵەکەی هەڵگرتبوو. دواجار پەرویز گیرا، لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی سپارد، بەڵام کەسی پێوە نەکرد.

هاوکارێکی دیکەش، سدیق هەنجیری بوو. لە لاپەڕەکانی پێشووی ئەم کتێبەدا زۆر جار باسی کراوە. سدیق شاعیر و مامۆستای ئەدەب بوو. شارەزای ئەدەب بوو. عاشقی سادق هیدایەت، یەکێک لە نووسەرە گەورە و هاوچەرخەکانی ئێران و ئالبێر کامۆ بوو. سدیق مرۆڤێکی ڕۆشنبیر، هێمن، لەسەرەخۆ و مێهرەبان بوو. ئەو کە چاونەترسیی و شەهامەتی حەکیمە بێدەنگەکانی هەبوو، لەڕادەبەدەر هەستیار بوو، هەربۆیەش ئاشکرا بوونی ڕاستییەکان سەبارەت بە ستالین، ئەو هەڵسوکەوتەی بەرانبەر بە «گولاک» کرابوو و گەندەڵیی دەسەڵاتداران لە دام و دەزگای کۆمۆنیستیدا، سدیقی ئێشاند. ڕاپۆرتی «خرۆشچۆف» لە ساڵی ١٩٥٦دا بۆ بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتی سۆڤییەت، بە شێوەیەکی تایبەتی باوەڕەکانی لەرزۆک کردبوو و تووشی گومان و دوودڵیی کردبوو. ئەو لەم بارەوە بە پارێزەوە لەگەڵ هاوڕێکانی دەدوا. ئەوانیش وەڵامیان ئەدایەوە کە: «ئێمە ئاگاداری هەموو شتەکان نین و ئەم خرۆشچۆفە ئیتر کێیە؟ و ئەوەش کە، هەرچۆنێک بێت، ئیمکانی نییە خائینێک بە تەنیایی بتوانێت جەوهەری ئیدئۆلۆژییەک بگۆڕێت و...».

سدیق بە مەبەستی دروست بوونی ئاڵوگۆڕێکی مرۆیی لە کۆمەڵگادا خەباتی دەکرد، بە دەرکەوتنی ئەم ڕاستییانە، هیوای بە ئاڵوگۆڕ، لە بنەڕەتەوە کەوتبووە ژێر کاریگەرییەوە. ئەو بۆ دروست کردنی کۆمەڵگەیەک خەباتی دەکرد کە لەودا، خەڵکی کورد لە هەژاری

و زوڵـم ڕزگاریان بێت. هەڵسـوکەوتی وەکوو کەسـێک کـە خەیانەتی لێکرابێت، کەوتبووە دۆخی بەرگرییەوە. ئاشـکرا بوونی ئەو ڕاستییانە، لـە بۆچوونەکانی ئەودا، بەو ئیمانە ڕاسـتگۆیانەوە کـە هەیبوو، تۆوی گومانـی خسـتبووەوە. دیارە، هەسـتی خەیانەت پێکـران، تەنیا تایبەت بـە باوەڕمەندانـی تاران و کوردسـتان نەبوو (چەپ لە سەرانسـەری دونیادا تووشـی ئەو گومانە ببوو). خەباتکاران پێیان وابوو کە هەموو ڕاسـتییەکانیان پێ نەگوتـراوە، هەربۆیەش، بەگشـتی ڕەتیان کردەوە. چونکـە ئەوان پێویسـت بوو خەباتەکەیان درێژە پێبـدەن و ئەگەر ئەو ڕاسـتیانەیان قبووڵ کردبا، مەترسـیی ئەوە لەئارادابـوو کە کۆنترۆڵی هەموو شتێک لە دەستیان دەربچێت. بە قبووڵ نەکردنی ئەو ڕاستییانە، لە ڕاستیدا، ئەوان بەرگرییان لەو مەرامنامە و بەرنامە سیاسییە دەکرد کـە خەباتیان بۆ دەکرد و خرۆشـچۆف مـەرام و بەرنامەی تێک وپێک دابوون. ئەوان هیچی دیکەیان نەبوو.

سـدیق لەم بابەتە تێگەیشـتبوو، بەڵام، چەنکـە نەیدەزانی چی بکات، خۆی بە ئەرک و کارە بچووکە ڕۆژانەکانی خەباتەوە سـەرقاڵ دەکرد. عەبدولڕەحمان سـدیقی بۆلای مەلامستەفای بارزانی بەڕێ کردبوو بۆ ئـەوەی سـەبارەت بـە هاوکاریی نێـوان دوو حیزبەکە قسـە بکات. بە پێچەوانـەی عەبدولڕەحمانەوە، سـدیق زۆر هیوای بە سـەرکەوتوویی دیدارەکـە نەبـوو. بـەڵام لەو ڕووەوە کـە خەباتکارێکـی تەکووز و بە دیسـیپلین بوو، قبووڵی کردبوو. سـدیق، هەم دیپلۆماتێکی باش بوو و هەم شارەزای خاڵە ناکۆکەکانی هەردوو حیزبەکە بوو. جگە لەوەش، لە لێکدانەوە و بەڵگە هێنانەوەدا، کارامە بوو.

موناقشـەی نێوان بارزانی و سـدیق، موناقشەیەکەی پڕ لە گەنگەشە و دەنـگ وباس هەڵگر دەبێت. بارزانـی لەگەڵ هاوکاریی دوو حیزبەکە کـۆک بووە، بەو مەرجـەی کە تەنیـا حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی عەراق مافی بڕیاڕدانی هەبێت. بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە سـەربەخۆیی بڕیاردانی بە بنەمایەکی سـەرەکی دادەنا، ئەو بابەتە

نەگونجاو بوو. حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ئەم هاوکارییەی تەنیا لەسەر بنەمای مافی بەرابەر، بە مسۆگەر دەزانی، نەک ملکەچ بوونی حیزبێک بۆ حیزبێکی دیکە.

سدیق لە گەڕانەوەی لەم سەردانەدا، لە سنووری نێوان کوردستانی عەراق و کوردستانی ئێران شەهید کرا. لەو ڕووەوە کە هیچ لێکۆڵینەوەیەک لەو بارەوە نەکرا، هەرگیز دەرنەکەوت کە ئەمری ئەو کوشتنە لە لایەن کێوە دەرچوو.

سلێمان موعینی: ئەو لە ساڵەکانی ١٩٦٠دا، ئەندامی ڕێبەریی حیزب و گەلێکیش خۆشەویست بوو. مرۆڤێکی پڕ لە وزە و خاوەنڕا بوو (لەم سەردەمەدا، عەبدولڕەحمان لە پراگ نیشتەجێ بوو، وێڕای وانە گوتنەوە لە زانکۆ، سەرقاڵی ئامادە کردنی بڕوانامەی دوکتۆراکەی بوو. ئەو دواتر و لە ساڵی ١٩٧٣دا، بوو بە سکرتێری گشتی).

لەم کاتەدا، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتیی شۆڕشێکی چەکداریی دەکرد کە ماوەی ١٨ مانگ، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٨ـ ١٩٦٧دا، لە بەرانبەر هێزە سەرکوتکەرەکانی شادا خۆڕاگریی کردبوو. هەموو ئەندامانی ڕێبەریی حیزب لەو شۆڕشەدا گیانی خۆیان لەدەست دا. لە ڕاستیدا، کادری ڕەهبەریی حیزب لەناوچووبوو. ڕێژیمی شا تەرمی سلێمانی بە پەیژەیەکەوە بەستبووەوە و نووسراوێکیان لەسەر لاپەڕەیەک کردبووە ملی کە لەسەری ئەم ڕستەیە نووسرابوو: «سلێمانی موعینی، ئەمەیە سزای خەیانەتکاران».

بەکرێگیراوانی ڕێژیم بە مەبەستی پێشگرتن بە هەرچەشنە ناڕەزایەتییەک و دروست کردنی کەشی ترس و تۆقاندن لای خەڵک و چاوترسێن کردنیان، تەرمی بە گوللە دابێژراوی سلێمانیان بە گوندەکاندا دەگەڕاند.

ئیسماعیل، ئامۆزای عەبدولڕەحمان: ئەو گەنجێکی زیرەک و گەلێک فیداکار بوو و لە ناخی دڵەوە ئەندامەتیی خۆی لە حیزبی دیموکراتدا پێ خۆش بوو. ئەوە ئیسماعیل بوو کە ساڵی ١٩٥٧دا، لینا و منداڵەکانی

لە ڕێی شــاخەکانی کوردستانی ئێرانەوە بۆ کوردستانی عەراق ئاودیو کــرد و هەتا بەغا لەگەڵیان چوو. لــە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ تاران گیرا و خرایە زیندانەوە.

پاش ئازاد بوون لە زیندان، ڕێبەریی حیزب پێشــنیاری پێکرد واز لە سیاســەت بهێنێت و درێژە بە خوێندنەکەی بدات و ئەویش بە قســەی کــردن و درێــژەی بــە خوێندنەکەی دا. پــاش کۆتایی هاتنــی خوێندن، ئەندازیارێکی بەناوبانگی لێدەرچوو و ژیانی هاوبەشی پێکهێنا. منداڵێکی بوو و دواجار لەتەمەنی ٦٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

ئەبــوو: ئامــۆزای عەبدولڕەحمــان بــوو. ئەویــش، لە ڕاســتگۆیی و پابەندبــوون بە خەبات لە ڕێی خەڵکەکەیــدا، لە ڕەفیقەکانی هەڵکەوتەتر بــوو. ئەویش مرۆڤێکی گەرموگوڕ و خــاوەن زەوق بوو و هەموو بەو بۆنەوە خۆشیاندەویســت. ماوەی ١٣ ســاڵ لە چاڵەڕەشەکانی ڕێژیمدا زیندانــی بوو. پاش ئــازاد بوونی لــە زیندان، ماوەیــەک لەگەڵ ناجێگر بوونی دەروونی ململانێی کرد و لەم ماوەیەدا هەڵسوکەوتێکی ڕاڕایانەی هەبوو. هەستیاریی لەڕادەبەدەری ئەو، بووە هۆی ئەوەی نەتوانێ برینە کۆنەکانی بە تەواوی لەبیر بکات. ســەرەڕای ئەوەش چووە شاخەکانی کوردستان و پەیوەست بە ڕیزی هاوسەنگەرە کۆنەکانی خۆی بووەوە. پاش ماوەیەک، چووە دەرەوەی وڵات و ئێستاش بە هەژاری دەژی.

هەندێجار مرۆڤ، پاش ســاڵانێک بەند بوون و تەحەمولی کردەوەی نامرۆیــی، لــە دوای ئازاد بــوون لە زیندان، تووشــی سەرلێشــێواوی دەبێــت. چونکــە وشــەکان گــۆڕدراون و ئەو وشــانەی پێــش زیندان بەکارهاتــوون، چیتر ئەو مانایان نییە. ئەمــەش دەتوانێ ببێتە هۆکاری هەندێ خراپ تێگەیشتن و دەتوانێ هۆکارێکی دیکەش بێ بۆ نائومێدی و هیوابڕاوی.

دژبەرانی ڕێژیمی شــا دەیانزانی کە ئەگەر بکەونە دەســت ســاواک، چییــان لێ بەســەر دێت. ئەوان دەیانزانی کە ئەگەر ســاواک کردەوەی ئــەوان بە تاوانێکی گــەورە مەزەندە بکات، ســزاکانیش گەورە و گران

دەبــن و ئــەوەش کــە مەرگێکــی چاوەڕواننەکــراو، باوەڕپێنەکــراو و بەئازار چاوەڕوانیان دەکات. ســەرەڕای ئەوەش، وەکوو شێر دەکەونە چاڵەڕەشــەکانەوە، بۆئەوەی شەمەندەفەری مێژوو بڕێکی کەمیش بێت بەرەو پێــش ببەن. ئەوان باش مەترســییەکانیان دەزانی، بەڵام گوێیان نەدەدایە.

نەتــەوەی کورد، ســەدەگەلێکی لە خەبات و ســەرکوت تێپەڕاندووە. ئەم نەتەوە زۆرجاران لە ڕەوتی خەباتدا، کەمئەندام بوون، کوشــتار و کۆمەڵکوژیی ڕۆڵەکانی خۆی بەچاو بینیوە، بەڵام تۆقاندن و چاوترسێن کــردن، هەرگیز نەیتوانیوە ئەم نەتــەوە بەچۆکدا بێنێت و لە پێی بخات، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، ورەی ڕابوون بووە بە بەشــێک لە تایبەتمەندیی ئــەم نەتەوەیە و بزوێنــەری بووە بۆ بەردەوامیی خەبات و پاراســتنی بوون و کولتوری.

■ تێپەڕین لە شاخەکانی کوردستان

مانەوە لە تاران، ڕۆژ بە ڕۆژ بۆ خەباتکارە کوردەکان مەترســیدارتر دەبــوو. هەربۆیەش، بڕیار درا کە ڕێبەرایەتیــی حیزبی دێموکرات پەنا بەرنە بەر شاخەکانی کوردستان. هەروەها، لێنا و منداڵەکانیشی پێویست بوو ئێران بەجێبهێڵن. لەو ڕووەوە کە هەوڵەکانیان بۆ ناردنە دەرەوەی لێنا و منداڵەکان بە شێوەی یاسایی شکستی هێنا بوو، تاقە ڕێگایەکیان بۆ مابووەوە، ئەویش ڕاکردن لە ڕێی شاخەکانەوە بوو.

ئــەو ڕۆژە، چەنــد هاوڕێیەکیان بــۆ ماڵئاوایی هاتن. لێنــا ئارام بوو. چەمەدانە ســووکەڵەکەی پێچابووەوە. هەندێ بیسکویت، سابوون، بڕێ جلوبەرگ بۆ منداڵەکان و ژێر شەڵوارێک بۆ لێنای تێدا بوو.

ئــەو نەدەبوو جلوبەرگی ژێــرەوە و فڵچــەی ددان هەڵگرێت، چونکە دەبووە هۆی گومان لێکردن. بڕیار بوو بچێتە بەغدا. عەبدولڕەحمان پێی گوتبوو کە پاســپۆرت، بلیتی فڕۆکە و پارەی پێویست لە بەغدا ئامادەیە. لــەو کاتەدا، بە مێشــکی کەســدا نەدەهات کە لێنــا و منداڵەکان چەندین

مانگ لە بەغا دەمێننەوە.

هێندەی نەخایاند کە لە وڵاتی پاشایەتیی عەراق ڕاپەڕین سەری هەڵدا و سیستمەکەی لە پاشایەتییەوە گۆڕدرا بۆ کۆماری. بەڵام لەو کاتەدا، هێشتا مەلیک فەیسەڵی دووهەم لەسەر دەور بوو و سەرۆک وەزیرانی حکومەتەکەشی نووری سەعید بوو کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دژبەران، ناوبانگی دەرکردبوو. لینا بیری لە پەندی : «لە ترسی مار پەنا بۆ ئاگر بردن» دەکردەوە، خەریک بوو خۆی دەخستە گەرداوێکی مەترسیدارترەوە. بەڵام دیسانەوەش بەخۆی دەگوت کە ڕەنگە بە ئامادەبوونی پاسپۆرت لە بەغا، بەخت یاریان بێت و بە سەلامەت لەو گێژاوە دەربازیان بێت.

عەبدولڕەحمان و منداڵەکان نووستبوون. لینا، کاتێکی بۆ خۆی وەچنگ خستبوو. سەرتاسەری تاران، بۆ ڕاکردن لە گەرمای شێداری شەو، نووستبوو. خەیاڵاتی جۆراوجۆر لینای داگرتبوو و وەکوو گێژەڵووکە لە مێشکیدا گێژی دەخواردەوە. پێیان گوتبوو کە ئەو و منداڵەکان لە شاخەکانی کوردستانەوە ئاودیو دەبن. هەروەها پێیان گوتبوو کە باشتر وایە ئاگاداری ڕێوشوێنەکان نەبێت و پێشیان گوتبوو هەرچی کەمتر بزانێت، بۆخۆی باشترە. لینا دەستەوئەژنۆ دانیشتبوو. هەستی بە پیری و پووچی دەکرد. سەرەڕای ئەوەش، ئەو کە سەفەرێکی دوورودرێژی لەبەر بوو، هەرچی بیری لێ دەکردەوە، نەیدەتوانی دڵی خۆی ڕازی بکات و بچێتە سەر جێیەکەی و بنوێت. هەستێکی سەیر لەسەر کورسییەکە چەقاندبووی. لەکاتی لەدایک بوونی دووهەمین منداڵیەوە کە هێندەی نەمابوو لەسەری بە هیلاک بچێ، لینا لاواز و بێهێز ببوو: بەقەدەر پێویست نانی نەدەخوارد، بەشێکی زۆری ئەو پارەی دەگەیشتە دەستی، دەبوە تێچووی خواردنی منداڵەکان و ماڵوماڵ کردن. دیارە، پاش گەڕانەوەی عەبدولڕەحمان، دۆخەکەی باشتر ببوو. بەڵام، لەو درەنگەشەوەدا هەستی بە بێتاقەتی دەکرد. ڕێک وەکوو فیلمێک، سەردەمی منداڵی و لاویەتی بە پێش چاویدا تێدەپەڕی

و ســاتە خۆش و ناخۆشــەکانی ژیانی بیر دەهاتەوە. لێنا، خەمساردانە ســەیری دەکردن، وەک بڵێی ژیانی کەســێکی دیکە بن. بەو حاڵەشەوە، نەیدەتوانی ڕایانگرێت.

لێنا کراسێکی کۆنی لەبەر کردبوو، لەوانەی ژنان لە ناوچە سنوورییەکان لەبەری دەکەن. کراســێکی فشــی درێژ و ئاودامان. قۆڵکراسەکانی ئەم کراســە، قوماشێکی ســێ گۆشــەی درێژیان پێوە دوورابوو کە دەبوو لەدەوری مەچەک هەڵپێپچن و یان لە پشــتەمل گرێیان بدەن، بۆ ئەوەی لــە کاتی کاردا بەردەســتیان نەگرێت. جنســی کراســەکە لــە پەمۆ بوو بــە موتیڤگەلێکی کاڵەوە. ســەفەرەکەی بەیانیی زوو دەســتی پێدەکرد. سەفەرێکی دوورودرێژیان لەبەربوو. بەڵام، هیچ کەس نەیدەزانی، چەند دەخایەنێت. هەموو شتێک پەیوەندیی بە بارودۆخەوە هەبوو. هاوڕێکان پێیــان گوتبوو کــە نیگەران نەبێت. بــەڵام، لێنا لە چاویاندا هەســتی بە نیگەرانی کردبوو و هەربۆیەش نیگەرانییەکەی خۆیشــی بێ هۆ نەبوو. ئــەوان پێیــان گوتبــوو کە پێویســتە خۆی بۆ هەرچەشــنە پێشــهاتێک ئامــادە بکات. بــەڵام چ جۆرە پێشــهاتێک؟ بۆ خراپترین پێشــهاتەکان؟ عەبدولڕەحمــان پێدەکەنــی و دڵنیــای دەکردەوە کە هەموو شــتێک بە باشی دەچێتە پێش. بەڵام، لێنا کە هاوسەرەکەی خۆی باش دەناسی، بە پارێزەوە قسەکانی قبووڵ دەکرد.

ئیســماعیلی ئامــۆزای عەبدولڕەحمــان، دەبــوو بەیانیــی زوو بێت و ئــەوان بەرێتە ترمیناڵی پاســە نەفەرهەڵگرەکان. لێنــا نەیدەزانی کە ئایا ئیسماعیلیش هاوسەفەریان دەبێت یان نە. ئاواتی دەخواست ئیسماعیلیش لەگەڵیــان بچێــت. چەنکە لێنا ئەوی لە کەســێکی نەدیو و نەناســراو پێ باشــتر بوو. بە بوونی ئیســماعیل، لێنا کەمتر هەستی بە تەنیایی دەکرد و منداڵەکانیش ئیســماعیلیان زۆر خۆشدەویســت. دەبــووە هاوکایەی منداڵــەکان و وەها دەیهێنانــە پێکەنین کە فرمێســک بەچاویاندا دەهاتە خــوارەوە. ئەوان ئیســماعیلیان لە باوکیان زیاتر دەناســی. هەرکاتێک، عەبدولڕەحمان لە ســەفەرێکی دوور و درێژ دەگەڕایەوە، منداڵەکان، بە

ئاســتەم ئەویان وەبیر دەهاتەوە و مینا خۆی لە پشــت دامێنی کراســی دایکیەوە دەشــاردەوە. منداڵەکان هێشتا بە بوونی باوکیان ڕانەهاتبوون کە باوکیان سەرلەنوێ سەفەری دەکردەوە.

کات نزیــک بە ســێ (٣)ی بەیانی بوو. لــە دەرەوە، دنیا خەریک بوو ڕووناک بێتەوە. لێنا دەستی کرد بە ئامادەکردنی بەرچایی و سەرێکیشی لە هەردوو ژوورەکە دا، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت هەموو شــتێک ڕێکوپێکە. ئەو نامەیەش کە بۆ خاوەن ماڵەکە نووســیبووی لەســەر مێزەکە داینا. لــە نامەکــەدا، لێنا لەبەر ئەوەی بەو شــێوەیە خانووەکــە چۆڵ دەکەن، داوای لێبووردنی کردبوو و هەروەها نووسیبووی کە دەتوانێت هەموو کەلوپەلــی نــاو ماڵەکە، لەبــری ئەو کــرێ خانوویەی پێی قــەرزدارن، هەڵگرێتەوە. عەبدولڕەحمان پێش دەرچونی لێنا و منداڵەکان، ڕۆشتبوو. کاتێک ئیسماعیل گەیشتێ، منداڵەکان لەسەر کۆشی دایکیان نووستبوون و چەمەدانە بچووکەکەشــیان ئامادە بوو. ئیســماعیل سەرەتا نامەکەی لێنــا بــۆ خــاوەن ماڵەکــەی خوێنــدەوە و دواتریش بــە وردی هەموو ماڵەکەی پشــکنی و ئەوســا، مینای نووستوو و چەمەدانەکەی هەڵگرت. لێنــاش هیوای کردە باوەش و لەحاڵێکدا کە ســەری هیوا لەسەرشــانی بوو، چارشــێوەکەی کێشا بەڕوویدا. هەموو شتێک لە بێدەنگیی تەواودا دەچووە پێش.

کۆڵانەکە چۆڵ بوو. کۆڵانێکی خۆڵاویی پڕ لە بەرد. ســەگێکی شــەل و کوێر، بۆ چەند ســاتێک کەوتە دوایان، بەو هیوایەی شــتێکی دەســت کەوێــت. بــەڵام، دواجار بێهیوا بوو و وەســتا و ملی ڕێگاکەی گرت و ڕۆشت.

لە ڕێگادا، لێنا، بۆ جارێکی دیکەش پرســیاری لە ئیســماعیلی هاوڕێی کــرد کــە ئایا بە درێژایــی ســەفەرەکەیان لەگەڵیان دەبێت. ئیســماعیل وەڵامــی دایەوە: «دواتر دەردەکەوێت». ســەیرە! دەتگوت دمی هەموو ئــەو پیاوانەیــان دروو بوو، کەس وەڵامێکی دروســتی نەدەدایەوە. لێنا دەترسا بەتەنیا سەفەر بکات. دەترسا لە ڕەوتی سەفەرەکەدا دەستبەسەر

بکرێــت و بە بێ ئــەوەی کەس ئاگادار بێت لەگــەڵ منداڵەکانی بکەوێتە زیندانەوە. ئەو لەو سەفەرە دەترسا. چونکە بە هیچ شێوەیەک ئاگاداری وردەکارییەکانی ســەفەرەکەی نەبوو. لەوە دەترسا کە نەوەکا ئەوانەی بڕیــارە بێن بەدوایانــدا، نەگەنە شــوێنی دیاریکراو و لە هەمووشــیان خراپتر ئەوە بوو کە لینا هیچ پارەیەکی لە گیرفاندا نەبوو. تەنیا شــتێک کــە پێیــان گوتبوو، ئەوە بوو کە ئەو دەبێ بــە گوێی هاوڕێیان بکات و گوێڕایەڵیــان بێت. هەر ئەوە و هیچی دیکە. لــەم تەنیاییەدا، بەهەرحاڵ، ئیســماعیلی لەگەڵ بوو کە ئەویش قســەی جێی متمانە بوو و دڵی مینا پێــی گەرم بوو، لینا و منداڵەکانیشــی خۆشدەویســت. لە نێــوان لینا و ئیسماعیلدا هاوڕێیەتییەکی ڕاستگۆیانە دروست ببوو.

تێرمیناڵەکــە دوور بــوو و پیادەڕەوییەکــی ماندوویيهێنــی هەبــوو. بیرەوەرییەکانیش لە کۆڵ لینا نەدەبوونەوە.. ڕایش نەدەگیران.

لینــا کــە تاسەرئێســقان عاشــقی مێردەکــەی بــوو، چاوەڕوانــی گەڕانەوەکانی عەبدولڕەحمان دەبوو. تامەزرۆی بینینی بوو، تامەزرۆی بوونی، دەیویست لە سەلامەتی و زیندوو بوونی دڵنیا بێت. ئەو هەمیشە چاوەڕوانــی هاوســەرەکەی بــوو، بۆ ئــەوەی هەموو ئەو شــتانەی لە نەبوونی ئەودا بەسەری هاتبوو، ئەوەی بینیبووی و ئەوەی فێری ببوو، بۆی بگێڕێتەوە و باسی چۆنیەتی گەورەبوون و گەشەکردنی منداڵەکانی بۆ بکات و عەبدولڕەحمانیش هەمیشە چیرۆک و بابەتگەلێکی هەبوو کە بۆی باس بکات و لینا وەکوو قوتابییەک کە عاشــقی مامۆســتاکەیەتی، گوێــی لێ دەگــرت. بــەڵام ئــەوەی لینا دەیویســت بۆ هاوســەرەکەی بیگێڕێتەوە، بۆ هاوسەرەکەی لەڕادەبەدەر ئاسایی بوون.

ئــەوەی بۆ ئــەو گرینگ بــوو ئەوە بوو کــە هاوڕێکانی بڵێــن لینا بە باشی دەرەقەت ڕاسپاردەکانی هاتووە و ئەوە هەموو ئەو شتە بوو کە حەزی لە بیستنی بوو. لینا بۆ دانەوەی دڵی خۆی، بە خۆی دەگوت کە هاوســەرەکەی نیگەرانیی زۆری هەیە، زۆربەی کاتەکانی بۆ کارەکانی تەرخان دەکرێت، بەرپرسایەتیی ئەو بڕیاراتەی هەردەم لە ئەستۆیەتی،

قورســـە، جگەلەوەش، ئەو بەردەوام لە بەرانبەر مەترسیی گەورەدایە و هەربۆیەش کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، شـــەکەت و ماندووە و بیری لای خۆی نییە و پاش گەڕانەوەشی، کاری زۆری هەیە بۆ ئەنجامدان.

ڕۆژێکیـــان، لە نێوان کۆمەڵێک لە هاوڕێیاندا، باســـی لینا هاتە گۆڕێ. عەبدولڕەحمان ئاماژەی بە پەندێکی پێشـــینیان کرد کە دەڵێ: «وامزانی شـــەربەتە، کەچـــی بـــە مرەبـــا دەرچـــوو». واتاکەشـــی ئەوە بـــوو کە: «کاتێک ژیانی هاوبەشـــم لەگەڵ پێک هێنا، نەرمونیان بوو، بەڵام دواتر تێگەییـــم لەوەی بیرم لێدەکردەوە خاراوترە». لینا بەلایەوە ســـەیر بوو کە هاوســـەرەکەی بە شـــەربەت و مەرەبا دەیشـــوبهێنێ و هەربۆیەش زۆر تـــووڕە بـــوو لەوەی ئەو پیـــاوەی کە بەو ڕادەیە خۆشـــی دەوێت، لە ســـەرەتادا ڕوانینێکی باشی لەســـەری نەبووە. هەربۆیەش پرسیاری لێکرد: «کەواتە، بۆچی ژیانت لەگەڵ پێکهێنام؟»

عەبدولڕەحمان پێدەکەنی و وەکوو هەمیشـــە، وتەکانی لینای بە هەند وەرنەدەگـــرت. لینـــاش نەیدەتوانی لەگـــەڵ خووی پیاوســـالارانەی ئەم کۆمەڵگایە ڕابێت.

بۆچـــی مرۆڤ، کەســـێکی خـــۆش دەوێت؟ چی دەبێتە هـــۆی ئەوە کە مرۆڤ لە یەکەم ساتدا، سەرنجی بەرەولای کەسێک ڕاکێشرێت و بۆچی کەســـێکی دیکە نە؟ بۆ نموونە وسوقوددیوان، بۆچی هەر لە سەرەتاوە لینا لە ڕیزی ئەو کەســـانەدا دابنابوو کە خۆشـــی دەوێن؟ لەبەر ئەوەی باوکـــی عەبدولڕەحمان بوو؟ بێگومان. بەڵام هۆکارێکی دیکەشـــی ئەوە بوو کە ئەو پیاوێکی بەئاگا بوو و جگەلەوەش، لینای خۆشدەویست.

پاش ئەوەی لینا وســـوقوددیوانی باش ناسی، تەنانەت کاتێک پەی بە تایبەتمەندیی دەســـەڵاتخوازانەی ئەو برد، ئەوە هیچی لە خۆشەویستیی لینـــا بۆ ئـــەو کـــەم نەکـــردەوە، بەڵکوو هەر خۆشـــی دەویســـت و ئەو تایبەتمەندییەی وسوقوددیوانی سەرچاوەگرتوو لە داب و نەریتی باوی کۆمەڵگەی کوردستان دەزانی.

عەبدولڕەحمـــان باوکـــی خـــۆش دەویســـت، دەیپەرەســـتی و ڕێـــزی

لێدەگـرت. بـەڵام سـەبارەت بە دایکی، بەقـەدەر باوکی ڕێـزی نەبوو، بۆچی؟ دایکی زۆر خۆشـی دەویسـت. ئەوەی دایکی پێی بەخشـیبوو، لەو سـەردەمەدا کەمتر کوڕێک لە دایکیەوە دەستی دەکەوت. هەرچەند کە دایکی عەبدولڕەحمان نەخوێندەوار بوو، بەڵام تێگەیشتن لە کولتور، مەزهـەب، ئایین و زمانـی کوردی و غەیری کـوردی فێری کوڕەکەی کردبـوو. بـەڵام ئەو، ئەوانـەی لەبەرچاو نەدەگرت. ڕەنگـە لەبەر ئەوە بوو کە لە منداڵیدا زۆر بە نازداری فێر کرابوو. ڕەنگە، شـتێکی دیکەش هەبوو، دایکی تەنیا لە ئاسـتی ڕاسـپاردندا هەندێ شـتی بە کوڕەکەی دەگوت و دواجار هەموو شـتێکی لەئەسـتۆی خودی ئەو دەهێشتەوە. ڕەنگە، لـەو ڕووەوە کە عەبدولڕەحمان دەبووە هۆی دوورکەوتنەوەی ئەو لە دایکی و لەولاشـەوە زاکوونیـی باوکی، ببووە هۆی ڕێزلێگرتنی زیاتری. ڕەنگە لە منداڵیدا، ئەو هەسـتەی هەبووە کە خەمساردییەکانی باوکی، دەرئەنجامی ئەو متمانەیە بووە کە پێی بوویەتی.

عەبدولڕەحمان هەر لە منداڵیەوە، زیرەک و خاوەنی کاریزمای بەهێز بوو. براکانی دیکەشی هەمان تایبەتمەندییان هەبوو. بەڵام لەو ڕووەوە کـە لـە هەموویـان بچووکتر بوو، ڕەنگـە بە هۆی حەزی باڵادەسـتتر بوونـەوە، ئـەو تایبەتمەندییەی لـەودا زیاتر گەشـەی کردبێت. ئەویش وەکوو هەر منداڵێکی ئاسایی، حەزی دەکرد سەر لەو نهێنییانە دەربکات کە پێی نەدەگوترا و یان لێیان دەشـاردەوە. ئەوەش، ڕێگەی پێدەدا کە هەم تواناکانی خۆی نیشانی هەمووان بدات و هەم هەست بە زیرەکیی خۆی بکات و دواجار لە سـای سـەرکەوتنەکانیدا، هەسـت بە غروور بکات و هەستی متمانەبەخۆیی بەهێزتر بێت.

لێنـا لەگەڵ منداڵـەکان و هاوڕێیـان، دەبوو بەو پاسـە نەفەرهەڵگرە سەفەر بکەن کە ماوەیەک لەوەپێش و ڕێک ڕۆژێک پێش لەدایک بوونی هیوا، عەبدولڕەحمان سەفەری پێکردبوو. پاش گەڕانەوەی لەو سەفەرە، عەبدولڕەحمـان بـە لێنای گوتبوو کـە لە جادەی نێـوان «زەنجان» و «میانە»دا، پۆلیس پاسـەکەی ڕاگرتووە و شـۆفیرەکەی ناچار کردووە

هەموو چەمەدانەکان لەسەر پاسەکە دابگرێت. هەرکام لە موسافیرەکان دەبــوو خــۆی چەمەدانەکــەی بــۆ تەفتیــش بکاتــەوە. عەبدولڕەحمان چەمەدانــی پــێ نەبوو. تەنیــا جیزدانێکی بچووکی بەدەســتەوە بوو کە پــڕ بوو لە بەڵگەنامەی گرینگ و مەترســیداری حیزبی. عەبدولڕەحمان کەڵک لە بەیەکداهاتنی موســافیرەکان لــە کاتی دابەزیندا وەردەگرێت و وێڕای شاردنەوەی جیزدانەکەی لە ژێر قوماشی کورسیی شۆفیرەکەدا، دوای هەموو موسافیرەکان بە دەستی بەتاڵ دادەبەزێت. عەبدولڕەحمان نیگــەران بوو. لــە ڕوانگەی پۆلیســەوە، ئەوەی کە ئــەو چەمەدانی پێ نەبوو، گوماناوی دەهاتەبەرچاو. هەربۆیەش، یەکێک لە پۆلیســەکان کە جلی مەدەنی لەبەردابوو و بەرپرس بوو لە کۆنترۆل کردن، پرســیاری لێدەکات: «چۆنە وا تۆ بە بێ چەمەدان سەفەر ئەکەیت؟»

عەبدولڕەحمان، بە مەبەستی وەچنگ خستنی کات، پاکەت جگەرەکەی لــە گیرفانــی دەردێنــێ، جگەرەیــەک دەداتــە پۆلیســەکە و بۆیشــی دادەگیرســێنێت و دواتر جگەرەیەک بۆخۆی دادەگیرسێنێت. ئەوسا، بە ئارامی، دەســت لە گیرفاندا و جگەرە بە لێوەوە، بە پرســیارێک وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: «ئایا هەرگیز ڕووی نەداوە کە خۆت بە بێ چەمەدان سەفەر بکەیت؟»

پیــاوی پۆلیــس: «نــە، مەگیــن ئــەوەی ســەفەرەکەم کورتخایــەن بووبێت».

عەبدولڕەحمــان وەڵامی دایەوە: «منیش وەکوو تۆم. دەچم لە مردوو ناشتنێکدا بەشدار بم و بەیانیش دەگەڕێمەوە.» هەڵبەت، عەبدولڕەحمان بــە دەنگێکی کــز و ماتەوە ئەوەی گوتبوو. پۆلیســەکە، سەرەخۆشــی لێکردبوو و هیوای خواستبوو کە خوالێخۆشبوو، خزمی نزیکی نەبووبێت. پاشان ئیزنی بەڕێ کەوتنی بە پاسەکە و هەموو موسافیرەکان دابوو.

لینا سەبارەت بە مەبەستەکان و بزربوونەکانی هاوسەرەکەی شتێکی ئەوتــۆی نەدەزانــی. چونکــوو عەبدولڕەحمان هیچــی پێنەدەگوت. بە پێچەوانــەوە، پاش گەڕانەوەی لە ئورووپا، ئەمجارەیان هاوســەرەکەی

دەهاتەگۆ و دیواندڕی دەکرد. ئەو چووبوو بۆ پراگ و لەوێ کۆمەڵێک لە هاوڕێیان، بریتی لە چێک، کورد و ئێرانیی بینیبوو.

سەبارەت بە هاونیشتمانەکانی، دڵگران و ڕەنجاو دەهاتەپێش چاو و دەیگوت: «ئەوانە لە کافەکانی پراگدا سەرقاڵی شۆڕشن و نیوەشەوان، کاتێک لە کافەکان وەدەریان دەنێن، لە پارکەکان و یان نووستنگەی زانکۆکانیان تا بەیانی لە شۆڕشەکەیان بەردەوام دەبن. سەرەڕای ئەوەی موناقشەکانیان گەڕموگوڕ و بۆچوونەکانیشیان زۆر جیاوازە، بەڵام دەرئەنجامێکی دیاریکراوی لێ ناکەوێتەوە. ئەوانە «شۆڕشگێڕانی ناو کافەکانن». ئەو بابەتە تەنانەت زەرەر لە خوێندنەکەشیان دەدات».

ڕاستیەکەی ئەوە بوو کە ئەو خوێندکارانەی کە خوێندنی باڵایان تەواو دەکرد، بە پەنجە دەژمێردران. ڕێژەیەکیشیان خوێندنەکەیان بە نیوەچڵی دەهێشتەوە و وازیان لێ دەهێنا و هەندێکیشیان زۆری دەخایاند هەتا تەواویان دەکرد.

سەبارەت بە سەفەرەکەیشی بەهەمان شێوە بەڕەنجاوی دەدوا و دەیگوت: «کوردەکان نابێ متمانە بە هیچ کەس و هیچ شتێک جگە لە شاخەکانی کوردستان بکەن.»

لێنا پرسیاری لە هاوسەرەکەی کرد: «باشە تۆ بۆ داوای یارمەتی چووبووی بۆ ئەوێ؟ داوای چ یارمەتییەکت لێ کردن؟ داوای یارمەتیت لە کێ کرد؟ لە حکوومەت؟ یان حیزبی کۆمۆنیست؟»

عەبدولڕەحمان: «چ لە بابەتەکە ئەگۆڕێ؟»

لێنا: «هیچ ناگۆڕێ، چووزانم.»

عەبدولڕەحمان مۆن نەبوو. ئەمجارەیان، پێکەنینەکەی تاڵاوی لێ دەڕژا. ئەو کەسانەی بە شێوەی نهێنی دەژین، لەبەرئەوەی شوێنیان نادیارە، کەسیش نامەیان بۆ نانووسێ. بە درێژایی ئەم ساڵانە، لێنا هیچ هەواڵێکی لە پراگ، پووری و باپیری نەبوو. هەربۆیەش بە تامەزرۆییەوە چاوەڕێ بوو عەبدولڕەحمان هەمووشتێکی بۆ بگێڕێتەوە. «بۆ وێنە لە ئاڵوگۆڕەکانی شاری پراگ و لەم ماوەیەدا سەردانی کێی کردووە و لە

کویَ ژیاوە و...هتد»

لێنا: «باپیرم و پوورمت بینی؟» لێنا لەم دنیایەدا، تەنیا ئەو دوو کەس و کارەی شک دەبرد.

عەبدولڕەحمان سەردانی کردبوون. بەڵام، لەشوێنی خۆیان نەمابوون، باشتر وایە بڵێین لەماڵ دەریان کردبوون. چونکە لە ژێر ئەو عەردەی کە ماڵە بچووکەکە لەسەری هەڵکەوتبوو و لە نزیک کانگاکانی «کۆهینوور» kohinour، بەردەخەڵووزیان دەردەهێنا.

سەبارەت بە باپیری، عەبدولڕەحمان پێی گوت: «باپیرت کۆچی دوایی کردووە». لێنا لە ڕادەبەدەر باپیری خۆشدەویست. پێش پێکهێنانی ژیانە هاوبەشەکەیان، لێنا پێشنیاری بە عەبدولڕەحمان کردبوو کە سەردانی باپیری و پووری بکەن بۆ ئەوەی لێنا هاوسەرەکەی بە تەنیا خزمەکانی بناسێنێ. بەڵام عەبدولڕەحمان هەمیشە پێشنیارەکەی ڕەت کردبووەوە و وێڕای داوای لێبووردن، گوتبووی: «من شەرمیان لێ دەکەم.».

لێناش کە پێی وابوو هاوسەرەکەی هێشتا شەرم دەکات، زۆر پێداگری نەدەکرد و هیوادار بوو پاش زەماوەندەکەیان، عەبدولڕەحمان ڕازی دەبێت و سەردانیان دەکات. لەولاشەوە، لێنا لەکاتی خۆیدا، سەبارەت بە پرۆژەکانی خۆی هیچی بە باپیری نەگوتبوو، ئێستاش دەترسا بە باس کردنیان، بکەوێتە بەرشاڵاوی سەرکۆنەی باپیری و ببێتە هۆی وەڕەزی و تووڕەبوونی.

پاش پێکهێنانی ژیانی هاوبەشیان و گەڕانەوەی عەبدولڕەحمان بۆ ئێران، لێنا کە سکی بە مینا پڕ بوو و ڕووبەڕووی دۆخێکی ناجێگر ببوو، سەردانی باپیری و پووری کرد. ئەوان لەو کەسانە نەبوون کە دەسبەجێ و لەئانوساتدا بەرانبەر بە ڕووداوەکان دژکردەوەیان دەبێ یان تووڕە دەبن. ئەوکاتە، ئەوان سەبارەت بە پێکهێنانی ژیانە هاوبەشەکەی لێنا هیچیان نەگوتبوو. بەڵام ئەو ڕۆژە، دواجار پوورە زیدێنکای zedenka، بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی: «ڕەنگە ئەو شەرم بکات لەوەی سەردانی ئێمە بکات، بەڵام لە پڕ کردنی سکی تۆ هیچ

شــەرمێکی نەکــرد.» و پووری بەو کەمــە خوێندەوارییەوە کە هەیبوو، لەبــەردەم باوکی و مێردەکەی خۆیدا، باســی ئەوەی کــرد کە بە ژیان لەگــەڵ پیاوێکی ڕۆژهەڵاتی چاوەڕوانی لینای دەکرد. دواتریش، پووری و مێردەکەی و باپیری، هەرسێک پێکەوە هەوڵیان دەدا لینا ڕازی بکەن کــە لەبری گەڕانــەوە بۆلای عەبدولڕەحمــان، لای ئــەوان بمێنێتەوە و تەنانەت، ســەرەڕای هەژارییەکەیان، پێشنیاریان پێ کرد کە لای ئەوان بژیت و هەموو پێکەوە چاوەدێریی منداڵەکەی بکەن و...

لینا پرســیاری لــە هاوســەرەکەی کــرد: «گیانەکەم، بــۆم بگێڕەوە، پەیوەندیتان چۆن بوو؟»

عەبدولڕەحمــان و مامــە فرانتس frantz، پێکەوە ســەردانی کافەکانی شــاریان کردبــوو. مامــە فرانتس کە لە کرێــکارە کۆنەکانــی کانگاکان بــوو، ئابجۆخۆرێکــی لەزەبر بوو. لەو ڕووەوە کــە ژنەکەی ڕێگریی لە خواردنەوەی دەکرد، بۆ خواردنەوەی پەرداخێک ئابجۆ هیچ هەلێکی بە فیڕۆ نەدەدا و بۆی وەدەر دەکەوت. هەربۆیەش بینینی عەبدولڕەحمانی بــە دەرفەت زانیبوو و بە ژنەکەی گوتبوو کە پێویســتە بڕواتە دەرەوە و شــارەکەیان نیشــانی عەبدولڕەحمان بدات. ژنەکەی فرانتسیش، باش لەو گەشتە تووریســتییانەی هاوســەرەکەی تێدەگەیشت. جگەلەوەش، عەبدولڕەحمــان لــە گێڕانەوەی چوونــەدەرەوەی خــۆی و فرانتس دا، سەرســووڕمانی خۆی دەربڕی و گوتی: «بیهێنە پێش چاوی خۆت کە هەتا من پەرداخێکم هەڵدەدا، ئەو توانای هەڵدانی ســێ تا چوار پەرداخ ئابجۆی هەبوو (هەر پەرداخێک نیو لیتر بوو) و ئێمە پێکەوە ســەردانی چەنــد کافەمان کرد. هەموو جارێکیش، فرانتس بە هۆی ئەوەوە کە من شــارەزای خواردنەوە نەبووم و زۆریش دەچوومە ئاودەســت، گاڵتەی پێدەکــردم. ئاخــر ئەو خۆی هــەر یەکجار چووە ئاودەســت، کاتێکیش دەگەڕاینــەوە بــۆماڵەوە، فرانتس ڕەپ و ڕاســت دەڕۆشــت و لەتری نەدەدا، کەچی من، بە ئاستەم خۆم بە پێوە دەگرت.».

.. ئەو بیرەوەرییانەی ئاوا زەینی لینایان ســەرقاڵ کردبوو، لە کورت

کردنەوەی ڕێگاکەدا کاریگەریی خۆیان هەبوو. ئیسـماعیل بێدەنگ بوو و منداڵەکانیش لە باوەشیاندا نووستبوون.

جارێکیان، پێویست بوو عەبدولڕەحمان لە ڕێی شاخەکانی کوردستانەوە بگاتە شـوێنێک. ئەو و ڕێنماکەی بەسـەر گۆمێکی بەستوودا تێدەپەڕن. سـەهۆڵی گۆمەکە لە بن پێیاندا دەشـکێت و دەکەونە نێو ئاوی ساردی گۆمەکەوە و بە زەحمەت خۆیان لە نوقم بوون و خنکان ڕزگار دەکەن. کاتێکیش لە گۆمەکە دێنەدەرەوە، بە چەرمەسەری لە سەرمابردوویی و ڕچان ڕزگاریان دەبێت. ڕێنماکەی کە پیاوێکی ئیختیاری هەشـتا ساڵان بووە، وەکوو کارژۆڵە بەکێوەکەدا هەڵگەڕاوە.

لێناش پیاوێکی ئەوتۆی لە شـاخەکانی کوردسـتان ناسیبوو. خەڵکی دەیانگوت کە ئەو پیاوە زیاتر لە سەت ساڵ تەمەنیەتی. ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ لێنا بوون، بۆیان گێڕابووەوە کە باوکەکانیشیان ئەو پیرەپیاوەیان بینیوە. پێشـمەرگەکان کە لەگـەڵ جەولەی ناو شـاخەکان ڕاهاتبوون، گرفتێکیـان لەگەڵ شـوێن کەوتنی ئـەو پیرەپیاوە نەبوو. بـەڵام بۆ لێنا گەلێـک بەئـازار بوو. چنگی لە بەردەکان گیر دەکـرد، لە هەورازەکاندا، چواردەست و پێ سەردەکەوت و لە نشێوەکاندا، لەسەر وردەبەردەکان هەڵدەخلیسـکا. لە یەکێـک لە گوندەکاندا، ئەو پیاوە ئیختیارە ئەسـپێکی بۆ لێنا قەرز کردبوو. ئەوان دەبوو زۆر بەخێراییی بە تەنشـت گوندێکدا کە خەڵکەکەی زۆر جێی متمانە نەبوون، تێپەڕن. لێنا سـوار ئەسـپەکە ببـوو. بەڵام لە نشـێوەکاندا، ئەسـپەکەش وەک لێنا لەسـەر بەردەکان هەڵدەخلیسـکا. هەربۆیـەش، لەبـەر ئـەوەی لێنـا و ئەسـپەکە نەگلێن، پێشـمەرگەکان لەغاو، یاڵ و تەنانەت کلکی ئەسپەکەشیان توند دەگرت. پیرەپیاوەکە کە زۆر پێشـیان کەوتبوو، بە ئامـاژە داوای لێدەکردن کە خێرا بکەن، و لەبەر خۆشیەوە بەسەر «گەنجی ئەم دەورە و زەمانەدا» کە توانای ڕۆشـتنیان نییە، پرتەوبۆڵەی دەهات. پێشـمەرگە گەنجەکان پێدەکەنین و لێنا ئێرەیی بە هێز و گورجوگۆڵیی ئەوان لە شـاخەوانیدا دەبرد.

یەکێکی دیکە لــەم پیرە ماندوویی نەناســانە، ڕێنمای عەبدولڕەحمان بووە لە شاخەکانی کوردستاندا. ئەوان لە گوندێک بۆ پشوودان لادەدەن. پیرەپیــاو لەڕادەبــەدەر خواردبوویەوە. لەو ڕووەوە کە پێویســت بوو لەگــەڵ تاریکیدا، بەڕێ بکەون، عەبدولڕەحمان، وێڕای هاندانی پیرەپیاو بۆ کەم خواردنەوەی مەشــرووب، پێی دەڵێت: «ئێمە هێشــتا ڕێگایەکی دوور و درێژمــان لەبەرە، هەربۆیەش نابێ زۆر بخۆیتەوە». پیرە پیاو وەڵامی دەداتەوە: «باشــتر وایە تۆش بخۆیتەوە، چونکە لە ڕێدا لەگەڵ سەرما و سۆڵە و بەفر ڕووبەڕوو دەبینەوە».

کاتێــک بەڕێ کەوتنــەوە، پیرەپیاو لەتری دەدا و جوێنی بە بەردەکان دەدا و تووکــی لێدەکــردن، بەڵام نەیدەهێشــت عەبدولڕەحمان یارمەتی بدات. هەڵبەت، پیرەپیاو، هەرگیز نەکەوت و عەبدولڕەحمانی بۆ تێپەڕین لــە ڕێــگا ناوبــڕەکان، ڕووبــار و گۆمە ڕچیــاوەکان ڕێنمایــی دەکرد. شــەوەکە نووتەک و تاریکەشــەو بووە. تەنیا ڕووناکیی ئەستێرەکان و تریفەی بەفر بوو کە هەندێ ڕێگاکەی بۆ ڕووناک دەکردنەوە. سەهۆڵی یەکێک لە گۆمەکان کە خۆرەتاوی ڕۆژ تەنکی کردبووەوە و هێشــتاش بە تەواوی نەیبەســتبووەوە و بەقەدەر پێویست ئەستوور نەبوو، لەژێر پێیاندا دەشکێت. پاش ئەوەی خۆیان لە گۆمەکە دەرباز دەکەن و دەگەنە ڕۆخەکەی، ئاوە ســاردەکە، عەبدولڕەحمان دەبووژێنێتەوە و لە سستی دەری دێنێت. بەڵام پیرە پیاو دانیشــتبوو و نەدەجووڵا و نەیدەویســت بەردەوام بێت و ئامادە نەبوو هەنگاوێکی دیکە هەڵبگرێت. جەستەیان تا ســەر ئێسقان بەستبووی. ئەگەر نەجووڵایانە، بێگومان مەرگیان لە ڕێ بوو. هەربۆیەش، عەبدولڕەحمان پیرەپیاوەکەی ناچار کردبوو هەستێتە سەر پێ و بەڕێ بکەوێت و بەدوای خۆیدا ڕەکێشی کردبوو بۆ ئەوەی خوێن بە دەمارەکانیاندا بگەڕێت.

لەگەڵ شەبەقی بەیان، لە یەکێک لە گوندەکانی کوردستان لایان داوە و چوونەتــە ماڵێکەوە و لەوێ چەند ڕۆژێک ماونەتەوە. عەبدولڕەحمان تایەکی قورسی هەبووە و وڕێنەی کردووە. بەڵام پیرەپیاوەکە تەندروست

بــووە و وێــڕای گاڵتە کردن بــە عەبدولڕەحمان، دەیگــوت: «چاو چاو! گەنجی ئەم ســەردەمە، بەڕاستی بێدەستوپلن و لەبەرانبەر هیچ شتێکدا خۆڕاگــر نیــن. بۆچی، ئاخر کــوڕی باش بۆچی پێش بــەڕێ کەوتن بە گوێی منت نەکرد و وەک من نەتخواردەوە، بۆچی، ها بۆچی؟»

لــەم کاتــەدا، هەراوزەنایــەک، لینای وەخــۆ هێنایەوە و ســەرەداوی بیرەوەرییەکانی پچڕاند. گەیشــتبوونە ترمیناڵەکە. لەوێ موســافیرەکان چاوەڕوانــی بــەڕێ کەوتنی پاســەکان بوون. ئیســماعیل بــە هەنگاوی پتەو بەرەولای شــۆفیرەکە ڕۆشت و بلیتەکەی نیشان دا. شۆفیرەکەش کورســییەکانی نیشــان دان. لێرەدا بوو کە لینا تێگەیی بەتەنیا ســەفەر ناکات و ئەوەش، بەڕاستی کەیف خۆشی کردبوو.

پاســەکە لە ڕێگادا، لە شــارەکانی قەزوێن، زەنجان و میانە ڕایگرت، بــە بێ ئــەوەی ڕووداوێکی تایبەت بێتە ئاراوە. پۆلیســیش دیار نەبوو. ئەوان، دواجار گەیشــتنە شوێن، واتە شــاری تەورێز. ئەمە دووهەمین جــار بــوو کە لینا پێی دەنایە شــاری تەورێز. لەم شــارە بــوو کە لینا ئــاگادار کرایەوە کە لــە کۆبوونەوەیەکدا کــە عەبدولڕەحمان بەڕێوەی بردووە، بڕیار درابوو کە ئیســماعیل (ئامــۆزای عەبدولڕەحمان) لەگەڵ لینــا و منداڵەکانی بڕوات و ڕۆڵی هاوســەری لینــا و باوکی منداڵەکان بگێڕێــت. ئــەوەش دەبێتە هۆی ئــەوەی زۆر نەکەونە بــەر چاو. لیناش دەبــوو ڕۆڵــی لاڵ بگێڕێــت و وا بنوێنێ بە مەبەســتی وەرگرتنی شــفا سەفەری کەربەلا دەکەن، بۆ ئەوەی لەو شارە پیرۆزەدا، موعجیزەیەک ڕووبدات و لینا زمانی بکرێتەوە.

ســەفەری دووهەمــی بۆ تەورێــز، کورتخایەن و بە بــەراورد لەگەڵ جاری یەکەم، بە بێ ڕووداو بوو. بەیانیی زوو ســواری پاســەکە بوون و بەرەو ســەقز کە شارێکی بچووک بوو لە بناری کێوەکاندا، ڕۆیشتن. پــاش تێپەڕین لە شــارەکانی مەراغــە، میاندوواو، بۆکان و...گەیشــتنە سەقز. شاری ســەقز کۆتایی سەفەرەکەیان بە ئۆتۆمبیلی گواستنەوەی گشتی بوو. لەوێ، کەسێک چاوەڕێیان بوو. ئەو کەسە، لە کۆڵانە تەسک

و ترووسـک و ناهەموارەکانـەوە بـەرەولای ماڵی ژنێک کە دۆسـتیان بـوو، ڕێنمایی کردن. پاش خواردنی نانی شـەو، لینا کە زۆر شـەکەت ببوو، هەموو بیر و هۆشـی لای دەرکردنی شەکەتی و حەسانەوە بوو. منداڵەکانیش لەسەر کۆشی نووستبوون و لەبەر ئەوەی لینا چوارمشقی دانیشتبوو، ئەژنۆکانی سست ببوون.

لـەم کاتـەدا کابانی ماڵەکـە، هیوای کـردە باوەش و گوتـی: «دەبێ بڕۆیـن.» ئیسـماعیلیش مینای کردە باوەش. لینا لەوەیکە لەو شـێوازە دانیشتنە ڕزگاری ببوو، هەستی بە ئازادی دەکرد.

شـیبایەکی نیان و خۆش، ڕوومەتی لینای دەلاواندەوە و لە سسـتی دەری دەهێنـا. لەوپـەڕی شـار، گەیشـتنە هۆتێلێکی بچـووک و کۆن. هاوڕێکانیان، وێڕای ئاماژە کردن بە هۆتێلەکە، گوتیان: «ئێرەیە، بەخت یارتان بێت».

ئیسـماعیل، پێـش چوونە نـاو هۆتێلەکـە، ئاخێکی قووڵی هەڵکێشـا. زۆر مانـدوو دیـار بوو. بـە پێچەوانەوە، منداڵەکان کـە خەوی خۆیان کردبوو، هەسـتابوونەوە و کەیف خۆش بوون و حەزیان لە یاری بوو. خاوەن هۆتێلەکە چاوەڕوانیان بوو، ئاوڕی دایەوە بەلای ئیسماعیلدا و کلیلەکانی دایە دەسـتی و ژمارەی ژوورەکەشـی پێ گوت. ژوورەکە لە نهۆمی یەکەمدا بوو. دواتر دانیشتەوە و سەرقاڵی چا خواردنەوە بوو.

پلیکانـەکان تاریـک و داڵانەکەش ڕووناکیی تێدا نەبـوو. دۆزینەوەی درگای ژوورەکـە، کاری حەزرەتـی فیـل بـوو. تەنانـەت منداڵەکانیش بێدەنـگ بـوون. دواجار، ئیسـماعیل درگاکەی کـردەوە و بە هێمنی و وردبینییـەوە کردیـەوە، دەتگوت، ئەو لە پێشـدا دەیزانی لە پشـت ئەو دەرکـەدا چـی چاوەڕێیان دەکات. هەمـوو لە سـەردەرانەی درگاکەدا وشـک ببوون و دەمیان داچەقیبوو: لە ژوورەکەدا هەموو شتێک ڕەش بـوو، مێز، کورسـی، نوێن، دیوارەکان، میچەکـە و زەوییەکە، هەمووی یەکدەسـت ڕەش بوو. هەموویان واق وڕ ماو، حەپەسا بوون. تەنانەت مینای بچکۆلانەش، کە تا چەند سـاتێک لەوەپێش حەزی لە یاری بوو،

دەمی داچەقابوو و چاوی بڕیبووە ژوورەکە.

یەکەم کەس کە لەو دۆخە دەرهات، پیاوە پشــت و پەناکەیان بوو. بە هەنگاوی قایم پێی نایە ناو تاریکاییەکەوە. بەڵام زۆر زوو کشاوە دواوە. لێنا و منداڵەکان لە داڵانەکەدا مابوونەوە. پاش چەند چرکەیەک، ئیسماعیل لە قاقــای پێکەنینیدا. پێکەنین هەم چارەســەری سەیروســەمەرەترین دۆخەکانــە و هــەم تایبەتمەندیــی ئەوەی هەیــە زوو دەتەنێتەوە. لێنا و میناش دەســتیان کرد بە پێکەنین. ئــەوان نەیاندەزانی بۆچی پێدەکەنن. بەڵام ئیســماعیل دەیزانی. هەنــگاوە قایم و پتەوەکەی ئیســماعیل، ئەو ماددە ڕەشــە یەکپارچە و یەکدەســتەی جووڵاندبــوو و لە ژوورەکەدا کەوتبووە فڕین و بە هەموو لایەکدا دەفڕین. ئەو ڕەشــاییە، لە ڕاســتیدا بریتی بوو لە هەزاران مێش. ئیســماعیل، پەنجەرە بچووکەکەی کردەوە و بە ڕاوەشاندنی کوتە پەڕۆیەک دەستی کرد بە دەرکردنیان. بە بینینی ئیســماعیل، لێناش، چارشێوەکەی لابرد و لاســایی ئیسماعیلی کردەوە و دەســتی کرد بە دەرکردنی مێشــەکان. بڕوا پێکردنی بۆ کەســێک کە دۆخێکی ئەوتۆی ئەزموون نەکردبێت، قورسە.

لێنــا دڵی لەژێڵلا دەهات، هــەر کاتێکی دیکە بوایە، ئەو هەرگیز ئامادە نەدەبوو لەســەر چرپایەکی وا کە مێشــەکان گڵاویــان کردبوو، بنوێت. لــەوەش زیاتر، هەرگیز ئامادە نەدەبوو کچەکانی لەســەر چرپایەکی وا بخەوێنێت. بەڵام ئەوان، هەم شــەکەت بوون و هەم چارێکی دیکەشیان نەبوو. هەربۆیەش، پاش خواردنی ئەو خواردنە بەتام و چێژە، لەســەر چرپاکە ڕاکشان و دەسبەجێ خەویان لێکەوت.

■ ئاشنا بوون لەگەڵ شاخەکانی کوردستان

بەیانیی زوو، شــاریان بەجێهێشت و لە ڕێگەیەکی پڕ کەند و لەندەوە بەرەو شــاخەکان ڕۆیشــتن. نزیکەی نیوەڕۆ، گەیشتنە مالۆچکەیەک کە ئاقاری بە دار ودرەخت تەنرا بوو. دیمەنێکی بەشکۆ لەپێش چاویان بوو و ئەویــش ئەو زنجیرە شــاخانە بوو کە دەبــوو ببڕن بۆ ئەوەی بگەنە

شــوێنێکی ئەرخایەن. لەوماڵۆچکەیە، ســێ پیاو و کوڕێکی ١٤ ســاڵان چاوەڕێیان بوون. ئەو ســێ پیاوە و کوڕە هەرزەکارەکە، یەکجێ ڕۆڵی ڕێنمــا، هــاوڕێ، ڕاوێــژکار و یاریدەدەریان دەبینــی. مینا کەیفخۆش، لــە دارێکــەوە بــۆ دارێکی دیکە و لــە پیاوێکەوە بــۆ لای پیاوێکی دیکە ڕایدەکرد. هەســتی دەکرد لە شوێنی دڵخوازی خۆیەتی. هیواش هەوڵی دەدا بەدوایــدا ڕابــکات، بەڵام هێشــتا نەیدەتوانی وەکــوو مینا ڕابکات. سەرەڕای ئەوەش، هیواش بەڕاستی کەیفخۆش بوو. خۆرەتاو گەرمای بە سروشت دەبەخشی و ئارامی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشا بوو، دەتگوت ئەوان شۆڕشگێڕی نهێنی و ڕاکردوو و پێشمەرگەی حیزبێکی قەدەغەکــراو نەبــوون، بەڵکوو کۆمەڵێک هاوڕێ بوون کە بۆ ســەیران لەوێ کۆبوونەتەوە.

لە پشــتەوەی ماڵۆچکەکە، جیپێک بە میچی ئاســنین، کورسیی شل و شــەوێق و بەتاڵ لە پووشــوو، کون کون و ژەنگاویی لێ بوو. ئەگەر لە شوێنێکی دیکە بووایە، بێگومان لەمێژبوو فڕێیان دابوو!.

هەموو بە مەبەســتی قسە کردن لەسەر سەفەرەکەیان، لەسەر زەوی دانیشــتن و پاشــان ڕوویان لە ئیســماعیل و لێنا کرد و گوتیان: «کاک ئیســماعیل، نابــێ لەبیــری بکەیت کە ڕۆڵی هاوســەری لێنــا و باوکی منداڵــەکان دەبینــی. ئەگەر لەپڕ و بــەدەر لەچاوەڕوانی کەســێک هاتە ســەرڕێمان، دەبێ چاوەڕوان بیت هەتا ئێمە قســە بکەین. تۆ منداڵەکان هێــور دەکەیتەوە و ئێمە چی بڵێین، وا دەکەیت. تۆش لێنا، نابێ لەبیرت بچێتەوە کە لاڵیت. هەرکاتێکیش ئاگادارمان کردیتەوە، بە چارشێوەکەت خۆت دادەپۆشــی و وەکوو ئیســماعیل، چیمان پێگوتی، دەبێ گوێڕایەڵ بیت، بیریشیت نەچێتەوە کە تۆ بۆ زیارەتی کەربەلا دەچیت بۆئەوەی لە خودا بپاڕێیتەوە شــفات بدات. بیرت نەچێتەوە کە ئەگەر پێویســت بوو، ئێمە قسە دەکەین و ئەوە ئەرکی ئێمەیە.»

لێنا: «ئەی چۆن لەگەڵ منداڵەکان و ئێوە پەیوەندی بگرم؟»

- «بە ژێست و بۆ فێربوونیش، هەر لەئێستاوە خۆت ڕابهێنە.»

ـ «ئەی ئەگەر لەبیرم بچێتەوە و یان هەڵەیەک بکەم؟»
ـ « نابێ لەبیرت بچێت، هیچی دیکە و بەس. هەر لە ئێستاشەوە دەست بکە بە خۆ ڕاهێنان.»
ـ «مرۆڤی لاڵ، لە کاتی ترس و یان ئازاردا، دەقیژێنێ؟»
کەس نەیدەزانی. بەهەرحاڵ، تەنانەت ئەگەر ئاواش بووایە، نەدەبوو یەک وشەش لە زاری لێنا دەربچێت. دیارە، داواکاریی کارێکی ئەوتۆ ئاسانە، بەڵێندان بۆ جێبەجێ کردنیشی ئاسانە. بەڵام، بەکردەوە بەو سانایییەش نییە.
لەسەر ڕێی ئەوان، ئەگەری بوونی هەر بەربەست و داوێک هەبوو، لە جەندەرمەکانەوە بگرە هەتا جاشەکان. هەربۆیەش پێویستی بە وردبینی و وریایی زۆر هەبوو، چونکە مەترسی لە هەموو شوێنێک هەبوو. لێنا پرچەکانی هۆنیبووەوە، چاوی بە کلە ڕشتبوو و سەریشی بە لەچکێکی کوردی داپۆشیبوو. هەروەها، بۆ کاتی پێویست، چارشێوێکیشی پێبوو. لەبەرئەوەی ژیانی نهێنی نەیدەهێشت خۆی بداتە بەر خۆرەتاو، ڕەنگی هەڵبزرکابوو. هەربۆیەش، لێنا کە باوەڕی نەدەکرد دۆخەکە بەو سانایییەش تێپەڕێت، دەستی کرد بە ناڕەزایەتی دەربڕین و بیانوو گرتن و گوتی: «نەکەس بڕوا بە کورد بوونم دەکا و نە بە چیرۆکی چوونە کەربەلام!»
وەڵامەکەی هەر ئەوە بوو کە پێشتریش بەجاران بیستبووی: «لێرە، ژنی وەکوو تۆ زۆرن، بە ڕواڵەتی سپی و تەنانەت بە پێستی سپییەوە. لێرە، تەنانەت ژنی کاڵوکرچ بە چاوی شینیشەوە هەیە. تۆ نە سپیت و نە کاڵوکرچ. تەنیا ڕەنگی ڕوخسارت هەڵبزرکاوە و ئەوەش لەگەڵ دۆخەکە دێتەوە، ڕێک لە نەخۆش دەچیت.»
لێنا بڕوای بە قسەکانیان نەدەکرد، تا ئەوەی ڕۆژێک لەسەر ڕێی خۆی، کوردگەلێکی بینی کە ڕەنگی ڕوخساریان سپی، پرچیان کاڵ و چاویان شین بوو.
لێنا بیری لەوە دەکردەوە کە ئەمانە، ئەو منداڵانەن کە لە ڕەوتی

جەنگی جیهانیی دووهەمدا و لە کاتی داگیر کردنی کوردستان لە لایەن سوپای سوورەوە، لەدایک بوون. تەنانەت ئەو بۆچوونەی خۆی لەگەڵ ئــەو پیرەپیاوانەی کە لەو ســەردەمەدا ژیاون بــاس کردبوو. ئەوانیش وەڵامیــان دابــووەوە کــە ڕەنگە وا بووبێــت، بەڵام گەلێــک پێش هاتنی سوپای سووریش، مرۆڤی کاڵو کرچ لە کوردستاندا بوونی هەبووە.

جیپــە چکۆلەکــە کە هەر بــۆ لەبەریــەک هەڵوەشــاندنەوە باش بوو، چاوەڕێی موســافیرەکانی دەکرد. بە شۆفیرەکەوە هەشت کەس بوون. بەو پێیە، وەکوو ماســیی «ســاردین»ی ناو قوتوو، ترنجانە پاڵ یەکتر و ســوار بــوون. جیپەکــە بەهــۆی دار و بــەرد و کەند و لەندی ســەر ڕێــگا هەڵدەبەزییــەوە و ســەریان لە میچە ئاســنینەکە دەکوترا. لێنا کە هیــوای لە ئامێــز گرتبوو، لەکاتی هەڵبەزینەوەکاندا نەیدەتوانی ســەری خۆی بپارێزێت. ســەرەڕای ئەوەش، لە کاتی دابەزینەکانیشدا ئازارێکی زۆری دەکێشا. مینا کە لە باوەشی ئیسماعیلدا بوو، دەگریا و دەینالاند. شــۆفیرەکە بە زەحمەت جیپەکەی بۆ کۆنترۆڵ دەکرا و موسافیرەکانی دیکــەش، بۆ ئەوەی زبانی خۆیان نەگــەزن، ددانیان لێک توند کردبوو. خۆرەتاوەکەیش گەرمی کردبوو.

هیــوا لەگەڵ خــۆ لاڵ کردنی دایکی ڕاهاتبوو. بــە بزەیەک و ماچێک، دۆخەکە ئاســایی دەبووەوە. کــوڕە هەرزەکارەکە، زۆربەی جار هیوای دەخســتە توورەکەیەکەوە کە بە چارشــێو ســازی کردبــوو و بە کۆڵ هەڵیدەگرت. بەڵام، مینا کە خۆی بە گەورە حیساب دەکرد، لە لایەکەوە، نەیدەهێشــت بکرێتە کۆڵ و لــە لایەکی دیکەشــەوە، منداڵییەکەی ڕێگر بــوو لەوەی لە دۆخەکە تێبگات. مینا ئازاری دەکێشــا و ئازارەکەشــی نەدەشاردەوە.

لــە نشــێوەکاندا، جیپەکــە وەها خێرا دەڕۆشــت کە هەموو ترســیان لێدەنیشــت. لە هەورازەکانیشــدا بە پێچەوانــەوە، خێراییەکەی دەگۆڕا. جارێکیــان لــە کاتی هەڵگــەڕان لە کێوێکــی تووش، جیپەکــە وەک دوا هەناســەی بدات، وەستا. شۆفیرەکە کە باش شــارەزای ئۆتۆمبیلەکەی

خـۆی بـوو، داوای لێکردن دابـەزن و بە پێ هەورازەکـە ببڕن. لەگەڵ دابەزینـی موسـافیرەکان، جیپەکە سـەرکەوت و لە لووتکـەی کێوەکە چاوەڕێی دەکردن.

لەکاتی سـەرکەوتن لەو هەورازە، شـۆفیرەکە ئامـاژەی بۆ کردن کە بێدەنگ بن و ئەوەش، دەرخەری ئەوە بوو کە مەترسـییەک لەئارادایە. کاتێک گەیشـتنە لای شـۆفیرەکە، بە گوێیاندا چرپاندی کە ئۆتۆمبیلێکی نیزامیی بینیوە کە ڕەنگە یەکێک لەو دوو ڕێگایە بگرێت کە ئەوان پێویستە پێیدا تێپەڕن. پاشـان، شـۆفیرەکە ئەوانی لە ژێر بەشـێکی لەپێشـەوە سـازکراوی تاشەبەردێکدا شاردەوە و دواتر ستۆپی جیپەکەی خەلاس کرد و بە پاڵدان بردییە پشـت تاشە بەردەکە. هەموویان هەناسەیان لە ڕکەی سـینگیاندا قەتیـس کردبوو و لە نێوان پنچکـە چڕەکاندا خۆیان حەشـاردا و چاوەڕوان بوون. ناوچەکە بە تەواوی ئارام بوو. شنەیەک دەنگی مەکینەی ئۆتۆمبیلێکی گەورەی دەهێنایە بەر گوێیان. دواتر، وردە وردە دەنگەکـە ڕووی لـە کزی نا و دواجار بەتەواوی بڕا. وا دیار بوو ئۆتۆمبیلەکە، ڕێگای دووهەمی هەڵبژاردبوو. سواری جیپەکە بوونەوە و بە نیگەرانییەوە درێژەیان بە سەفەرەکەیان دا. جیپەکە دەیبۆڕاند، وەها کە گوێیان لە هیچ دەنگێک لە دەرەوەی خۆیان نەبوو. ئەوەش نیگەرانی کردبوون و لینا دەیویست پێشنیاریان پێبکات کە پاشماوەی ڕێگاکەیان بە پێ بڕۆن. هەربۆیەش بۆ ئەوەی گوێیان لە دەنگی بێت، دەستی کرد بە هاوار کردن. دەسبەجێ وەڵامیان دایەوە: «بێدەنگ بە! تۆ لاڵیت.»

بەڵام: «دەبێ بابەتێکی گرینگتان پێ بڵێم.»

وەڵام درایەوە: «بێدەنگ بە».

ڕوون بوو کە قەدەغەکە جیدییە و ڕێنماکان دەزانن چی دەکەن و لینا چارێکـی نییە جگە لە ملکەچ بوون. هەربۆیەش، گەڕایەوە سـەر دۆخی لاڵ بوونەکەی.

دواجـار، گەشـتنە جادەیەکـی قیلەتـاو. هەرچەنـد کـە لـە جـادە قیلەتاوەکەشـدا، بۆڕەی جیپەکە بـەردەوام بوو، بەڵام لانیکەم لە تەکان

و شـــەکان کەوتــن. لــە دوورەوە ماڵەکانی گوندێـک دەکەوتە بەرچاو. جادەکــە بە بناری کێوێکـدا تێدەپەڕی. لە یەکێک لە پێــچ کردنەوەکانی جادەکەدا، بەرەوڕووی دەســتەیەک ســەرباز و چەنــد جیپێکی نیزامی بوونــەوە. نیزامییــەک بە ئاماژە داوای لێکردن بوەســتن. دواتر ئەمری کرد دابەزن. لێنا لەچکەکەی کێشا بەسەریدا، وەها کە تەنیا چاوی دیار بوو، ڕێک بەوجۆرەی بە چارشــێو فێری ببوو. دەســتی مینای گرت و ئیسماعیلیش هیوای کردبووە باوەش.

فەرماندەی دەستەکە پرسیاری کرد: «لە کوێوە دێن؟»

شۆفیرەکە وێڕای نیشان‌دانی ئیجازەی شۆفیرییەکەی، وەڵامی دایەوە: «لە تەورێزەوە»

فەرمانــدە ئیجازەکەی وەرگرت و وێــڕای ڕامان لە یەکە بە یەکەیان، ماوەیەکــی زۆر ســەرقاڵی بــەراورد کردنی وێنەی ســەر ئیجازەکە و ڕواڵەتی شۆفیرەکە بوو.

ـ «ناسنامەت پێیە؟»

ـ «نا، بەڵام ئیجازەی شــۆفیری تەواوە» ( لەو سەردەمەدا، هەڵگرتنی ناسنامە زۆرەملی نەبوو. هەربۆیەش، فەرماندە زۆر پێداگری نەکرد).

موســافیرەکان لە بەرانبەر ســەربازەکاندا وەســتابوون و چاوەڕوان بــوون. فەرماندەکە کە ســەربازێک لە پاڵ دەســتیەوە وەســتا بوو، بە وردی ســەیری لێنای دەکرد. سەربازەکانی دیکە، سێ هەنگاو ئەولاتر، ڕێگاکەیان گرتبوو.

فەرماندە: «بۆکوێ دەچن؟»

شۆفیر: «ئەڕۆین بۆ بانە.»

فەرماندە: «بۆچی ئەچن بۆ ئەوێ؟»

شۆفیرەکە بە ئاماژەی پەنجە، ئیسماعیل و لێنای نیشان دا و وەڵامی دایەوە: «ئەو هاوڕێیەمان و دایکی منداڵەکانی[٣]» دەبەین بۆ ئەوێ. لەوێ

٣. نابێت بگوترێت: «هاوسەرەکەم»، بەڵکوو دەبێ بگوترێ دایکی منداڵان. کاتێک کەسێک پرسیاری ناوی دایکی منداڵەکانی لە پیاوێکی کورد بکات، بە قەڵسی و تووڕەییەوە وەدەری دەنێن. ئەگەریش بەڕاستی

دەژین.»

فەرماندە وا دەینواند کە گومانی لە موسافیرەکان هەیە. سەربازەکانیش سەیری موسافیرەکانیان دەکرد و هەندێکیشیان هەمان پرسیاری فەرماندەیان لە موسافیرەکان دەکردەوە. یەکێک لە سەربازەکان ڕووی کردە گەنجە چواردە ساڵانەکە کە ڕێنمایان بوو و پرسیاری لێکرد تا ئەو کاتە کەس ئەو کوڕەی بەهێند نەگرتبوو. کوڕەکە سوورهەڵگەڕا بوو، شڵەژابوو و بە پەلە و بە شێوەیەکی بێسەروبن وەڵامی سەربازەکەی دایەوە. ئەمە یەکەم ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو کوڕە هەرزەکارە لەگەڵ کەسانێک بوو کە دەیویست لە دژیان خەبات بکات. سەربازەکە دەستی کرد بە پرسیار کردن لە یەکێکی دیکە لە موسافیرەکان.

لێنا چاوی بڕیبووە زەوییەکە، توند دەستی مینای گرتبوو. ئیسماعیل، ئامۆزای عەبدولڕەحمان، بە هێنانە خوارەوەی دەستەکانی، ئەوانی لە سەربازەکان جیا کردەوە. پاشان شۆفیرەکە نزیک کەوتەوە و گوتی: «ئەم خانمە لاڵە، بە مەبەستی چارەسەری چووبووە تەورێز بۆلای دوکتور». مینا تەنیا فارسی دەزانی، لە حاڵێکدا کە منداڵە کوردەکان، تەنیا لە قوتابخانە فێری فارسی دەبن و کچانی گوندیش هەر نەدەچوونە قوتابخانە. هەربۆیەش، مینا کە لە هەموو شت تێدەگەیی، ئەگەر زاری کردبایەتەوە و تەنیا یەک وشەیشی بگوتبا، کارەسات دەقەوما. بە لای سەربازەکانەوە، مینا منداڵێکی کورد بوو. هەربۆیەش نەدەبوو فارسی بزانێت.

لەوکاتەدا کە سەربازەکان دەیانویست جیپەکە بپشکنن، مینا کە دەیویست شتێک بڵێت، گوتی: «مامان». لە کاتێکدا کە منداڵانی کورد بە دایکیان دەڵێن «دایە». لێنا شڵەژابوو، هەرچۆنێک بێت، دەبوو پێش بە قسەکردنی مینا بگرێت. هەربۆیەش، نەقورچکێکی لە شانی مینا گرت و ئەویش دەستی کرد بە قیژە قیژ و هەرئەوەش دەربازی کردن.

---

وەڵامی بوێ، دەبێ بپرسێت: ناوی دایکی منداڵەکان چییە؟

بـــەڵام، لێنـــا وێڕای لـــە ئامێز گرتنی کچەکەی، ڕقی لە عەرز و ئاســـمان هەســـتابوو. سەربازەکان جیپەکەیان پشـــکنی و چەمەدانە بچووکەکەی جـل و بەرگی منداڵەکانیشـیان کردەوە. دواتر، پـاش ڕاوێژێکی کورت، ئیزنی تێپەڕینیان بە موســافیرەکان دا. میناش کە ســەری لەسەر شانی دایکی بوو هەنسکی دەدا.

هەموو خێرا ســوار بوونەوە و جیپەکە، پاش ســەرکەوتن، لە ســەر کێوەکــە و لــە گۆڕاییەکــی بچووک ڕایگرت. بەڕاســتی، پێویســـتیان بە دوورخستنەوەی دڵەڕاوکێ و پشوودان هەبوو، پێویستیان بە هەڵمژینی شـنەی فێنکی کوێستان بوو. ئەوان ڕووداوێکیان تێپەڕاندبوو کە دەکرا ســەرئەنجامێکی خراپــی هەبێت. ڕاگرتنەکەیان زیاتــر لە نیو کاتژمێری نەخایاندبوو، بەڵام بەلای ئەوانەوە چەندین کاتژمێری خایاندبوو. یەکێک لــە موســافیرەکان هەندێ خواردەمەنــی دەرهێنا. هەموو لــە بێدەنگیدا دەســتیان کرد بە نان خواردن و پاش نان خواردن کەوتنە قسە کردن. بڕوایان نەدەکرد بەو سانایيە دەرباز بوونە.

لای نیوەشەو، گەیشتنە یەکەم قۆناغی سەفەرەکەیان. دەبوو کاتژمێر ٣ی بەیانی بەڕێ بکەونەوە. هەوا زۆر سارد بوو. لە دەرەوە ئەسپێکی ســپی کە بریتــی بوو لە ماینێکی پیــر و لاواز، چاوەڕێی دەکرد. لەبری زین، بەڕەیەکی کون‌کونیان خســتبووە ســەر پشــت ماینەکە. یەک دوو کەسیش، یارمەتیی لێنایان دا سواری بێت و دواتر، هیوای نووستوویان دا بە باوەشیەوە. بەڕە هەبوایە یان نە، هیچی لە دۆخی لێنا نەدەگۆڕی. ئێسقانە دەرپەڕیوەکانی ماینەکە بەر ئێسقانەکانی لێنا دەکەوت و دەبووە هۆی ئێش و ئازارێکی زۆر و لە ڕاســتیدا، وەکوو ئەوە وابوو ســواری ئەسپێکی ڕووت بووبێت.

ئیســماعیل ســواری هێســترێک ببــوو. لــە کوێســتان دا، هێســتر ئەرخایەنترین کەرەســتەی گواســتنەوەیە. بەڵام، لەم ناوچانە، بۆ سوار بوون، هێستریش وەکوو گوێدرێژ، بایەخ و ڕێزێکی وای نییە. هەربۆیەش، نەیانوێرابــوو لێنا کە ژنێکی ئورووپایــی و هەروەها ژنی ڕێبەرەکەیان

و لــە هەمــان کاتدا کوڕی یەکێک لە «خان»ە کوردەکان بوو، ســواری هێســتر بکەن. هەربۆیەش، بە باشــتریان زانیبوو سواری ئەو ماینە لەڕ ولاوازەی بکەن کە هەر پێســتەکە و ئێسقانەکە بوو. چونکە لەبەرچاوی ئەوان، ئەسپ نەجیب و جێی ڕێز بوو. لە حاڵێکدا، لینا خوداخودای بوو ماینەکەی لەگەڵ هێســترەکەی ئیسماعیل بگۆڕێتەوە! هیوای لە باوەشدا بوو، بە ســەرنجدان بە هەڵبەزین و دابەزین لە هەوراز و نشــێوەکاندا وهەروەهــا نەبوونــی ئاوزەنگــی، خۆڕاگــری لەسەرپشــتی ئەســپەکە و نەکەوتنــە خــوارەوەی کارێکی ســانا نەبوو. کــوڕە مێردمنداڵەکە بە بینینــی ماندوویەتی لەڕادەبــەدەر و داهێزرانی لینا، هیوای لێ وەرگرت و خســتیە کۆڵەپشــتییەکەیەوە و بە کۆڵ هەڵیگرت، میناش، ســەرەڕای ئەوەی ئیســماعیلی زۆر خۆشدەویســت، دەگریا و بیانووی لای دایکی دەگرت. هەربۆیەش، بە مەبەســتی ئارام کردنەوەی منداڵەکە، جاروبارە دەیهێنایە لای خۆی، بەڵام لەو ڕووەوە کە مینا لە خوشکەکەی قورستر بوو، پاش ماوەیەک، دووبارە دەیدایەوە بە ئیسماعیل.

لــە کاتــی یەکەمین و دووهەمیــن لادانیاندا، لینا بە تەنیــا دەیتوانی لە ئەســپەکە دابەزێت، بەڵام لە لادانەکانــی دواتردا، بەهۆی ماندوویەتی و نزارییەوە، پێویســتی بە یارمەتی ئەوانی دیکە هەبوو. تەنانەت چەندین جــار داوای کــرد بــە پێی خــۆی بڕوات. بــەڵام کەس گوێــی نەدەدایە. ئەســپە هەژارەکەش، لە شــەکەتیی خۆیدا ئازاری دەکێشــا و دەبوو لە هەورازەکانــدا پاڵی پێوەنێن و لە نشێوەکانیشــدا، بــۆ ئەوەی نەکەوێت کلکی بگرن.

قۆناغەکانی ســەفەرەکەیان دووردرێژ بوون و هەربۆیەش پێویست بــوو بەرنامەکەیــان ڕەچــاو بکەن. بــەڵام هەم لینا و هەم ئەو ئەســپە، ڕەوتەکەیان خاو دەکردەوە. لە یەکێک لە لادانەکانیاندا، لە نزیکەی لووتکەی یەکێک لە بەرزترین شاخەکانی ئەو ناوچە، یەکێک لە ڕێنماکان خۆی لە لینا نزیک کردەوە و بە بزەیەکی پڕ لە چاوەڕوانییەوە پێی گوت کە ئایا دەیهەوێ شــتێکی زۆر جوان ببینێت؟ لینا دەیویســت بەڵام ماندوویەتی

بڕسـتی لێ بڕیبوو. بەهەرحاڵ، لینا پرسـیاری لێکـرد: «دەتهەوێ چیم پێ نیشـان بدەیت؟» ڕێنماکە دەسـتی لینای گـرت و یارمەتی دا بگاتە لووتکەی کێوەکە کە زۆریش دوور نەبوو. لەوێ لەسەر کۆگایەک خاک وەسـتان. پیاوە ڕێنماکە بە لینای گوت: «سـەیرکە!» پاشان ئەو پیاوە، لە حاڵێکدا کە لە شـادمانی و کەیفخۆشـیدا پێدەکەنـی، هەردوو باڵی کردەوە و لە خۆشـیاندا هاواری دەکرد و دواتریش کەوتە سووڕانەوە بە دەوری خۆیدا و گوتی: «خوشکە گیان، سەیری ئەم شکۆ و جوانییە بکە! ئەم شاخانە هی خۆمانن و ئێرە کوردستانە!!!»

لینا کە سـەیری سـەمای زیکر ئاسـای ئـەو پیاوەی دەکـرد، کەوتە ژێر کاریگەریی عەشـق و خۆشەویسـتیی ئەو پیاوە بۆ نیشتمانەکەی، سەیرێکی ئەو دیمەنانەی کرد کە ئەو پیاوەی ئاوا شەیدا کردبوو، ویستی لـە جێی خۆی هەسـتێ، بەڵام لەشـی بەدوایدا نەهات. لـە بەرانبەریدا، دیمەنێکی شیاوی خودایانی ئۆڵەمپ ڕاخرابوو. دەوروبەری بە دەریایەک دێوەزمەی باڵابەرز کە شاخەکانی کوردستان بوون، گیرابوو.

لینـا: «ئێمـە بـەرەو کام لا دەڕۆیـن؟» دەسـبەجێیش تێگەیـی کـە پرسـیارێکی بێهوودەی لە ڕێنماکە کردووە. ئەو پیاوە بە شـادمانییەوە ئاماژەی بە ڕێگایەکی نادیار کرد. ئەو لەگەڵ شـاخەوانیی درێژخایەندا ڕاهاتبـوو، شـارەزا بوونی ڕێـگا بەلایەوە گرینگ نەبـوو. دەریایەک لە شـاخەکان، ئەو ئاقـارەی تەنیبوو. هەر لووتکەیـەک چەندین لووتکەی دیکـەی لـە خۆیـدا شـاردبووەوە و هەندێکیان ڕێیان تـێ نەدەچوو و لەشکان نەهاتوو دەهاتنە بەرچاو.

ئایا شادکامی و ترس، وەکوو ئاو و ئاگر، ناتەبان؟

لینـا زۆر ماندوو بوو. سـەرەڕای ئـەوەش، دەبوو لە سـەفەرەکەی بـەردەوام بێت. منداڵـەکان، عەبدولڕەحمـان و کـوردەکان، متمانەیان بـە ورەبەرزیـی ئەو کردبـوو و چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکرد بەسـەر هـەر تەنگ و چەڵەمەیەکدا زاڵ بێت. لە ڕاسـتیدا ئـەوان نەیاندەزانی چ چاوەڕوانییەکی قورسـیان لەو هەبوو! لە هەمان کاتدا، هەسـتی دەکرد

توانـای هەڵگرتنـی ئـەو بـارەی نییە. خـۆی دەبینیەوە کە لەو شـاخە بێسـنوورانەدا نوقم بووە. سـەرەڕای ئەوەش، ئەو دەبوو وردە وردە، بـە هێزی ئیرادە، بەرسـەر ماندوویەتیی خۆیـدا زاڵ بێت. بە بەرچاوی لیناوە، پیاوە ڕێنماکە سەرمەسـت لە دڵخۆشـی و ئۆگریی شـاخەکانی، وەکوو شـەیدایی عاشـقێک بۆ خۆشەویسـتەکەی، سـەمای دەکرد بە دەوری خۆیدا دەسـووڕایەوە و لەگەڵ هەر قاقایەکدا، ددانە سپییەکانی دەبریسـکانەوە. ئەگـەر پێت گوتبا «با بڕۆین» بێگومان بە شـادییەوە باڵـی دەگرتـەوە و لە شـاخێکەوە بۆ شـاخێکی دیکە دەڕۆشـت بە بێ ئەوەی هەست بە ماندوویەتی بکات.

بەختەوەری و شادکامی دەتەننەوە و پێوەدەچن. لینا چیدیکە گوێی لە دەنگی پیاوە ڕێنماکە، کە ڕووی لە ئاسـمان کردبوو، نەمابوو. هەسـتی دەکرد کەوتۆتە گێژەڵووکەیەکی پڕ لە شادییەوە، گێژەڵووکەیەک وەکوو سـەمایەکی بێکۆتایـی و بەرێوەچوونـی هەندێ بۆنەی وەحشـییانە، هەروەهـا گەرداوێکی بێکۆتایی و تەژی لە بەختەوەری، ئەوانە هەموو، کەوتبوونـە سـووڕانەوە بە دەوری لینادا و لینـا خۆی لە نێوەندی ئەو گێژەڵووکـەدا دەبنییەوە. هەسـتی دەکرد کەوتۆتە فڕین و لە سـەروو هەمـوو ڕووداوەکانەوەیـە. هەموو شـتێک نەدیو ببوو، لـە ڕێنماکان، عەبدولڕەحمان و منداڵەکانەوە بگرە تا عەرد و ئەو شـاخە زەبەلاحانە، تەنانەت ئاسـەوارێک لە شەکەتی و سسـتیش نەمابوو، هەستی دەکرد کەوتۆتـە نێـوان ئاسـمانەکان و جەهەننەمـەوە، نوقمـی هەسـتەکانی خـۆی ببـوو و ئاگای لەو پیاوە ڕێنمایە نەمابوو. ئەو پیاوە لە سـەما و سووڕانەوە وەستابووەوە و لە تەنشت لینا چوارمشقی دابوو و چاوی بڕیبـووە ئەو خاڵەی لینا چاوی تـێ بڕیبوو. لینا دوور کەوتبووەوە، بە شێوەیەکی مەترسیدار دوور کەوتبووەوە. پیاوە ڕێنماکە، دەستی خستە سـەر شانە لاوازەکانی لینا و ڕایوەشاند و لە هەمان کاتدا بە هاوارەوە هەندێ وشـەی لە گوێی لینادا دووپات دەکردەوە کە بەلای لیناوە نامۆ بوون. دواجار، وەڵامی لینا بۆ ئەو پیاوە، تەنیا بزەیەک بوو.

پیاوە ڕێنماکە ئارامیی بە ڕواڵەتیەوە دیار بوو، بە بزەیەکەوە پرسیاری لە لینا کرد: «کێ بوو؟!» لینا، دەم بە بزە، هەستایە سەر پێ و گوتی: «تۆ ڕاست دەکەیت، کوردستان بەڕاستی جوانە». هەستی دەروونی و ڕۆحیی لینا، هەمیشە کاریگەریی لەسەر جەستەی دادەنا. ئەگەر ئەو هەستانە، خەماوی بوونایە، لینا لە ڕووی جەستەییەوە هەستی بە بارگرانی و پیری دەکرد و زۆرجاریش نەخۆش دەکەوت. بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر دەروون و ڕۆحیشی شادمان بووایە، هەستی بە خۆڕاگری و بێکێشی، وزە و چالاکی دەکرد لە جەستەیدا.

لینا ڕێزێکی زۆری بۆ نەتەوەی کورد دادەنا کە لە سەرکوت و زوڵم ئازاری دەکێشا، تێکەڵ بە شۆڕشگێڕانی ئەم نەتەوە ببوو و دەیویست لە شۆڕشەکەیاندا بەکەڵک بێت. لە ڕێی فێر بوونی زمان و داب و نەریتیانەوە، ژیانی خۆی لەگەڵ گرێ دابوون. سەرەڕای ئەوەش، هەموو ئەمانە، دەرئەنجامی ئەو کارانە بوون کە فێری ببوو و هەروەها ئەو شارستانیەتەش کە تێیدا گەورە ببوو، ئەگینا لە گەڵ هیچکام لەم شتانە ئاشنا نەبوو. لە ڕاستیدا، سەرەڕای ئەوەی لینا بە لێکدانی عەشق و ئاوەز لەگەڵ کوردەکان تێکەڵ ببوو، بەڵام هیچکام لەوانە تا قووڵایی ناخی ڕۆ نەچووبوون.

لەم کاتەدا، نزیک لە ئاسمان و لە سەروو دەریایەک لە شاخەکانەوە، شادکامی و ترس بەرانبەر بەیەک وەستابوون و پێکەوە سازابوون. گەوهەر و ڕۆحی کوردایەتی بەسەر لینادا زاڵ ببوو و گەوهەر و ڕۆحی لینا لەگەڵ گەوهەر و ڕۆحی کوردایەتی ئاوقا ببوو و بەم چەشنە بوو کە شوناسی لینا گۆڕدرا و بوو بە شوناسێکی کوردی.

لینا بە ئارامی لە لووتکەی کێوەکە داگەڕا و هەستی کرد لەگەڵ ئەو بەرپرسیاریەتییەی کەوتۆتە ئەستۆی، سازاوە. هێزێک بە لەشیدا هاتبووەوە. لە ڕاستیدا، لینا لەگەڵ ئەو هەستەی تا چەن ساتێک لەوەپێش لەگەڵی نەدەسازا، گونجا بوو. لەو ساتەدا، تەنیا هەستی بە ئارامییەکی قووڵ دەکرد.

لێنا و هاوڕێکانی گەیشتنە گوندێک. ئەسپەکەیان لە تەویلەیەک دانا و هێسترەکەشیان بە گوێدرێژێک گۆڕییەوە و ئەوەی لە کەل و پەل پێیان بوو، باری گوێدرێژەکەیان کرد. بە پێچەوانەی بیرکرنەوە و ترسی لێنا، ڕێگا کەمتر ماندووی کردن. ئایا بەهۆی ئەوەوە بوو کە ڕێنماکانیان شارەزا بوون و لە کێوە ناوبڕەکانەوە بەرەو بناری کێوەکان دەیانبردن؟ یان لەو ڕووەوە بوو کە گەنجەکان بە هاسانی خۆیان لەگەڵ هەموو دۆخێک دەگونجێنن؟ یان لێنا ئەو لێنای پێشوو نەمابوو؟ ژانی پشتی، ماندوویەتی لاقی، بلۆقە تەقیوەکانی پای، ئازاریان دەدا، بەڵام پاش ماوەیەک بەڕێدا ڕۆشتن، وردە وردە ژانیان دەشکا. ئەوان، شەوان دەڕۆشتن و ڕۆژان خۆیان دەشاردەوە و پشوویان دەدا.

ڕێنماکان باسی کوڕێکی بچکۆلەیان دەکرد کە دووسەری هەبوو. خەیاڵی دیاردەیەکی ئاوەهاش، بیری لێنای بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، شەوانە وازی لە لاڵ بوون دەهێنا و سەبارەت بەو کوڕە دووسەرە، ڕێنماکانی بە پرسیار هەڵدەپێچا. ئەوانیش وەڵامیان ئەدایەوە: «پەلە مەکە، بەچاوی خۆت دەیبینی.»

بەیانییەک گەیشتنە چۆڵەوارێک کە تەنیا ماڵۆچکەیەکی لێ بوو. درگای خانووەکە کەوتبووە نێوەڕاستەوە و بەڕووی ڕێڕەوێکی بچوکدا دەکرایەوە کە دوو ژوور بەملا و ئەولایەوە بوو.

یەکێک لە هاوڕێکانی لێنا گوتی: «هەرکام لەم ژوورانە تایبەتە بە یەکێک لە ژنەکانی خاوەن ماڵەکە.» لە ڕاستیدا، ئەوان دەیانزانی لە ئوورووپا فرەژنی قەدەغەیە و سەریان دەخستە سەر لێنا. لێنا لە وەڵامی ئەو ڕێنمایەدا بە سرتە پێی گوت: «خۆزگە بە خۆی چوار ژنی نییە، دەنا لە کوێ جێی دەکردنەوە؟» ڕێنماکە، بۆ هەڵخڕاندنی لێنا وەڵامی دایەوە: «هەردوو ژنەکەی لە مەزرا کار دەکەن و پێکەوە زۆر کۆکن. یەکیان منداڵی نییە و ئەوی دیکەیان دایکی کوڕە دوو سەرەکەیە.»

منداڵەکە وەک گوێی زرینگابێتەوە، هاتە ژوورەوە. منداڵێکی تەندروست و جوان بوو. ناوی کامران بوو. کامرانی بچکۆلانە و هاروهاژ، چووە

لای یەکــە بە یەکەی میوانەکان و ماچی کردن. ئەو کە تازە پێی نابووە پێنجەمیــن ســاڵی تەمەنییــەوە، لەگەڵ مینا و هیوا بــوو بە هاوڕێ. ئەو لــە نێو مرۆڤــە گەورەکاندا گەورە دەبوو، بێگومان لــە نەبوونی منداڵی هاوتەمەنی خۆی ئازاری دەکێشا. کامران کەللەیەکی زل و جەستەیەکی بەخۆوەی هەبوو. لە پای تەمەنی، درشتتر و پوختەتر دەهاتە بەرچاو، بــە هۆی ئــەوەوە کە کەللەی تا ڕادەیەک گەورەتر لە ئاســتی ئاســایی لــەو ناوچەدا بــوو، هاوڕێکانی دایک و بابی، بە گاڵتــە نازناوی «کوڕە دوو ســەرەکە»یان لێ نابوو. کامران تەنانەت لینــاشــی کێشــابووە ناو یارییەکەیــەوە. بــەڵام بــۆ دڵنیایــی زیاتر، لینا هێشــتاش ڕۆڵــی ژنێکی لاڵــی دەگێڕا و بە ژێســت و ئاماژەوە، جەماعەتی لــە خۆی تێدەگەیاند. کامرانیش پێدەکەنی، هەڵبەزودابەزی دەکرد و لە خۆشیاندا دەیقیژاند و یەکبین قســەی دەکرد. بەڕاستی منداڵێکی زۆربلێ بوو. مینا و هیواش بــۆ پێکەنین، لاســایی ئەویان دەکــردەوە. لە پڕ، لە ڕەوتــی یارییەکەدا، کامرانــە بچکۆلانــە ڕووی لە لینــا کرد و بە زمانی کــوردی پێی گوت: «دایکــت دەگێم». لینا حەپەســا بوو، بە ئامــاژە تێی گەیاند کە وتەکەی دووپات نەکاتەوە. منداڵەکە هەمان وتەی دووپات کردەوە. لە ڕاســتیدا، وتەکەی ئەو، جوێنێکی باوک سالارانە بە دایکی لینا بوو کە باوەڕ کردنی قــورس بوو. لینا بیــری لەوە دەکردەوە کە ئەو منداڵــە زۆر بێئەدەبە! وئەوەش کە ڕەنگە لە گوندەکان، منداڵی وەرزێرەکان زوو گەورە دەبن و ئەویش نەک هەر لە باری جەستەییەوە! (چواردە ساڵ پاش ئەوە، ئەم منداڵە هاروهاژە، پەیوەســت بە ڕیزی پێشــمەرگەکان بوو و بەدەستی سەربازەکانی شا کوژرا).

بەیانییەک، هیلاک و ماندوو لە ڕێپێوانی شەوانە، لە نزیکەی مەزرایەکی بەدارودرەخــت پەرژین کراو، لایانــدا. شــوێنێکی خۆش و دڵڕفێن بوو. باڵنــدەکان لە خەوی شــەوانەیان هەســتابوونەوە و جریوەیان دەهات. مینــا بــەدەوری خوشــکەبچووکەکەیدا دەســووڕایەوە و هەوڵــی دەدا ڕاکێشــی یاریی بــکات. یەکێک لە ڕێنماکان، بە پەلــە خۆی گەیاندە مینا

بـۆ ئەوەی بێدەنگی بکات و گوتی: «نابێ دەنگتان لێوە بێت» لێنا وازی لـە لاڵ بوون هێنـا و گوتی: «بۆچی؟». لەو ڕووەوە کە هیچ کەسـێک و تەنانـەت هیچ ماڵێکیش لەو ناوچەدا بـەدی نەدەکرا، لێنا تووڕە بوو. پیاوە ڕێنماکەش کە ترسـا بوو و قەڵـس دەهاتە بەرچاو، داوای لە لێنا کرد دوای کەوێت.

مەزراکە کەوتبووە نەرمەلێژێکەوە. کاتێک گەیشتنە سووچێکی دیکەی مەزراکەوە، پیاوەکە بە پاڕانەوەوە داوای لە لێنا کرد دەمەوڕوو ڕاکشێت و لە نێوان دارەکانەوە سـەیری خوارەوە بکات. ئەوان لەسـەر ڕۆخی هەڵدێرێک بوون کە گوندێک لە خوارەوەی دیار بوو. پاشـان ئەو پیاوە گوتی: «ئەم مەزرایە هی دۆسـتێکمانە و جگە لە خۆی کەس سـەردانی ئێرە ناکات. ئاغای ئەم گوندە جاشـە و گوندییەکان زۆر لێی دەترسـن. ئەگەر بماندۆزنەوە، خەڵکەکە هیچ یارمەتییەکمان نادەن.»

ـ «ئەی بۆ لێرە لامان داوە؟»

ـ «ئەگەر بێدەنگ بین، شـوێنێکی ئەمینە. ئەو ڕێگایەی تا وێستگەکەی دیکـە لەبەرمانـە، دوورودرێـژە. هەمووشـمان ماندووین و پێویسـتە پشوویەک بدەین.»

هەموویان خەویان دەهات، بەڵام ئیسماعیل دیار نەبوو. پاش ماوەیەک گـەڕان، ئیسـماعیلیان لـە ناوەڕاسـتی مەزراکە دۆزییەوە کە بەسـەر کۆگایەک خۆڵدا کەوتبوو و وڕێنەی دەکرد و قسـەی حەلەق و مەلەقی بەزاردا دەهات. ئیسـماعیلیش خوێندکار بوو، ئەویش وەک لێنا بەرگەی ئەو چەشنە سەفەرانەی نەدەگرت.

یەکێک لە ڕێنماکان گوتی: «هەر ئەمەمان مابوو!»

لێنا داوای لێکردن ئاوی بۆ بێنن. ئاوەکەیان هێنا و لێنا دەستی کرد بە یارمەتیدانی ئیسماعیل و سەروچاوی بە ئاوەکە شوشت و...

ڕێک لەوکاتەدا، گوێدرێژەکە دەسـتی بـە زەڕاندن کرد و بەو جۆرە، بوونـی ئەوان لەو مـەزرای بە کەڕەنـادا کرد. یەکێک لـە ڕێنماکان بە پەلـە بەرەو هەڵدێرەکە ڕایکرد بۆ ئەوەی ببینێت زەڕاندنی کەرەکە هیچ

جموجۆڵێکی خستۆتە خەڵکەکەوە یان نا؟ کەرەکە وردە وردە بێدەنگ بوو. دۆخی ئیسماعیلیش جێگر بووەوە و ڕێنماکەش لە هەڵدێرەکە گەڕایەوە: وادیاربــوو، دەنگی گوێدرێژ، ئەویش لەو دوورەوە، کاریگەریی لەســەر خەڵکــی گوندەکە دانەنابوو. پاش نیوەڕۆ، پیەوندیکەرەکە بە چێشــتێکی گەرمەوە هات. بۆ ئەوان کە بە درێژایی ئەو ڕۆژانە شــتی ســارد وەک نان، پەنیر، ترێ و لە دوا ڕۆژەکانیشــدا بیســکویتیان خواردبوو (بەڵام هەتا دڵت بیگرێ، ئاو بۆ خواردنەوە زۆر بوو)، خواردنی چێشتی گەرم، زیاتر لە خوانی جەژنێکی ڕاستەقینە دەچوو.

ئەو گوندییە، لە کۆبوونەوەیەکی جودا لەگەڵ ڕێنماکاندا، هەندێ شتی باس کرد کە بە چاوەکانیانەوە نیگەرانی دیار کەوت. پاش نان خواردن، گوندییەکە قاپەکانی هەڵگرت و بەپەلە گەڕایەوە.

ســەرپەلی ڕێنمــاکان، بە بێ هیــچ ڕوونکردنەوەیــەک گوتی: «دەبێ دەســتبەجێ بــەڕێ بکەویــن». (لــە ڕاســتیدا، دەســتەیەک لــە هێــزە ســەربازییەکانی ڕێژیمــی شــا لــەو ناوچەیــەدا بوون و لــەو گوندە و کێوەکانــی ئەونــاوە جەولەیان دەکرد. بە دوای بنکەی ســەرکردایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێراندا دەگەڕان).

ڕۆژانی دواتر، بە بێ وەستان بەڕێوە بوون، جگە لەو کاتانەی کە بە هۆی شــەکەتیی لەڕادەبەدەرەوە، بڕســتی ڕۆشتنیان لێ دەبڕا و ناچار دەبوون ماوەیەکی کورت لابدەن. لەو کاتانەشــدا، دەســتبەجێ خەویان لێدەکەوت. بەڵام خەوەکەشــیان، سەرەخەو بوو، چونکە دەبوو هەرچی زووتــر بەڕێ بکەونەوە. بڕســتیان لــێ بڕا بوو، تەنانــەت ڕێنماکانیش ئەوەنــدە هیلاک بوون هێزی هەنگاویان نەمابوو. لەپڕ دۆخەکە گوڕدرا. چیدیکە ڕێنماکان داوایان لێ نەدەکردن بێدەنگ بن و تەنانەت بۆخۆشیان کەوتنە ورتە ورت، ســەریان دەخســتە ســەر منداڵەکان و گوڵ و گیای ئــەو ناوەیان پێ نیشــان دەدان و...هتد، بە کورتــی، دەیانتوانی ئازادانە قســە بکەن و بە دڵی خۆیان بنوون. پاشــان گەیشــتنە نزیکەی گوندێک کە بەســەر گردێکەوە بــوو. گردێک تەژی لە دار و شــینکایی. گردەکە

دار ودرەختێکی زۆری هەبوو کە دانیشــتن لە ســێبەری فێنکیدا دڵڕفێن بوو. لە تەنشت دارەکانیشەوە مەزرایەک بەرچاو دەکەوت کە بەردەوام کاری لەســەر کرابوو. لەســەر گردەکــە، کۆمەڵێک پیــاوی چەکدار کە هەمان پێشمەرگەکان بوون، چاوەڕوانیان بوون. هەموو بەدەنگی بەرز قسەیان دەکرد، پێدەکەنین و یەکتریان ماچ دەکرد. کاتێک گەیشتنە لای لینــا، بێدەنــگ بوون، لینا لــەوەی ڕووی دەدا، تێنەدەگەیــی. یەکێک لە پێشمەرگەکان بە لفکەی جامانەکەی بەشێکی دەموچاوی شاردبووەوە، لە دەستەکە جیا بووەوە و بەرەو لینا کەوتەڕێ، لینا چاوەکانی ناسییەوە: هاوسەرەکەی بوو، ئەگەر لینا وەک ئورووپاییەک هەڵسوکەوتی کردبا، دەبوو پاز بداتە ئامێزی و دەســتی دە ئەســتۆ بکات، بەڵام ئەو چیدیکە ئورووپایــی نەبــوو. هەربۆیەش، وەکــوو ژنە کوردێــک جووڵایەوە و تەنیــا بە بزەیەکەوە بەرەوڕووی بووەوە و بەرەولای باوکیان، پاڵی بە منداڵەکانەوە نا.

گەیشــتبوونە بنکەی ســەرکردایەتی حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێــران. هەموو بە شــێوەی بازنەیی لە ژێر دارەکان دانیشــتن. بوولیڵی بەیانی بوو. کاتێک، ئەوان بێدەنگ دەبوون، سروشت دەهاتە گۆ، دەتگوت دەعباکان، سیســرکەکان، زەردەواڵەکان و چۆلەکەکان چاوەڕوان بوون مرۆڤــەکان بێدەنگ بن تا ئــەوان بە نۆبەی خۆیان بێنــە گۆ. جارجارە، عەبدولڕەحمان بە دزییەوە سەیرێکی لینای دەکرد و هەندێ جاریش بە شــاراوەیی دەستی دەگوشی. لە هەمان کاتیشدا بە وردی گوێی لەوانی دیکە دەگرت. ســەرەڕای ئــەوەش وەکوو هەمیشــە، عەبدولڕەحمان لە هەمووان زیاتر قسەی دەکرد.

مینــا و هیوا، دەســتبەجێ هەســتیان بە نائاســایی بوونــی دۆخەکە کردبــوو و لەگــەڵ ئــەوەدا کە بێدەنــگ بــوون، خۆیان بــە دایکیانەوە نووســاندبوو و ســەیری ڕواڵەتــە نوێیەکانیــان دەکــرد. بــە بزەیەکی شــەرمنەوە کە دەرئەنجامی پەروەردەیەکی باش بوو، وەڵامی پێکەنینی پــڕ لە خۆشەویســتیی پیاوەکانیــان ئەدایەوە. وەکــوو خەڵکی ناوچەکە

چـای دیشـڵـەمەیان دەخـواردەوە، واتـە سـەرەتا قەنـدە کڵۆکەیان لە چاییەکە هەڵدەهێنا و دواتر دەیانخسـتە دەمیانەوە و پاشان قومە قومە دەیانخـواردەوە. بە دڵنیاییـەوە منداڵەکان قەندەکەیـان لە چاکە بەلاوە خۆشتر بوو. پاش نانی ئێوارە، هەموو لە نێوان دارەکاندا نووستن. لێنا لەبـەر دەنگی پرخە پرخی پیـاوەکان خەوی لێ نەدەکەوت. هەربۆیەش سـەیری ئاسمان و سەرسـووڕهێنەریی ئەستێرەکانی دەکرد و هەوای پاکژی کوێستانی هەڵدەمژی. دواجار، ئەویش خەوی لێکەوت.

شـەو بـە بەریـەوە مابـوو، لێنا هەسـتی کرد هیـوا لە تەنشـتییەوە نەماوە، مینا لە تەنشـتەکەی دیکەی بە ئارامی نووستبوو. لێنا، بە دوای هیـوادا گـەڕا. پێی وابوو هیـوا خۆی کردووە بە ژێـر لێفەی یەکێک لە نووسـتووەکاندا و خـەوی لێ کەوتۆتـەوە، هەربۆیـەش یەکە بە یەکە لێفەکانـی هەڵدەدایـەوە. بـەڵام هیوا لە هێچ کوێ دیـار نەبوو. ترس لە گیانی لێنا نیشـت. عەبدولڕەحمانی لە خەو هەسـتاند و ئەویش ئەوانی دیکـەی خەبەر کردەوە. هەموو پێکەوە بـەدوای هیوادا دەگەڕان. بەڵام نەیاندۆزییـەوە. بـە لێنایان گوت: نیگـەران مەبە، بەیانیـی هەرکە ڕۆژ بووەوە، دەیدۆزینەوە. بەڵام، لێنا بە پشـتن بەسـتن بە ڕۆشنایی مانگ و ئەسـتێرەکان، لەسـەر گەڕان سـوور بوو. بەڵام کەس گوێی نەدایە. لێنـا لەسـەر چیمەنی گردەکە دانیشـت و دەسـتی بە گریـان کرد و لە هەموویان تووڕە بوو، بە تایبەت لە عەبدولڕەحمان قەڵس ببوو کە پاش بێ دەرئەنجام بوونی گەڕانەکەیان، سـەرلەنوێ ڕاکشابووەوە و خەوی لـێ کەوتبووەوە. لێنا چاوەڕوانی هەموو شـتێکی دەکرد جگە لەمەیان. مێردەکـەی بە بـێ نیگەرانی لـە ون بوونی کچەکـەی و هەروەها ئەو ترسە گەورەیەی لە هاوسەرەکەی نیشتبوو، خەوی لێ کەوتبوو! لێنا بە وردی سـەیری کێڵگە شێف کراوەکەی بەرانبەری کرد، هێڵە هاوتەریب و ڕاسـتەکانی شـێفەکە، وەکوو ڕۆژ لەبەر چاویدا دیار بوو. سەرنجی دا لە سـووچێکی مەزراکە، کۆگایەک دیار بـوو، کۆگایەکی تا ڕادەیەک بەرچاو کە تەکووزیی کێڵگە شـێف کراوەکەی دەشێواند. لێنا وەک تیر

بــەرەولای ئــەو کۆگایــە ڕایکرد و بینــی کە هیوا وەک فریشــتەیەک و لەوپەڕی ئارامیدا خەوی لێکەوتبوو.

سەرەتا لە خۆشیاندا دەستی بە گریان کرد و دواتر ئەوانی دیکەشی ئاگادار کردەوە.

لێنا، ئیســماعیل، منداڵەکان و ڕێنماکانیان، ســەرلەنوێ کەوتنەوە ڕێ. پێشــمەرگەکان و عەبدولڕەحمانیــان لەوێ بەجێ‌هێشــت. ئــەو لووتکە بەرزانەیان بەجێهێشــت کە ســەریان لە ئاسمان دەســوو و ڕوویان لە لووتکەکانی دیکە کرد.

لێنا پرسیاری کرد: «زۆرمان ماوە؟»

وەڵامیان دایەوە: «بێدەنگ بە تۆ لاڵیت.»

کەواتە، لە ڕاستیدا هیچ نەگۆڕدرابوو. تەنیا ئاڵوگۆڕێک کە ڕوویدابوو، ئــەو لادانــە کورتــە لــە بنکــەی ســەرکردایەتیی حیزبــی دێموکراتــی کوردســتانی ئێرانــدا بوو و ئێــرەش، بۆ ئەوان تەنیا، شــوێنێک بوو بۆ حەســانەوەیەکی کاتی و پشــوویەکی کــورت، چونکە ئــەوان تەنانەت دەرفەتی حەسانەوەشیان نەبوو.

خەڵکی گوند، هەر لەگەڵکوو خۆر نیشت دەنوون و بەیانیی زووش لە خەو ڕادەبن. لە هاویندا، شــەوان کورتن، هەربۆیەش، موسافیرەکان بۆ پێوانی مەودا ڕەچاو کراوەکان، دەبوو پەلە بکەن، چونکە دوا کەوتبوون. فێنکی و بێدەنگیی شــەو، هەستی بەدوور بوون لە مەترسیی لە مرۆڤدا دروست دەکرد.

لــەم کێوانەدا، مرۆڤ لــە ڕەوتی ڕێپێوانی شــەوانەدا لەگەڵ خولیا و خەونی ســەیر و سەمەرە و سەرســوڕهێنەردا بەرەوڕوو دەبێتەوە کە دەرئەنجامی جوانی و هێزی سروشــتن، خەون و خولیاگەلێک کە گەلێ خەیــاڵ و فانتازیا وەبیری مــرۆڤ دێننەوە. لەگــەڵ هەڵاتنی خۆر، ئەو خەون و خەیاڵاتە شــیرینانەش دەڕەوێنەوە و مــرۆڤ بۆ ئەوەیکە واز لە نۆســتالژیای ئەو خەونانە بهێنێت و لە ملی خۆیی بکاتەوە، بەڵێن بە خۆی دەدات کە ڕۆژێک دەگەڕێتەوە و سەردانی ئێرە دەکاتەوە...

پێی لینا ئاوسا بوو و پڕ ببو لە بلۆقی تۆقیو و ناسۆر و ئەو قوماشانەی لە دەوری لاقە بەئازارەکانی هەڵپێچابوو، لە ڕێگادا دەکرانەوە. دەگەیشتنە هەر کانییەک، لینا لاقەکانی لە ئاوە ساردەکە دەخست. ئەوەش یارمەتیی دەدا لە سەفەرەکەی بەردەوام بێت. بۆ ئەوەش ژان و ئازار لە پێی نەخات، هەوڵی دەدا لە ڕێی پەند و حیکمەت و شتی لەو چەشنە و تەنانەت سەرکۆنە کردنی خۆیەوە، زەینی خۆی سەرقاڵ بکات و مێشکی لە بیرکردنەوە لە ئازار بەتاڵ دەکردەوە، هەندێ جار هانای دەبردە بەر ئاسمان، گاڵتەی بەخۆی دەکرد، نەفرینی لە لاواز بوونی خۆی دەکرد و تەنانەت بەزەیی بەخۆیدا دەهاتەوە. سەرەڕای هەموو ئەوانەش، وەکوو ئەوانی دیکە لە ڕێگاکەی بەردەوام دەبوو.

ئەوان شەو، گەیشتنە گۆڕەپانی گوندێک.

شۆفیری پێشوویان گوتی: «لێرە بە بێدەنگی چاوەڕێم بن! دەچم هاوڕێکەم لە خەو هەستێنم.»

کاتژمێر یەکی بەیانی بوو. لە ڕووناکیی مانگەشەوەکەدا، هەموو شوێنێک و هەروەها ڕاکردووەکانی ئێمەش دیار بوون. یەکێک لە ڕێنماکان بە ئاماژە داوای لێکردن خۆیان بخەنە سێبەری یەکێک لە ماڵەکانەوە. لەو کاتەدا کە ئەوان خۆیان ڕێکدەخست بەرەولای سێبەرەکە بڕۆن، ڕێنماکە گوێدرێژەکەی بە ئاستەم جووڵاند بۆ ئەوەی دوایان کەوێت و بچێتە بەر سێبەرەکە. ڕێک لەو کاتەدا، گوێدرێژەکە دەستی کرد بە زەڕە زەڕ. زەڕاندنی گوێدرێژ لەو مانگەشەوەدا، ئەویش کاتژمێر یەکی بەیانی، هیچی لە نهێنی کاری پێوە دیار نەبوو. گرووپە حەپەساوەکەی ئەوان لە شوێنی خۆیان چەقیبوون. ڕێک لە تابلۆیەک دەچوو گیانی بەبەردا هاتبێتەوە و چاوەڕێی کارەساتێک بکات. بەڵام هیچ کەس لە خەڵکی ئەو گوندە تەنانەت بۆ پرسیاریش بێت، نەهاتنە دەرەوە. پێدەچێت ئەم گوندە جاشی نەبێت و لەوانەش بوو خەڵک لەگەڵ زەڕاندنی گوێدرێژ ڕاهاتبن. دواجار، شۆفیرەکە کە بۆخۆی یەکێک لە ڕێنماکانیان بوو، لەگەڵ هاوڕێیەکەی گەڕایەوە و هەوڵیان دا گوێدرێژەکە

بێدەنگ بکەن و پاڵیان پێوەدەنا بۆ ئەوەی بچێتە پێشەوە. بەڵام سوودی نەبوو. گوێدرێژەکە پێــی چەقاندبوو و یەک بەخۆی دەیزەڕاند. دواجار خۆی بێدەنگ بوو. هیچ کەس و تەنانەت وڵاخدارێکیش ناتوانێ بڵێ ئەو کرە بۆ وای کرد.

دواجار، لە سنووری نێوان عەراق و ئێران، لە خاڵێکەوە دەرباز بوون کە هیچ هێمایەکی تایبەتی نەبوو کە دیاری بکات ئەوە سنوورە.

لێنــا پێی وابــوو کە بــەرەوڕووی تێلــدڕوو دەبێتەوە، ڕێــک وەکوو ئــەو وڵاتانەی کە پەرژینێکی ئاســنین، لە وڵاتــە ڕۆژئاواییەکان جودای دەکردنەوە. بۆ لێنا، جێی سەرســوڕمان بوو کە سەرەڕای ئەوەیکە ئەم دوو وڵاتــە ( ئێــران و عەراق) زۆربــەی کات پێکەوە لــە دوژمنایەتیدا بوون، ئاسەوارێک لە ناوچەگەلێک بە کۆنترۆڵی توندەوەی نەدەبینی.

■ عەراق

بــە درێژایی ڕەوتی ســەفەرەکەیان تــا عەراق، ئەوان هەشــت کەس بوون. کاتێک، بەیانیی ڕۆژی دواتر لێنا چاوی کردەوە، بینی کە بوونەتە پێنج کەس. سێ کەس لە ڕێنماکان کە کوردی ئێران بوون، پاش کۆتایی هاتنی ئەرکە پێسپێردراوەکەیان گەڕابوونەوە.

موســافیرەکان لــە قوژبنێکــی گردێکــدا لایــان دا. ڕێنماکەیان ڕووی لــێ کــردن و گوتی: «ئەوە شــاری ســلێمانییە. لێرە چاوەڕێــم کەن تا دەگەڕێمــەوە» ئەوســا ڕووی کــردە لێنا و گوتی: «لێــرە کەس کاری بەســەرتانەوە نییە و لە ئەگەری هەر شــتێکدا، بیــرت نەچێتەوە کە تۆ لاڵیــت.» پاشــان ڕووی لە ئیســماعیل کرد و گوتی: «تــۆش هەتا پێت دەکرێ بێدەنگ بە و کەمتر قسە بکە.»

کوردەکانــی ئــەم ناوچــە، بریتی لە کوردی ئێــران و کوردی عەراق، بــە شــێوەزاری ســۆرانی دەدوێــن و بــە تــەواوی لەیەکتــر تێدەگەن. لەگەڵ ئەوەشــدا، تەنیا لە چۆنیەتی بەکارهێنانی وشــەکان و شــێوازی قســەکردندا، تــا ڕادەیەک جیاواز بوون و ئەویش بــە هۆی کاریگەریی

وڵاتە پەیوەندیدارەکانیانەوە بوو. گەڕانەوەی ڕێنماکە زۆری خایاندبوو. وەکوو جارەکانی پێشــوو، لێرەش ڕاگرتنــی منداڵەکان و ناچارکردنیان بــە بێدەنگــی کارێکی ســانا نەبوو. هــەرکام لە گەورەکان، بــە نۆرە لە ئامێزیــان دەگرتن و بە دەنگێکــی نەوی چیرۆکیان بۆ دەگێڕانەوە. پاش نیوەڕۆ، ڕێنماکە بەتەنێ و بە دەســتی بەتاڵ گەڕایەوە. چاوساغەکەیان دیــار نەبوو و پەیامێکی دانابوو. دواجار، چاوســاغەکە لای نیوەشــەو گەیشتە لایان.

■ سلێمانی

لای ســپێدەی بەیان گەیشــتنە ماڵێکی بچووک لە نزیکەی سلێمانی و چوونــە پێخەفەکانیانەوە، بەو بیرەوە کە ســبەی بەرەو بەغا دەڕۆن و لەوێ پاسپۆرت و بلیتەکانیان دەگاتە دەستیان.

هەرچەنــد هیوای مرۆڤ زیاتر بێت، بــەو ڕادەیەش ئەگەری بێ هیوا بوونــی لەئــارادا دەبێت. لە ســلێمانی، مــاوەی حەوتوویــەک چاوەڕێی گەیشتی ئەو ئۆتۆمبیلە بوون کە دەبوو بیانباتە بەغا.

ڕۆژێکیان، دەنگی گڕەی مەکینەی جیپێکی شەقوشڕ، موسافیرەکانی ڕاکێشی بەر پەنجەرەکە کرد. ئۆتۆمبیلێک بوو کە دەبوو تا بەغا بیانبات. وادیاربــوو، ئــەوان لەگــەڵ ئۆتۆمبیلی «جیپ»دا شانســێکی باشــیان نەبووبێت.

لەگەڵ بیستنی وشـەی : «سەرکەون»، هەموو سوار بوون.

لەکاتی تێپەڕین لە ســلێمانی، لینا پرســۆکانە سەیری جم و جۆڵی ناو شــاری دەکرد. ژیان لە تاران، ئیدی دوور دەهاتە پێش چاو. هەنووکە، ئەو، خانووگەلێکی دەبینی کە بە ڕەنگی کاڵباو ڕەنگابوون و دەوروپشتی خانووەکانیش بە دار و شــینکایی تەنرابوو. کۆڵانەکان خاوێن بوون و نهۆمــی یەکەمی خانووەکان کرابووە دووکان و کەســابەتی تێدا دەکرا. هەموو دەرکەوتەکان، دەرخەری هێمنایەتی بوون.

لینا، پاش ئەو ڕۆژەش، چەند جارێکی دیکە و لە دۆخە جیاوازەکاندا،

سلێمانی بینییەوە. لە دەرئەنجامی شەڕە جۆراوجۆر و زۆر و زەبەنەکان، شارەکە خەساری زۆری بینیبو و کاولکاریی زۆری بەسەر هاتبوو.

ئەوان، لە ڕێی چەمچەماڵەوە گەیشتنە کەرکووک و لە کەرکووکەوە تا بەعقووبە، هەموو ڕێگاکە بیابانێکی قاقڕ بوو بە هەورێک لە تۆز و خۆڵەوە. پاشانیش لە ڕێی ئەعزەمییەوە گەیشتنە بەغا.

لەم سەردەمەدا، شاری بەغا هێشتاش شێوازی مێعماریی نەریتیی خۆی پاراستبوو. باڵەخانەکان و ڤێلا مۆدێرنەکان، بە ماوەیەکی زۆر پاش ئەوە سەریان هەڵدا. ماڵەکان پێکەوە لکابوون و بەرهەیوانی بچووکیان هەبوو کە بە چەشنێک پاراوانی دار یان ئاسنین کە بەکارهێنانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە کۆنەکان، ڕازێندرابوونەوە.

ئەم بەرهەیوانە کون کونانە، دیمەنێکی تایبەتی بە ماڵەکان دەبەخشی. لە ناوەندی شاردا، کۆڵانی فەراخ سەعدوون هەبوو و لە نزیکەی ئەویشەوە، کۆڵانێکی تەسک و درێژ و پڕ لە دووکان هەبوو بە نێوی شارع ڕەشید و بازاڕێکی زۆر کۆنیشی لێ بوو کە سەدام حسێن چەند ساڵێک پاش بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات، ئەو بازاڕەی وێران کرد و پەیکەرەی خۆی لەو شوێنە دانا.

لە بەغا، وەکوو تاران، سەربانی ماڵەکان پان و تەخت بوون و ئێواران خەڵک لەسەربان دادەنیشتن. شەوان، پاش ڕۆژێکی زۆر گەرم، نووستن لەو بەرهەیوانانە و هەڵمژینی هەوای فێنکی بیابان و بینینی ئەستێرەکان، چێژێکی تایبەتی هەبوو. شەوانە، ئەستێرەکان گەورە و بەردەست دەهاتنە بەرچاو.

جیپەکە لە پێش ماڵێکی بچووک ڕایگرت. لەو ماڵە، چەند کوردێک بۆ پێشوازیکردنیان هاتنە دەرەوە کە لێنا هیچیانی نەدەناسی. پاش چوونە ژوورەوە، میوانەکان و خانەخوێکان کەوتنە گفتوگۆ و ئەوەش بووە هۆی بێ هیواییەکی گەورە بۆ لێنا. چونکە بۆی دەرکەوت کە نە پاسپۆرت و نە پارە بۆ کڕینی بلیت، هیچیان لە ئارادا نین.

بەردەنگەکانی، دڵنواییان دەکرد و دەیانگوت: «نیگەران مەبە،

ڕێگەچارەیەکی بۆ دەبینینەوە.»

سبەی ئەو ڕۆژە، لینا ماڵئاوایی لە ڕێنماکان و جیپە داشقەکە کرد. ئەو جیپەی سەرەڕای شەق وشڕ بوونەکەی، ئەوانی بە سەلامەت گەیاندبووە شـوێن. لینا دەبوو چەندین مانـگ چاوەڕێ بکات، بە بێ ئەوەی بزانێت ئەو چاوەڕوانییە کەی کۆتایی پێدێت و کەی چارەسـەری کێشەکەیان دەکرێـت. ڕاوەدوونانی دژبـەران لە عەراقیش کەمتر لـە ئێران نەبوو. لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژەکان، کێشەکانیان چەندقات دەبووەوە. ئەوان دەبوو ژنێـک بـە دوو منداڵەوە بدۆزنەوە کە ئامادە بن پاسـپۆرتەکەیان «ون بکەن»، بۆ ئەوەی لینای شـاردراوە و نائاسـایی کەڵک لەو پاسـپۆرتە وەربگرێت، دیارە ئەو کارە بۆ خودی ئەو ژنەش مەترسیدار دەبێت.

خانەخوێـکان، دۆخـی وڵاتی ژێر دەسـەڵاتی نووری سـەعید، پیاوە بەهێزەکەی عەراقیان بۆ لینا ڕوون کردەوە و باسیان لە نیشتمانپەروەرە کـوردەکان، کۆمۆنیسـتەکان و ئـەو دیموکراتانە کرد کە دەستبەسـەر ببـوون و ئەشـکەنجە کرابـوون و کوژرابوون. هەروەهـا بۆیان باس کـرد کە بـۆ پارێزگاری کردن لـەو و منداڵەکانی چ ڕێوشـوێنگەلێکیان گرتۆتەبەر. بژاردەی زۆریان لەبەردەسـتدا نەبوو. لینا ناچار بوو خۆی لەگەڵ دۆخەکە بگونجێنێت.

ئەگەر لینا بە تەنێ سەفەری بکردایە، ساناتر لەگەڵ دۆخەکە ڕووبەڕوو دەبووەوە. بەڵام ئەو دوو منداڵی پێبوو. هەربۆیەش دەبوو دڵنیا بێت کە لە ئەگەری نەخۆش کەوتنی منداڵەکاندا، سـەردانی کام دوکتور دەکات و یـان ئەگەر پێویسـتییەکی هەبوو، دەبێ ڕوو لـە کێ بکات و دواجار ئـەوەش کە ئەوان تا ئەو کاتە بۆ پاسـپۆرتەکەیان چییان پێ کراوە و.. بەردەنگەکەی کە بە پێکەنینەوە سـەری ڕادەوەشاند، نێوی تۆفیق بوو. بە پێکەنینەکەی تۆفیقدا دیار بوو کە لەو هەل ومەرجەدا هیچی لەدەست نایە.

لەڕاسـتیدا، لینا بەتەنیا و لە دۆخێکی خراپدا، خۆی لە شارێکی بێگانە و لە نێوان غەریبەکاندا دەبینییەوە. تەنانەت ئیسماعیلیشی لێ نەبوو بۆ

ئەوەی هەندێ دڵی بحەسێتەوە. ئیسماعیلیان بردبووە شوێنێکی دیکە و هۆکارەکەشیان بۆ باری ئەمنیەتی دەگەڕاندەوە.

لێنــا پەناباتێکی لە گیرفاندا نەبوو، ڕێک وەک ئەو ڕۆژەی لە تارانەوە بــەڕێ کەوتبــوون. ئەوەش لــە کاتێکدا بوو کە ئەو دەبــوو بۆ خۆی و منداڵەکانی جل و بەرگ و پێڵاو بکڕێت.. ئەوان، تەنانەت فلْچەی ددانیشیان پێ نەبوو! ئەو ڕۆژە لە بنکەی ســەرکردایەتی، هاوسەرەکەی بینیبوو و ئەو گرفتانەی بۆ باس کردبوو. هاوســەرەکەی وەڵامی دابووەوە کە لە بەغا ئەو شــتانەی بۆ ئامادە دەکەن و جگەلەوەش، زۆریش پێویســتی پێــی نابێت، چونکە ماوەیەکی زۆر لە بەغا نامێننەوە و لێناش بڕوای بە قسەکانی کردبوو.

لێنــا بە پێچەوانەی بەغا، لە تاران هەســتی بــە غەریبی نەکردبوو. لە بەغا خۆی لە دەستی کەسانێکدا بینییەوە کە بۆی نامۆ بوون. تەنانەت لە کاتی پێویست و هەر پێویستییەکدا، ناونیشانی کەسیانی نەبوو. عەرەبی نەدەزانی و بە شــێوەیەکی تایبەت هەســتی دەکرد لەوێ تووشی کێشە و ئاســتەنگ دەبێتەوە. نە ڕێی گەڕانەوەی مابوو و نە وەک ئەوەش کە چاوەڕوانــی دەکرد دەرەتانی گەڕانەوە بۆ ئوورووپا بۆی ڕەخســا بوو. هەربۆیەش، لەگەڵ باوەڕبەخۆبوون، دەبوو پشــت بە خۆی ببەســتێت، بێدەنــگ و هێمــن بێــت، واز لە بۆڵەبــۆڵ و گازندە بهێنێــت و هاوکات، لەوەی پێویســت بــوو بیزانێت، ئاگادار بێت، تەنانــەت ئەگەر بەتەنیا بۆ ئارامیی و ئاسوودەیی منداڵەکانیشی بووبێت.

لێنــا تەنیا کاتێک کەیفخۆش و بەختەوەر بوو کە منداڵەکانی ســەرە جوان و نازدارەکانیان دەکردە ســەر ڕانی و ئەوەش، لە ڕاستیدا گیانی بەبەر لێنادا دەکردەوە.

منداڵــەکان تەنیا ســامانی ئەو بــوون لە دنیادا و ئــەو دەبوو لە هەر مەترســییەک بیانپارێزێــت. هەربۆیەش، لە ماوەی ئەو هەشــت مانگەی لــە بەغــا مانەوە، ناچــار بوو ماڵەوماڵ بــکات و هەرجارەیــش، لەگەڵ منداڵەکانی ئانوســاتگەلێکی تەژی لە ســۆز و هەست و هەندێجاریش

پڕ مەترسی تێپەڕێنن.

■ مانەوە لە بەغا، لەماڵی حەمەسوور

حەمە لەو دەستە مرۆڤانە بوو کە هەموو مووی جەستە و تەنانەت برژانگ و برۆشیان سپییە، قژی سوورێکی مەیلەو زەردێکی ئاڵتوونی بوو، باڵای نێونجی و جەستەیەکی ڕێکی هەبوو. حەمە پیاوێکی نیشتمانپەروەر و مێهرەبان بوو و لە British Council، لە بەغا کاری دەکرد. محەممەد و براکەی ئاواڵزاوابوون و لەگەڵ دایک و بابی خۆیان و هەروەها دایک و بابی خێزانەکانیان، هەموو پێکەوە لە ماڵێکدا دەژیان. ژنەکانی هەردوو براکە، زگیان هەشت مانگ بوو. لە ڕاستیدا، هەریەکەیان، حەوت منداڵیان هەبوو و زگیان بە هەشتەمین منداڵ پڕ بوو. بە گەیشتنی لێنا و منداڵەکانی، حەشیمەتی ئەو بنەماڵەیە گەیشتە ٢٥ کەس. لە ماوەی ژیان و مانەوەیان لەو ماڵە، لێنا و منداڵەکانی لە چوون بۆ نهۆمەکانی سەرەوەی ئەو بینایە مەنع کرابوون. لێنا و منداڵەکانی لە ژوورێکی بچووک لە نهۆمی یەکەم دەژیان کە پەنجەرەیەک بەڕووی دەکرایەوە و چێشتخانەکەش، لەوپەڕی حەوشەکە هەڵکەوتبوو.

ژنەکانی ئەو ماڵە بەیانی زوو بە مەبەستی ئامادە کردنی نانی بەیانی لەخەو ڕادەبوون. پاش نانی بەیانی، پیاوەکان دەچوونە سەر کارەکانیان و ژن و منداڵیش، بۆ نیوەڕۆ، پاشماوەی چێشتی شەوی پێشوویان دەخوارد. پاشان، دەکەوتنەخۆ بۆ ئامادەکردنی شیوی ئێوارە. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە تێرکردنی زگی ئەو هەموو مرۆڤە کاتی زۆری دەویست و هەندێجاریش کە سازکردنی شیو کاتێکی زۆرتری پێویست بووایە، ژنەکان لە کاتژمێر چواری بەیانییەوە بەخەبەر دەهاتن.

ژنەکان لێنایان خۆش نەدەویست. لێنا لە کاروباری چێشتخانەدا یارمەتی دەدان. ئەوانیش چی کاری قورس و ناخۆش بووایە بەویان دەکرد، وەکوو شوشتنی قاپ وقاچاخی ناڕێک. نیشانیان دەدا کە چی بکات، بەڵام قسەیان لەگەڵ نەدەکرد، لێنا، سەرەتا لە هۆکاری ئەو

هەڵسوکەوتەیـان تێنەدەگەیـی و پاش دوو حەوتوو لـە مانەوەی لەو ماڵەدا بوو کە زانی ئەو ژنانە بۆ وا دەکەن.

چەند ڕۆژێک پاش گەیشتنیان بۆ ئەم ماڵە، مینا نەخۆش کەوت. تایەکی قورسی لێهاتبوو و هەناسەی بۆ نەدەدرا. ژنانی ئەو ماڵە، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر خەمساردییان دەنواند. کردەوەیەکی ئەوتۆ لە کوردەکان نەدەوەشایەوە. بەوحاڵەشەوە، ژنەکان چاوەڕوانی کاری چێشتخانەیان لە لێنا دەکرد. بەڵام لێنا گوێی نەدەدایە و بەدیار منداڵەکەیەوە کە وڕێنەی دەکرد مایەوە، هەوڵی دەدا بە دانانی دەستەسـڕی تەڕ و سارد لەسەر جەستەی کچەکەی، تاکەی بشکێنێت. لێنا ئۆقرەی لێ بڕابوو و چاوەڕێی گەڕانـەوەی حەمەسـووری دەکـرد. کاتێک حەمە هاتەوە، لێنا ویسـتی قسـەی لەگەڵ بـکات. ژنـەکان، هەموو پێکـەوە و بە پەلەپـەل کەوتنە قسـە و هـات وهاواریـان دەکرد و مۆڕەیـان لە لێنا دەکـرد. کاتێکیش دەرفەتێکی بۆ ڕەخسـا و دۆخەکەی بـۆ حەمە ڕوون کردەوە و داوای لێکرد کچەکەی بەرێتە لای دوکتور، حەمە وەڵامی دایەوە کە پێویسـت ناکات و منداڵەکە خۆی چاک دەبێتەوە. ژنەکان کە لەپشتەسەری حەمە وەستابوون، بەدەنگی بەرز خۆشحاڵیی خۆیان لەو وەڵامە دەربڕی.

لێنـا بـۆی نەدەچووەوە سـەر یەک. منداڵەکـەی لە یاودا دەسـووتا و دەیڕاواند و لێنا، شـەوی دواتر و سـبەی ئەو شـەوەش چووە لای خانەخوێکـەی و داخوازەکـەی دووپات کردەوە. بـەڵام حەمە خۆی لە هێنانـی دوکتـور دەبوارد، لێنا بە قەڵسـی پێی گوت کـە تۆفیق ئاگادار دەکاتـەوە. ئـەو قسـەیە بێکەڵک نەبـوو، بەڵام تۆفیق پاش سـێ ڕۆژ گەیشتە لایان. مینا لە تا و یاودا دەسووتا و بێخوست کەوتبوو. دواجار تۆفیق ناونیشـانی دوکتورێکی دایە و پارەی تاکسییەکەشی پێدا. بەڵام حەقدەستی دوکتۆرەکەی پێ نەدا و گوتی: «بە دوکتورەکە بڵێ لە لایەن منەوە هاتووی».

بەسـەرنجدان بـە ئەزموونەکـەی تارانی، لێنا نیگـەران بوو. دوکتور منداڵەکەی پشکنی و گوتی: «ئەم منداڵە ستڵەجەم(زاتوجەم) بووە بۆچی

وا درەنــگ هێناوتانــە؟» لێنا وەڵامی نەدایــەوە و زبانی گۆی نەدەکرد، تەنانەت نەیوێرا بە دوکتورەکە بڵێت کە پارەی کڕینی دەرمانەکانیشــی نییە.

لێنــا بە منداڵەکەیەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. بەڵام ٢٠ کاتژمێری خایاند هەتــا تۆفیــق هاتەوە و چــوو دەرمانەکانی بۆ کڕی. لێنا لــەو ماوەیەدا ڕۆحی بەبەرەوە نەمابوو و ئازاری دەکێشا. ١٠ ڕۆژی خایاند هەتا مینا گیانێکی بەبەردا بێتەوە. کز و لاواز ببوو و ســەرلەنوێ پێویســت بوو بکەوێتەوە ســەر پێی خۆی. بەڵام لە مەرگ ڕزگار بوو. لێناش شەکەت و مانــدوو و لــە باری ڕۆحییەوە ئازارێکی زۆری کێشــابوو. لە هەموو کەس و هەموو شــتێک قەڵس و تووڕە بوو، بەڵام لەو ڕووەوە کە هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو، بێدەنگ بوو.

پــاش ماوەیــەک، حەمــە داوای لــە لێنا کــرد لەگەڵی دابنیشــێت. لێنا دانیشــت. حەمە ڕووی تێکرد و گوتــی: «تۆ دەبێ هەرچی زووترە لەم ماڵە بڕۆیت». (لێنا لە دڵی خۆیدا دەیگوت پێناچێت بەڕاستی بێت!)

لێنــا: «هەتــا نەزانم بۆ کوێ دەچم، لەم ماڵە ناڕۆم. ناکا دەتهەوێ من و ئەم منداڵانە لە کۆڵان بەڕەڵا کەیت. هەر باسیشی مەکە.»

حەمــە: « ژنەکەم پێی وایە تــۆ ژنی دووهەمی منی و ئەم منداڵانەش هی منن.»

لێرەدابــوو کە لێنا لە هــۆکاری هەڵسوکەوتی ئەو ژنانە لەگەڵ خۆی تێگەیی! دەرکی دەکردن. بەڵام بە هیچ شێوەیەک بەتەما نەبوو لەو ماڵە بڕوات و هەربۆیەش بە حەمەسووری گوت: «تۆ دەبێ هەم بە ژنەکەت بڵێیــت و هەم بۆ هاوڕێ کوردەکانمــان ئەم بابەتە ڕوون بکەیتەوە. من کاتێک لەم ماڵە دەڕۆم کە بزانم بۆ کوێ دەچم». سبەی ئەو ڕۆژە، دوو کەسی کورد هاتن بەدوای لێنادا و ئەویش بە ترس و لەرزەوە سواری ماشینەکە بوو، چونکە ئەو دوو کەسەی نەدەناسی.

■ کۆشکی وەیشوومە و نەهات

ماشـینەکە لە شـار وەدەرکەوت و لە نێوەڕاسـتی بیاباندا، لەبەردەم بینایەکی گەورەدا ڕایگرت. لینا پرسیاری کرد ئێرە کوێیە. بەڵام، وەکوو هەمیشـە وەڵامی وەرنەگرتەوە. لە ڕاستیدا، ئەو بینایە کۆشکێک بوو لە بیاباندا وسەرلەبەری نەهامەتیی لێ دەباری. جگە لەو کۆشکە، هەتا چاو هەتـەری دەکـرد، هیچی دیکە دیار نەبوو. لـە مۆتەکە دەچوو، گەرمای تاقەتپڕووکێن، لم و بیستنی نارەناری بای بیابان...

دەرکەی ئەو کۆشکە گەورەیە کرایەوە. نێو کۆشکەکە، فێنک و تاریک بـوو. دیاربوو کە ماوەیەکی زۆرە دەرکەکەی داخراوە و هەوای تازەی تێنەچـووە. بێدەنگییەکی وەها بەسـەریدا زاڵ بوو کە مرۆڤ هەسـتی بە نیگەرانی و دڵەڕاوکێ دەکرد. منداڵەکان بە دایکیانەوە نووسـابوون. دەنگـی پێیان لە کۆشـکەکەدا دەنگی دەدایـەوە و زایەڵەی پەیدا دەکرد. لە بەرانبەریاندا، حەوشـێکی چوارگۆشە دیاربوو کە کانییەکی ناقۆڵای تێـدا بـوو. گژوگیای وشـک لە نێـوان بەردەڕێژەکان ڕوابـوو و بنەی وشـکهەڵاتوو و بێفەڕ لەهەموو لایەکەوە سەری هەڵدابوو. میعماریی کۆشـکەکە شـێوازی ڕۆژهەڵاتییانـەی هەبـوو، دیارە لە سـەردەمانی ڕابردوودا، وەکوو شوێنێکی دڵگر کەڵکی لێ وەرگیراوە.

لەژێر تاقەکان و لە پشـت هەر ئەسـتوونێک درگایەک هەبوو. لە هەر لایەکەوە، هەشـت درگا هەبوو، بەوپێیە، بە گشـتی لە نهۆمی خوارەوە ٣٢ درگای لـێ بوو و بەو ڕادەیەش لە نهۆمی یەکەم. درگاکانی نهۆمی دووهـەم داخرابـوون و ئەوە هەموو ئەو شـتانە بوو کە لەو کۆشـکە مابووەوە کە سـەردەمانێک شـوێنی ژیانی شـازادەیەک بووە بە ژن و بنەماڵە و خزمەتکارەکانییەوە.

لینـا و منداڵەکانیان بردە نهۆمی یەکەم و لەوێ، دەرکەی ژوورێکیان کـردەوە. ژوورێکی بچوک بـوو و تەنیا پەنجەرەیەکی بچووکی هەبوو. لـە ژوورەکەدا دوو دۆشـەکی ڕۆژهەڵاتی، مەلافـە، دوو دەوری، دوو پەرداخ، دوو کەوچک، چەقۆیەک و گۆزەڵەیەکی ئاوی لێ بوو، چرایەکی

نەوتی بۆ چێشـت لێنان، تیانەیەکی بچووک و تەشتێک. بەڕەیەکی کۆن و پرتووکاویش لەسـەر ئەردی ژوورەکە کە لە خاکەسوورەی کوتراو بوو ڕاخرابوو.

یەکێک لە ڕێنماکان بە لینای گوت: «لە کۆتایی داڵانەکە، ئاودەسـت و ئاوی لێیە». پاشـان گوتی: «کارەبا نییە. بەڵام بەوحاڵەشـەوە، تەنانەت نابێ مۆمیش داگیرسێنن». (وەک بڵێی لینا مۆمی لەگەڵ خۆی هێنابێت). لـە ئامۆژگارییەکانـی بـەردەوام بـوو: «دەبـێ بێدەنگی ڕاگـرن و بۆ نووستنیش لە ژوورەکەدا بمێننەوە. کەس نابێ بزانێ ئێوە لێرەن».

لینا پرسـیاری کرد: «بۆ کەسـیش لێرەوە تێدەپەڕێت؟ ئەوەی بەدی دەکرێـت، کـەس لەم دەوروبەرە نییە. ئەگەر تـۆ منداڵت هەبێ، لە کوێ بینیوتە منداڵێک ٢٤ کاتژمێر بێدەنگ بێت؟»

ڕێنماکـە وەڵامی دایەوە کە بەڵێ، خەڵکانێک بێرەدا تێدەپەڕن. پیاوێک بوو کە زۆر ڕاشکاوانە قسەی دەکرد و گوتی ئەو کۆشکە هی کوردێکە و هەربۆیـەش نابێ تووشـی گێچەڵی بکەین. بەهەرحـاڵ، ڕێنماکان لە بەجێهێشتنی ئەو شوێنە بەپەلە بوون. لینا و منداڵەکانی دەبوو تا کەی لەو کۆشکەدا بمێننەوە؟ چوار حەوتوو یان چل ساڵ؟!

لە مـاوەی حەوتوویەکدا، دووجـار، پیاوێک دەهـات و خواردەمەنی بـۆ دەهێنان، ڕێک وەک ئاژەڵگەلێک کە لە قەفەسـدا ڕاگیرابن. پیاوێکی نەناسـراو، لـە پلیکانـەکان سـەردەکەوت، خواردەمەنییەکانی لەسـەر زەوییەکـە دادەنـا، قاپـە شـوردراوەکانی کـۆ دەکردەوە و بـە گوتنی «عەلەیکەسـەلام»ێک بەجێـی دەهێشـتن و دەڕۆشـت. وەڵامـی هیـچ پرسیارێکی لینای نەدەدایەوە و تەنانەت بزەیەکیشی بەڕووی منداڵەکاندا نەدەهاتـێ و بە کورتی: ئەو ئەمـری ئاغاکەی جێبەجێ دەکرد و زمانی نەدەگەڕا.

■ منداڵە بچووکەکان لە قەفەسدا

منداڵـــەکان بـــە قەتیـس بوونی خۆیانـــەوە ئازاریان دەکێشـــا. وەکوو هەمـــوو منداڵەکانی دیکە، ئەوانیش پێویســـتیان بە ڕاکردن، یاری کردن و تەنانـــەت هاتوهاوار بوو، بەو ڕادەیەش پێویســـتیان بە خواردەمەنی بوو بۆ ئەوەی گەشە بکەن. چیدیکە ئەو خواردەمەنییەی بۆیان دەهێنان پێیـــان نەدەخـــورا. بە پێداگـــری و پاڕانەوەوە لێنا توانـــی ڕازییان بکات هەندێ بیسکویتیان بۆ بێنن بۆ ئەوەی منداڵەکانی پێ تێر بکات. ڕۆژانە، لێنا منداڵەکانی ناچار دەکرد بەڕێدا بڕۆن. خۆیشـــی لەگەڵیان هەنگاوی هەڵدەگـــرت و بۆ ئەوەی پێـــش بە ڕاکردنیان بگرێت و نەهێڵێت زایەڵەی دەنگی پێیان لە کۆشکەکەدا دەنگ بداتەوە، دەستی دەگرتن.

بـــەم شـــێوەیە، هەتا بەتەواوی شـــەکەت دەبوون، لێنـــا منداڵەکانی لە نهۆمـــی یەکەم و خـــوارەوە دەگێڕا. دواتر تەشـــتەکەی پڕ دەکرد لە ئاو بـــۆ ئەوەی منداڵەکان یاری تێدا بکـــەن، بەڵام هاوکات زاری دەگرتن بۆ ئـــەوەی پێش بە زریق و هۆڕیان بگرێت. ئەو لەو ڕێگەوە، لە ڕاســـتیدا، ژیانی ڕزگار دەکردن و هاوکات لە شادییەکانی ژیان بێبەشی دەکردن. لەگـــەڵ ئاوابوونـــی خـــۆر دەنووســـتن. بەڵام لێنـــا خەوی لـــێ دەزڕا و منداڵەکانیش زۆربەی شـــەوەکان خەوی ناخۆشیان دەبینی. لەو کۆشکە کەم هەوایەدا، هەر دەنگێک، وەکوو سنجی چینی زایەڵەی لە کۆشکەکەدا بڵاو دەبووەوە و دەبووە هۆی دڵەڕاوکێ.

یەکـــەم شـــەو، لێنـــا هەوڵـــی دا پەنجـــەرەی ژوورەکـــە بکاتـــەوە بـــۆ ئـــەوەی هـــەوای ژوورەکە تازە بێتـــەوە، بەڵام پەنجەرەکـــە قفڵ کرابوو و نەدەکرایـــەوە. هەربۆیـــەش دەرکەکەی بە کراوەیی هێشـــتەوە. بەڵام کردنـــەوەی دەرکەکـــەش کێشـــەکەی چارەســـەر نەدەکـــرد. شـــنەبا بە هاژەهـــاژ بە نێو لقوپۆپی درەختە کورتەباڵا لە گەشـــە کەوتووەکان و هەروەها بە کون و کەلەبەری دیوار و دارەڕا کۆن و ڕزاوەکاندا دەگەڕا و لوولـــی دەخـــوارد و گەلێک خەیـــاڵ و فانتازیای دەخولقانـــد. لێنا پێی وابوو کەســـێک بە ئاســـپایی دەرکەی کۆشکەکە دەکاتەوە، بە پێی پەتی

و لەسەر پەنجە دەڕوات، یان سیخەی هەناسەی کەسێک، یان ئاژەڵێکی گۆشــتخۆر و یان خوشــینی مارێک دەبیســێت. تەنانەت بیری لە هاتنی دز و پیاوکوژەکانیش دەکردەوە. ئەو شــەوانێکی پڕ لە جندۆکە و شتی وای بە خەیاڵدا دەهات و هەربۆیەش، هەراسان لە جێی خۆی هەڵدەستا و ســەیری ژوورەکان، حــەوش و پلیکانەکانی دەکــرد و دواتر درگای ژوورەکەی دادەخســت. هێنــدەی پێنەدەچوو گەرما بڕســتی دەبڕی و عارەقەی پێدەردەدا و هەربۆیەش، ســەرلەنوێ دەرکەکەی دەکردەوە. هێشتا چاوی نەچووبووە خەو، هەڵدەستایەوە و دادەنیشت.

ئەگەر یەکێک لە منداڵەکان، لەسەر نوێنەکەی تلی بدایە و لە لێنا دوور بکەوتایەتەوە، لێنا بەهۆی خەیاڵاتی خۆیەوە دەشــڵەژا و لەو تاریکییەدا بەدوایــدا دەگەڕا. ئەو پیــاوەی خواردەمەنی بۆ دەهێنان، لەگەڵ داهاتنی تاریکیی شــەو دەهات. سەرەتا، لێنا بەو هیوایەی لەگەڵ خۆی دەیانبات بۆ شــوێنێک کە خڵکی دیکەشــی لێ بێت، بە پیرییەوە دەچوو. دواتر کە دواهیواشــی بەو پیاوە بڕا، لەگەڵ نزیک بوونەوە لە ئان وســاتی هاتنی ئەو پیاوە، منداڵەکانی دەبردە ژوورەکە و دەرکەی لەسەر دادەخستن و خۆیشــی لەسەر پلیکانەکان، بە تاکە چەکی بەردەستی، واتە چەقۆکەی، چاوەڕێــی غەنیمــی دەکرد بۆ ئەوەی ئەگەر پێویســتی کــرد، بیکوژێت. پیاوەکە دەهات و خواردەمەنییەکەی بۆ دەهێنان، ســەلام و عەلەیکێکی دەکرد، خواردەمەنییەکەی دادەنا و بە گوتنی عەلەیکەســەلامێک، بەجێی دەهێشتن و دەڕۆشت و ئەوەش ببووە نەریتێک بۆیان.

بەهــەر نرخێــک بووبێت، لێنــا دەبوو بەرگــە بگرێت. لــە دڵی خۆیدا دەیگوت: «بەرگە نەگرتن، بە مانای خەیانەت کردنە».

■ بەغا و تاران

لەوکاتەدا کە لێنا بە مانگان لە بەغا چاوەڕوانی وەرگرتنی پاسپۆرتی ســاختە بــۆ ســەفەری ئۆرووپا بوو، شــاری بەغــا چۆن بــوو و ئەو بەغــای چــۆن بینی؟ لێنــا هیچکام لــە جوانییەکانی شــاری بەغا، کە بە

شـــاری هارونولڕەشـــید، شـــەهرزاد و ســـەندبادی دەریاپێـــو ناوبانگی دەرکردبوو، نابینێت. چەنکە ئەو لەو شارەدا نەدەژیا، بەڵکوو خۆی تێدا شـــاردبووەوە. لە ڕاستیدا، ئەوەی لەو شـــارە بەچاوی خۆی بینیبووی، بریتی بوو لەو دیمەنانەی لە شووشـــەی ئـــەو ئۆتۆمبیلانەوە بینیبووی کە لە حەشـــارگەیەکەوە بەرەو حەشـــارگەیەکی دیکـــە دەیانگوێزایەوە. هەربۆیەش، هیچی سەبارەت بە چۆنیەتی و شێوازی ژیانی خەڵکی ئەو شارە نەدەزانی.

لەوکاتـــەدا، ئەو لە گەڵ منداڵەکانی بەتەنێ مابووەوە و چارەنووســـی کەوتبووە دەســـت کەســـانێک کە نەیدەناســـین و مافی بڕیاردان لەسەر چارەنووســـی، بەدەســـتی خۆی نەبوو. لێنا بیری لە تـــاران دەکردەوە، لەوێ هەرگیز ئاوا هەســـتی بە تەنیایی نەکردبوو. بەرانبەر بەو شارەی کە تێیدا، هەژاری و ســـامانداری بەتەنشت یەکەوە بوون و دیکتاتۆریی شـــا ناچاری کردبـــوو بەجێی بهێڵێت، هەســـتێکی نۆســـتالژیکی هەبوو. لێنا هەســـتی دەکرد کە ژیان لە تاران شـــتێکی دیکە بوو. بەلای لێناوە، بەغا، شـــارێکی بێڕواڵەت بوو، شارێکی نەهات و تەژی لە دیاردەگەلی سیحراویی وەیشوومە.

بـــە ژیـــان لەو «کۆشـــکە نەهاتەدا»، لێنـــا زمانی دەگیـــرا و تور ببوو و ماوەیەکـــی دوور و درێژ ئەو کەمایەســـییەی لەگـــەڵ مایەوە. قەتیس مانی درێژخایەن لەو کۆشـــکەدا، هەتاهەتایی دەهاتە پێش چاوی. کاتێک ئەو کۆشـــکەی بەجێهێشـــت و لە ئۆتۆمبیلێک بە شووشەی داکشاوەوە دانیشـــتبوو، وەک ئەوە وابوو لە هەســـارەیەکی دیکـــەوە هاتبێت. پڕ بە ناخی هەوای فێنکی شەوی هەڵدەمژی و هەستی بە کەیفخۆشی دەکرد. سەرەڕای ئەوەی لەهەرچەشنە ئازادییەک بێبەش بوو، هەستی بە ئازادی دەکرد. لێنا و منداڵەکانی، دواجار، کۆشکی ئەو شازادە کۆچکردووەیان بەجێدەهێشـــت کە بۆیان ببووە زیندانێکـــی جندۆکەلێدراو. منداڵەکانیش هەســـتیان بەوە کردبوو. دەیانتوانی بەدڵی خۆیان جموجوڵ بکەن و بە دەنگی بەرز قسە بکەن. حەپەساو و سەرسوڕماو سەیری شەپۆلەکانی

ئاوی دیجلەیان دەکرد، ســەیری بریقوباقی پاپۆڕە گەشــتیارییەکان و ڕەنگدانــەوەی لە ئاوی ڕووبارەکەیان دەکــرد. چاوەکانی مینا تریفەیان لێ دەباری، داوێنی لینای ڕادەکێشــا و بە هێمنی و سەرســووڕمانەوە، پەنجــەی بــۆ پاپــۆڕە ڕەنگاوڕەنگەکان ڕادەکێشــا و دەیگــوت: «دایکە ســەیرکە، ســەیرکە!» هیواش بــە چاولێکەری لە خوشــکە گەورەکەی، دەستە بچکۆلەکانی بۆ هەمان ئاراستە ڕادەکێشا.. لینا چێژی لە شادمانی کچەکانی وەردەگرت. کیژۆڵەگەلێک کە ماوەیەکی زۆر بوو بێدەنگییەکی نائاسایی بەسەریاندا سەپابوو.

بینینی کۆڵانەکانی بەغا ببوە هۆی بووژانەوەی هەموو ئەو هەستگەلە لە لینادا. گوێی لە قســە و باســی خەڵک ڕادەگرت، بۆنەکانی هەڵدەمژی و دەنگەکانی دەبیســت. هەموو ئەمانە بۆی نامۆ بوون. ئەو بە شارێکی بەرین و بێ ڕۆحدا تێدەپەڕی. لە کۆڵانەکاندا، ســەیری ژنەکانی دەکرد کە دەســت لە دەســتی منداڵەکانیاندا پیاســەیان دەکــرد. حەزی دەکرد یەکێــک بێت لــەوان و لەنێو ئاپۆرای حەشــیمەتەکەدا بــزر بێت. بەڵام، دەنگێک لە دەروونــەوە ڕایدەگرت و وەبیری دەهێنایەوە کە: «خۆڕاگر بــە، ڕەنگــە خەســارگەلێکی گەورەتــری ڕۆحیــت بەرکەوێــت کە بۆت قەرەبوو نەبێتەوە.»

ڕاســتییەکەی ئەوەیە کــە بەغا، بووە هۆی ســڕینەوەی جوانییەکانی ڕۆژهەڵات لە زەینی لینادا.

■ قورعان و ژن

لە باری منداڵەوە، لینا دوو کچی ببوو. لەم وڵاتانەدا، بەلای پیاوانەوە، قــەدر و ڕێــزی ئەو ژنانەی کچیــان دەبێ بارتەقای ئــەو ژنانە نییە کە کوڕیــان دەبــێ. لینا لە هەر شــوێنێک بــۆی بلوایە، ئــەو بابەتەی باس دەکرد و زۆربەی جارەکانیش لەوبارەوە لەگەڵ پیاوەکان قسەی دەکرد. چونکە ئەو ڕێژە کەمەش لە ژنان کە ئەو لە ژیانی نهێنی خۆیدا لەگەڵیان ڕووبەڕوو دەبوو، ژنانێک بوون کە دیلی چێشتخانەکان بوون و ئەرکی

ڕاگرتنــی منداڵیــان لە ئەســتۆ بوو. شــەوانیش کە لــە کار دەبوونەوە، ئەوەندە ماندوو بوون کە لینا دڵی نەدەهات بەو پرســیارانە زامەکانیان بکولێنێتــەوە. جگە لەوەش، پێدەچوو ئەو پرســیارانە بــۆ ئەوان بێمانا و نەگونجاویــش بوایــە. زۆربــەی ئــەو پیاوانەی کە لینا ســەبارەت بە دۆخی ژنان لە کۆمەڵگەی وڵاتەکەیان قسەی لەگەڵ دەکردن، کەسانێک بوون کە پەیوەســت بە بزووتنەوەی ئۆپۆزیســیۆنی وڵاتەکەیان بوون، بزووتنەوەگەلێک کە لە سیاسەتی خۆیاندا لەسەر بەرابەریی ژن و پیاو پێداگرییان دەکرد. ئەم پیاوانە بە گەرمی و ئۆگرییەوە باسی ئەو ژنانەیان دەکرد کە لە خەباتدا بەشــدار بوون و ســەبارەت بە ژنەکان، خۆیان بە ئازادیخواز (پێویســتە دان بەوەدا بنێین کە بە تایبەت سەبارەت بە لینا) نیشان دەدا. بەڵام کاتێک هاوسەرەکانیان، خوشکەکانیان، کچەکانیان و ژنانی دیکەی بنەماڵەکەی خۆیان بیانویســتایە لە ڕێپێوانێکدا بەشــداری بکــەن و یــان پەیوەســت بە خەباتی سیاســی بــن، پیاوەکانــی بنەماڵە بەرهەڵســتیان دەبوونــەوە. دیارە ئەوەش تەنیا لــەو ڕووەوە نەبوو کە دەترســان ژیانی ئەو ژنانە بکەوێتە مەترســییەوە، بەڵکــوو هۆکارێکی دیکەشــی ئەوە بوو کە پیاوەکان بەگشــتی بڕوایان بــەوە بوو کە ئەوە شوێنی ژنان نییە.

ســەرەڕای ئــەوەش، ئــەو بابەتــە هەرگیز ڕێگــر نەبوو لــەوەی کە بزووتنەوەکان، لە کاتی پێویســتدا، کەڵک لە ژنــان وەرنەگرن، تەنانەت ئەگەر تەنیا لەبەر ئەوەش بووبێت کە ژنان بە چارشــێو و جلوبەرگی ژنانەوە دەیانتوانی لە شوێنی وا تێپەڕن کە پیاوەکان نەیاندەتوانی. لینا جیاوازیــی هەڵسوکەوتی پیاوەکان لەگەڵ ئــەو ژنانەی کوڕیان دەبوو (هەڵسوکەوتی هاوســەرەکانیان لەگەڵ ژنەکانیان بەڕێز و سەرەنجەوە بــوو) و ئــەو ژنانەی کــە کچیــان دەبــوو (هاوســەرەکانیان بەرانبەر بــە ئــەم ژنانــە کەمتەرخەم و خەمســارد بون)ی بە چــاوی پیاوەکاندا دەدایــەوە. دیارە حاڵەتــی دەگمەنیش هەبوو. ئەمە لــە خۆیدا، هۆکاری پشتڕاســتکردنەوەی ئەم پێوەرە گشتی و باوە بوو. بە بۆچوونی لینا،

لەوکاتــەدا، عەبدولڕەحمــان لــەو بــارەوە یەکێک لە مرۆڤــە دەگمەن و هەڵکەوتەکان بوو، بەڵام، بۆ ڕێز گرتن لە پیاوەکانی دیکە، داوای لە لێنا دەکــرد کــە وەکوو ژنێکی گوێڕایەڵ و خاکەڕا، واتە ژنێکی موســوڵمان هەڵسوکەوت بکات، بەڵام ئەو پیاوانەی کە لێنا دەیناســین، هەموویان، ئەو بۆچوونە دۆگمانەیان ڕەت دەکردەوە کە لە ئایەتە جۆراوجۆرەکانی قورعانــدا ســەبارەت بە پێگەی خوارەوەی ژنان بە نیســبەت پیاوانەوە هاتبوو. لێنا کاتێک ســەری ئەو باســەی لەگەڵ دەکردنەوە، چاوەڕوان بوو کە ئەوان ڕاشــکاوانە دژایەتی خۆیــان لەگەڵ ئەم ڕوانگە قورعانیە ســەبارەت بە ژن دەرببــڕن. بەڵام، ئەوان هەمیشــە وەڵامیان دەدایەوە کــە کۆمەڵگــەی ئــەوان، کۆمەڵگەیەکــی زۆر دواکەوتووە و هێشــتا لە کۆمەڵگەیەکــی ئەوتــۆدا ناکرێت چاوەڕوانــی بەرابەری نێــوان پیاو و ژنت هەبێ. پێدەچوو ئەوان ڕاســت بکەن. بەڵام، ئەم بابەتە ڕێگر نەبوو لــەوەی لێنا سەرزەنشــتیان نەکات و پرســیاریان لێ نــەکات کە بۆچی یەکــەم هەنــگاوەکان لــە بنەماڵەکانی خۆیانــەوە هەڵناگــرن و دەیگوت کــە ئاڵوگۆڕە گەورەکان هەمیشــە لــە کردەوە بچووکەکانەوە دەســت پێدەکــەن. ڕاســتییەکەی ئەوە بوو کــە ئەوان لــە دەرئەنجامی چەندین ســەدە کاریگــەری وەرگرتن لــە قورعــان و کارکردی ڕۆژانــە لەگەڵ نەریتە دینییەکان، شکڵیان گرتبوو، نە دەیانتوانی و نە بۆیان دەکرا لەو قاڵب و شــکڵە خۆیان دەرباز کەن، قاڵبێک کە ئەوانی بەسەر ژناندا زاڵ دەکرد و بەهێزی دەکردن و هەربۆیەش، پیاوەتی و هەستی باڵادەستیی ئــەوان بەردەوام دەبوو، ســەرەڕای ئــەوەش، لە دەیــەی ١٩٥٠دا، ئەم قاڵبــەش درزی هەڵگــرت و بە ئاڵوگۆڕ لە ئاســتی جیهانــدا و لە وڵاتی شــوێنی نیشــتەجێ بوونی لێنا، ڕێژەیەکی زۆر لە ئایەتەکان، بەتایبەتی ئایەتەکانــی تایبەت بە هاوســەرگیری، فرەژنی، میــرات، تەڵاق و مافی سەرپەرشــتیی کردنی یاســایی ژنان لە منداڵەکانیان، ئیتر ســوا بوو و بە مێژوو ســپێردرابوون. شارنشــینی، تا ڕادەیەک ئاڵوگۆڕی بەســەر کۆمەڵگــەدا هێنابوو. بەڵام بردنە ژێر پرســیاری ئەم بابەتە، پێویســتی

بــە قوربانــی دان و شــەهید دان بوو کە ئــەوەش کاریکی ســانا نییە، چونکە، باس، باســی لەدەست دانی دەســەڵاتی پیاوانە بەسەر ژناندایە. بیرۆکەی باڵادەســتیی پیاو، ئیستاشی لەگەڵدا بێ، بەسەر ڕای گشتییدا زاڵە و ســەرجەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە.

لەم بوارەدا، قورعان بە تەواویی ڕاشــکاوە و بچووکترین دژایەتی و تەنانەت ڕەخنە لەوبارەوە، ژانەسەر و گرفتی زۆری بەدواوە دەبێ.

لە سوورەی نیسا، بەشی ٤، ئایەتی ٣٨دا، باڵادەستی پیاو بەسەر ژندا پشتڕاست کراوەتەوە و مافی ئەوە بە پیاو دەدات کە لە ئەگەری ملکەچ نەبوون یان یاخی بوونی ژندا، تەمبێی بکات و تەنانەت لێیشی بدات.

لە ئایەتی ٢٢٣، ســورەی بەقەرە، بە پیاو گوتراوە کە ژنەکەی بۆ ئەو وەکــوو مەزرایەکــە کە بۆ کێڵان دەبــێ و ئەو لە هەر شــوێنێکەوە کە بەکەیفی بێت، دەتوانێت بیکێڵێت.

لە هەمان سوورەی بەقەرە، ئایەی ٢٨٢دا، سەبارەت بە شاهێدی دان لە دادگا، گوتراوە کە لە ئەگەری نەبوونی شاهێدێکی پیاودا، لەبری ئەو دوو شاهێدی ژن دەتوانن شاهێدی بدەن. چونکە ژنان کەمتر لە پیاوان متمانەیان پێدەکرێت.

وەک بڵێــی، ژن هەرگیز ناگاتە تەمەنی خۆناســین، هەربۆیە، تەنانەت کاتێــک بێوەژن دەکەوێت، دەرەقەت سەرپەرەشــتیی کردنی منداڵەکانی خــۆی نایــەت. ژن، ئەگەر باوکی منداڵەکان ئیزنی بــدات، تەنیا دەتوانێ ئــاگای لە منداڵەکانــی بێت. جگەلەوەش، پیــاو دەتوانێت یەکلایەنە و بە کەیفی خۆی، ژنەکەی تەڵاق بدات (هەندێجار، تەنیا شــاهێدیی پیاوێک بۆ پاســاو هێنانەوەی کردەوەیەکی ئەوتۆ پێویســتە، بەڵام ئەم کارەش هەمیشــە پێویســت نییە) بــەڵام ژن مافێکی ئــاوای نییــە. ئەگەر ژنێک داوای تەڵاق بکات، ســەلماندنی هــۆکاری داخوازەکەی، ئەوەندە قورس و دژوارە کــە زۆرجــار، لــە کۆکردنەوەی هەموو ئەو هــۆ و هۆکارانە دەمێنێتەوە، ئەو تەنیا کاتێک دەتوانێت ئازادیی خۆی بەدەســت بهێنێت،

کـە ئەو شـیربابییەی هاوسـەرەکەی لە کاتی هاوسـەرگیرییەکەدا بۆی داناوە، بۆ هاوسەرەکەی بگێڕێتەوە، و خۆی «بکڕێتەوە».

بـە پێـی ئایەتێکی دیکە، لـەو ڕووەوە کە ژن لە بـاری ئەخلاقییەوە، لاوازە، باشـتر وایە هەمیشە لەژێر سەرپەرەشتیی یەکێک لە پیاوەکانی بنەماڵە (باوک، برا،...)دا بێت و بۆ ژنێکی بەڕێز، شایستە نییە کە تەنانەت بـە بوونی منداڵەکانیشـی بەتەنـێ بێت. دواجار بـە پێچەوانەی پیاوان، ژنێکـی موسـوڵمان ناتوانێـت لەگـەڵ پیاوێکی ناموسـوڵمان زەماوەند بـکات. کۆمەڵگە، کۆمەڵگەیەکی باوک سـالارە و زەماوەنـدەکان، لەناو خۆیاندایـە. هەربۆیـەش، ئەو منداڵانـەی کە لە ژنان لەدایـک دەبن، بە شـێوەی ئۆتۆماتیک سـەر بە خێڵی باوکەکەیانن و دەبێ دینی باوکیان هەڵگرنەوە.

■ هەڵسوکەوتی هاوشانی پیاوان لەگەڵ لینا

لەم ناوچانە، میواندۆستی، خۆی شێوازێکە لە ژیان. خەڵک حەزیان لە میوانداری و هەروەها میوان بوونە. ئەم بابەتە، وەکوو سـەرنجدان بە خەڵکی دیکە و برسی ڕانەگرتنی موسافیرەکان، نەریتێکی شایستەیە.

لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە لینا لە ڕۆژهەڵات دەژیا، زۆرجار بانگێشتی نانـی نیوەڕۆ و ئێوارە دەکرا. کاتێک دەچـووە ماڵی خانەخوێ، هەموو شتێک ئامادە کرابوو. دیارە لەم کاتانەدا، بە دەگمەن هەڵدەکەوت کە ئەو تاکـە میوانی ئەو بنەماڵە بێت. پیاوی ماڵەکە، لەگەڵ میوانە پیاوەکان لە ژووری میوان دادەنیشـتن و چاوەڕێیان دەکرد کە ژنەکان، خواردنەوە و شەوچەرەیان بۆ بێنن. پیاوەکان لە ژووری میوان دەکەوتنە گفتوگۆ و باس و ژنەکانیش لە چێشتخانە سەرقاڵی چێشت لێنان دەبوون. پاشان، کاتـی خواردنی نانی نیوەڕۆ یان شـەو، ژنەکان چێشـتەکانیان دەهێنا و لەسـەر سـفرە یان مێز دایان دەنا و پیاوەکانیـش دەیانخوارد. پاش نـان خواردن، ژنـەکان دەهاتنە ژووری میوان و لەگـەڵ کۆکردنەوەی قاپەکان، خواردەمەنییەکانی دیکەیان دەهێنا. ژنەکان، لەگەڵ منداڵەکان لە

چێشتخانە نانیان دەخوارد. هەندێجار، منداڵەکان دەیانتوانی بە مەرجی گوێڕایەڵی و بێدەنگ بوون، لە تەنشت باوک یان برا گەورەیانەوە لەگەڵ میوانە پیاوەکان دانیشن.

لەم کاتانەدا، لێنا لەگەڵ پیاوەکان نانی دەخوارد. خودی لێناش دەیزانی بوونی ئەو لە ژووری پیاوان دەگمەن و نائاسـاییە و دەشـیزانی بۆچی وا لەگەڵ ئەو دەجووڵێنەوە. لە ڕاسـتیدا، خانەخوێکان دەیانویسـت بەو شێوەیە نیشانی بدەن کە لەگەڵ داب و نەریتی ئورووپاییەکان ئاشنان و باوەڕیان بە بەرابەریی ژن و پیاو هەیە. بەڵام، ئاگایان لەو دووڕوویی و دووفاقییە نەبوو کە لە کردەوەدا بەرانبەر بە ژنەکانی خۆیان دەیاننواند و نەشیاندەزانی کە بەوکارە (وەکوو مۆدێڕنەکان هەڵسوکەوت کردن) بە بێ ئەوەی بیانەوێت و ئاگایان لێ بێت، سووکایەتییان بە لێنا دەکرد.

هەڵبـەت، لە میوانداریی ئەوتۆدا، لە یەکەمین دەرفەتدا کە ئەدەب ڕێی پـێدەدا، لێنـا داوای لێبووردنی لـە پیاوەکان دەکـرد و دەچوو بۆلای ژنەکان لە چێشتخانە و ئەوەندەی بۆی دەڕەخسا، لە چێشتخانە، لەگەڵ ئـەوان نانـی دەخوارد. مەبەسـتی ئەو لـەو کارە ئەوە بـوو کە وێڕای هاوقسەبوون لەگەڵ ژنەکان و تێکەڵ بوون لەگەڵیان، لەو دۆخە قورس و ناتەبایەدا کە داب و نەریت بەسەریدا سەپاندبوون، بەشدار بێت.

■ ماڵۆچکەکەی نەژاد لە بەغا

ڕۆژێکیـان، لێنـا و منداڵەکانیان بردە بـەردەم ماڵێکی بچووک. لەوێ نەژاد و «سلێمان»ی برازای بە پیرییانەوە هاتن. لێنا، نەژادی لە پراگەوە دەناسـی. نەژاد، لەوکاتەدا، خوێندکارێکی گەنج، شاد، چالاک، زیرەک و خۆشـحاڵ لە سـەرکەوتنەکانی خۆی لای ژنان بوو. باڵای مامناوەندی بوو و لاواز دەینواند. نیشـتمانپەروەری و گاڵتە کردنی لە باوکیەوە بۆ بەمیرات مابووەوە.

مانـەوە لـە ماڵـی نـەژاد، هیوابەخش بـوو، چونکە نەژادیـش ژیانی هاوبەشـی پێـک هێنابـوو و دوو منداڵی هەبـوو، لێنا سـاجیدەی ژنی

نەژادی خۆش دەویســت. جگەلەوەش، منداڵەکانیــان بۆ منداڵەکانی لێنا دەبوونە هاوگەمە و یاری.

بــەڵام ســاجیدە لە ماڵ نەبوو، لێنــا هەواڵی پرســی و لەوکاتەدا بوو کــە تێگەیی نەژاد ســاجیدە و منداڵەکانی ناردۆتــەوە بۆ ماڵی باوکی لە باکوور. ڕێبەرایەتیی حیزب، ماڵی نەژادی بۆ مانەوەی لێنا و منداڵەکانی لەبەرچــاو گرتبــوو و نەژادیــش دەبــوو ڕۆڵی مێــردی لێنــا و باوکی منداڵــەکان بگێڕێت. لێنا جارێکی دیکــەش خۆی لە بەرانبەر پرۆژەیەکی لەپێشــەوە داڕێــژراودا بینییەوە، کردەوەیەک کە بە هیچ شــێوەیەک بە لایەوە پەســەند نەبوو، بە تایبەت کە بە هۆی ئەوەوە، نەژاد لە ژنەکەی دوور کەوتبووەوە و منداڵەکانیش لە باوکیان دابڕابوون.

نــەژاد لــە کارخانەیەکــی ڕســتنی کەنــەف کاری دەکــرد و کاتژمێر ٨ی بەیانــی پاســێک دەهات بەدوایــدا. لێنا کاتژمێــر ٦ی بەیانی لەخەو هەڵدەســتا و نانی بەیانی ئامادە دەکرد. پاش ماوەیەک، نەژاد خەبەری دەبــووەوە، پیژامەی لە پێ دەکــرد و جگەرەیەکی دەنا بە لێویەوە و بە پاســکیل دەچوو بۆ بازاڕ. بەیانیــان، بازاڕ قەرەباڵغتر بوو لە ئێواران و پڕ دەبوو لە پیاوی پیژامە لە پێ، خەواڵوو، زەمیلە بەدەست و سەروقژ ئاڵۆزکاو.

«هاوســەر»ی لێنا، خواردەمەنیی پێویســتی ڕۆژانــەی لەگەڵ نان و ڕۆژنامە لە بازار دەکڕی و کاتژمێر ٧ی بەیانی دەگەیشتەوە ماڵەوە.

نــەژاد کاتژمێرێــک کاتی لەبەردەســتدا دەما بۆ خۆ ئامــادە کردن و ڕۆشــتن بۆ ســەر کارەکەی. لێرەدا بــوو کە ئەوەی لێنا نــاوی لێنابوو «ســەمای فڕفڕۆکەیی» دەســتی پێدەکرد. نەژاد، سووچێکی مێزەکەی چۆڵ دەکرد و هەموو ئەو شتانەی کە بۆ خواردن، جگەرەکێشان، ڕدێن تاشین و خوێندنەوە پێویستی پێی بوو، لەو سووچەی مێزەکە دایدەنان، هاوکات کە ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، لەپەســتا شــرۆڤەی ناوەرۆکەکەی دەکرد. ســەبارەت بە کاروباری ڕۆژانە ئەوەی پێویســت بوو بە لێنای دەگوت، برازاکەی بانگ دەکرد، لە پشــت مێزەکە هەڵدەســتا و بەدوای

کارێکـدا دەڕۆشـت، سـەردانی ئاودەسـتی دەکرد، هەندێجـار قەڵس دەبـوو، پیژامەکـەی دادەکەند و کراس و شـەڵوارەکەی لـە بەردەکرد، ئـەوەی دایکەندبوو، بەملاولادا فڕێـی دەدا، کتێبێکی دەکردەوە و چەند دێڕێکی لێ دەخوێندەوە و پاشان دەستی دەکرد بە کۆنترۆڵ کردنی ئەو شتانەی کە پێویستیان بە کۆنترۆڵ کردن نەبوو.. تا گەیشتنی پاسەکەی، کە زۆربەی جارەکانیش دەبوو لەبەر دەرکە لەسـەری بوەسـتێت، بەم شـێوەیە بەردەوام دەبوو، هەندێجار چاوەڕێ کردنی پاسەکە هێندەی دەخایاند کە پاسەکە بە بێ نەژاد ملی ڕێگاکەی دەگرتەبەر و دەڕۆشت. سلێمان بڕوای بەوە هەبوو کە مامی هەرگیز ناگۆڕدرێت. ئەم پرۆسەیە دەبووە هۆی سەرگەرمی و کات ڕابواردنی لێنا و منداڵەکانی.

■ میوانانی شەو

نـەژاد کاتژمێـر ٢ی بەیانی لێنـای وەخەبەر هێنا و گوتی: «هەسـتە «چا»کـە سـازکە، میوانمان هەیە» لێنا هەسـتا، دڵخـۆش بوو لەوەی ئەوجـارەش وەکوو ژنی ماڵ، پاش دانانی چایەکە، بەجێیان دەهێڵێت و دەخەوێتەوە...بـەڵام نەژاد داوای لێکـرد لەلایان بمێنێتەوە، پێنج پیاو بە جل و بەرگی کوردییەوە دانیشـتبوون، قژەسەریان بە مێزەری کوردی داپۆشیبوو. لەم کاتەی شەودا، ڕۆڵی ژنێک کە قسە ناکات و چاو دەبڕێتە زەوی بە کیفی لێنا بوو. بەرانبەر پیاوە نەناسـراوەکان دانیشت. کات لە سـێی بەیانی نزیک دەبووەوە و لێنا لە دڵی خۆیدا، شـەڕی بە عەرز و ئاسـمان دەفرۆشـت. جووڵەیەک کە دەرئەنجامی با و یان دەسـتەکان بوو، ناچاری کرد سـەر هەڵێنێت و سـەیری پیاوەکان بکات. پیاوەکان مێزەرەکانیان هەڵگرتبوو و لەپێش خۆیان لەسـەر میزەکە دایاننابوون. هەندێکیـان قژەسـەریان زۆر هاتبووەوە و هەندێکی دیکەیان، سـەری خۆیـان لە بنـەوە تاشـیبوو، ئەوانیش سـەیری لێنایان دەکـرد و نیگا قووڵەکانیان، بۆ لێنا نامۆ بوو.

لێنـا، بـۆ ئەوەی شـڵەژاوییەکەی نەبینـن، چاوی داخسـتەوە. ئەوان

ده‌ستیان به‌ پێکه‌نین کرد و لینا ده‌نگی پێکه‌نینی یه‌کێکیانی ناسییه‌وه‌. ئه‌و پیاوه‌، به‌ جه‌سته‌یه‌کی لاواز و سه‌ری تاشراوه‌وه‌، نه‌ده‌ناسرایه‌وه‌، به‌ڵام ڕواڵه‌ته‌ گه‌شه‌که‌ی ده‌ری‌ده‌خست که‌ خودی خۆیه‌تی.

لینا، دڵگران له‌وه‌یکه‌ زووتر خۆی ده‌رنه‌خستووه‌، ڕاشکاوانه‌ چاوی بڕیه‌ نێوچاوانی. لینا که‌ له‌و کاته‌دا، کراسێکی خه‌و و ڕۆبێکی کۆن و کورتی له‌به‌ردابوو، به‌رانبه‌ر ئه‌و پیاوه‌ ڕێکپۆشانه‌ به‌ جل و به‌رگی کوردییه‌وه‌ وه‌ستابوو و کاتژمێرێک بوو ئه‌و پیاوانه‌ پێیان ڕاده‌بوارد، نه‌ک هه‌ر هیچی پێ نه‌ده‌گوترا، به‌ڵکوو چاوه‌کانیشی ده‌زوورانه‌وه‌ «هێنده‌ی نه‌مابوو له‌ پڕمه‌ی گریان بدات!». لینا تووڕه‌ و قه‌ڵس به‌جێی هێشتن و په‌نای برده‌به‌ر ژووره‌که‌ی خۆی و به‌ هێمنی ده‌ستی به‌ گریان کرد، وه‌ک بیه‌وێ به‌و فرمێسکانه‌ هه‌موو ترسه‌کان، دڵه‌ڕاوکێکان، ماندوویه‌تییه‌کان و ڕه‌نج و ئازاره‌کانی ئه‌و مانگانه‌ی دوایی له‌بیر به‌رێته‌وه‌.

ده‌رکه‌ی ژووره‌که‌ کرایه‌وه‌ و به‌ ئارامی داخرایه‌وه‌. لینا، ده‌ستبه‌جێ گریانه‌که‌ی ته‌واو کرد و ده‌م‌وچاوی پاک کرده‌وه‌، دڵخۆش بوو له‌وه‌ی ژووره‌که‌ ڕووناکاییه‌کی که‌می هه‌بوو (عه‌بدولڕه‌حمان حه‌زی نه‌ده‌کرد لینا بگری). عه‌بدولڕه‌حمان ده‌م به‌ پێکه‌نین، به‌ جه‌سته‌یه‌کی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر لاواز، به‌ڵام ته‌ندروسته‌وه‌ به‌رانبه‌ر لینا وه‌ستابوو. لینا له‌ دڵی خۆیدا ده‌یگوت که‌ بۆچی مێرده‌که‌ی ئاوا لاواز بووه‌؟ به‌ سه‌یرکردنی عه‌بدولڕه‌حمان، هه‌موو قه‌ڵسی و تووڕه‌ییه‌که‌ی لینا ڕه‌وییه‌وه‌. به‌ پێچه‌وانه‌ی عه‌بدولڕه‌حمان، لینا که‌ چه‌ندین مانگ بوو وه‌کوو دیلێک له‌ ماڵه‌وه‌ مابووه‌وه‌ و جووڵه‌یه‌کی ئه‌وتۆی نه‌کردبوو، قه‌ڵه‌و ببوو.

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران تووشی نسکۆ ببوو و ڕێژه‌یه‌کی زۆر له‌ ئه‌ندامه‌کانی گیرابوون و ڕێژه‌یه‌کیش ده‌ستبه‌سه‌ر ببوون. هه‌ربۆیه‌ش حیزب پێویستی به‌ خوێنی تازه‌ و خه‌باتکاری نوێ بوو. عه‌بدولڕه‌حمان و هاوڕێکانی، به‌ مه‌به‌ستی ڕاکێشانی شۆڕشگێڕه‌کان، سه‌رتاسه‌ری کوردستان و شاخه‌کانی ئه‌و ناوچه‌یان ژێروژوور

دەکــرد. ئەم کارە، ئەرکێکــی قورس، تاقەتپڕووکێــن و لەبڕان نەهاتوو بــوو. ڕێپێوان و نەبوونی خواردەمەنی، هێزی بەبەرەوە نەهێشــتبوون. وەرزێرەکان و هەوارنشــینە کوردەکان، ســەرەڕای ئــەوەی بۆخۆیان گیــرۆدەی کەمیی بژیو بوون، هەرچییــان هەبووایە، وەک چای، نان و پەنیــر و هەندێجاریــش بڕێــک لەوانە زیاتر، بەوپــەڕی دڵئاواییەوە بە شۆڕشگێڕەکانیان دەبەخشی. بەڵام، بە دڵنیاییەوە ئەوە بەشی نەدەکردن. ســەرەڕای ئەوەش، ژیان لە هەوای ئازاددا، ببووە هۆی باشــتر بوونی تەندروستیان.

لینا بە وردی گوێی بۆ ناوەرۆکی قسەکانی عەبدولڕەحمان ڕاگرتبوو. هــاوکات لەوەیکــە بەوزووانــە بەجێــی دەهێڵێتــەوە، تەنــگاو دەبــوو. هاوســەرەکەی هەموو کاتەکانی خۆی بۆ کوردستان تەرخان کردبوو. ئــەو دووانە، بەڵێنیی ئەوینێکی ئەبەدییان بەیەکتر دایەوە. هێشــتا خۆر نەکەوتبــوو کــە عەبدولڕەحمــان و هاوڕێکانــی ماوەیــەک بــوو لەوێ ڕۆشتبوون.

■ تۆفیقی دروسکار

ڕۆژێک تۆفیق لەو کارگەبیناسازییەی کە خۆی سەرپەرشتیی دەکرد، بە تووڕەییــەوە گەڕایەوە بۆلای لینا. لەوکاتــەدا، عەراق لەگەڵ یەکیتی ســۆڤیەتدا، پەیوەندیی بازرگانیی هەبوو و تۆفیقیش وەکوو ئەندازیاری بیناســازی، سەرپەرشــتیاریی دروســتکردنی بینایەکی لە نزیکەی بەغا لەئەســتۆ بــوو کە ئــەو مێعمارانەی نەخشــەکەیان داڕشــتبوو خەڵکی ســۆڤیەت بوون. کاروبــاری بیناســازییەکەی تازە دەســتی پێکردبوو. گەرمــای هاوین لــە بەغا تاقــەت پڕووکێنە. هەربۆیــەش، بەیانیی زوو دەســتیان بەکار دەکرد و لای نیوەڕۆ دەســتیان لەکار دەکێشــایەوە و پاش ئــەوەی هەواکە ڕووی لە فێنکی دەنایەوە ســەرلەنوێ دەســتیان پێدەکردەوە.

تێکنیسییەنەکانی سۆڤییەت پێش کاتژمێر ٦ی بەیانی دەهاتنەسەرکار

و تا نیوەڕۆ کاریان دەکرد و دواتر، کاتژمێر ١٤سەرلەنوێ دەستیان پێدەکردەوە. بە وتەی تۆفیق، سۆڤییەتیەکان بەڕاستی کاریان نەدەگنخاند. کرێکارە عەراقیەکان ڕێک بە پێچەوانەی ئەوان بوون. زۆر درەنگتر لە کرێکارە سۆفییەتیەکان دەهاتنە سەرکار. دەوری کاتژمێر ٩ی بەیانی، تۆفیق کرێکارە عەراقییەکانی دەبینی کە لە بن سێبەری دارخورماکان دانیشتوون و بەدەم جگەرەکێشان، ئاو خواردنەوە و گاڵتە وگەپەوە پشوو دەدەن.

ئەو ڕۆژە، یەکێک لە نوێنەرەکانی کرێکارە عەراقیەکان، لە بەرانبەر سەرکۆنەکانی تۆفیق و بەڕوودادانەوەی تەکووزی و دیسیپلینی کرێکارە سۆڤیەتییەکان، پێی گوتبوو: «لێیانگەڕێ ئەوەندە کار بکەن هەتا گیانیان دەردەچێت». ئەو وتەیە وەکوو هێڵێکی سوور، ببووە هۆی تووڕەیی لەڕادەبەدەری تۆفیق.

تۆفیق کە هێشتا تووڕەییەکەی نەڕەویبووەوە، بە لێنای دەگوت کە ئەم کرێکارانە تەنیا بیر لە پارە دەکەنەوە و ئەوەش کە دەرئەنجامی خەمساردیی سیاسییە، بۆ «پێشەنگەکانی کۆمەڵگە» ی وڵاتەکەی قبووڵ ناکرێت. بەڵام ئەوەیکە تۆفیق لێی تێنەگەیبوو و یان نەیدەزانی، ئەوە بوو کە ئەو مووچەیەی سۆڤیەتییەکان وەریان دەگرت، زۆر زیاتر بوو لەو بڕە مووچە کەمەی کە کرێکارە عەراقیەکان وەریاندەگرت.

■ جەلال تاڵەبانی

لێنا، جێگۆڕکێی بەردەوامی حەشارگەکانی بە خەمساردییەکی تایبەت بە مرۆڤە بێهیواکان، قبووڵ دەکرد. چونکە بەهیچ شێوەیەک پێشبینی نەدەکرا ئەو ژیانە تەریک و دوورەپەرێزەی ئەو کەی کۆتایی دێت. هەربۆیەش دەبوو ملکەچی دیسیپلینە دیاریکراوەکان بێت.

لێنا ناچار کرا لە حەشارگەیەک لەگەڵ ٣ پیاوی گەنج بمێنێتەوە. یەکێکیان، خوێندکاری بواری یاسا بوو، زانکۆی بەجێهێشتبوو و لەدەست پۆلیس ڕایکردبوو. پیاوێکی میهرەبان و زۆربڵێ بوو و ناوێکی

خوازراوی هەبوو، بەڵام ناوە ڕاستەقینەکەی جەلال تاڵەبانی بوو.

هەرکاتێک لینا، حەشـارگەکەی دەگۆڕی، دەبوو ناوەکەشی بگۆڕێت. هـەر یەکەم شـەوی گەیشـتنی بە حەشـارگە نوێیەکەی، ئـەو ٣ پیاوە گەنجە کەوتنە خۆیان ناوێکی خوازراو بۆ لینا بدۆزنەوە. دواجار، جەلال بڕیـاڕی کۆتایـی دا و گوتی: «ناوی تۆ «نەسـرین»ە. نەسـرین ناوی گوڵێکی سـپییە کە لە شاخەکان دەڕوێ. تۆ ڕەنگی ڕوخسارت سپییە و لە شاخەکانەوە هاتووی بۆلای ئێمە.»

دواتر، لینا، زۆر ناوی دیکەشـی گۆڕی، بەڵام ناوی نەسرین هەمیشە ناوێکی گونجاو بوو بۆ ئەو و ئەمڕۆکە هێشتاش کوردەکان بەو ناوەوە دەیناسن.

جەلال تاڵەبانی ئەو کەسەیە کە ئێستا سەرۆک کۆماری عەراقە.

■ هێلانەی شەمشەمەکوێرە

ڕۆژێکیـان لینا و منداڵەکانیان گواسـتەوە بۆ ماڵێـک لە دەوروبەری بەغا. بڕیار بوو تا کاتی ئامادەکردنی پاسپۆرتەکانیان لەو ماڵە بمێننەوە. ماڵەکـە لە یەکێـک لە هەژارتریـن گەڕەکەکان بوو. کۆڵانەکان تەسـک و خـۆڵاوی و بەبـێ شـینکایی و دار ودرەخت بوو. لـە ئەملاوئەولای کۆڵانەکەدا، ڕیزە ماڵێکی بچووک هەبوون کە مەترسـیی ڕووخانیان لە ئان و ساتدا بوو.

گەیشـتنە بەردەم دەرکەیەکی کورت، درز هەڵگرتوو و ڕزیو. لە لای ڕاسـتەوە، بەرەو کۆڵانەکـە، پەنجەرەیەکی بچووکی هەبوو کە بە خۆڵ پڕکرابـووەوە و بە دڵنیاییەوە سـەردەمانێک شووشـەی پێوە بووە، لە پشـتەوەش پەرژینـی ئاسـنی هەبوو کـە لەمێژبوو ژەنگـی هەڵێنابوو. حەمەسوور وەکوو ڕێنما لەگەڵی بوو، چوونە دالانێکی تەسک و تاریک و جندۆکـە لێـدراوەوە: دیوارەکان قڵیشـاو و پڕ لە درز بوون. قسـڵی دیوارەکان وەریبوو و لە سـەر زەوییەکە پەڵەی دروسـت کردبوو کە ڕەنگەکـەی دیاری نەدەکرا و ڕەگەی زەردباوی تێدا بەدی دەکرا کە لە

پەڵەی گۆگرد دەچوو. داڵانەکە دەچووەوە سەر حەوشێکی بچووک. لە لای ڕاستەوەی حەوشەکە، ژوورێک هەبوو کە پەنجەرەکەی ڕووەو کۆڵان بوو. لاولاوەکانی پەنجەرەکە وەها لە دیوارەکە توند کرابوو کە کرانەوەی بۆ نەبوو. لە لای چەپی حەوشەکەش، پلیکانەی بچووک هەبوون کە بۆسەربان دەچوون، بەڵام بەهۆی پەرژینە ئاسنە ژەنگ هەڵێناوەکانیەوە، نەدەکرا بچیتە سەربان. لە ژێر پلیکانەکاندا، شێرەییێکی ئاو و تەشتێکی بەردین لە بنیدا هەبوو کە تاکە سەرچاوەی ئاوی ئەو ماڵە بوو.

لە لای ڕاستەوە، بەرانبەر شێرەی ئاوەکە، ژوورێکی دیکە هەبوو کە بە تەواوی تاریک بوو. زەوییەکەی بە ماددەیەکی نادیار داپۆشرابوو. لەم ژوورەدا، لە کەلوپەلی ناوماڵ، تەنیا دۆشەکێکی فەنەرداری بەجێماو لە سەردەمی دەقیانووسی لێبوو. چرپایەکەیان لە بن تاکە پەنجەرە بێ شووشەکەی ژوورەکە دانابوو. لێنا بە کچەکانی گوت ئەو چرپایە لە سەردەمی «شەهرزاد»ەوە ماوەتەوە. کچەکان بەو وتەیە گەشانەوە. بڕیار درا ئەو چرپایە بدرێت بە کچەکان. ئەوانیش، دەستبەجێ کەوتنە هەڵبەزودابەز لەسەری.

هەوڵیاندا وردەبەردەکانی سەر زەوییەکە کۆکەنەوە، بەڵام کاتێک چاویان بەو پیساییە کەوت کە لە ژێر بەردەکاندا بوو (تویژگەلێکی لۆچن و لینچق)، وردەبەردەکانیان بەلاوە پاکژتر و تەندروست تر بوو و پێیان باشتر بوو وەکوو خۆی بیهێڵنەوە و دەستی لێ نەدەن. لانیکەم، بەو شێوەیە لە مار و داعبای دیکە پارێزراو بوون.

تەنیا یەکجار، کیژۆڵەکان قەدەغەیان شکاندبوو و لە چرپایەکەیان دابەزیبوون، پێیان بە وردەبەردەکانەوە نووسابوو و هەربۆیەش، بە هاتوهاوار داوای یارمەتییان دەکرد.

دوا ژوور کە لە نزیکەی ژوورە تاریکەکەوە بوو، شکڵی «ئێڵ» (L) ی هەبوو. ئەم ژوورە، هەرچەند کە زۆر بچووک بوو، بەڵام، گەورەترین ژووری ئەو ماڵە بوو. دەرکەکەی، بە بێ کێشە دەکرایەوە و دادەخرا و

پەنجەرە کون کونەکەی، جگە لە چەند شـــوێنێکی، شووشـــەی پێوەبوو. مێژووی دروســـت بوونی ئەو خانووە زۆر کۆن و نادیاربوو. بەڵام بە ســـەرنجدان بە کورتی درگاکانی و هەروەهـــا ڕەهەندەکانی خانووەکە، دەکرا بڵێیت ماڵێکی زۆر کەون بوو و یەکەم کەســـانێک کە نیشـــتەجێی بوون، مرۆڤگەلێکی بچووکتر لە مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە بوون.

لێنا، پاش پشـــکنینی ماڵەکـــە، ناوی نا «هێلانەی شەمشـــەمەکوێرە»، چونکە بەڕاســـتی ماڵێکی نەحس و شـــووم بوو. دیوارەکان کە لەیەکەم ڕوانیندا زۆر ئەستوور دەهاتنەپێش چاو، لە ڕاستیدا ئەستوور نەبوون، بەڵکـــوو بەهۆی شـــێی ماڵەکەوە، ئاوســـابوون و ئاســـەواری دووکەڵی مەشغەڵیان لەسەربوو. لەسەر زەوییەکەش، شوێنەواری کوانووی ئاگر مابووەوە و پێدەچوو ژنان چێشتیان لەسەر لێنابێت.

یەکەمیـــن ڕووداوی خۆش لەم ماڵەدا، هاتنی ئیســـماعیل بوو. ئەو بە تەندروستییەکی باشەوە گەیشتبووە لایان. سەرەتا، منداڵەکان بەچاوێکی دیکە ســـەیریان دەکرد، وەک نەیانناسیبێتەوە. بەڵام زۆری نەخایاند کە منداڵەکان لە خۆشیاندا دەستیان کرد بە زریق و هۆڕ.

ئیســـماعیل و حەمەسوور و ئازەربایجانییەک بە نێوی حاجی ئاغایش دەبوو لەو «هێلانەی شەمشەمەکوێرەدا» بژین. لێنا هیچ پرسیارێکی لە حاجـــی ئاغا نەدەکـــرد، بەڵام بەلای خۆیەوە پێی وابوو کە ڕەنگە حاجی وەکـــوو پەیوەندی یان تەتەر، لە نێو بزووتنەوەی کوردەکانی عەراق و ئێران کەڵکی لێ وەربگیرێت، چونکە حاجی ئاغا، زۆرجار بزر دەبوو و پاش ماوەیەک، وەکوو پشـــیلەیەکی بەڕەڵڵا، برســـی و بە جل و بەرگی پۆخڵەوە، سەروکەللەی پەیدا دەبووەوە.

بە هاتنی ئیسماعیل، کچەکان دەستیان کرد بە یاری کردن و پێکەنین و لێناش، ســـەرلەنوێ کەســـێکی لەگەڵ بوو کە هەم بە باشـــی دەیناسی و هـــەم متمانەی پێی هەبوو و دواجـــار، دەیتوانی بە بێ ڕێگر و ملۆزم قسەی لەگەڵ بکات.

هەرگیـــز بڕوایان نەدەکرد ڕۆژێک لە ڕۆژان بەو هێلانە ڕابێن، بەڵام،

وردە وردە لەوێش ڕاهاتن. بوونی ئەو ٣ پیاوە لەو ماڵە، هەموو شتێکی گۆڕی، بە تایبەت کاتێک لینا بیری لەو «کۆشکە وەیشوومە» و تەنیاییە مەرگهێنەرەکەی خۆی دەکردەوە.

■ خاوەنی «هێلانەی شەمشەمەکوێرە»

خاوەنـی ئـەو ماڵە، پیرێژنێکی بەخۆوە بوو کە لە تەوقی سـەرییەوە هەتا پەنجەی پێی خۆی بە «عابایەکی ڕەش» و چەند میتری دادەپۆشی و بـە هۆی هەمان عاباوە، بەخۆوەتریش دەینواند. بەزەحمەت بەدرگای ماڵەکەدا ڕەت دەبوو. شـریتێکی ڕەشـی بەسـتبوو بـە نێوچاوانییەوە، کـە پێدەچوو هەرگیز نەشـۆرابێت و لە چڵکی خۆیدا دەبریسـکایەوە و ڕەنگەکەی قاوەیی هەڵگەڕابوو.

ئـەو ژنە بە بێ ئـەوەی کەس ئاگادار بکاتەوە خـۆی دەکرد بە ماڵدا و تاکـە کورسـی ماڵەکـەی لە بـەردەم پەنجەرەکە دادەنا و لەسـەری دادەنیشـت. ئەوانەی ماڵەکەیان بەکرێ گرتبوو، بەرانبەری، پشـتیان لە دیوارەکە دەکرد و دادەنیشتن. لێنا سەرلەنوێ خۆی لاڵ دەکردەوە و بە شێوازی عەراقییەکان، چایەکی خەست و ڕەشی وەسەر دەنا و لەپەستا بۆی تێدەکردن و تەنیا بە گۆڕینەوەی بزە، تێکەڵ بەو دانیشتنە دەبوو.

پیرێژنەکە، زۆر سـەردانی دەکردن و ئەو سـەردانانەش تا ڕوودانی ڕووداوێک کە بەیەکجاری پێی ئەوی لەو ماڵە بڕی بەردەوام بوو.

ئەسـپێ هێرشـی کردبووە سـەریان و شـەو و ڕۆژ لەشـی خۆیان دەخورانـد. لێنا لەوپەڕی بێهیواییدا، دەسـتی دایە خەبات لە دژی ئەو دەعبا گەزۆکە، بەڵام سەرەڕای هەموو تەگبیر و هەوڵەکانی، نەیدەتوانی بیانبەزێنێت. سەردەمێکی سـەخت بوو. کەس نەیدەزانی ئەو ئەسپێیانە لـە کوێوە هاتوون، تا ئەو ڕۆژەی پیرێژنەکـەی خاوەن ماڵیان، وەکوو ڕەوتێکی هەمیشەیی، لەسەر کورسییەکەی نزیک پەنجەرەکە دانیشتبوو، پاش خواردنەوەی چا، لە جێی خۆی هەسـتا و ویستی بڕوات. لە کاتی ڕۆشتندا، لە عابای پیرێژنەکەوە هەزارەزیلەیەکی وەک تۆز فڕکی بەست

کــە لەبەرانبەر ڕووناکیی خۆرەکەدا، وەکوو بارانێک لە ئەســپێ دەهاتە پێش چاو. هەموو حەپەســاو ســەیری ئەو دیمەنەیان دەکرد و بڕوایان بە چاوی خۆیان نەدەکرد.

هەر کە پیرێژنەکە لە دەرگا دەرچوو، هەموو بە پەلە بەدوای شــتێکدا گەڕان کە ئەو ئەسپێیانەی پێ پاک کەنەوە. دەبوو پێش بە بڵاوبوونەوەی ئەسپێکان بگرن. پاک کردنەوەی شوێنی ژیانیان لە ئەسپێ چەند ڕۆژی خایانــد. دەبوو بیانوویەکــی باش بدۆزنەوە بۆ ئــەوەی پێش بە هاتنی ئــەو پیرێژنە بۆ ئەو ماڵە بگرن. حەمەســوور، بیانووەکەی دۆزییەوە و گوتــی: دەبێ بەو پیرێژنە بڵێین لینا نەخۆشــینی درمیی هەیە و باشــتر وایە سەردانی لینا نەکات. پلانەکەیان گرتی و تا کۆتایی مانەوەیان لەو ماڵە، بە خاوێنی مانەوە.

■ سەرئەنجام

لینــا و کچەکانــی، ماوەی ٨ مانگیان لە شــاری بەغا بردبووە ســەر، بەبــێ ئەوەی ئاگایان لــەو هەولانە بێت کە بۆیان دەدرا. دواجار، تۆفیق پاسپۆرتێکی هێنا کە وێنەی لینای پێوە بوو. لە وێنەکەدا نیوەی ڕوخساری لینا بە عابا داپۆشــرابوو. شوناسی مینا گۆڕدرابوو بە کوڕێکی بچکۆلە بە نێوی ئەمین. هیواش وەکوو خۆی مابووەوە، بەڵام لەوە بەدوا نێوی فاتمە بوو. لینا کە پاسپۆرتەکەی بە دەستەوە بوو، لەوەیکە دواجار ئەو وڵاتە بەئازار و هیواکوژە بەجێدەهێڵێت، دڵخۆش بوو.

موســافیرەکانمان بە بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدەن، دەســتیان کرد بە ڕاهێنانی خۆیان لەسەر شوناسی نوێ و بەکارهێنانی نێوە نوێیەکانیان. تاقــە هەڵەیەک لەدەربڕینی وشــەیەکدا، دەیخســتنە مەترســییەوە. مینا و دایکــی نەدەبــوو لەبیری بکەن کــە لەوەبەدوا ئەو کــوڕە و تەنانەت لەکاتی میزکردنیشــدا دەبــێ هەڵسوکەوتی کوڕانەی هەبێت! کاتێک لینا لە هاوڕێکانیەوە گوێی لەو قســانە دەبوو، ســەری دەخستەســەریان و دەیگوت: «بەڕاســتی پێتان وایە ئەو موســافیرانە هیچ ئیشێکی دیکەیان

نییە جگە لەوەی سەیری «سیرەت»ی ئەو منداڵە بکەن؟»

ڕاهێنـان و فێربوونی لەبەرکردنی عابا، خۆی کێشـەیەکی دیکە بوو. دەبـوو ئـاگای لێ بێـت عاباکە بەسـەرییەوە بەرنەبێتـەوە و هەروەها فێربێـت پێیەوە بەڕێـدا بڕوات. کارێکـی زەحمەت بوو. پیـاوەکان لەو بـوارەدا نەیاندەتوانی یارمەتی بـدەن و ئەزموونەکانی لێناش لە بواری چارشـێو لەسـەرکردندا، هیچ بەکەڵکی نەدەهاتن. عابـای عەراقی، هەم گەورەترە و هەم قورسـتر و شێوازی لەبەرکردنیشی زۆر جیاوازە. بۆ بەیانییەکەی، حەمەسـوور کە لە ژنانی بنەماڵەکـەی خۆیەوە چۆنیەتی لەبەرکردنەکەی فێر ببوو، عابا پۆشینی فێری لێنا کرد.

لێنا دەسـتی کرد بـە پرۆڤە کردن و دواجار، فێـر بوو چۆن لەبەری بـکات و ڕایگەیانـد: «تـەواو، فێر بووم چـۆن بیکەمە بـەرم!» هەموو چەپڵەیـان بۆ لێـدا و ئافەرینیان پێ دەگوت و لێنـاش چەند هەنگاوێکی بـە عاباکەوە هەڵگـرت: دوو هەنگاو بۆ پێشـەوە و دوو هەنگاویش بۆ دواوە (ژوورەکـە هـەر ئەوەندە دەبوو). دڵخۆش بە سـەرکەوتنەکەی، لەسـەر کورسـییەکە دانیشت. لەگەڵ دانیشـتنەکەی، هەموو ئافەرین و چەپڵـەکان ڕاگیـران و تەنانەت منداڵەکانیش لە قاقـای پێکەنینیان دا. لە کاتی دانیشـتندا، عاباکەی بەرببووەوە و لێنا پێـی نەزانیبوو، لەحاڵێکدا کە بە بێ عابا، لێنا دەبوو هەسـت بە ڕووت و قووتی بکات! سـەرەڕای ئەوەش، ئەو دەبوو پرۆڤەکانی دەست پێبکاتەوە. لەو کاتەدا، عابا پۆشین ببـووە کایە و یـاری بۆیان و هەموو بە لێنایان ڕادەبوارد و سـەریان دەخسـتە سـەری. بەڵام، کاتێک، پێویسـت بوو لـە دەرەوەی ماڵ عابا بپۆشـێت، دەبوو متمانەی تەواوی بە خۆی هەبێت. لەپڕ هەسـتی کرد تەنگاوبووە. پەلەی بوو هەرچی زووتر لەوێ بڕوات. هەربۆیەش کەوتە پرسـیار کردن سەبارەت بە سەفەرەکەی. هاوڕێکانی سەیری یەکتریان کرد و پاشـان یەکیان وەڵامی دایەوە: «دەبێ ئەو پرسـیارانە لە تۆفیق بکەیـت.» وەڵامدانەوەکـە بە شـێوازێک بوو کە ڕێی هیچ پرسـیارێکی دیکەی نەهێشتەوە.

بێدەنگییەکەیـان، لینـای تووشـی نیگەرانـی و سەرلێشـێواوی کرد، کێشەیەک لە ئارادا بوو کە هیچکام لەو سێ هاوڕێیە نەیدەویست باسی بکات.

■ گۆڕینی ڕێگای سەفەر

لە ڕاسـتیدا، لینا و منداڵەکان دەبوو لە بەغاوە بەرەو دیمەشق بڕۆن. لە دیمەشـقیش، ماوەی هەشـت مانـگ بوو کاک هـەژار، قەدری جان، عێزەدیـن و زەبیحـی چاوەڕوانـی گەیشـتنی ئەمان بوون. بـەڵام، لەم ماوەدا، دۆخەکە گۆڕدرابوو و ئەوان نەیاندەتوانی ڕاستەوخۆ بڕۆن بۆ دیمەشق. پەیوەندی نێوان ئەو دوو وڵاتە گرژیی تێکەوتبوو.

وڵاتانـی ئێران، عـەراق، سـووریە و تورکیە کە پێکـەوە جیرانن، بە بەردەوامی چاوەدێریی یەکتری دەکەن. پەیوەندییەکانیان زۆر دۆستانە نییە و هاوپەیمانی و یەکیەتییەکانیان بەردەوام لە ئاڵوگۆڕدایە. هەندێجار دوو لـەو وڵاتانە، لە دژی وڵاتی سـێهەم یەکدەگـرن و هەندێجاریش ئەم یەکگرتنە پێچەوانە دەبێتەوە. تەنیا خاڵی هاوبەشـیان، بریتییە لە بە فەرمی نەناسینی مافی کوردەکان.

لـەو کاتەدا کە لینا لـە بەغا بوو، دژایەتیی نێوان سـووریە و عەراق کـە تا ئەو کاتە لە قۆناغی شەڕەقسـەدا بەرتەسـک کرابـووەوە، وەها پـەرەی گرتبوو کە مەترسـیی شـەڕ لـە نێوانیاندا هاتبووە ئارا. شـەڕ ڕووی نەدەدا. بەڵام، ڕێگای ڕاستەوخۆ لە عەراقەوە بۆ سووریە لە لینا گیرابوو. ڕێگای تورکیەش بە هەمان شێوە، چونکە هیچ پەیوەندییەک لە نێوان ئەم وڵاتە و حیزبە کوردییەکاندا نەبوو.

لە کاتی ناچاریدا، هەمیشـە ڕێگاچارەیەک دەدۆزرێتەوە. تەنیا ڕێگا، ڕێگای ئێران بوو. لەم کاتەدا، پەیوەندیی نێوان دوو ڕێژیمی پاشـایەتی زۆریـش خـراپ نەبوو. دەتوانین بڵێین ئەو دوو وڵاتە چاوپۆشـییان لە یەکتر دەکرد. دەیانگوت کە سنووری نێوان ئەو وڵاتانە، ڕێگەی دزە کردن و ئاودیو بوونی نائاسـایی هەیە و لیناش بە پاسپۆرتە عەراقییەکەیەوە

پارێـزراو بوو. بـەڵام، کاتێک لینا بیری لەو ڕێگا شـاخاوییە دەکردەوە کە هەشـت مانـگ لەوەپێش بەرەو عەراق بڕیبـووی، ورەی دادەبەزی. دواجار، بڕیارپیاندا بە پاس سەفەر بکەن.

لینـا: «لـە تـاران دەچمە لای کـێ؟ من لەوێ ناونیشـانی کەسـم لا نییە!»

وەڵامیان دایەوە: «نیگەران مەبە! دەچیت بۆلای عەبدولڕەحمان! هەتا دە ڕۆژ لەوەبەر، ئەو هێشتاش لە تاران بوو».

لینا: «ئێسـتا دەبێت هەسـت بە تەناهیش بکەم! ئەو هێشتاش لەوێیە؟ ناونیشانی ئەو دەزانن؟»

وەڵام درایەوە: «هیچ گرفتێک نییە. ئەو هاوڕێیەی سەردانی کردبوو، شـارەزای ڕێگاکەیە. ئەو بۆت ڕوون دەکاتەوە چلۆن لە تێرمیناڵەوە بە تاکسی بڕۆیت.»

لینا دڕدۆنگ بوو، چونکە مێردەکەی لەپەستا شوێنەگۆڕکێی دەکرد.

لینـا دەبـوو لـە هاوڕێیەکەوە کـە لە تارانـەوە هاتبوو، ڕێوشـوێنی گەیشـتنەلای عەبدولڕەحمـان فێـر بێـت و لەبەری بکات. بـۆی نەبوو ناونیشانەکە بە نووسراوە هەڵبگرێت. بەڵام ناونیشانەکەش هێندە ڕوون و دیار نەبوو و ئەو هاوڕێیەش، هەرجارێک کە ناونیشانەکەی دووپات دەکـردەوە، ئاڵوگۆڕی بەسـەردا دەهێنا، تا ئـەو کاتەی کە ئیدی پێداگر بـوو لە دروسـت بوونـی دوایین ناونیشـانەکە. ئەویـش بریتی بوو لە پێرسـتێکی دوور و درێژ لە کۆڵانەکان و وناونیشـانەکان. لینا سـەری لەگێـژەوە دەهـات و دڵـی لە ژێڵلا دەهـات. بەڵام ناچار بـوو متمانەی پێبـکات، چارێکـی دیکەی نەبـوو. هەربۆیەش، لینا پێشـنیازی کرد کە عەبدولڕەحمـان لە گەیشـتنی ئەو و منداڵـەکان ئـاگادار بکەنەوە. بەم شـێوەیە هەم دروست بوونی ناونیشانەکە پشتڕاست دەکرایەوە و هەم کەسـێک بۆ بردنیان دەهاتە تێرمیناڵی پاسـەکان. وەڵامیان پێدایەوە کە دۆخەکە هێند جیدییە کە تەنانەت ناتوانن یەک کەسـیش لەدەست بدەن و ڕیسک بکەن.

پاشـــان ئیســـماعیل پرســـیاری کرد: «ئایا بیرتان لە لێنا و منداڵەکانی کردۆتەوە؟ چونکە ئەوان لەبەردەم مەترسییەکی گەورەدان».

«بەدڵنیاییـــەوە بیریان لـــێ دەکەینەوە. بەڵام لێرە، مەترســـیی گەورە لەسەر زۆربەی کەسەکانمانە».

ڕێکخراوە نهێنییەکان کە لە کەمیی کادر، ئیمکاناتی ماڵی و هەمووجۆرە کەم و کوڕییەکی دیکە ئازاریان دەکێشا، مەترسیی شەڕ دۆخەکەی لێ ئاڵۆزتـــر دەکردنەوە. هەربۆیەش، بەرەوپێش بردنی خەبات لە دۆخێکی ئەوتـــۆدا، بـــە بێ ڕەچـــاو کردنی دیســـیپلین و مل ڕاکێشـــان بۆ هەندێ کێشـــە و گرفـــت، ئیمکانی نییـــە. لێنا لەو دۆخە تێدەگەیی. ســـەختگیریی ئـــەوان بەرانبەر بە لێنا، ئەوەندەش غافڵگیـــری نەدەکرد. ئەوان چیدیکە نەیاندەتوانـــی یارمەتیـــی بدەن و ئەوەش بەو مانایـــە بوو کە لەوەبەدوا دەبێـــت بە تەنێ قورســـایی کارەکان لەئەســـتۆ بگرێت. لێنـــا نەیدەتوانی تۆفیـــق بە خەمســـاردی تۆمەتبار بکات. چونکە لـــەو کاتەوە کە ڕێگایان یەکـــی گرتبوو، تۆفیق ڕێزێکی زۆری لە لێنا گرتبوو، ڕێزێک کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر و زیاتر ببوو.

■ دیسانەوەش سەبارەت بە تۆفیق

تۆفیـــق مـــۆن و مڕومـــۆچ و کـــەم دوو بوو. بـــەڵام کاتێـــک دەکەوتە قســـە و گفتوگۆ، وتەکانی هەمیشـــە ســـەرنجڕاکێش بـــوون و کاتێکیش مرۆڤ دەرفەتی باشـــتر ناسینی تۆفیقی بە خۆی دەدا، بە هاوڕێیەتی و دۆستایەتیی تۆفیقەوە شانازی دەکرد.

تۆفیق بەرەوڕووی چارەنووســـێکی تۆقێنەر بووەوە. کاتێک لێنا پاش ئـــەو هەموو تەنگ و چەڵەمە گەیشـــتە ئورووپا و لـــە ئەمنییەتدا دەژیا، هەواڵی دەستبەســـەربوونی تۆفیقی پێگەیشـــت. بە دڕندانەترین شـــێوە ئەشـــکەنجەیان کردبوو. بەڵام نەهاتبووە گۆ و کەسیشی پێوەنەکردبوو. هەواڵی مەرگی تۆفیق لە زینداندا، کاریگەریی مەرگی برایەکی لەسەر لێنا دانابوو. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە لێنا لە بەغا بوو و لە چارەڕەشـــی

و نەهامەتیدا دەژیا، تۆفیق تاکە کەس بوو کە ترووسکاییەکی بە ژیانی ئەو دەبەخشــی. ئەو، لە ڕاستیدا، وێناکەری ئەو هیوایە بوو کە دەبووە هــۆی خۆڕاگریی لینا و بە پێــوە ڕایگرتبوو. هەربۆیەش، مەرگی تۆفیق بۆشاییەکی گەورەی خستە ژیانی لیناوە.

ســاڵانێکی زۆر بەســەر ئەو هەواڵــە تاڵەدا تێپەڕیبــوو. لینا خوێندنی زانکۆی تەواو کردبوو و لە یەکێک لە زانکۆکانی پراگ وانەی دەگوتەوە. ڕۆژێک، کوردێکی عەراقی سەردانی لینای کرد و لەو دیدارەدا جزدانێکی دەستکردی چنراو بە زەنگیانە و مت وموورووی ڕەنگامەی دایە دەستی و گوتــی: «تۆفیق ئــەم جزدانەی لە زیندان بۆ تۆ دروســت کردووە و منی ڕاســپاردووە کە بە تۆی ببەخشــم و پێت بڵێم کــە ئەو تۆی لەیاد نەکردووە».

بەم چەشنە بوو کە لینا بە خۆشییەوە هەواڵی مانی تۆفیقی پێگەیشت! لــەو ڕووەوە کە تۆفیق خۆڕاگریی دەکــرد و نەدەهاتە زمان، بایەخێکی بۆ ڕێژیم نەمابوو. هەربۆیەش، دەیبەن بۆ سیاچاڵێک لە بیابان و لەوێ ڕایدەگــرن و کاری زیندانــی پێدەکەن. بە بنەماڵەکەشــیان گوتبوو کە هیــچ زیندانییەک بەو ناوەوە بوونی نییە. لەوکاتەدا، وەڵامێکی ئەوتۆ بۆ بنەماڵەی زیندانییەکان، بە مانای مەرگ و نەمانی ڕۆڵەکانیان بوو.

لــەو ڕۆژەوە، لینا زۆر جار ماڵەکەی گۆڕیبوو و هەموو کەل و پەلی ناوماڵەکەشــی بەجێهێشــتبوو و یان لێی فەوتابــوو، بەڵام ئەو جزدانە بچووکەی تۆفیقی هەمیشە لەگەڵ خۆی دەبرد.

لینــا لە ســاڵەکانی دەیەی ١٩٧٠دا، گەڕایەوە بــۆ بەغا. تۆفیق هەواڵی لێناردبــوو و بانگێشــتی ماڵی خۆی کردبــوو. ژنێکی جوان و دوو کچ، بــە بزەیەکــی پڕ لە خۆشەویســتییەوە بە پیرییەوە هاتبــوون. ئەو ژنە، ژنــی تۆفیــق و ئــەو دوو کچەش، کچەکانــی بوون. قژەســەری تۆفیق ماش و برنجی ببوو، قەڵەو ببوو و ورگەخڕەکەی دەشــاردەوە. قسەی دەکــرد، پێدەکەنــی و ســەری دەخستەســەر کچەکانی...ئــەو لــە ژیان بەردەوام بوو، بەڵام چاوەکانی شــۆقی پێشــوویان نەمابوو. ئەو لە نێو

ئەندامانــی بنەماڵەکەیدا بەختەوەر بــوو. بەڵام، هەڵسوکەوتی جەللادان و جینایەتکاران لە درێژماوەدا کاریگەریی خۆی لەســەر دانابوو. دڕندە بوون، دەروونی مرۆڤ بریندار دەکات.

■ گەڕانەوە بۆ ئێران

هێنــدەی نەمابــوو بۆ کاتــی ڕاگەیاندنی قەدەغــەی هاتوچۆ. پۆلیس گەڕەکەکانی ناوشار و لەوانە ئەو گەڕەکەی کە لینا و هاوڕێکانی خۆیان تێدا شــاردبووەوە، ژێر و ژوور دەکــرد. هەربۆیەش، لینا و منداڵەکانی دەبوو هەرچی زووترە بەڕێ بکەون.

مانگــی مارس لە بەغا، مانگێکی چێژبەخش و خۆشــە. سروشــت بە ژیانەوەیەکــی تــەواوەوە دەبووژێتەوە. لە ڕۆژدا، گەرمــا نیانە، کەچی شــەوان هێشتا کزەی سەرمای ماوە. ساڵی پار، لینا لە وەرزی بەهاردا گەیشــتبووە عەراق. لەو کاتەدا، لە کوردســتان و بەغایش هەوا گەرمی کردبــوو. بــەڵام لە کاتی گەڕانەوەی بۆ تاراندا، هەوا ســاردی دەکرد و هەربۆیــەش هاوڕێیان جلوبەرگی پەشــمینە بۆ منداڵەکان و مانتۆیەکی سووکەڵەشــیان بــۆ لینــا هێنابوو، کە دەبوو بەســەر کراســە کوردییە هاوینەکەیــدا و لە بــن عابەکەیەوە لەبەری بکات، ئەوان پێیان وابوو کە ئەو جل و بەرگە بۆ ئەو وەرزە گونجاوە، بەڵام لە کوردســتان هێشــتا زســتان بــوو و بەفر و بەســتەڵەک نەتوابووەوە. کەســیش بیری لەوە نەکردبووەوە.

لینا ئەو ســەفەرەی بــە تەنیا لەگەڵ منداڵەکانی دەســت پێدەکرد. لەو کاتەدا کە شــاری بەغای بەجێدەهێشــت، بیری لەوە دەکردەوە کە هیچ کــەس بڕوا بــەو نەهامەتییە نــاکات کە ئەو چەشــتبووی و خەڵکانێکی دیکــەش هەن کە هێشــتاش لەگەڵ ئــەو نەهامەتییانە دەســتەویەخەن. ســاڵەکانی دواتــر، لینا چارەڕەشــی و نەهامەتیی زیاتریــش دێتە ڕێی، بەڵام ئەو چەند مانگەی لە بەغا بردبوویە سەر، وەکوو دەستەوەستانی و بێدەرەتانییەکــی بەئازار لە زەینی ئەودا نەخشــی بەســتبوو. ئەو بۆ

خـۆ گونجاندن لەگـەڵ ڕیتمـی دژوار و جەهەننەمیـی ئاڵوگۆڕەکان و لەیـاد کردنی خێرای خـوو و خدەی ڕابردوویەکی نـە زۆریش دوور، چەرمەسـەرییەکی لەڕادەبـەدەری کێشـابوو. هەمـوو چاوەڕوانیـی بەهێزبوونیـان لێدەکرد. هەربۆیە، ئەویش بڕوای بەوە هەبوو کە دەبێت توانـای هەڵگرتنـی هەر بارگرانییەکـی هەبێت و هەروەهـا لە ئەگەری ڕوودانی هەر پێشـهاتێکدا ئامادەی دۆزینـەوەی ڕێگاچارە بێت. لەگەڵ ئەوەشدا، پێشتر لێنا هەرگیز لە کۆمەڵگەیەکی هەمیشە لە کۆچ و جووڵە، بـە ناوکی مرۆیی تێکچڕژاو و لێک گرێـدراوەوە نەژیابوو. ئەو تەنیا و تەنیـا یەک شـتی هەبوو کە لووتکەی متمانە و پشـت پێبەسـتنی بوو، ئەویش بریتی بوو لە منداڵەکانی. ئەو وەکوو شێرێکی مێ، لەگەڵ خۆی ڕاکێشـی ئەملاوئەولای دەکردن. سـەرەڕای ئـەوەش، لەگەڵ تێپەڕینی زەمەن، هەستی دەکرد کە وردەوردە توانای تێگەیشتن لە ڕاستییەکانی نامێنێـت و ئەو ئامانجەی هەڵبیـژاردووە و بۆ وەدیهاتنی خۆی بۆ هەر تەنـگ و چەڵەمەیەک ئامادە کـردووە، لێی دەبێتـە تراویلکە. بە قووڵی تووشـی هەسـتی سەرلێشـێواوی ببـوو و خـۆی لە ململانێـی گرفتە ئاڵـۆز و فەوتێنەرەکانـدا دەبینییـەوە. ئەو زۆر گەنج بـوو و کچەکانی زۆر خۆشدەویست، بە عەشـقێکی تاڕادەیەک «سروشتی».. ئەوانی لە مەترسییە ڕاستەقینە و خەیاڵییەکان دەپاراست.

لە ڕاستییدا مرۆڤ خاوەنی هێزێکی بێکۆتاییە لە خۆگونجاندندا.

لێنا کە بەغای بەجێدەهێشت، چیدیکە ئەو ژنە گەنجە نەمابوو کە چەند مانگ لەوەپێش پێی نابووە ئەو شارەوە. سەرەڕای ئەوەش، ئەو ساڵانەی کە ئەو لە ئێران، کوردستان و بەغا بردبوویە سەر و یارمەتیدەری بوو بۆ ئەوەی خۆی بناسـێت، وەکوو دەسـکەوتێکی مەزن کە چارەنووس پێی بەخشـیبوو، لـە ناخی ئەودا جێی خۆی گرتبوو. ئەم سـاڵانە، هەم زۆر شتی لێ سەندبووەوە و هەم زۆر شتی پێبەخشیبوو.

■ گەڕانەوە

لێنا و منداڵەکان بەرەوتاران سـواری پاسـێکی ڕزیو و شـەق و شڕ بـوون. لێنا فێر ببوو چۆن عابا لەبـەر بکات، دیارە نە بە کارامەیی ئەو ژنانـەی هەموو تەمەنیان وەکوو ئاسـایی ترین جـل و بەرگ لەبەریان دەکرد. لێنا پرچەکانی هۆنیبووەوە و نێوچەوانیشـی بە پەڕۆیەکی سپی شەتەک دابوو. لە ژێر عابەکەیەوە، کراسێکی شڕ و ناسک، وەک پێستی جەستەی لەبەرکردبوو و بەسەریشیدا مانتۆیەکی ناسک و سووکەڵەی پۆشـیبوو. لەباتیی پێڵاو، جووتێک سـەرپایی لەپـێ کردبوو. پیرێژنێک دەسـتی خستە سەر شانی لێنا و بە ئاسپایی پێی گوت: «خانمی ئازیز، عاباکەت ڕێک بکە!»

عاباکـەی خزابـووە سـەر شـانی و ئـەو هەسـتی پـێ نەکردبـوو! موسـافیرەکانی دیکـە، خۆیـان گێـل کردبـوو. بـەڵام، پیاوێـک کە لە کورسـییەکی هاوڕیزیان لە لایەکەی دیکە دانیشتبوو، بە بزەیەکی پڕ لە سۆزەوە سەیری لێنای کرد.

پـاش تێپەڕین لە خانەقین، پاسـەکە بـەرەو ناوچەیەکی کوێسـتانی ڕووەو قەسری‌شیرین لە سنووری ئێران بەڕێ کەوت. لێنا لە کۆنترۆڵی پاسـپۆرتەکان دەترسا و لە پەستا ئەوەی فێری ببوو، لە زەینی خۆیدا، دووپاتی دەکردەوە: کێیت، لە کوێوە دێیت، بۆکوێ دەچیت و بۆچی؟

لە پاسپۆرتەکەدا، ئەو لە نەجەف، شاری پیرۆزی شیعەکان لە عەراق لەدایک ببوو. لەم شـارەدا خەڵک بە فارسـی قسـە دەکەن و ئەوەش لە بەرژەوەندیی لێنا بوو.

کۆنترۆڵی پاسـپۆرتەکان بە بـێ هیچ گرفتێک تێپەڕی. ئەفسـەرەکە، تەنیا سـەیرێکی پاسـپۆرتەکە و منداڵەکانی کرد و هیچی دیکە. پاشان، مەئمووری گومرۆکەکە داوای لە شۆفیرەکە کرد کە هەموو جانتاکان لە سـەر پاسـەکە داگرێت. ئەو چەمەدانە بچووکەی کە لێنا لەگەڵ خۆی تا بەغا بردبووی، لە گەڕانەوەدا بەڕادەی پێشوو پڕ نەبوو.

منداڵەکان ڕێـک وەک ڕاهێنانەکانیان هەڵس‌وکەوتیان دەکرد. مینا کە

قرار بوو ڕۆڵی کوڕ بگێڕێت، بە جوانی دەرەقەتی ڕۆڵەکەی خۆی هات و پاشان بە ئاماژە لینای تێگەیاند کە کاری ئاودەستی هەیە. لیناش مینای بردە پشت خانووەکە و هێندەش پەلەی گەڕانەوە بۆلای مەئمووری گومروکەکەیان نەبوو. مەئمووری گومروک ڕووی لە لینا کرد و ئەمری پێکرد: «جانتاکەت کامەیە؟» پێش لەوەی لینا وەڵام بداتەوە، ئەو پیاوەی لە کورسییەکەی ڕیزەکەی ئەولایانەوە دانیشتبوو، بەتوندی وەڵامی مەئموورەکەی دایەوە و پێی گوت واز لە خانم و منداڵەکانی بهێنە. مەئمووری گومروک کە دەیویست دوا قسەی کردبێت، پرسیاری لەو پیاوە کرد کە ئایا تۆ دەیانناسیت؟ ئەویش وەڵامی دایەوە: «جیرانین».

لینا لە خۆتێهەڵقورتانی ئەو پیاوە سەری سووڕ مابوو، لەگەڵ منداڵەکان چوونە موسافیرخانەیەکەوە و لەوێ، هەستی بە برسیەتی کرد. بۆنی برنجی بەتامی ئێرانی، بە تایبەت برنجی «کلک ڕەش» (دۆم سیا)، هەموولایەکی تەنیبوو و مرۆڤ تەنانەت لە دەرەوەی موسافیرخانەکەش بۆنەکەی دەبیست.

ساڵۆنی موسافیرخانەکە پڕ بوو لە خەڵک. خواردنەکەش بریتی بوو لە برنج و خۆرشتی(شلە) فسنجان. بە بینینی قاپە پڕ لە خواردنەکان، ئاو زایە دەم لینا. لەو ڕووەوە کە تەنیا ١٠ تمەنی پێبوو و دەبوو یەک تمەن بۆ کرێی تاکسیی تاران ڕابگرێت، هەربۆیەش بڕیاری دا پێش داوا کردنی خواردنەکەی، نرخی خواردنەکان بپرسێت و بەراوردێکی گیرفانی خۆی بکات. پاش پرسینی نرخەکان، خاترجەم بووەوە. لینا کە داهێزرابوو، هەرکە مێزێک چۆڵ بوو، یەکسەر ڕۆشت و لەگەڵ منداڵەکانی لە دەوری دانیشتن. ڕێک لەو کاتەدا کە دەیویست داوای خواردن بکات، ئەو پیاوەی یارمەتیی دابوون، بە دوو قاپی پڕ خواردنەوە خۆی گەیاندە مێزەکەیان و قاپەکانی لە پێش لینا و منداڵەکانی دانا.

لینا: «بەڕێز سپاست دەکەم، بەڵام ناتوانم قبووڵی بکەم».

ئەو پیاوە کێ بوو کە هەر لە سەرەتای سەفەرەکەیانەوە یارمەتی دەدان؟ بە دڵنیاییەوە، ئەو تێگەیبوو کە لینا ئەو کەسە نییە کە هەوڵ

دەدات ڕۆڵەکەی بگێڕێت. ئایا پۆلیسی ئێرانە و هەر کە گەیشتنە تێرمیناڵی پاسەکان لینا دەستبەسەر دەکات؟ یان ئەو پیاوە، سەرەڕای بوونی ئەو منداڵانە، نیازێکی خراپی بەرانبەر بەو ژنە گەنجە لە سەردایە؟

ئەو پیاوە، بەسەر مێزەکەدا نووشتایەوە و بە ڕێزەوە گوتی: «خاتوون، نەمدەویست ببمە مایەی ئازارتان و لەوەیکە هەستێکی ئەوتۆم لاتان دروست کرد، داوای لێبووردن دەکەم. کاتێک بینیم لەگەڵ ئەو منداڵانە بە تەنێ سەفەر دەکەیت، تەنیا ویستم یارمەتیتان بدەم.»

پاشان، جارێکی دیکەش داوای لێبووردنی کرد و پاش ماڵئاوایی، لە نێو حەشیمەتەکەدا لەچاو بزر بوو. برنج و خۆرشتی فسنجان خەریک بوو لەسەر مێزەکە و لەپێش چاوی سارد دەبووەوە و نەیدەزانی چی بکات. لە نێوان ئەو هەموو خەڵکەدا کە هاتوچۆیان دەکرد و بە یەکدا دەهاتن، لینا نەیدەتوانی قاپەکان بگرێت بە دەستیەوە و بیباتەوە بۆ ئەو پیاوە. سەرەڕای ئەوە، منداڵەکانیش زۆریان برسی بوو . هەربۆیەش، بەدزییەوە قاپێکی هێنایە پێش و کردی بە دەم منداڵەکانەوە. پاشان، بە هەندێ دوودڵی و شەرمەوە، خۆیشی دەستی بە خواردن کرد. پاش تێر بوون، هەم شەرمەکەی ڕەوییەوە و هەم ترسەکەی لەو پیاوە کە تا ئەو کاتە تەنیا چاکەی لەگەڵ کردبوون.

پاش حەسانەوە و نان خوارد، موسافیرەکان سواری پاسەکانیان بوونەوە و بەرەو تاران بەڕێ کەوتنەوە. ئەوان بە خاکی کوردستاندا تێدەپەڕین. لە کوردستان، هێشتا زستان ماڵئاوایی لە سروشت نەکردبوو. هەوا سارد و بەستەڵەک بوو و کولووی بەفر خۆی دەکرد بە کون و کەلەبەری پاسە شڕەکەدا. شۆفیرەکە لە موسافیرخانەکانی سەرەڕێ ڕایدەگرت، بۆ ئەوەی موسافیرەکان چایەک بخۆنەوە و خۆیان گەرم کەنەوە. موسافیرەکان، شەو لە پاسەکەدا خەوێکی چاکیان کرد، بەڵام لینا کە گۆرەوی لە پێدا نەبوو و سەرپایی لە پێدا بوو، هەتا بەیانی لە سەرمادا هەڵچۆقا بوو و خەوی لێ نەکەوتبوو. ڕادیۆی شۆفیرەکە کە بە درێژایی سەفەرەکەیان پێ کرابوو، ڕایگەیاند کە لە ناوچەی سەقز

پلەی سەرما بۆ ٣٤ دەرەجەی سانتی گرادی ژێر سیفر دابەزیوە.

پاسەکەیان چەند کاتژمێر درەنگتر گەیشتە تاران. کاتێک دواجار پاسە شەق و شڕەکە گەیشتە تێرمیناڵی تاران، خۆر بە تەواوی ئاوا ببوو. پێی لینا تەزیبوو. موسافیرەکان شاڵاویان بۆ تاکسییەکان برد. لینا، پاڵی بە دیواری دەرەوەی ساڵۆنی چاوەڕوانییەکەوە دابوو و هەڵتروشکا بوو. پەلەی نەبوو. کەس چاوەڕوانی ئەوی نەدەکرد. تەنانەت کەسیش نەیدەزانی ئەو و کچەکانی لەوێن.

لە خاڵی سنووری بەمەلاوە، پیاوەکە یان دەخەوت و یان سەیری دیمەنەکانی دەرەوەی دەکرد. ئەو چیدیکە سەیری لینای نەدەکرد. لینا کە پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو و منداڵەکانیشی بە تەنشتیەوە بوون، لە هیلاکیی خۆیدا، بە تەواوی ئەو پیاوەی لەبیرکردبوو. پیاوە «دراوسێکەی» کە لە تەنشتیانەوە وەستا بوو، بە لینای گوت: «خانم، تاکسیم بۆ ڕاگرتووی، بۆکوێ تەشریف دەبەیت؟»

لینا ترسا (لە دڵی خۆیدا گوتی، ئەمانە دەیانهەوێ من هەتا لای عەبدولڕەحمان بیانبەم). هەربۆیەش، هاواری کرد و گوتی: «کاکە پەیوەندیی بە تۆوە نییە».

ئەو پیاوەش، داوای لێبووردنی کرد و ڕۆشت.

لەو کاتە بە دواوە، زۆر جاران، لینا سەبارەت بەو پیاوە پرسیاری زۆری لە خۆی دەکرد. ئایا هاوڕێیانی بەغا ناردبوویان بۆ ئەوەی یارمەتییان بدات و لە ئەگەری پێشهاتی هەر ڕووداوێکدا، ئاگاداریان بکاتەوە؟ یان پۆلیس بوو؟ پۆلیسی چ وڵاتێک؟ پۆلیسی عەراق یان ئێران؟ دەکرێت بیرۆکەی دووهەم وەلا بنرێت، چونکە پۆلیسێک کە بەو شێوەیە دوو هەنگاوی مابوو بگاتە ئەو عەبدولڕەحمانەی کون بە کون بەدوایدا دەگەڕان، واز لە نێچیرێکی وەها بەردەست ناهێنێت و بەو سانایە ناڕوات. لە ڕاستیدا، یان ئەم پیاوە، دژبەرێکی ڕێژیم بوو و هەستی کردبوو کە لینا پێویستی بە یارمەتییە، یان تەنیا مرۆڤێکی هەدار و چاوقایم بوو.

لێنا ئەو تاکسییەی جواب کرد و تاکسییەکی دیکەی گرت. بە پێی ئەو ڕێوشــوێنانەی لە بەغــا فێریان کردبوو، ڕێنمایی شــۆفیرەکەی دەکرد. ناونیشــانەکان ڕاست بوون و گەیشتە شــوێن. بەڵام بۆ دڵنیایی زیاتر، سێ کۆڵان ئەولاتر دابەزی.

کاتێک عەبدولڕەحمان دەرکەی لەسەر کردنەوە، ڕەنگی هەڵبزرکابوو. چاوەڕێی ئەمانی نەدەکرد. بوونی لێنا و منداڵەکان لە تاران، مەترسییەکی گەورەی بۆ عەبدولڕەحمان دروست دەکرد. لێنا، هەرکە لە سەردەرانەی درگاکە تێپەڕی، بووراپەوە. لە ڕەوتی ســەفەرەکەدا، ســەرما بردبووی و دوو حەوتــووی خایانــد هەتــا چاک بووەوە، لەو مــاوەدا، بە بێ داو ودەرمــان لە جێــدا کەوتبــوو و دەیڕاواند. عەبدولڕەحمــان، بۆ ئەوەی هێزێکــی بەبەردا بێتەوە و پشــوویک بــدات، یەک حەوتــووی دیکەش نەیهێشــت هەســتێتەوە. پــاش ئــەوە، لێنــا و منداڵــەکان دەبــوو تاران بەجێبهێڵن. لەم ماوەدا، لێنا و هاوسەرەکەی، زۆریان پێکەوە قسە کرد. عەبدولڕەحمان بە پێی خووی هەمیشــەیی خۆی، ئەو هونەرەی هەبوو کە قســەکانی خۆی بە شێوەیەکی سادە بکات و لە دەرفەتی گونجاودا، پێکەنینیشــی ئاوێتە بکات. ئەو هەمیشە بەدوای شادی و خۆشحاڵییەوە بوو و ئەوەش، لەگەڵ ئەو بوونی چێژبەخش دەکرد.سەرەڕای ئەوەش، ڕۆژێکیــان، عەبدولڕەحمــان بە شــێوەیەکی جیددی و تایبەت ســەیری لێنای کرد و گوتی: «گوێم لێ بگرە، دەبێ سەبارەت بە بابەتێکی گرینگ قسەت لەگەڵ بکەم».

لێنا هەمیشە بە وردی گوێی لە قسەکانی دەگرت. بەڵام، ئەم جارەیان شــتێکی تایبەت لە دەربڕینەکەیدا هەبوو. هەربۆیەش، لێنا چاوەڕوان ما هەتا قسەکانی بکات.

■ دانپێدانانی عەبدولڕەحمان

عەبدولڕەحمان: «کاتێک کە تۆ لە بەغدا بوویت، من دەستبەسەر بووم.»

لێنا: «چۆن؟ کێ خەیانەتی لێ کردیت؟»

عەبدولڕەحمان: «پرسیار مەکە و قسەکانم پێ مەبڕە! هاوکات لەگەڵ من، ئیسماعیلیشیان گرتبوو.»

لێنا: «کەواتە، بۆیە نەهات بۆ بەغا؟ بەڵام لەوێ بە منیان دەگوت کە باشە و هیچ کێشەیەکی نییە.»

عەبدولڕەحمان: «قسەکانم پێ مەبڕە...! هەردووکمانیان ئەشکەنجە کرد.» دواتر عەبدولڕەحمان شوێنی برینێکی لەسەر رکەی سینگی نیشان دا و لە وتەکانی بەردەوام بوو: «لە پێیەکانمەوە هەڵیانواسیبووم و لێیاندەدام. بە پێی ئەو پرسیارانەی لێیان دەکردم و هەر ڕۆژ لە ڕۆژی دیکە جیاواز بوو، تێگەییم کە ئیسماعیل ناوی چەند کەسێکی پێداون. هەربۆیەش من پێم گوتن ئەگەر ئیسماعیل ئازاد بکەن، ئامادەم قسە بکەم و ئەوەش کە ئیسماعیل زۆر شت نازانێت و ئەوەی پێی گوتوون هەڵەیە و ڕاست نییە. بە پێچەوانەوە هەموو ڕاستییەکان من دەیانزانم و ئەگەر دەیانهەوێ قسە بکەم، دەبێ پێش هەموو شتێک، ئیسماعیل ئازاد بکەن. لەو ڕووەوە کە ئەوان دەیانزانی من لە ئیسماعیل زۆر زیاتر زانیاریم لایە، هەربۆیەش ئیسماعیلیان ئازاد کرد.

«پاشان، ئەوان هەموو ڕۆژێک کاغەز و قەڵەمیان بۆ دەهێنام، بۆ ئەوەی، ئەوەی دەیزانم بینووسم. من سێ لاپەڕەم لە ناوی ئەو کەسانەی کە مردبوون و یان چووبوونە دەرەوەی وڵات و لە ئەمنیەتدا بوون، بۆ پڕ دەکردنەوە، لەگەڵ شی کردنەوەیەک لە دۆخی حیزب، دۆخێک کە لە ڕاستیدا، لەمێژ بوو چیدیکە کەڵکی نەمابوو و بەکار نەدەبرا. چەند ڕۆژ لەسەر یەک، ناچاریان دەکردم هەمان سێناریۆ بنووسمەوە و داوایان لێدەکردم ئەوەی ڕۆژی پێشووتر نووسیومە بینووسمەوە. نەدەبوو هەڵە بکەم! (لێنا دەیزانی کە هاوسەرەکەی زەینێکی بەقوەتی هەیە).

«دواتر داوایان لێکردم هاوکارییان بکەم. دەیانویست بچنە کوردستان و ئەو شـوێنانەی من لە ڕاپۆرتەکەمدا باسم کردبوو، ببینن. تەنانەت لە ئەگەری هاوکاریدا، بەڵێنیی ئازادی و پارەشیان پێدام.

سـەرەتا پێشـنیازەکەیانم قبـووڵ نەکـرد. بـەڵام پـاش بیرکردنەوە قبووڵم کرد، من بە باشـی نەمدەزانی ئیسـماعیل دانـی بە چیدا ناوە و نەشمدەزانی کە هاوڕێیانمان ئاگاداری گیرانەکەی من و ئیسماعیل هەن یان نە، نەمدەزانی حەشـارگەی خۆیان گۆڕیوە یان نە. بە پێچەوانەوە، بیرم لەوە کردبووەوە کە لەگەڵ گەیشـتنم بە کوردستان، چۆن خۆم لە دەسـت مەئموورە پۆلیسـەکان ڕزگار بکەم، چونکە بە باشی شارەزای ناوچەکـە بـووم. هەربۆیەش، لاپەڕەیەکم لەسـەر ئەساسـی هاوکاری لەگەڵ ساواک واژۆ کرد».

بەو پێیە، دوو پیاوی چەکداریان خستە تەک عەبدولڕەحمان بۆ ئەوەی بـڕوات بۆ کوردسـتان. عەبدولڕەحمان کە شـارەزای کوێسـتانەکانی کوردسـتان بوو، لە چاخانەی گوندێکدا کە پێشـتر شـوێنی هاتوچۆی خـۆی بوو، ئەو دوو چەکدارەی دانابوو و پێی گوتبوون کە بۆئەوەیکە هاوڕێکانی تووشـی شـک و گومان نەبن، پێویستە پێش هەموو شتێک، بـە تەنیـا پەیوەندییان پێوە بکات. تەنانەت پێـی گوتبوون کە پەیوەندی بە پۆلیسـی ئـەو ناوچەوە بکەن بۆ ئەوەی لەکاتی دەستبەسـەرکردنی هاوڕێکانیدا، یارمەتییان بدەن.

لینا کە هاوسەرە خۆشەویستەکەی خۆی بەڕادەی پێویست دەناسی، دەیزانـی کـە زۆربەی کاتەکان، خەڵک دەکەونـە ژێر کاریگەریی خووە سەرنجڕاکێشـەکانی عەبدولڕەحمانەوە، ئەو دوو مەئموورە پۆلیسـەی دەهێنایە پێش چاوی خۆی کە چلۆن، وێڕای گوێ ڕاگرتن لە گاڵتەکانی عەبدولڕەحمان، کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی سـەرنجی عەبدولڕەحمان بەنیسبەت خۆیانەوە.

لە شاخەکانی کوردستاندا، عەبدولڕەحمان وەکوو ماسی بوو لە دەریادا و دەیزانی کە هاوڕێکانی، هەموویان، گەلێک لەو گوندە دوورن.

دواجار، عەبدولڕەحمان دانپێدانانەکەی خۆی بەو ڕستەیە کۆتایی پێ هێنا:

«ڕەنگە ئەو دوو مەئموورە هێشتاش لەوێ چاوەڕوانی گەڕانەوەی من بن.» و ئەم وتەیەی خۆی بە دەنگێکی نەوی و چەشنێک لە ئاسوودەیی دەربـڕی و پاشـانیش گوتی: «من حەزم دەکرد خۆم ئەم شـتانەت بۆ بـاس بکەم، نەک ئـەوەی لە زاری خەڵکی دیکە و بە شـێوەیەکی دیکە بیبیسیتەوە.»

لێنا: «بەڵام، چۆن وێراوتە بگەڕێیتەوە بۆ تاران؟»

عەبدولڕەحمـان: «تۆیش بـاش دەزانی کە بنی بەرھەیوان ھەمیشـە تاریکە».

لێنا: «ئایا تۆ ھەموو شـتێکت بۆ من گێڕاوەتەوە؟ ھیوادارم ھیچت لێ نەشاردبێتمەوە؟»

بە سـەرنجدان بە شێوازی قسـەکردنی عەبدولڕەحمان، لێنا ھەستی دەکرد شـتی دیکەش لە ئارادایە. عەشـق مرۆڤ فێر دەکات کە لە ڕێی چۆنیەتی ئاخاوتن، نیگا و تەنانەت جووڵەیەکەوە تێبگات کە ئەوەی پێی گوتـراوە، تـەواوە یان نە. بـەڵام لێنا پێداگریی نەکـرد و پاش ئەوەش، ھەرگیز لەوبارەوە لەگەڵ عەبدولڕەحمان قسەی نەکردەوە. ئەو ھەمیشە، لە دەروونی خۆیدا لەگەڵ شـکدا لە ململانێدا بوو. بەڵام، ڕاسـتییەکەی ھەرچی بێت، شـتێک دیار و بەرچـاو بوو و ئەویش ئەوە بوو کە پاش ڕاکردنەکـەی عەبدولڕەحمـان، ھیچ کـەس نەگیـرا و حیزبیش وەکوو خۆی مایەوە. دانپێدانانێکی وەھا، کارێکی سـانا نییە. ورەی دەوێت. بە پێچەوانەوە، شاردنەوەی ئەوەی ڕوویدابوو، ئەو مەترسییەی ھەبوو کە ببێتە ھۆی لەدەست دانی متمانەی تەواوی ھاوڕێکانی.

ھەرچۆنێـک بێـت، بۆ لێنا، سـەرەڕای بوونی شـک و گومان، گوتنی ئەو بابەتە لە لایەن عەبدولڕەحمانەوە، شـانازییەکی گەورە بوو و ئەو شانازییە بووە ھۆی ئۆگریی زیاتری لێنا بۆ ھاوسەرەکەی.

■ گێڕانەوەی ئەحمەدئاغا ـ ساڵی ١٩٨٩

پـاش کوژرانـی عەبدولڕەحمـان لە سـاڵی ١٩٨٩دا، لێنـا بڕیاڕیدا بە هەندێ لە نووسـینەکانی خۆیدا بچێتەوە. پاشـان، لێنا سـەردانی ماڵی ئەحمەدئاغـای برای عەبدولڕەحمانی کـرد. هیوادارو بوو کە بە یارمەتیی ئەحمەدئاغـا، زەینـی خـۆی تیژتـر کاتەوە و بـە پشتڕاسـتکردنەوە و یـان ڕەت کردنـەوەی هەنـدێ گرتە لە نووسـینەکانی خـۆی بگات. لە ڕەوتی قسـەکانیاندا، جارێکی دیکەش باسـی دەستبەسـەر بوونەکەی عەبدولڕەحمان هاتەوە ئارا.

گێڕانـەوەی ئەحمەدئاغـا جیـاواز بـوو. بـە پێـی وتەی ئـەو، پاش دەستبەسـەربوونی عەبدولڕەحمان، سەرهەنگ زیبایی کە بە دڕندایەتی و سادیسـم ناوبانگی دەرکردبوو، سـەردانی ماڵی ئەحمەدئاغا دەکات. زیبایـی، وەکـی دیکـەش بە گەنـدەڵ و بەرتیـل خـۆر بەناوبانگ بوو. زیبایـی بە دانی بەڵێنیی هەڵسوکەوتی نەرم و نیان و یان ئازاد کردنی زیندانییـەکان، داوای پارە و پێشکەشـیی لـە بنەماڵەکانیان دەکرد. بەو شێوەیە، ئەو ببووە یەکێک لە ساماندارترین پیاوەکانی ئێران. لەبەرانبەر ئـازاد کردنی عەبدولڕەحمانـدا، داوای پێنج هەزار تمەنی لە ئەحمەدئاغا کردبـوو. لـە سـاڵەکانی ١٩٥٠دا، بـڕی پێنج هـەزار تمـەن، پارەیەکی بەرچـاو بـوو، هەرچەنـد بە بـەراورد بـە گرینگیی ئـەو بزووتنەوەی کـە عەبدولڕەحمـان ئەندامـی بـوو، ئەو بـڕە پارەیە، زۆریـش نەبوو، دیسـانیش پارەیەکی بەرچاو بوو بۆ ئەو سـەردەمە. لەو سـەردەمەدا، عەبدولڕەحمـان، تەنیـا وەکـوو ئەندامێکـی سـەرکردایەتیی حیزبـی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەستبەسەر کرابوو. جگە لەوەش، زیبایی بـۆ ئەوەی مەزەندەیەکی ڕادەی بەرتیل وەرگرتنەکەی لە کەس وکاری زیندانیەکان بەدەستیەوە بێت، هەمیشە زانیاریی پێویستی سەبارەت بە دۆخی ئابووری بنەماڵەی زیندانیەکانی وەچنگ دەخست. ئەو پارەیە بۆ ئەحمەدئاغا کە مامۆسـتایەکی سـادە بوو، یەکجار زۆر بوو، سەرەڕای ئـەوەش ئەحمەدئاغا بەڵێنـی پێدابوو کە ئەو پارەیەی بۆ ئامادە دەکات،

بـەو مەرجەی کـە زیبایی عەبدولڕەحمـان بێنێتەماڵـی ئەحمەدئاغا و لێـی گەڕێـت لەوێوە ئازادانـە بڕوات. زیبایی وای کـرد و پارەی خۆی وەرگرت و لەو ماڵە ڕۆشت. عەبدولڕەحمانیش دەستبەجێ ماڵی براکەی بەجێهێشـتبوو و ڕۆشـتبوو. لەو ڕۆژە بەدواوەش هەتا ساڵانێکی زۆر، هیچ پەیوەندییەکی بە براکەیەوە نەگرت.

دواتر، لەم بوارەدا ڕۆژنامەنووسانێکی زۆر، چەندین جار، بە مەبەستی ئەنجامدانـی دیمانـە سـەردانی لینایان کـرد. بەڵام، لینا کە شـارەزای هونەری پێچەوانە نواندنی ڕاستیەکان لە لایەن ڕۆژنامەنووسانەوە بوو، هەرجارە دەستی بەڕووەوە دەنان. بەڵام، ئەوەش ڕێگر نەبوو لەوەی کە هەندێک لە ڕۆژنامەنووسانی فەرمی و نافەرمیی ئێرانی، دەست نەدەنە نووسـینی وتارگەلێک (زۆربەیان ناڕاست بوون) سەبارەت بە چۆنیەتی ئازادبوونـی عەبدولڕەحمـان و تەنانـەت هەندێکیان، باسـی خیانەتیان دەهێنایـە ئاراوە. بەڵام ئەوەیکە جێگەی داخ بوو و ناسروشـتیش بوو، ئەوە بوو کە ڕۆژنامەکان ڕاسـتییەکیان نەدەبینی، ئەویش ئەوە بوو کە پاش ئازاد بوونی عەبدولڕەحمان، تەنانەت یەک کەسیش تووشی کێشە و ئاستەنگ نەبوو..

■ دیمەشق

لینا خۆی بۆ بەجێهێشتنی تاران ئامادە دەکرد. چەند ساڵ پێش لەوە، لینای ١٩ سـاڵان، پێداگر لە پشـتیوانی کردنی خەباتی هاوسـەرەکەی، پێـی نابـووە فڕۆکەخانەی مێهرئابـادی تارانەوە. هەنووکـە، دەبوو بە پاسـپۆرتێکی عەراقـی و ناوی خـوازراوی عەرەبی و بـە عابایەکەوە، لــە ڕێــی هەمان فڕۆکەخانەوە ڕێی ئورووپا بگرێتـە بەر. هەرچەند لەو ماوەیەدا، ئاستەنگ و تەنگ و چەڵەمەی زۆری هاتبووە ڕێ و هەمیشە بە مێشـکێکی هێمن و شەفافەوە بەرەنگاریان ببووەوە، بەڵام سەبارەت بەم سـەفەرەی، مەراقێکی زۆری لە دڵدا بوو. لەگەڵ ئەوەشـدا، هەوڵی دەدا بەسـەرخۆیدا زاڵ بێـت. دەبوو لــە فڕۆکەخانـەی مێهرئاباد زۆر

ئاسایی و ئارام بێتە پێش چاو.

لێنــا و کچەکانــی دەبوو لە تارانەوە بەرەو دیمەشــق ســەفەر بکەن، چەنکوو عەبدولڕەحمان تەنیا تا ئەوێ، دەیتوانی بلیتیان بۆ بکڕێت.

قــەدری جان کە پیاوێکی مرۆڤدۆســت و شــاعیرێکی ناوداری کورد بــوو، لە فڕۆکەخانەی دیمەشــق چاوەڕێــی دەکردن. ئــەو پیاوە چەند ســاڵ لەوەپێــش، بەهــۆی کۆمەڵکوژیــی کــوردەکان لە لایــەن تورکە کەمالیســتەکانەوە، ناچــار ببــوو بەرەو ســووریە کۆچ بــکات. قەدری، پیاوێکــی میانەڕەو و کەم دوو بــوو. لێنا و منداڵەکانی بردە ماڵی خۆی و لای ژن و منداڵەکــەی خــۆی داینــان. لێنای لەگــەڵ هاوڕێکانی خۆی کــە ئەوانیــش کوردی کۆچەر بوون لە ســووریە، ئاشــنا کرد. هێندەی نەخایاند کە لێناش لەگەڵ هەندێکیان بوو بە هاوڕێ.

لێنــا و کچەکانی، ماوەی دوو مانگیان لە هۆتێلێکی شــاری دیمەشــق وەکــوو زیندانی بردەســەر. لێنا، لــە هۆکاری ئەو هەمــوو چاوەڕوانیە تێنەدەگەیی. پاسپۆرتی هەبوو، تەنیا مابووەوە کڕینی بلیتەکان. بەخۆی دەگــوت ڕەنگە هاوڕێیان ســەرقاڵی کۆکردنەوەی پارەی پێویســت بۆ کڕینی بلیتەکان بن. بەڵام، دیســانەوەش بەخۆی دەگوت: بۆچی پێشــتر ئــەو هەوڵەیان نەداوە، بەتایبەتی کە کڕینی بلیتەکان لە تێچووی مانەوە درێژخایەنەکەیــان لە هوتێل، کەمتری تێدەچوو. دیارە لێنا و منداڵەکانی لە باری خوردوخۆراکەوە هیچ کێشــەیەکیان نەبوو. خواردنی باشــیان هەبوو و منداڵەکانیش لە خۆشەویســتیی دەوروبەریان چێژیان دەبرد. هاوڕێیان ســەردانیان دەکردن و بۆ گەڕان و ســەیران لە سروشــتدا، دەیانبردنــە دەرەوەی شــار. لە ڕاســتیدا، ئەوان بۆ ئاســوودەیی لێنا و منداڵەکانی ئەوەی لەدەستیان دەهات، دەیانکرد. بەڵام لێنا و منداڵەکانی بۆیــان نەبــوو بەتەنێ بڕۆنــە دەرەوە و ئەوەش لەخۆیدا چەشــنێک لە قەتیــس بوون بــوو و تەنگاو و وەڕەزی دەکردن. ســەرەڕای ئەوەش، ڕەچاوکردنی ئەدەب و نەریت، ڕێگەی بە ژنان نەدەدا کە لە ئامادەبوونی پیاوانــدا، باســی پــارە بکــەن. هەربۆیەش، ئــەو بابەتە دەبــوو لە ڕێی

پیاوەکانەوە چارەسەر بکرێت. جگە لەوەش، ئەم هاوڕێ تازانەی لێنا، مانەوەی خۆیشیان لە سووریە مەرجدار کرابووەوە بەوەی کە خۆیان لە چالاکیی سیاسی دووربگرن. لەحاڵێکدا کە خودی بوونی لێنا لەوێ، بۆ ئەوان بە مانای تێوەگلان لە کاروباری سیاسی بوو. ئەوەش تا ڕادەیەک سەری لێ دەشێواندن.

دواجار ڕۆژی سەفەر کردنیان گەییشت و لێنا کە لە فڕۆکەخانە لە چاوەڕوانیی سوار بوونی فڕۆکەدا بوو، هاوکات، ماڵئاوایی لە یەکێک لە قۆناغەکانی چارەنووسی خۆی دەکرد.

■ ئورووپا و پراگ

لەگەڵ گەیشتنیان بە پراگ، ڕێکخراوی خاچی سوور وەریگرتن و لە هۆتێلێکی چوار ئەستێرە، لە ناوەندی شاری پراگ نیشتەجێیان کردن.

ئاغای میدریخ (Mejdrich)، بەرپرسی پەنابەرەکان، پێی گوتبوون کە مانەوەی ئەوان لەوێ «کاتی»یە و پاشان پاکەتێکی پێدابوون کە بڕێکی کەم پارەی تێدا بوو بۆ وردە خەرجی ڕۆژانەیان. پراگ لەچاوی لێنادا وەک شارێکی بێگانەی لێهاتبوو. لێنا، داهاتووی خۆی لەوشارەدا سەیروسەمەرە و دابڕاو لەخۆی دەبینی. سەرەتا، لە وڵاتەکەی خۆیدا هەستی بە نامۆ بوون دەکرد. ئایا هەڵسوکەوتی هاونیشتمانەکانی لەبیرکردبوو، یان ئەوە خودی ئەو بوو کە بەو ڕادەیە گۆڕدرابوو!هەستی متمانە بەخۆیی کەمتر ببووەوە و سەرلەنوێ وەکوو سەردەمی ژیانیان لەو «کۆشکە شووشە»دا لە عەراق، تور ببووەوە و زمانی دەیگرت، لەکاتێکدا کە لە دیمەشق، ئەو نوقوستانییەی لەکۆڵ ببووەوە. هەستی دەکرد هەڵسوکەوتی ئاسایی نییە و ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە چیدیکە هیچ مەترسییەکی لەسەر نەبوو. سەرلەنوێ بە ئازادی ژیان، بۆ لێنا نامۆ ببووەوە و تووشی ناجێگربوونی دەروونیی دەکرد.

پاش چەند حەوتوو، عەبدولڕەحمان خۆی بە ژووری هۆتێلەکەیاندا کرد و ئەوەش سورپرایزێکی ڕاستەقینە بوو و منداڵەکان بە پێی

سروشــت و غەریزە، هەســتیان بەو شادکامیی و بەختەوەرییە کرد کە ژووری هۆتێلەکــەی تەنیبــوو، چ بەختەوەرییــەک باڵاتر بوو لەوەی کە هەموو پێکەوە بوون!

بەهاری پراگ نزیک دەبووەوە. کۆمەڵگەی چێکۆســلۆڤاکی، هەنگاوی بەرەو هەڵمژینی هەوایەکی بەتاڵ بووەوە لە هەوری ترس و بێمتمانەیی هەڵدەگــرت. بــۆ عەبدولڕەحمان ولێنا، پاش ســاڵانێک ژیانی نهێنی، ئەم دۆخە ورووژێنەر بوو. ســەرەڕای ئەوەی هێشتاش بە بینینی پۆلیس و کەســانی نیزامی تووشی هەمان دژکردەوەی بێمتمانەیی دەبوونەوە و لە ڕاستیدا، هێشتا لە دەست ئەم چەشنە بیرئانینانە ڕزگار نەبووبوون، بــەڵام چێژیان لــەو ئازادییە نوێیە وەردەگرت. جگەلــەوەش ئەوان بەو حاڵــەی خۆیــان و مانەوەی ئــەو هەســت و دژکردەوانەیــان گاڵتەیان بەخۆیان دەکرد.

پاش ماوەیەک، خاچی ســوور، ژوورێکی ١٢ میتری چوارگۆشەی، لە بینای تایبەت بە پەنابەران پێدان. بەڵام ئەنیســتیتۆی تەندروستیی پراگ کە بەهۆی شێدار بوون و ناتەندروست بوونی ئەو شوێنەوە، بەتایبەتی دۆخــی منداڵەکانی ڕەچــاو کردبوو، چەنــد یاریدەدەرێکی کۆمەڵایەتیی ناردبــوو بۆ ئەوەی هیوا لەو شــوێنە دووربخەنەوە. ناڕەزایەتیی لێنا و تەنانەت گریانەکانی هیــوای بچکۆلانەش کاریگەریی نەبوو. ئەوان، بەو بڕیارە، هیوایان بە دامەزراوەیەکی «تەندروست» سپارد، دامەزراوەیەک کە خودی لێناش، لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا کە هیوایان لەوێ ڕاگرتبوو، تێیدا کەوتبووە قەرەنتینەوە. بە درێژایی ئەو ماوەیە، تەنیا یەکجار توانی کچەکــەی لــە ئامێز بگرێــت. دوای ئەم ماوەیە تەنیا دەیتوانی لە پشــت میلەکانــەوە، لــە دوورەوە ســەیری کچەکەی بکات. ئــەو ماوە، هەم بۆ دایک و هەم بۆ منداڵەکە، دەورانێکی تاقەتپڕوکێن و بەئازار بوو.

لــەو ڕووەوە کــە لێنــا لە ماوەی مانــەوەی لە ڕۆژهەڵاتــدا بە زمانی چێکی قســەی نەکردبوو، هەنــدێ وردەکاریی زمانەکەی لەبیر کردبوو. لە لایەکی دیکەشــەوە، لە پراگ، کێشەی گیرانی زمانی (تور بوونەکەی)

پەرەی سەندبوو. سەرەڕای ئەوەش، بەهۆی ئەو چەرمەسەرییانەوە کە لە ڕۆژهەڵات بەسەری هاتبوو، باری دەروونی لاواز ببوو و هەستی بە کاریگەریی ئەو ڕووداوانە لەسەر باری دەروونی دەکرد. ئەو بە ئازادی دەژیا، بەڵام وەکوو ئەندامانی دیکەی بنەماڵە، بە شوناسی ساختە (ئەوان هێشتایش بەو پاسپۆرتە ساختە عەراقیەوە کە کوردەکانی عەراق بۆیان دروست کردبوون و بە ناوی خوازراوەوە دەژیان)، هەربۆیەش، منداڵەکان بە ناوی خوازراوەوە دەچوونە قوتابخانە. سەرەڕای ئەوەش، لینا توانی بە هاوکاریی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیان، بە ناوی بچووکی خۆیانەوە لە قوتابخانە ناونووسیان بکات، بەڵام نەک بە ناوی بنەماڵەییەکەیانەوە. عەبدولڕەحمانیش، ناوێکی بنەماڵەیی غەیری ناوی بنەماڵەیی ژن و منداڵەکەی هەبوو. لینا زۆری هەوڵدا کە لە ڕێی سەردانی ناوەندگەلێکی پەیوەندیدار وەکوو خاچی سوورەوە، بە شوناسی ڕاستەقینەیانەوە ناویان تۆمار بکرێت. سەرەڕای خایاندنی کاتێکی زۆر و تاقەتپڕووکێنیی هەوڵەکانی، دواجار هیچیشی پێ نەکرا. دوا وەڵامێک کە یەکێک لە کارمەندەکانی وەزارەتخانە پێی دابووەوە، بریتی بوو لەوەی کە «ئێوە دەبێ بەو شوناسە ساختەی کە پێی تا ئێرە هاتوون ڕازی بن». هەشت ساڵی ڕەبەق چاوەڕوانیان کرد تا بتوانن سەرلەنوێ ناوی بنەماڵەیی قاسملوو بۆ خۆیان بگەڕێننەوە.

لینا، لە پراگ پاش هەوڵ و ماندوو بوونی زۆر، لە زانکۆی شارل Charles ناونووسی کرد و توانی درێژە بە خوێندنەکەی بدات، ئەو خوێندنەی پێش پێکهێنانی ژیانی هاوسەرییەکەی دەیویست ئەنجامی بدات.

■ هاتنی مەلامستەفای بارزانی بۆ پراگ

چەند مانگ پاش ڕۆشتنی لینا لە بەغا، ڕێژیمی پاشایەتیی عەراق ڕووخا. عەبدولکەریم قاسم کە بە کوودەتا، حکومەتی کۆماریی دامەزراندبوو، خۆی ببووە سەرۆک کۆمار. مەلامستەفای بارزانی لەوکاتەدا وەکوو

پەنابەر لە یەکیەتیی سۆڤیەت دەژیا، سەرکۆماری نویێ داوای لیکردبوو بگەڕێتەوە بۆ عەراق. مەلا مستەفاش قبوولّی کرد و لە گەڕانەوەیدا بۆ عەراق، بۆ ماوەیەکی کورت لە پراگ لای دا. بنەماڵەی قاسملوو بۆ نانی ئێوارە مەلا مستەفایان بانگێشتی ماڵی خۆیان کردبوو. لەو میوانییەدا، مەلا مستەفا پێشنیازی بە عەبدولڕەحمان کردبوو کە بگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عەراق و لە نزیکەی سنووری ئێران نیشتەجێ بێت و بەو شێوەیەش لە شوێنی خۆی درێژە بە خەباتەکەی لە دژی ڕێژیمی شا بدات. عەبدولڕەحمانیش دەستبەجێ پێشنیازەکەی قبووڵ کردبوو.

لینا، هەرگیز، سەبارەت بە گرینگیی مەئموورییەتی هاوسەرەکەی دڕدۆنگ نەببوو. لەبیریشی نەچووبووەوە کە بەڵێنی پێداوە لە هەموو حاڵ و دۆخێکدا لەگەڵی بمێنێتەوە، بەڵام کاتێک عەبدولڕەحمان ڕایگەیاند کە دەگەڕێنەوە بۆ کوردستانی عەراق و لەوێ دەژین، بیری لە کچەکانی کردەوە و پرسیاری لە عەبدولڕەحمان کرد: «لە وڵاتێکدا کە ژنان هیچ مافێکیان نییە، چ داهاتوویەک بۆ کچەکانمان لەبەرچاو دەگریت؟ ئەوان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چ چارەنووسێکیان دەبێ؟»

عەبدولڕەحمان وەڵامی دایەوە: «ئەوان دەبن بە کورد، زمانی عەرەبی و کوردی فێر دەبن و تۆش زمانی چێکییان فێر دەکەیت، کچەکانمان بەسەر سێ زماندا زاڵ دەبن. لەوە زیاتر چی دیکەت بۆ دەوێن؟» لینا بەرهەڵستی ئەو لۆژیکە پیاوانە دەبێتەوە و وەڵامی دایەوە: «ئەوان کچن و من پێم وانییە کەیفیان بە دۆخی ژنانی ئەوێ بێت. لەبیریشت نەچێتەوە کە من بە کولتووری ژنێکی ئازادەوە گەورە بووم. تەنیا لەبەر ئەوەی خۆم لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایە بگونجێنم، هەرگیز ناتوانم بە پێچەوانەی باوەڕەکانم، کچەکانم پەروەردە بکەم. ڕێزم بۆ ئەو کۆمەڵگەیە هەیە و لەوەیکە منیان بەو جۆرەی کە هەم قبووڵ کردووە، ئەوپەڕی ئەمەگداریم هەیە، بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە من لە هەموو بوارەکاندا لەگەڵ ئەو کۆمەڵگەیە ڕێکم، بەتایبەتی لەگەڵ سیستمی باوک سالارانەی ئەو کۆمەڵگەیە سەبارەت بە ژنان، بەهەموو شێوەیەک

ناکۆکم و من هەرگیز لەگەڵ کچەکانم درۆ ناکەم.»

عەبدولڕەحمان کە وەڕەز دیار بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «تۆ وەکوو هەمیشە شتەکان دراماتیزە دەکەیتەوە. ئێستا، ئەوان هێشتا منداڵن. دواتر سەبارەت بەم بابەتە قسە دەکەین».

ئەو زۆربەی جار، گرفتە بنەماڵەییەکانی بەم جۆرە لەکۆڵ خۆی دەکردەوە.

پاشان، عەبدولڕەحمان بەردەوام بوو و گوتی: «هەرچۆنێک بێت، من بڕیاری خۆمم داوە و مەلامستەفاش ڤیزاکانمان بۆ دەنێرێتە ڤییەن. دەبێ بە خێرایی کاروباری ئێرەمان ڕێک بخەین و لە پراگەوە بەرەو ڤییەن بەڕێ بکەوین. بڕیار بدە! یان لەگەڵم دێیت و یان لێرە دەمێنیتەوە. بەڵام ئەوە بزانە کە من چیدیکە ناگەڕێمەوە بۆ ئێرە و تا ڕزگاریی کوردستان لەوێ دەمێنمەوە» و بەم شێوەیە کۆتایی بە باسەکە هێنا.

لێنا کەوتبووە سەر دووڕێیان: یا دەبوو لەگەڵ منداڵەکانی دوای عەبدولڕەحمان بکەوێت و یان لێی جودا بێتەوە و تەڵاق وەربگرێت.

پاش ماوەیەکی کورت، لێنا ئاگادار بووەوە کە منداڵەکان لەوێ بەجێدەهێڵن. عەبدولڕەحمان بۆی شی کردەوە کە ئەوان سەرەتا دەبێتماڵێک لەوێ بدۆزنەوە و ڕێکی بخەن و ئەوەش زیاتر لە سێ مانگ دەخایەنێت. پاش ئەوە، لێنا دەگەڕێتەوە بۆ پراگ و کچەکانیش لەگەڵ خۆی دەهێنێت بۆ ئەوێ. جگەلەوەش، لێنا دەبوو واز لە خوێندنەکەی بهێنێت.

هەندێ لە ڕووداوەکانی ڕابردوو، لەسەر دڵی لێنا قورس بوون. ئەو خۆی بە هۆی ئەو بڕیارەوە کە ئەوکات دابووی، سەرکۆنە دەکرد و پرسیاری لە خۆی دەکرد کە بۆچی بڕیاری جیاوازی نەداوە و بۆچی ملکەچی هەموو بڕیاراتی هاوسەرەکەی بووە. هەوڵی دەدا لە هۆکاری هەڵسوکەوتەکانی خۆی تێبگات. ئایا ڕێز و هەستی بەرپرسایەتی بەرانبەر بەڵێنییەکەی بوو، کە بەرەو ئەو کردەوانە ڕایدەکێشا؟ یان عەشق و خۆشەویستیی عەبدولڕەحمان کەمەندکێشی دەکرد؟ یان

خۆشەویسـتیی خەڵکی کورد؟ یان، ئەم کردەوانـەی، دەرئەنجامی ئەو هونەرە بوو کە هاوسـەرەکەی بە کەڵک وەرگرتن لێی، هەموو جارێک بیانووی لێ دەبڕی.

شـتێکی حاشاهەڵنەگر هەبوو و ئەوەش ئەوەبوو کە لینا نەیدەویست منداڵەکان لە باوکیان دابڕێت. ڕەنگە، هەتیو بوونی خودی لینا لەسەردەمی منداڵیدا تا ڕادەیەک کاریگەریی لەسەر لەو بڕیارەی بووبێت.

■ ژیان لە بەغا بەشێوەی فەرمی (١٩٦٠-١٩٥٩)

لە ڤییەن، هیچ ڤیزایەک نەگەیشـتبووە دەستیان. ئەوان هەرچی ڕۆژە سـەردانی کۆنسـولگەریی عەراق لـە ڤییەنیان دەکرد و هەمیشـە یەک وەڵامیان وەردەگرتەوە: «ڤیزاکان سبەی دەگەن». و دواجار، پاش سێ مانـگ ڤیزاکان گەییشـت، هەر ئەو سـێ مانگەی کە لینا بـە منداڵەکانی گوتبوو کە پاش ئەوە، دەچێت بەدوایاندا و لەگەڵ خۆی دەیانبات.

کاتێک گەیشـتنە بەغا، دۆخی وڵاتی عـەراق ڕووی لە ئاڵۆزی نابوو. ململانێـی نێوان عەبدولکەریم قاسـم و دژبەرەکانی دەسـتی پێکردبوو و بەخێراییش کاریگەریی خۆی لەسـەر دۆخی ئیقامەتی ئەوان نیشـان دا. دەزگای ئیسـتخبارات، چوونـە دەرەوە لە بەغـای بۆ ئەوان قەدەغە کردبـوو. هەربۆیـەش، ئـەوان نە دەیانتوانـی بڕۆن بۆ کوردسـتان و نـە بگەڕێنەوە بـۆ ئورووپـا. هەوڵەکانی عەبدولڕەحمـان لای دەزگای ئیسـتخباراتیش بەهیچ کوێ نەدەگەیشـت. دواجار، ناچار بوون لەگەڵ «پەرویز حێکمەتجوو»ی فڕۆکەوان، ڤێلایەکی نیوە کاول بەکرێ بگرن، هەمان پەرویز کە لە تاران لە ماڵی پیاوە زەردەشـتییەکە پێکەوە ژیانی نهێنییان بردبووەسەر.

ئیزنیان نەدەدان بڕۆن بۆ کوردستان و پاش ماوەیەک، عەبدولڕەحمان بـە لینای گوت کە پارەیەکی وەهایان پێنەماوە و پێویسـتە لینا بەدوای کاردا بگەڕێـت. بڕیارەکەیـان وابـوو کە لینا بـۆ ماوەیەکی کورت و تا ئـەو کاتەی ڕێگەیان پێدەدرێت لە بەغـا بڕۆنە دەرەوە، کار بکات، جگە

لەوەش سەفەر بۆ پراگ بە مەبەستی هێنانی منداڵەکان، ڕۆژ بە ڕۆژ دوا دەکەوت و دوور و دوورتر دەبووەوە و لێناش لە تاو ئازاری دووریی منداڵەکانی تووشــی حاڵەتی بێقەراری و بێدەرەتانی ببوو، هەربۆیەش، جارێکی دیکەش ناچار بە ملکەچ بوون بوو و لەوەیکە چوونەدەرەوەی بەیانیانــی بۆ ســەر کارەکەی، دەبووە هــۆی دوورکەوتنەوەی مۆتەکە لــە بیرکردنەوەکانی، تاڕادەیەک هێوری دەکردەوە. ئەو کەمە نامانەیش کــە لە لایەن سەرپەرشــتی منداڵــەکان لە پراگەوە دەگەیشــت، چیدیکە کاریگەرییان لەسەر دڵە بێئۆقرەکەی نەبوو.

■ کارکردن لە وەزارەتی نیشتەجێ بوون

کارێکیــان لــە وەزارەتــی نیشــتەجێبوونی عــەراق بــە لێنا پێشــنیاز کــرد. کاتێــک لێنا بــۆ یەکەمین جار چــوو بۆ ئەوێ، لــە لایەنی خودی وەزیــرەوە کە پیاوێکی کورد بوو بە نێوی عەونی، پێشــوازی لێکرا. لە ڕاســتیدا، عەبدولڕەحمان بە بێئەوەی لێنا ئــاگادار بکاتەوە، ئەو کارەی بــۆ دۆزیبــووەوە. وەزیر پیاوێکی جوان و گەنــج و مێهرەبان بوو. ئەو ئیشی دیلمانجی و وەرگێڕانی بە مووچەی ٣٠ دیناری عەراقی (کەمترین مووچــە لــەو وەزارەتخانەدا) و شــەش کاتژمێــر کاری ڕۆژانە بە لێنا ســپارد. لێنــا دەبوو لــە کاتژمێر ٩ی بەیانییەوە هەتــا ٣ی پاش نیوەڕۆ کار بکات.

ڤێلاکــەی ئەوان لە لای چــەپ و وەزارەتخانەش لە لای ڕاســتەوەی دیجلــە هەڵکەوتبــوو. ئەو دەبــوو مەودایەکی نزیکــەی دوو کیلۆمیتری ببڕێ. بەیانیان، شنەیەکی فێنک بەسەر «پردی ١٤ی ژوئیە» (ڕێکەوتی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لە لایەن ڕێژیمی نوێوە)دا، هەڵیدەکرد. بەڵام، پاش نیوەڕۆ، لێنا بەهۆی گەرمای تاقەتپڕووکێنەوە کە ڕێک لە تەنووری نانەواخانە دەچوو، ماندوو و شەکەت دەگەیشتە ماڵەوە. لەو کاتژمێرەی ڕۆژدا، خەڵک لەحاڵی حەسانەوە و خەوی پاشنیوەڕۆدا بوون. سەرەتا، لێنا مووچەکــەی خۆی بە نادادپەروەرانە و کەم هەڵدەســەنگاند، بەڵام

دواتــر، بە زۆری دەزانــی، چونکە هیچ کارێکیان پێنەدەســپارد. نە بۆ وەرگێڕان و نە بۆ دیلمانجی، هەر هیچ شتێک نەبوو.

کاتێکیــش لینا، ناڕەزایەتی دەردەبڕی، وەڵامیان دەدایەوە: «ســەبرت هەبــێ، ڕاوەســتە، کارت بــۆ دەبــێ». لینا کــە تاکە ژنی ئەو بەشــە لە وەزارەتخانە بوو، هەستی دەکرد کە ڕێژیم بۆ ئەوەی خۆی دێموکراتیک و لایەنگری ڕزگاریی ژن پیشــان بدات، وەکــوو بووکەڵەیەک بە نرخی ٣٠ دینار لەوێ ڕایدەگرت!

لینــا لە سیســتمێکدا پەروەردە ببوو کــە بچووکتریــن دواکەوتن، بە بێڕێزی دادەنرا. هەربۆیەش، دوو حەوتووی یەکەم، هەرچی ڕۆژە ڕێک لــە کاتژمێــر ٩ی بەیانیدا لە وەزارەتخانە ئامادە دەبوو. بەڵام هەمیشــە لەگــەڵ دەرکەیەکــی داخــراو بــەرەوڕوو دەبــووەوە. پــاش ماوەیەک ســکرتێرێکی پیــر (کە هەمــوو کارێکی ئــەو وەزارەتخانەیــەی بەڕێوە دەبــرد) خــۆی کێش دەکرد و بە کلیلەکانەوە دەهات. ڕۆژانی ســەرەتا، ئەو سکرتێرە بە بینینی لینا کە چاوەڕوانی ئەوی دەکرد، سەری سووڕ دەما. دواتر، کاتێک ســکرتێرەکە لینای لــەو چاوەڕوانییەی بەردەرکەدا دەبینییــەوە، هەوڵــی دەدا پێش بــە پێکەنینەکەی بگرێــت، پێکەنینێک کە دەبووە هۆی شلەژاوی و حەپەسانی لینا. چەند خولەکێک پاش گەیشتن، فەوزی، کە لەگەڵ لینا لە یەک ژووردا کاریان دەکرد دەگەیشتە بەرەوە. فەوزی گەنجێکی ٢٠ ساڵە بوو کە ڕۆژان لەو وەزارەتخانە کاری دەکرد و شــەوانیش، درێــژەی بــە خوێندنەکەی دەدا. فــەوزی، لەپاش مردنی باوکی، دەرهێنانــی بژیوی بنەماڵە قەرەباڵغەکەی کەوتبووە ئەســتۆی. کارمەندەکانی دیکە، لە نێوان کاتژمێر ١٠ بۆ ١٢ی نیوەڕۆ دەهاتنە سەر کار. ئەوان، بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە، قسە و باس، خواردنەوەی چا یان قاوە خۆیان ســەرقاڵ دەکرد، کوڕێکی گەنج هەموو ڕۆژێک ســەردانی دەکــردن و پێڵاوەکانــی بۆ بۆیــاخ دەکردن و دواتر بــۆ خواردنی نانی نیــوەڕۆ دەچوونە دەرەوە. پاش گەڕانەوە، دەچوونە لای فەوزی و ئەو بەڵگەنامانــەی ئەو ئامادەی کردبــوون، واژۆیان دەکرد و پاش کاتژمێر

یەک و نیو، یەکە یەکە، دەڕۆشتنەوە بۆماڵەوە.

ورده ورده لێناش ڕاهاتبوو و هەرچی ڕۆژە نیو کاتژمێر درەنگتر دەچووە سەر کار. لە بەر ئەوەی بەدرێژایی ماوەی مانەوەی لە وەزارەتخانە هیچ کارێکی نەبوو بیکات، ماندوو دەبوو. لێنا، لە چاوەڕوانیی ئەوەدا کە ڕۆژێک کارێکی پێبسپێرن، هەندێ شتی بۆ خوێندنەوە لەگەڵ خۆی دەبردە سەر کار. بەڵام هەرگیز، هیچ کارێکیان پێنەسپارد.

فەوزی متمانەی بە لێنا دەکرد و سەبارەت بە ڕووداوەکان و دۆخی وڵات، ئاگاداری دەکردەوە. دەیگوت کە ڕێژیمی قاسم ڕووی لە کزی ناوە و پیاوە دەسەڵاتدارەکانی وڵات دژبەری ڕێژیمی قاسمن و هەندێ لە کارمەندەکانی ئەم وەزارەتخانەیەش لە دژبەرەکانن و چاوەڕێی ڕووخانی ڕێژیمن و لە هەموو شوێنێک خەریکی کاری تێکدەرانەن لە سیاسەتەکانی ڕێژیمدا و دواجاریش ئەوەی کە پێدەچێت ئەمانە، ببنە هۆی یاساغ بوونی چوونەدەرەوەی لێنا و عەبدولڕەحمان لە بەغا.

لەو کاتەوە کە ئەوان پراگیان بەجێهێشتبوو، یازدەمانگ تێدەپەڕی، ئەو دێموکراسییەی بە کودەتا ڕاگەیەندرابوو، بەرەو دیکتاتۆری دەچوو. ئەوەش لێنای نیگەران دەکرد.

عەبدولڕەحمان، بۆ دڵنیایی و هێور کردنەوەی لێنا، جەختی دەکردەوە و دەیگوت: «هیچ مەترسە، ئەگەر قاسمیش ملکەچی فشارەکانی زمانلووسەکانی دەوروبەری بێت، ڕێگای ڕاکردن بەرەوە کوردستان، هەمیشە بۆ ئێمە کراوەیە!»

لێنا: «ئەی منداڵەکانمان؟»

عەبدولڕەحمان: «دۆخی منداڵەکانی ئێمە، هەزار قات باشترە لە دۆخی منداڵانی کورد. ئەوان دەبێ تا ئەو کاتەی پێویست بێت، فێر بن بە بێ ئێمە بژین و بە تەنیا گەورە بن».

لێنا: «منداڵانی کورد لە هەژاری و نەداریدا دەژین، بەڵام لەگەڵ بنەماڵەکانی خۆیاندان، کەچی منداڵەکانی ئێمە وەکوو هەتیویان لێ

هاتووه.»

هەمــوو ژنــەکان ئــەو توانایان نییە کە بۆ هەمیشــە ڕێز لــەو مێردە بگــرن و خۆشــیان بوێت کە بیــر لە منداڵەکانی ناکاتــەوە، لە ماڵدا هیچ یارمەتییەکیــان نــادات و تەنانەت پــارە و بژیوی بنەماڵەکەشــی دابین نــاکات. لینا ڕێزی لــە مەئموورییەتەکــەی عەبدولڕەحمان دەگرت، بەڵام ئەویش ئەعسابی پۆڵایینی نەبوو.

لینــا تا کاتی دەرکردنیان لە عەراقیش، لــەو وەزارەتخانەیە مایەوە و قبووڵیشی کرد کە لە خســتنەڕێی پیشانگایەکی پیشەیی چێکۆسلۆڤاکی لــە بەغا، کە مووچەیەکی باشیشــیان پــێ دەدا، کار بکات. ئەو بەو دوو مووچەوە کە وەریدەگرت، بژیوی هەموو ئەو کەســانەی کە لەو ماڵەدا دەژیان دابین دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشــدا، تێپەڕینی زەمەن و نەگۆڕانــی دۆخەکەیان لە بەغا، ببووە هۆی سەرهەڵدانی کێشە و نەسازان لە نێوان ژن و مێرد دا. لینا لەڕادەبەدەر هەستیار ببوو. ئەو، چیدیکە تەنانەت لە ئەگەری ڕێگەپێدانی دەوڵەتی عەراقیش ئامادە نەبوو بچێت بۆ کوردستان و تەنیا شتێک کە دەیویســت گەڕانــەوە بۆ پراگ بوو. ئەو ئیتر بێــزار ببوو. لە مۆتەکە و خەونەکانیــدا دەیبینی کە منداڵەکانی خەریکە لە قوڕ و لیتەدا نوقم دەبن و یــان دەکەونــە خەندەقێکی پــڕ لە گورگەوە و یان لــە ماڵێکدا گیریان کــردووە کە گڕی تێبەربووە. چیدیکە تاقەت و توانای ئەوەی نەبوو کە ئەو بەڵێنییەی بە منداڵەکانی دابوو، جێبەجێی نەکات.

■ رزگاربوونی عەبدولڕەحمان لە کوژران

عەبدولڕەحمان دەبوو بچێت بۆ کوردســتان. دەبوو بە شێوەی نهێنی بەغا بەجێبهێڵێت. دووجار لە ســەفەرەکەی سەرکەوتوو بوو. لە ڕەوتی ســەفەری دووهەمیدا، لینا کە باری دەروونــی بەتەواوی تێکچووبوو، لە دڵی خۆیدا هەســتی بە پێشهاتی خراپ دەکرد. عەبدولڕەحمان کە بۆ ماوەی حەوتوویەک سەفەری بۆ کوردستان کردبوو، سێ ڕۆژ درەنگتر

گەڕایەوە. وەکوو هەمیشە گاڵتەی دەکرد و بە ئیشتیاوە نانی دەخوارد. بەڵام، لینا دڵنیا بوو کە کێشـــەیەک ڕوویدابوو. کاتێکیش لینا پرســیاری لێدەکرد، وەکوو هەمیشـــە وەڵامی دەدایەوە کە هەموو شــتێک بە باشی و ڕێک و پێکی تێپەڕیوە.

پاش حەوتوویەک، لە کاتێکدا کە هەر خۆیان لە ماڵەوە بوون و چایان دەخواردەوە، دواجار عەبدولڕەحمان هاتە گۆ و گوتی: «من لە هۆتێلێک گیرســامەوە، شــەو درەنگان، لەگەڵ هاوڕێیانی حیزبی قەراری دیدارم هەبــوو. ئــەوان بەتایبەتی، لەوپەڕی ســنوورەوە بۆ قســەکردن لەگەڵ مــن هاتبــوون. ڕێک لەو کاتــەدا کە خۆم ئامادە کردبــوو لە هۆتێلەکەم وەدەرکەوم، دۆســتێکی کوردی عەراقی بــە پەلە خۆی بە ژوورەکەمدا کــرد. بەرانبــەر هۆتێلەکە، دوو پیاو چاوەڕێــی منیان دەکرد، بۆ ئەوەی بــە خەنجەر لێمــدەن. بەوپێیە، دیار بوو کەســێک خەیانەتی لێکردووم. هەربۆیــەش، ئێمە لە دەرکەی پشــتەوە چووینــە دەرەوە و من چیدیکە نەگەڕامــەوە بــۆ ئــەو هۆتێلــە. ئــەم ڕووداوە، بووە هــۆی تێکچوونی پلانەکانمان. دۆزینەوەی شــوێنێکی نوێ بــۆ دیدارەکەمان، ماوەیەک لە کاتی گرتین و ناچاریش بووین کات و ساتی کۆبوونەوەکانمان بگۆڕین. هەربۆیەش، من هەندێ درەنگتر لە کاتی دیاریکراو گەڕامەوە».

■ دەرکردن لە عەراق

ڕۆژێکیان عەبدولڕەحمان دەم بە پێکەنین خۆی کرد بە ماڵدا و گوتی: «پارێزگار بۆ سبەی کاتژمێر ١٠ی بەیانی لە هەردووکمانی گێڕاوەتەوە. دەیناسم، پیاوێکی باشە. دواجار، دەتوانین لێرە بڕۆین».

پارێزگار، پیاوێکی مێهرەبان و ڕووخۆش بوو (هەڵبەت بۆ لینا، زیاتر لە ڕادەی پێویســت). خولکی کردن دانیشــن و ئەمری کرد قاوەیان بۆ بێنن. لەگەڵ عەبدولڕەحمان باسی کەمبایەخ و بابەتی ڕۆژانەی دەکرد و هاوکات، وەکوو نەریتێکی باوی ئەم وڵاتانە، لەپەستا دەیگوت: «بەخێر بێن» و عەبدولڕەحمانیش، هەرجارە بە هەمان فۆرموولی ڕەچاو کردنی

ئەدەب، سپاســی دەکرد. تا ئەوکاتەی کە کاتی هۆکاری بانگهێشتەکەی گەییشت (لینا بە عەرەبی قسەی نەدەکرد، بەڵام بە گشتی لە ناوەرۆکی باسەکەیان تێدەگەییشت).

لەڕاســتیدا، بەڕێــز پاریــزگار، بــەداخ بــوو لەوەیکــە ناچــارە پێیان ڕابگەیەنێت کە ماوەی مانەوەیان لە عەراق بەسەرچووە و ئەوان دەبێ لە ماوەی ٤٨ کاتژمێردا، ئەو وڵاتە بەجێبهێڵن و لەو ڕووەوە کە هۆکاری بڕیارەکەیان پێڕانەگەیانــدووە، ناتوانێت هیچ ڕوونکردنەوەیەکی زیاتر بدات. بە ڕوونی دیار بوو کە درۆ دەکات و هەربۆیەش پرســیار کردن لــەو، چ ســوودێکی دەبوو؟ ســەرەڕای ئەوەش، ئەوان بــە هێنانەئارای وردەکارییەکانــی ســەفەرەکەیان، توانییــان بــۆ یــەک ڕۆژی دیکــەش ئیزنــی مانەوە وەربگرن، هەرکە گەیشــتنەماڵەوە، لینا لە خۆشــحاڵیی ئەوەیکــە ســێ ڕۆژی دیکــە لە پــراگ دەبوو، شــایی لە دڵیــدا دەگەڕا. خاوەن ماڵەکەیان پیاوێکی ئەرمەنی بوو. هەرکاتێک بۆ وەرگرتنی کرێی خانووەکە سەردانی دەکردن، وەکوو هەمیشە، بەدەم چا خواردنەوەوە، باســی ئــەو زوڵمەی دەکرد کە لــە ئەرمەنییەکان و کــوردەکان کراوە. هەمیشە کرێی چوارمانگی لە پێشدا وەردەگرت، ئەو ڕۆژە دەبوو کرێی سێ مانگیان پێ بداتەوە. کاتێک عەبدولڕەحمان سەری باسەکەی لەگەڵ کردەوە، ئەو پیاوە کەوتە باسکردنی دۆخی هەژارانەی خۆی و ئەوەیکە ناتوانێت کرێی ئەو سێ مانگەیان بۆ بگێڕێتەوە. هەربۆیەش، نەیانتوانی پارەکەیــان وەربگرنــەوە. جگەلەوەش، ئەوان ناچار بــوون هەموو ئەو شــمەکانەی کە بۆ ماڵەکەی کوردستانیان کڕیبوو، لەوێ وازی لێبهێنن، چونکــە نــە ئیمکانی ماڵیی و نە کاتــی ئەوەیان هەبوو کــە هەموو ئەو شمەکانە بگوێزنەوە بۆ پراگ. هەربۆیەش، کەرەستە و شمەکەکانیشیان بەو پیاوە ئەرمەنییە «هەژارە» بڕا.

عەبدولڕەحمان، بە شــێوەیەکی سروشتی لە لینا تێگەیشتووتر بوو و لەگەڵ بابەتەکان وەکوو خۆیان ڕووبەڕوو دەبووەوە و نەدەکەوتە ژێر کاریگەریی هیچ شتێکەوە. بەڵام، لینا هەڵسەنگاندنی دەکرد و هەوڵی دەدا

بابەتەکان پێشـــبینی بکات و پرسیاری لە خۆی دەکرد کە ئەمە یان ئەو حاڵەتە، کامیان بۆ گرتنی هەڵوێستێک باش و گونجاو دەبێت. دەیویست ســـەبارەت بە ئەگەرەکانی قســـە بکات. بەڵام عەبدولڕەحمان هەمیشـــە وەڵامـــی دەدایـــەوە: «بـــا بزانین چۆن دەبێـــت، دواجـــار ڕێگەچارەیەک دەدۆزرێتەوە.»

ئـــەوان، ڕۆژهەڵاتیـــان بە چوار جانتـــاوە بەرەو پراگ بەجێهێشـــت و ئەوەش هەموو ئەو شتە بوو کە دەبوو ژیانێکی نوێی پێ بنیات بنێنەوە، لەڕاستیدا، دەبوو ژیانی خۆیان لە هیچەوە دەست پێبکەنەوە.

■ گەڕانەوە بۆ پراگ (١٩٦٠)

لەوکاتەدا، دۆزینەوەی ئاپارتمان لە پراگ زۆر ئاستەم بوو. بە تایبەتی ئەگەر بەپەلەش بێت. خوازیار، دەبوو ناوی خۆی لە پێرستی شارەوانی تۆمار بکات. پێرستی داخوازکەران دوورودرێژ بوو و بێ بوونی واسیتە، بەســـاڵانی دەخایاند تا بتوانن خانوویەکیان دەست کەوێت. هەربۆیەش، کەســـانێک هەبوون کە پێشـــبینیی ئەو حاڵەیان کردبـــوو و ناوی منداڵە کەم تەمەنەکانی خۆیان لەو پێرســـتەدا تۆمار دەکرد، بەو هیوایە کە لە تەمەنی گەورەبوونیاندا، سەرپەنایەکیان دەبێت.

عەبدولڕەحمان بۆ گەڕان بەدوای خانودا لە شوێنێکی باشەوە دەستی پێکـــرد و ڕاســـتەوخۆ چوو بـــۆلای هاوڕێکانی لە شـــارەوانیی پراگ و ئەوانیـــش زۆر زوو خانوویـــەک بـــە ٣ ژووریـــان لە ناوچـــەی پێترینی Petriny بـــۆ دۆزییەوە. پێترینی، یەکێک لە گردەکانی شـــاری پراگ بوو کە دەوڵەت دەســـتی کردبوو بە دروســـت کردنی شارۆچکەیەک لەسەر ئەم گردە. لەو کاتەدا، ئەو شارۆچکەیە، تەنیا سێ بینای نیشتەجێبوونی لێبوو. ئەوانی دیکە بریتی بوون لە: کارگەی بەربڵاو، ماشـــینی تایبەت بە هەڵکەندنی زەوی و هەڵگرتنەوەی خاک و پشکێنەر و هەروەها چاڵ و کەرەســـتەی بیناسازی...ئەو شتەی دەبووە هۆی شادمانی منداڵەکان و تۆقینی دایک و بابیان.

کۆڵانەکانیش، لەڕاســتیدا هەر بوونیان نەبوو و بە شێوەیەک کۆڵانی خەیاڵــی و بریتــی بــوون لە شــوێن تەگــەری ماشــینەکانی تایبەت بە بیناسازی لە قوڕدا.

ساڵەکانی سەرەتای ژیانیان لە ماڵە نوێکەیاندا، بە هەندێ زێدەڕۆییەوە، ساڵانێکی تەژی لە مۆتەکە بوون. کاروباری بیناسازیی ئەو شارۆچکەیە دەبوو لە حەوت ســاڵدا بگاتە ئەنجام، بەڵام پاش دە ســاڵ، هێشــتاش پرۆســەی بیناســازیی بەردەوام بــوو. کۆڵانەکان کارەبایــان نەبوو و هاتوچۆی شەوانە لەوێ گەلێک پڕمەترسی بوو.

لە دوا وێســتگەی شەمەندەفەر، بە مەودای دوو وێستگە لە ماڵەکەی ئەوانەوە، ئەنستیتۆی لێکۆڵینەوەیی پرۆفسۆر ویخترلەی (Wichterle) لێ هەڵکەوتبوو. لەم ئەنســتیتۆیە بوو کە عەدەسەی کۆنتاکتی چاو کەشف کرا. نیکیتا خۆرۆشــچۆف (Nikita KHrouchtchev)، ســکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیســتی یەکیەتیی ســۆڤییەت کە بۆ دیدار سەردانی پراگی کردبوو. بەنیاز بوو ســەردانی ئەو ئەنستیتۆیەش بکات. هەربۆیەش، بە پێشبینیی ئەگەری دیدارێکی ئەوتۆ، بە خێرایی کۆڵانەکانی «پێترینی»یان ئاسفاڵت کرد. ڕۆشتن بەسەر ئاسفاڵتی خاوێندا، چێژێکی تایبەتی هەبوو! پاش ڕۆشــتنی خۆرۆشچۆف، کاروباری بیناسازی دەستی پێکردەوە و سەرلەنوێ کێوگەلێک لە قوڕ وچڵپاو هەموو لایەکی گرتەوە.

عەبدولڕەحمان دەستی کرد بە وانە گوتنەوە لە قوتابخانەی باڵای موتاڵا ئابوورییەکان (EHEE) و زۆری نەخایاند کە دەســتی کرد بە نووسینی بڕوانامەکــەی خۆی بۆ وەرگیرانی وەکوو «بەربژاری زانســت». پاش وەرگیرانی وەکوو بەربژار، دەســتی کرد بە نووســینەوەی بڕوانامەی دوکتــۆرای دەوڵەتییەکــەی و داکۆکیــی لێ کرد. دواتر، دەســتێکی پێدا هێنایەوە و وەکوو کتێبێک چاپی کرد. هاوکاتیش وتارگەلێکی بۆ ڕۆژنامە دەنووسی و هەروەها بۆڵتەنی «کوردستان»ی بڵاو دەکردەوە (هەمان بۆڵتەن کە لینا لە ئێران لە بڵاو کردنەوەیدا هاوکاریی کردبوو).

چەنــد مانگێک پــاش گەڕانەوەیان بۆ پراگ، لیناش لە زانکۆی شــارل

(Charles) لە کۆلیژی فەلسەفە، دەستی کردەوە بە خوێندن. پاش کۆتایی پێهێنانـی، قوتابخانـەی باڵای موتـاڵا ئابوورییەکان کە پێویسـتیان بە مامۆسـتای زمانی ئینگلیسی هەبوو، پۆستی ئاسیستانی بە لێنا دا. پاش دوو سـاڵ، پلەی لێنا بۆ یاریدەدەری مامۆسـتای زانکـۆ بەرزبووەوە. هیـچ کاتێکی ئازادی بـۆ نەمابووەوە. لـە لایەکەوە وانـەی دەگوتەوە، بەکاروباری ناوماڵ ڕادەگەیشـت و لە خوێندندا یارمەتیی کچەکانیشـی دەدا و لـە لایەکی دیکەشـەوە، بەکاروباری کـوردەکان و یارمەتیدانی هاوسـەرەکەی لـەو بـوارەدا ڕادەگەیـی، ئەم کارەشـی، هەمـوو کاتە ئـازادەکان، پشـووی کۆتایـی حەوتوو و ڕۆژانی پشـووی فەرمیی لێ داگیر دەکرد.

■ پلانی دەرکردنی عەبدولڕەحمان لە حیزب

لـە مانگـی ژوئیـەی سـاڵی ١٩٦٤دا، کۆنگـرەی دووهەمـی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە گوندی سۆنە، لە سنووری کوردستانی ئێران بەڕێوەچوو. لەم کاتەدا، عەبدوڵڵا ئیسـحاقی، ناسراو بە ئەحمەد تۆفیق، پیاوی خاوەن دەسەڵاتی حیزب بوو. لێنا لە کاتی مانەوەی نهێنی خۆی لە تاراندا ناسیبووی. لە لاپەڕەکانی پێشووی ئەم کتێبەشدا باسی کراوە. ئـەو هەموو هەوڵی خۆی خسـتەگەڕ بـۆ ئەوەی بە تۆمەتـی خیانەت، عەبدولڕەحمان لە کۆمیتەی ناوەندی حیزب دەربکات. کاریزما، کارامەیی و کەسـایەتیی بەرزی عەبدولڕەحمان نەک هەر ببووە هۆی سەرئێشـە بـۆ ئەحمەد تۆفیـق، بەڵکوو بۆ زۆرێک لە ئەندامانی دیکەی حیزبیش بە هەمان شـێوە بـوو و هەربۆیەش لە بەرژەوەندیـی هەموویان بوو کە لەسـەر ڕێی خۆیـان لایدەن. عەبدولڕەحمان حەوت سـاڵ لەمەوبەر لە لایەن سـاواکەوە دەستبەسـەر کرابوو و پاش ماوەیەک ئازاد کرابوو. ئەحمـەد تۆفیـق و هاوتاکانی دیکـەی، ئەو بابەتەیان کردبـووە بیانوو و داوایـان کرد لە حیـزب دەربکرێت. بـەڵام، عەبدولڕەحمان لەوکاتەدا لـە پراگ بـوو و هەربۆیـەش نەیدەتوانی بەرگری لەخـۆی بکات. ئەو

سەبارەت بە کێشەکانی خۆی لەگەڵ حیزب، لەگەڵ هیچ کەس، تەنانەت لەگەڵ لیناش قسەی نەدەکرد و چاوەڕوانی دەرفەتی گونجاو بوو.

لــە ســاڵەکانی ١٩٦٨ـ ١٩٦٧، کومیتەی مەرکــەزی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەســتی بە خەباتێکی چەکدارانە کرد لەگەڵ ڕێژیمی شــادا. پاش ١٨ مانگ خەبات، دە کەس لە ڕێبەرانی ڕاپەڕینەکە کوژران (ئەحمــەد تۆفیــق لەوێ نەبــوو، واتە لە نێــوان ڕاپەڕیوەکانــدا نەبوو). عەبدولڕەحمان کە لە پراگ دەژیا، لەو ڕاپەڕینەدا بەشــداریی نەکردبوو و بابەتی دەرکردنیشی لە حیزب «لەبیر» کرابوو.

■ داگیر کردنی چێکۆسلۆڤاکی

لەم ســەردەمەدا کە بۆ کوردەکان ســەردەمێکی دژوار بوو، بەهاری پراگیــش لە دووهــەزار کیلۆمیتریــی باکووری ڕۆژئاوای کوردســتان، لــە ژێر پۆســتاڵی «ســوپا دەســتەبراکانی» پەیمانی وەرشــۆ، تایبەت بە دەســتوپێوەندەکانی ســۆڤییەتدا دەیناڵاند. ڕێژەی ئەو کەســانەی کــە لە کاتی هێرشــدا کوژران، هەرگیز ئاشــکرا نەکرا. بــەڵام لە کەس شــاراوە نییە کە ڕێژەیەکــی یەکجار زۆر بوو. چێکۆســلۆڤاکی لە ڕێی «براکانییەوە» ببووە وڵاتێکی داگیر کراو، هەموو هیواکانی ببووە بڵقی ســەر ئاو و پرۆژەکانی ســەبارەت بە ســەقامگیرکردنی «سوسیالیزم بە ڕواڵەتێکی ئینســانییەوە» پێشــێل کرابــوو و لەناوچووبوون. کەس نەیدەزانی کۆمارەکە چی بەسەر دێت.

یەکەم ســاڵ، لە لایەن داگیرکەرانەوە، پێکەوە هەڵکردن و گونجانێکی ســەیر بەســەر وڵاتدا زاڵ بوو. ســۆڤییەتەکان کە لەپــاش داگیرکردنی خوێنینــی مەجارســتان لــە ســاڵی ١٩٥٦دا، هەڵسوکەوتــی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی و کێشەکانی بەرەوڕوویان لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاواییان لەبیر نەکردبوو، لە چێکۆسلۆڤاکی بە پارێزەوە ڕەفتاریان دەکرد. ئەوان بە خۆ بواردن لەو دەستێوەردانانەی دەبووە هۆی دەنگدانەوەی کێشەخولقێن لە ژیانی کۆمەڵگەدا، لە ڕاســتیدا سیاسەتی چاوەڕوانییان گرتبووە بەر

تا ئەوکاتەی کە تووڕەیی خەڵکی چیکۆسلۆڤاکی ورووژێندرا.

لە ســاڵی دووهەمــی داگیرکردندا، پــەردەکان لادران. هاوکات لەگەڵ هاتنەســەرکاری حکوومەتی نوێی هوســاک (Husak)، بە ئەمر و لەژێر چاوەدێریی ســۆڤییەتەکان، پاکتاوکردنەکان لە هەموو بەشەکانی ژیاندا دەستی پێکرد.

ڕۆشــنبیرە ســەرکەش و یاخییەکانیان ناچار کرد لە کارخانەکان کار بکــەن و یان بە پلــەی نزمەوە کردیانیان بە کارمەندی نووســینگەکان. مووچەکەشــیان هەم دیاریکراو بوو و هەم ئەوەندە بوو کە بە ئاســتەم بەشی لانیکەمی پێداویستییە زەروورەکانی ژیانی یەک کەسی دەکرد (بە بــێ ڕەچاو کردنی بنەماڵەکانیــان). ڕێژەیەکیان ناچار بوون وڵاتەکەیان بەجێبهێڵــن. ئــەو دۆخە تەنیا تایبــەت بە ڕۆشــنبیرەکان نەبوو، بەڵکوو هەموو توێژەکانی کۆمەڵگەی دەگرتەوە. هەموو ئەو کەسانەی کە ملیان بۆ خواســتەکانی ڕێژیم ڕانەدەکێشا، سزا دەدران. نەبوونی هەرچەشنە دوورەدیمەنێکــی ئــازادی، هیواکانــی خەڵکــی کردبووە بڵقی ســەرئاو. بوونی سوپای ســوور و «تێکنێسیینەکانی» سۆڤییەت، خۆی دەبووە هــۆی زیاتر کردنی ئەو بێهیوابییە. ئەوەش، بۆ ئەم وڵاتە کە لە ناوەندی ئۆرووپــا هەڵکەوتبــوو و ئازادییەکــەی خــۆی تەنیا لە ســاڵی ١٩١٨دا، پاش دارمانــی ئیمپراتۆریی بنەماڵەی هابســبۆرگ، بەدەســت هێنابوو، تاقەتپڕووکێن بوو.

ســەرەڕای مەترســیی تۆمەتگەلــی خیانەت و زینــدان، زۆر کەس بە شــێوەی نهێنی دەســتیان بە دژایەتیی چالاکانە کرد. هەندێ کەســیش ڕوویان لە دژایەتیی ئاشــکرا کرد. «مەنشــووری ٧٧» پەردەی لەسەر تاوانەکانی نومەنکلاتور (Numenclature) هەڵدایەوە، داوای لە داگیرکەران کرد وڵاتەکەیان بەجێبهێڵن و داوای لە خەڵک دەکرد لە دژی داگیرکەران بوەســتنەوە. بەرهەمــی یاســاغ کراو، بە شــێوەی «ســامیزدات» بڵاو دەکرایەوە.

پرۆفسۆرە ناودار و بەناوبانگەکان لەو کلاسانەی لە ماڵەکانی خۆیاندا

بەڕێوەیـان دەبردن، فەلسـەفە و بابەتگەلی جۆراوجۆری زانسـتی و... یان دەگوتەوە، ڕێژیم بە یارمەتیی شاهێدە درۆزنەکان و کۆکردنەوەی «بەڵگـەی» سـاختە، دژبەرەکانیان بـە خراپەکار و تاوانبـار تۆمەتبار دەکـرد و دەیانخسـتنە زیندانـەوە. بەڕێزان واسـلاو هاوێـل (Vaclav Havel)، ڕۆدۆڵف باتێک (Rudolf Battek) و زۆرێکی دیکەش لەو دەستە بـوون. ئەو دۆخە مـاوەی دوو دەیە بەردەوام بوو. لەو ماوەدا، خەڵکی چێکۆسـلۆڤاکی کەوتنە بەر ئازار و ئەزیەت و سـووکایەتی پێکردن و زینـدان کران و ناچار کـران تووڕەییەکانیان بەرانبەر بە داگیرکەران و دەستوپێوەندییەکانیان قووت بدەنەوە.

ئـەو بەرەیەی لە سـاڵەکانی ١٩٦٠دا لەدایک ببوون، لە دۆخی مرۆڤە دیلەکانـدا گـەورە بوون و وەکوو دایک و باوکەکانیان، لە ژێر خنکاندن و چەوساندنەوەی دۆگمەکان، قەدەغەکراوەکان، سزاکان و چەشنەکانی تەنبێ کردندا دەژیان. وڵاتی چێکۆسـلۆڤاکی کـە پێش جەنگی جیهانیی دووهەم، لە باری فەرهەنگی و پیشەییەوە بە یەکێک لە پەرەسەندووترین وڵاتانی ئورووپایی هەژمار دەکرا، لە ژێر دەسەڵاتی سۆڤییەت و ڕێژیمی بەناو «دێموکراسـیی خەڵکیی»دا ببوو بە وڵاتێکـی پەرەنەگرتوو و بە داگیرکردنـی وڵات، ڕۆژ بە ڕۆژ دۆخەکەی خراپتر دەبوو. دواجار، ٢١ سـاڵ داگیرکاریی «کاتی» پێویسـت بوو بۆ ئەوەی لە پاییزی ١٩٨٩دا، «شۆڕشـی مەخمەری» سـەرهەڵبدات و ببێتە هۆکاری بەجێهێشـتنی یەکجاری وڵات لە لایەن هێزەکانی سۆڤییەتەوە.

لەژێـر دەسـەڵاتی داگیرکەرانـدا، دەزگای بارهێنـان و پـەروەردەی نەتەوەیی، خوێندنی ئەو منداڵانەی کە دایک و باوکیان «سزا درابوون»ی لـە قوتابخانە نازۆرەملییەکاندا یاسـاغ کردبوو. تەمبێ کراوەکان بریتی بـوون لەو کەسـانەی کـە لە مافی کارکـردن بە پێی پسـپۆرییەکەیان، ڕاگرتنی پێگە و کارەکەیان بێبەش کرابوون یان لە حیزب دەرکرابوون. لە ژێر دەسەڵاتی ڕێژیمی پاوانخوازدا، هەموو کردەوە و هەڵسوکەوتێکی خەڵک لە ژێر چاوەدێریدا بوو و هەربۆیەش لە زانکۆکان کەشی ژیانی

پیشەیی ڕۆژ بە ڕۆژ بەرتەسکتر دەبووەوە.

دواجـار، ڕۆژێک هاوڕێکانی لینا ئاگاداریان کردەوە کە قسـە و باس و پڕوپاگەنـدای تۆمەتبارکردنی ئەو بـە «دوژمنی خەڵک» لەگۆڕێدایە. ئـەو هاوڕێیانە بە هێنانی نێوی هەندێک لە کاربەدەسـتانی باڵادەسـتی لینا، بۆیان ڕوون کردەوە کە ئەو کاربەدەسـتانە دەیانهەوێ لینا لەکۆڵ خۆیـان کەنـەوە، چونکە وەک باسـیان دەکرد لینـا «گیانی» هاوکاری لاواز دەکات. بـە کورتی، وادیار بوو کە مانەوەی لینا لە کۆلیژ، چیدیکە پێویست نەبوو.

پاش داگیرکردنی چیکۆسـلۆڤاکی لە سـاڵی ١٩٦٨دا، عەبدولڕەحمان لـە گوتنەوەی وانە لە قوتابخانەی بـاڵای موتاڵا ئابووریەکان (EHEE) بەردەوام بوو، بەڵام ئەو کە بەهۆی وێناسازیی کۆمەڵگەی چیکۆسلۆڤاکی بە شێوازی یەکیەتیی کۆماریی سۆڤییەت و بە تایبەتی نۆژەنکردنەوەی توندئاژۆیانـەی توتالیتاریسـم، خوێـن لە جەرگی دەتکا، سـاڵی ١٩٧٠، پێشـنیازی دەوڵەتی عەراقی سەردەمی حەسـەن ئەلبەکری، سەبارەت بە هاوکاری کردن لەگەڵ وەزارەتی پلاندارێژیی ئەو وڵاتە بۆ داڕشتنی گەڵاڵەی پەرەسەندنی درێژخایەن قبووڵ کرد.

لەگەڵ بەجێهێشـتنی توتالیتاریسم لە چیکۆسلۆڤاکی، عەبدولڕەحمان دەڕۆشـت بۆ ئـەوەی لەگەڵ ڕێژیمێکـی دیکە کار بـکات، ڕێژیمێک کە ئەویـش لـە ئازاردانـی خەڵکەکـەی خۆی کەمـی دانەدەنا. سـەرەڕای ئـەوەش، بە چوونی بۆ عەراق، عەبدولڕەحمان لە نیشـتمانەکەی خۆی واتە کوردستان و خەڵکەکەی خۆی نزیک دەبووەوە و لەوێ بارودۆخی پێویسـت بۆ خەباتی بۆ دەڕەخسـا، بۆ عەبدولڕەحمان، چیکۆسلۆڤاکی سەرەڕای هەموو کێشە و ئاریشە و نەهامەتییەکانی، وڵاتێکی شارستانی دەهاتـە هەژمار، لە حاڵێکدا کە کوردەکان، خەڵکانێکی بێئەنوا، هەژار و پەرەنەسەندوو بوون و لە دواکەوتووییدا ڕاگیراو بوون.

لـە پراگ، لینا بە تەنـێ مابووەوە و دەبوو بـۆ دەرچوون لەو دۆخە نالەبـارە کـە لەبـەردەم ئـەو و کچەکانیـدا بـوو، ڕێگایەکـی گونجاو

بدۆزێتەوە.

■ دەست لەکار کێشانەوەی لێنا

کچە بچکۆلەکەی، دەبوو ساڵی داهاتوو بچێتە زانکۆ. بەڵام، ناکۆکیی نێوان لێنا و بەرپرسانی زانکۆ و ملکەچ نەبوونی لەبەرانبەریاندا، ئەو مەترسییەی هەبوو کە کاریگەریی لەسەر خوێندنی کچەکەی دابنێت. هەربۆیەش، پاش بیرکردنەوە و ڕامان لەو بابەتە، لێنا بڕیاڕی دا کە پێش لەوەی دەری بکەن، خۆی دەست لەکارکێشانەوەکەی ڕابگەیەنێت. ئەم بڕیارە، بەو مانایە بوو کە ئەو دەبوو بەدوای کارێکی دیکەدا بگەڕێت. عەبدولڕەحمان هێشتاش لە عەراق بوو و لەوێ کاری دەکرد. بەڵام ئەو یارمەتییە ماڵییەی کە لە لایەن ئەوەوە بە لێنا دەگەییشت، پچڕپچڕ و نابەردەوام بوو. لە ڕاستیدا، تەنیا داهاتێک کە لێنا دەیتوانی حیسابی لەسەر بکات، بریتی بوو لەو مووچەیەی کە وەری دەگرت.

بەخۆشییەوە، بەڕێوەبەری کورسیی مارکسیسم ـ لێنینیسم لە زانکۆی تکنیکی، بە نێوی ئانتۆنین خیبا (Antanin CHyba)، هاوڕێی عەبدولڕەحمان بوو. ئەو، کۆنە کۆمۆنیستێک بوو کە بە شێوەی نهێنی یارمەتیی ئەو ڕۆشنبیرانەی ئەدا کە لەسەر کارەکانیان لادرابوون بۆ ئەوەی بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکان بابەت بنووسن. پاشان، نووسینەکانیانی بە ناوی خۆی یان هاوڕێکانیەوە بڵاو دەکردەوە و دواتر داهاتی نووسینەکەی بۆ وەردەگرتن. ئانتۆنین بە مەبەستی بەلاڕێدا بردنی ڕێنماییەکانی باڵادەستەکانی خۆی، داهێنانی جۆراوجۆری دەکرد و لەوەیکە گاڵتەی بە نۆمانکلاتۆرەکان کە زۆربەشیان لە ناسیارەکانی خۆی بوون دەکرد، کەیف خۆش دەبوو و ئەوەش دەرخەری ئەوە بوو کە ئەو لە هەموو توێژەکان، دۆست و دوژمنی خۆی هەبوو.

ئەو بە لێنای گوت: «من ئێستاکە لە بواری ژینگەدا لقێکم کردۆتەوە. سەرپەرشتیارییەکەی لە ئەستۆی پرۆفسۆر «نۆڤی»یە Novy و تۆش جێگریی ئەوت لە ئەستۆ دەبێت». ئەو بڕیارە خێرایە، لێنای غافڵگیر کرد.

بەڵام، ئانتۆنین وەکوو ئەوەی بڕیارێکی زۆر ئاسـاییی و سـانای دابێت خۆی پیشان دەدا. لە ڕاستیدا، پرۆفسۆر «نۆڤی»یش لە جەنگەی پاکتاو کردنەکاندا، لە پێگەی مامۆستایەتی بیرکاری بێبەش کرابوو. ئەو هیچی سـەبارەت بە ژینگە نەدەزانی و لێناش لەو کەمتری دەزانی. سەرەڕای ئـەوە، ئانتۆنین بە هێنانەوەی شـێورڕێوییەکی زۆر، ئەو پۆسـتەی بە تایبەتی بۆ پرۆفسـۆر نۆڤی داتاشـیبوو و بەم چەشنە، پێکهاتەی لقێکی نوێـی بنیات نا. ئـەو ڕێگەچارە گەپچاڕ و سەیروسـەمەرەیە، دەیتوانی بۆ هەرسـێکیان کێشەخولقێن بێت. بەڵام لەوکاتەدا، ئەوە بەجۆرێک مل ڕانەکێشـان بۆ خواسـتە کافکاییەکانی ڕێژیم لە بواری تەمبێ کردن و سزاداندا بوو.

■ هەڵبژێرانی عەبدولڕەحمان بە سکرتێریی گشتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

لەوکاتەوە کە ئەرتەشـی شـا لە سـاڵی ١٩٦٨دا، ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێرانـی لەناو بردبوو، ئـەو حیزبە زۆر لاواز ببـوو و بەنیوەگیانـی درێژەی بە بوونی خۆی دەدا. سـاڵەکانی ١٩٧٤-١٩٧٠، عەبدولڕەحمان، هاوکات کە لە وەزارەتخانەی پلاندارێژیی عەراق کاری دەکـرد، بـە هاوکاریی جەماعەتێکـی دیکە لـە ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران، توانیبووی، ڕێکخراوێک بە پێکهاتەیەکی سیاسیی تۆکمە وەڕێبخاتەوە و بەرنامە سیاسییەکەی دابڕێژێت. ساڵی ١٩٧١، لە سـێهەمین کۆنفرانسـی حیزبدا، بۆ بەدەستەوەگرتنی پۆستی سـکرتێری گشتی پێشـنیار کرابوو. پاش دوو ساڵ، کۆنگرەی سێهەمی حیزب گیرا. لەم کۆنگرەیەدا، عەبدولڕەحمان وەکوو سـکرتێری گشـتی حیـزب هەڵبژێردرا و لەوکاتەوە تـا کاتی مەرگەکەی، لە ڕەوتی هەموو کۆنگرەکانی حیزبی دێموکراتدا، عەبدولڕەحمان بۆ پۆسـتی سـکرتێری گشتی هەڵدەبژێردرایەوە.

پـاش ئـەو کۆنگرە مێژووییە، عەبدولڕەحمـان داوای لە لێنا کرد بێت

بۆ بەغا. ئەو دەیویست سەبارەت بە بابەتێکی گرینگ قسەی لەگەڵ بکات. ئەوان لە یەکێک لە دوورگەکانی دیجلە پیاسەیان دەکرد. هەوا دڵڕفێن بوو. خۆرەتاو زەویی گەرم کردبوو و لینا لە بن پێی خۆیدا هەستی بە هێزی سروشت دەکرد. عەبدولڕەحمان باسی شکستی حیزب لە پێنج ساڵ لەوەبەر، باسی «سلێمان»ی دەکرد کە لە ماوەی ژیان و مانەوی نهێنی لە تاران ناسیبووی و هەروەها باسی ئەو ساڵە تووش و دژوارانەی دەکرد کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران تێیپەڕاندبوون. باسی هەوڵەکانی خۆی دەکرد لە ماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا لە بواری نۆژەنکردنەوە، چاکسازی، زیندوو کردنەوە و تۆکمە کردنی ئەو حیزبەدا.

پاشان، وەک ئەوەی تا ئەو کاتە هیچی نەکردبێت، پرسیاری لە لینا کرد کە ئایا لە ڕەوتی ئەو خەباتەدا یارمەتی دەدات؟

لێناش لە وەڵامدا بە پرسیارەوە وەڵامی دایەوە: «مەگین من تا ئێستا یارمەتیم نەکردووی؟» لە ڕاستیدا، پرسیارەکەی عەبدولڕەحمان لە دڵی لینا گران هاتبوو و حەپەساندبووی. هەڵێنجانی ئەو لەو پرسیارەی مێردەکەی ئەوە بوو کە تا ئەو کاتە هەرچی کردووە، لە لایەن هاوسەرەکەیەوە فەرامۆش کراوە.

پاشان عەبدولڕەحمان بەردەوام بوو: «من بۆ سکرتێریی گشتی حیزبی دێموکرات هەڵبژێردراوم. لەمەبەدوا، هەم بەرپرسایەتیم مەزنتر دەبێت و هەم پێویستە زیاتر کار بکەم.»

هەواڵەکە، هەواڵێکی گرینگ بوو، بەڵام لینا، لە مێشکی خۆیدا بیری لە پێگەی خۆی وەکوو هاوسەری ڕێبەری حیزبێکی نایاسایی و ئەرکە پەیوەندیدارەکانی دەکردەوە! لە لایەکەوە دەیبینی کە هاوسەرەکەی زۆر خۆشحاڵە و شانازی بە پێگەکەیەوە دەکات و لە لایەکی دیکەشەوە، نەیدەزانی چلۆن پیرۆزبایی لە هاوسەرەکەی بکات. هەربۆیەش، بە بێ ئەوەی وشەیەک بە زاریدا بێت، هاوسەرەکەی ماچ کرد.

عەبدولڕەحمان: «وادیارە پێگەی مێردەکەت، هیچ بایەخێکی بۆ تۆ

نییه‌!»

لێنـا: «به‌هیـچ شـێوه‌یه‌ک وا نییه‌! ته‌نیـا ڕێگه‌م پێبده‌ تـا بتوانم ئه‌و هه‌واڵه‌ی پێت داوم لای خۆم هه‌ڵبتاوێنم».

لێنا زیاتر له‌ بیسـت سـاڵ بـوو له‌گه‌ڵ کورده‌کاندا بـوو. ئیتر وه‌کوو ئه‌وانـی لێهاتبـوو و خۆی بـه‌ ئه‌ندامێکی ئه‌وان ده‌زانـی. جگه‌ له‌وه‌ش، مه‌گیـن خـودی لێنا له‌ به‌ره‌ی ئه‌و چێک ـ ئاڵمانییانـه‌ نه‌بوو که‌ له‌ کاتی خۆیدا وه‌کوو کورده‌کان بێئه‌نوا و چه‌وساوه‌ بوون!ڕاستییه‌که‌ی ئه‌وه‌یه‌ که‌ ئێسـتا، به‌دوور له‌ ناوه‌ندی خه‌بات، له‌ پراگ ده‌ژیا. کچه‌کانیشـی که‌ گـه‌وره‌ ببوون، هه‌ر له‌و شـاره‌دا ده‌ژیان. هه‌رچه‌نـد که‌ کچه‌کان ورده‌ ورده‌ لـه‌ لێنـا دوور ده‌که‌وتنـه‌وه‌، بـه‌ڵام لێنـا بڕوای بـه‌وه‌ هه‌بوو که‌ سه‌ره‌ڕای گه‌وره‌ بوونیان، هێشتاش پێویستیان به‌و هه‌بوو. هه‌ربۆیه‌ش بـۆ جارێکی دیکه‌ش لێنا له‌ نێـوان دوو بژارده‌دا مایه‌وه‌ و دوودڵ بوو. یه‌کیـان به‌ سـوود بوون بـۆ نه‌ته‌وه‌یه‌ک که‌ زۆری خۆشده‌ویسـتن و ئه‌وی دیکه‌شیان مانه‌وه‌ له‌گه‌ڵ کچه‌کانی بوو.

لێنـا ڕووی له‌ عه‌بدولڕه‌حمان کرد و پرسـیاری لێکـرد: «منداڵه‌کان چییـان لێ به‌سـه‌ر دێـت؟» لێنا ده‌یویسـت بزانێت کـه‌ مێرده‌که‌ی له‌و بواره‌دا چ پێشـبینییه‌کی کردووه‌. وه‌ڵامی مێرده‌که‌ی ئه‌وه‌ بوو: «ئه‌وان ئیتر گه‌وره‌ بوون و ده‌توانن له‌سه‌ر پێی خۆیان بوه‌ستن».

لێنا: «پێویسته‌ قسه‌یان له‌گه‌ڵ بکه‌یت. گرینگیی پله‌ نوێیه‌که‌ی خۆت و هه‌روه‌ها ئه‌و به‌رپرسـایه‌تییه‌ی به‌و بۆنه‌وه‌ ده‌که‌وێته‌ ئه‌سـتۆت، بۆیان ڕوون بکه‌وه‌. ئه‌وسا ئه‌وان باشتر له‌ ژیانی خۆیان تێده‌گه‌ن، ئه‌و ژیانه‌ی کـه‌ زۆربه‌ی کاته‌کان به‌ هۆی نهێنی پارێزیی و چالاکییه‌ زه‌رووره‌کانی ئێمـه‌وه‌ لێیان ئاڵۆز بـووه‌. ئه‌وه‌ ده‌بێته‌ هۆی ئه‌وه‌یکه‌ زیاتر شـانازیت پێـوه‌ بکه‌ن و ڕه‌نگیشـه‌ یارمه‌تییان بدات تا سـاناتر لـه‌ دڵه‌ڕاوکێکانی تایبه‌ت بـه‌ ته‌مه‌نیان ڕزگاریان بێت. ڕه‌نگـه‌ یارمه‌تیمان بده‌ن، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر ته‌نیا به‌ تێگه‌یشتن له‌ ئێمه‌ بێت.»

به‌ڵام شتێکی ئه‌وتۆ هه‌رگیز جێبه‌جێ نه‌ده‌کرا. چونکه‌ به‌رزبوونه‌وه‌ی

پلەی ئەو بۆ سـکرتێری گشـتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، دەبوو بە تەواوی بە نهێنی بمایەتەوە. هیچ کەس، تەنانەت منداڵەکانیشی نەدەبوو لێی ئاگادار بنەوە.

ئەمجارەیـان، مانـەوەی لینـا لە بەغدا گەشـت و گـوزاری پێوە بوو. شـوێنگەلێکیان بینـی بە ناوی سـیحراوییەوە، وەکوو: سـەمرە، ئەبوو دۆلف، ناسیرییە، ئوور، لاگات ـ وارکا لە باشووری بەغدا، لە باکووریش دەربەندیخان، سلێمانی، مووسڵ، ئەربیل، نەینەوا، نەمروود، هاترا و...یان بینی و سەردانی بەنداوی دووکان و زەریاچەی حەبانییەیان کرد. بابل و دەروازەی تیسـفوونیان بینی.. لە بازاڕە جۆراوجۆرەکاندا پیاسـەیان کرد. سەردانی مۆزەخانەی بەغایان کرد و کەلەپوورە دۆزراوەکانی بن زەوییان بینی. سەیری شانازییەکانی بەینولنەهرەینی کۆن و هەموو ئەو شتانەیان کرد کە ئەم ناوچەیە بە دونیای بەخشیبوو..

پاشـان لینا بە تۆشەبەرەیەک لە ناسینە نوێیەکان، ئاگادار لە ڕازێکی گەورە و سەرێکی تەژی لە پرسیاری بێوەڵام گەڕایەوە بۆ پراگ.

پاش سـاڵێک، عەبدولڕەحمان لە بەغدا گەڕایەوە و دەستی کردەوە بە وانە گوتن لە قوتابخانەی باڵای زانستە ئابوورییەکان. لەوە بەدوا، ئەو، پەیوەندییە هاوشـێوەخواز و هاوتەرازکەرەوە باوەکانی نێو زانکۆکانی بـە زەحمەت پێ تەحەموول دەکرا. بەڵام لـەو ڕووەوە کە دیپلۆماتێکی کارامـە بوو، پەیـڕەوی لێدەکردن و لەگـەڵ هاوکارەکانی و هەروەها بەرپرسـانی ئیداریـی دەوڵـەت پەیوەندیی باشـی دەگـرت و بە هۆی بیرتیـژی، ڕووخۆش بوون و زانسـتی خۆی، سـەرنجی خەڵکی بۆلای خۆی ڕادەکێشـا و هەموو ڕێزیان لێ دەگرت. لەگەڵ ئەوەشدا، لە باری فیکرییـەوە، لەگەڵ بابەتی هاوشـێوەخوازی ناکۆک بوو. ئەو بە باشـی ئاگاداری بەرپرسایەتییە گەورەکەی خۆی بوو کە ڕزگاریی نەتەوەکەی بوو لە چەوسانەوە و سووکایەتی پێکردن. ئەوەش بە گۆڕینی ڕێژیمی دیکتاتۆری پاشـایەتی لە ئێراندا مسـۆگەر دەبوو. هەروەها پێویسـتی بـەوە هەبـوو کە لەوەبـەدوا، لە هەرشـتێک کـە بازنـەی بۆچوون و

چالاکییەکانی بەرتەسک دەکردەوە، خۆی بەدوور بگرێت. لەو ڕووەوە، ڕێژیمی چێکۆسلۆڤاکی بۆ ئەو دەست و پێ گیر بوو. جگەلەوەش، بە شاراوەیی مانەوەی پلەی سکرتێری گشتیش، کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر سووک کردنی ئەرکەکانی نەبوو.

■ یاساغ بوونی مانەوە لە چێکۆسلۆڤاکی

لە مانگی فێڤرییەی ١٩٧٦دا، عەبدولڕەحمان بانگهێشتێکی لە لایەن نووسینگەی پۆلیسی تایبەت بە پێڕاگەیشتن بە کاروباری بیانییەکان لە پراگ بەدەست گەییشت. لە گەڕانەوەدا لە نووسینگەکە، زۆر بە کورتی گوتی: «مۆڵەتی یەک مانگیان پێ داوم کە خاکی چێکۆسلۆڤاکی بەجێبهێڵم». ئەو ڕستەیەی بە بێ هیچ شی کردنەوەیەک گوت.

لێنا: «بۆچی؟ مەگەر چی ڕووی‌داوە؟ تۆ بەنیازی چی بکەیت؟»

عەبدولڕەحمان کە زۆریش تووڕە بوو، وەڵامی دایەوە: «هیچ، چێکۆسلۆڤاکی بەجێدەهێڵم.»

لێنا: «ئەی من و منداڵەکان دەبێ چی بکەین؟»

عەبدولڕەحمان وەڵامێکی پێ نەبوو و تەنیا شانی هەڵتەکاند. ئەو دەرکردنە، دەیتوانی چ کاریگەرییەک لەسەر داهاتووی ئەندامانی بنەماڵەکەیان دابنێت؟

بۆ بەخۆدا هاتنەوە و ئاسایی بوونەوە، لێنا پێویستی بە کات بوو.

ئەو هەواڵە، هیچی باشی لێ شین نەدەبوو. عەبدولڕەحمان کاتی بە فیڕۆ نەدا. پێنج ڕۆژ پاش هەواڵی دەرکردنیان لە لایەن پۆلیسەوە، بە جانتایەکی سووکەڵەوە ڕێگەی پاریسی گرتەبەر. کاتی سواربوونی لە شەمەندەفەرەکە بە لێنای گوت: «شتومەکی دیکەم بە پۆست بۆ بنێرە».

نیگەرانییەکانی لێنا سەبارەت بە بنەماڵەکەی سەری هەڵدەدایەوە. مینا کە لەو کاتەدا ٢٣ساڵ تەمەنی بوو و سەردەمی گەنجییەتی خۆی بە ئاڵۆزی بردبووەسەر، دواجار خۆی بۆ وەرگرتنی دیپلۆم ئامادە دەکرد.

هیوا ٢١ساڵی بوو و لە زانکۆی براتیسلاوا، سەرقاڵی خوێندنی ئابووری بوو. ئەوان لە بەرانبەر ئەو دۆخەدا چ هەڵوێستێکیان دەبوو و ئایا مافی ئەوەیان پێدەدرا خوێندنەکەیان تەواو بکەن؟

پاش سێ مانگ، لینائیش لە هەمان نووسینگەی تایبەت بە پێڕاگەیشتن بە کاروباری بیانییەکان بانگهێشتی بۆ هات. ئەمجارەیان ئەو کارمەندەی کە هەمیشە بە کاروباری ئەماندا ڕادەگەییشت و هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەیانی دەناسی لەوێ نەبوو. پۆلیسێکی نەناسراوی لێ بوو. پۆلیسەکە پیاوێکی کورتەباڵا، گەڕاوە و بە ڕواڵەت ڕووخۆش بوو، بە لینای ڕاگەیاند: «خاتوون، مۆڵەتی مانەوەی بەڕێزتان و کچەکانتان چیدیکە نوێ ناکرێتەوە و هەربۆیەش داواتان لێدەکەین کۆماری چێکۆسلۆڤاکی بەجێبهێڵن».

ئەو پیاوە پۆلیسە، لە ڕاستیدا نوێنەری دەسەڵاتی سیستمێکی سیاسی بوو، سیستمێک کە هاوکات لەگەڵ ئارام بوونەکەی، لە دەسەڵات و هێزی خۆی دڵنیا بوو. لینا وەک کارەبا لێی دابێت، چەند ساتێک بێخوست مایەوە. پاش ئەوەی مێشکی کەوتەوە کار و هێزێکی بە بەردا هاتەوە، بە ئەدەب و ڕێزەوە گوتی: «وابزانم خراپ تێگەیشتنێک لە ئارادایە». هەرچەند دەیزانی هیچ خراپ تێگەیشتنێک لەئارادا نییە.

پیاوە پۆلیسەکە، وتەکەی خۆی دووپات کردەوە.

لینا: «کەواتە، داوا دەکەم لە بەڕێزتان، نامەی دەرکردنی ئێمە لەم وڵاتە بە نووسراوە بدەنە دەستمان.»

دیارە لینا باش دەیزانی کە ئەو ڕێژیمە، هیچ بەڵگەنامەیەکی نووسراو سەبارەت بە کارکرد و هەڵسوکەوتی خۆی بە نیسبەت خەڵکەوە نادات بە دەستەوە و پاشانیش گوتی: «بە بێ بەڵگەنامەی نووسراو، من لەم وڵاتە ناڕۆمە دەرەوە. لە بیریشی بکەن کە من هاتوومەتە ئێرە و وای دابنێن کە من وەڵامی بانگهێشتەکەتانم نەداوەتەوە. ئێمە هیچی خراپمان نەکردووە. جگە لەوەش، تا ئەم کاتە، تەنانەت هۆکاری دەرکردنی ئێمە لەم وڵاتەتان پێنەگوتووین.»

پیــاوی پۆلیــس: «ئەگەر بێتــاوان بوونایە، دەوڵەتــی کۆماری دەری نەدەکردن!»

لینا: «ئەم تاوانە کامەیە، هاوڕێ؟»

شــێوازی ئاخاوتنەکان ڕوویان لە تووڕەیی نابوو. لینا، بە ئەنقەســت وشەی «هاوڕێ»ی بە شێوەیەکی مانادار بەکار هێنا و گوتی: «ئەزانی چی دەکەین، هاوڕێ؟ هەر ئێســتا من لە نووسینگەکەی بەڕێزت دەچمە دەرەوە. چــاوەڕێ دەکــەم هەتــا نامــەی فەرمیی ئێوە ســەبارەت بەم دەرکردنە و ڕوونکردنەوەی پێویست لەو بارەوە بگاتە دەستم. تا کاتی وەرگرتنی ئەو نامەیە، ئێمە یەکترمان نەبینیوە!»

پیــاوی پۆلیس: «هەر بیریشــی لێ مەکەوە! کاتێــک بڕیارێک دراوە، ئێوە ناچارن ملکەچی بن. ئەم گاڵتەجاڕییەش لەگەڵ من ببڕێنەوە خانم، خۆیشت باش دەزانی هیچ سوودی نییە!»

لینــا کــە لە هەموو ئــەو ماوەیەدا بە پێوە وەســتابوو، لەپڕ هەســتی بــە ماندوویەتی کــرد. هەربۆیــەش کورســیەکی هەڵگــرت و بەرانبەر بەردەنگەکەی داینا و لەســەری دانیشــت. لە ڕاســتیدا، لینــا پێوە ببوو. هەربۆیەش بەردەوام بوو و گوتی: «ئەگەر پێویست بکات دەڕۆم بەڵام بــە تەنــێ. ئێوە مافی ئەوە بــە کچەکانم دەدەن کــە خوێندنەکەیان لێرە تەواو بکەن. ئەوان بێتاوانن و ئێوەش باش دەزانن!»

پیــاوە پۆلیســەکە هاتە قســە و گوتی: «تۆ ناچــارم دەکەیت وتەکانم دووپات بکەمەوە. بە هێچ شێوەیەک، نە تۆ و نە کچەکانت، ناتوانن لێرە بمێننەوە. هەرسێکتان دەبێ ئێرە بەجێبهێڵن.»

ئەو سەرلەنوێ بە ئارامی و ئەرخایەن قسەی دەکرد. لینا هیچی دیکەی لەدەســت نەدەهات. هەربۆیەش سەرلەنوێ ســەبارەت بە نووسراوەی دەرکردنەکەیان و ڕوونکردنــەوە لەو پەیوەندییەدا پێداگریی کردەوە و گوتی کە لەغەیری ئەوەدا، ئەوان بۆهیچ کوێ ناڕۆن.

ئــەو پیــاوە کــە لــە ســەرەتای گفتوگۆکەیانــدا، زۆر شارســتانیانە هەڵسوکەوتی دەکرد، لە جێی خۆی هەستا و بەدەنگی بەرز دەستی کرد

بە قسە کردن. چیدیکە تاقەتی ئەو ژنە و پێداگرییەکانی نەمابوو، گوتی: «چ بمێننەوە و چ لەم وڵاتە بڕۆن، هیچ جیاوازییەکی بۆ من نییە. ئەگەر ملکەچ نەبن، لە کاتی دیاریکراودا، ئێمە دێین و تا سنوور دەتانبەین. ئەوسا بەڕێزت دەبێ بە تەنێ ئیش و کارەکانت تێپەڕێنیت».

لێنا: «کەواتە، بۆچی بۆ بڕیارێکی وەها گرینگ، خۆتان لە دانی نووسراوە دەبوێرن؟ بۆچی بە بێ هیچ ڕوونکردنەوەیەک، ئەمرمان پێدەکەن لەم وڵاتە بڕۆین؟ چلۆن چاوەڕوانمان لێدەکەن کە بە بێ هیچ نووسراوەیەک، ملکەچی بەجێهێشتنی وڵات بین؟»

ئەمجارەیان ئەو هاوڕێیە، بەڕاستی تووڕە بوو. تا ئەو کاتە، زۆر شارەزایانە بە چێکی قسەی دەکرد. بەڵام، تووڕەییە لەڕادەبەدەرەکەی، بووە هۆی دەرکەوتنی شێوەزارە خەستە ڕووسییەکەی، واتە زمانە دایکییەکەی. ئەو لە ڕاستیدا، «ڕاوێژکار»ێکی خەڵکی سۆڤییەت بوو.

بابەتەکە جیددی بوو. «ڕاوێژکار»ەکانی سۆڤییەت تەنیا لە بابەتە «جیددی و هەستیار»ەکاندا لە باتی مەئموورە پلە نزم و بوروکراتە چێکییەکان کارەکانیان تێدەپەڕاند. تا ئەو کاتە، لێنا پێی وابوو کە موستەشارەکانی سۆڤییەت لە سێبەردا ماونەتەوە و تەنیا لە پشتەوەی کاربەدەستە باڵاکانی ڕێژیم ڕۆڵ دەگێڕن، بە پێچەوانەوە، ئەوە کاربەدەستە مل ئەستوورەکانی ڕێژیم بوون کە ئەو کارانەی کە سۆڤییەتەکان بە مەبەستی ئاگادار نەبوونەوەی ڕای گشتی لە دەستێوەردانیان لە کاروباری وڵات، خۆیان نەیاندەویست ئەنجامی بدەن، لە بری ئەوان ئەنجامیان دەدا. بەڵام بەهۆی ئەم پێشهاتەوە، لێنا تێگەیی کە لەهەڵەدا بووە.

لێنا بە زەینی ئاڵۆز و شپرزەوە لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس هاتە دەرەوە. ئەو کەسی نەبوو تا ئەوەی بەسەری هاتبووی بۆ بگێڕێتەوە. کچە گەورەکەی خۆی بۆ تێپەڕاندنی دیپلۆم و کچە بچووکەکەشی بۆ دانی تاقیکردنەوەکانی زانکۆ ئامادە دەکرد. هەربۆیەش، نەیدەویست بە هەواڵی دەرکردنەکەیان تووشی شۆکیان بکات. بەڵام شاردنەوەی

ڕازێک بەو قورساییە و هەڵسوکەوت کردن بە شێوەیەک کە وەک بڵێی هیچ ڕووی نەدابێت، بەڕاستی کارێکی قورس و دژوار بوو!

پاش هاتنە دەرەوە لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس، لینا ماوەیەک بە پێ ڕۆشت. پیاسە کردن شێوازێک بوو کە بۆ بەخۆدا هاتنەوە و لادانی بەربەستەکان کەڵکی لێوەردەگرت.

هەرچۆنێک بێت، ئەو ناچار بوو نیشتمانەکەی بەجێبهێڵێت.

پێویستە ئەو ڕاستییە لەبەرچاو بگرین کە دۆخی لینا، دۆخێکی سەیر و سەمەرە بوو. بە پێکهێنانی ژیانی هاوبەش لەگەڵ ئێرانییەک، لینا شوناسی نەتەوەیی خۆی لەدەست دابوو و ناچار کرابوو شوناسێکی نەتەوەیی دیکە وەربگرێت (ئەوە دەرئەنجامی ئەو ڕێکەوتننامەیە بوو لە ساڵی ١٩٥٠دا، لە نێوان ئێران و چێکۆسلۆڤاکی دا واژۆ کرابوو) و پاش گەڕانەوەشی بۆ نیشتمانەکەی خۆی، نەیتوانیبوو شوناسی نەتەوەیی خۆی وەربگرێتەوە. هەربۆیەش، لەو وڵاتەدا وەکوو بیانییەک دەژیا و ئێستاش، لە وڵاتەکەی خۆی دەرکرابوو.

لینا هەرچی دەکرد بۆی قووت نەدەچوو کە لە وڵاتەکەی خۆی دەرکراوە. ئەو وڵاتە، وڵاتی زێدی بوو. لەوێ بوو کە عەشقە گەورەکەی ژیانی ناسیبوو و یەکەمین کچیشی هەر لەوێ لەدایک ببوو. لەوێ خوێندنی تەواو کردبوو و دواتریش وانەی گوتبووەوە. ئەو هەم ئیشەکەی خۆشدەویست و هەم خوێندکارەکانی. هاوڕێکانی لەوێ بوون. لە ناخەوە شاری پراگی خۆشدەویست. هەموو کۆڵان و پەسیوەکانی، تایبەت بووایەن یان نە، بینا مێژووییەکانی، گوزەرگا ناوبڕەکانی، شارە کۆنەکەی بە میعماریی شێوازی گوتیکیەوە، بینا گۆ شکڵەکانی و سەرداوە ژێر زەوینییەکانی و هەروەها مێژووەکەی، کە دەکرا لە ڕووی شێوازە جیاوازەکانی میعمارییەکەیەوە پێی‌بزانرێت، هەمووی بە تەواوی دەناسی. ئەو چیدیکە نەیدەتوانی پەیوەندی بەو سەرچاوە نهێنییانەوە بگرێت کە زانیاریی متمانەپێکراویان پێدەدا، سەبارەت بە دۆخی وڵاتە داگیرکراوەکەی. ئەو کوتوپڕ هەستی بە هەموو ئەم شتە

گرینگانە کرد، ئەو شتانەی پێشتر بیری لێ نەکردبوونەوە.

لێنـا، ئەم هەواڵە ناخۆشـەی لـە ڕێی تەلەفۆنەوە بـە عەبدولڕەحمان ڕاگەیاند. عەبدولڕەحمان ئەمجارەشیان بە گاڵتەیەک بەرانبەر بەو هەواڵە هەڵوێسـتی گرت (ڕەنگە بەو شـێوەیە دەیویسـت هەنـدێ لەبارگرانیی سەرشانی لێنا سووک بکات؟): دەبینی! ئێستا، ئەگەر حەزیشت لێ نەبێ، مەجبووری بێیت بۆلای من!»

کچەکانـی دەبـوو بـڕۆن بۆ سـوئێد. لێنـا لە نێـوان دوو بـژاردەدا مابـووەوە. لەگەڵ کچەکانی بڕوات بۆ سـوئێد یان بچێت بۆ فەرانسـە بـۆلای عەبدولڕەحمان؟ هەڵبژاردنێکی قـورس و تەنانەت بەئازار بوو. ئەوەی لێنا پێش لە هەموو شـتێک لە ناخی دڵیەوە دەیویسـت، پێکەوە بوونی هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەیان لە یەک شوێن بوو.

لێنـا، کە دەنگی زایەڵەیەکـی بەرزی پەیدا کردبـوو، گوتی: «دەتوانم لەگەڵ کچەکانم بڕۆم بۆ سوئێد».

عەبدولڕحمـان: «وازیان لێ بێنە با بۆخۆیان بژین. ئەوان ئیتر منداڵ نین. لای ئەوان ناتوانی خۆشی ڕابوێری. بەڵام لێرە گەلێک کار هەیە کە کەس وەک تۆ دەرەقەتیان نایە. منیش لێرەم، دەبینی، هەموو شتێک باش دەبێت. ئێمە یەکترمان خۆشـدەوێت و پێکەوەش پیر دەبین. بەهەرحاڵ، ئەگەر لەگەڵ منداڵەکانیش بڕۆیت، دواجار ئەوان ڕۆژێک بەجێت دەهێڵن و تۆ بە تەنێ دەمێنییەوە».

لێنـا مێردەکەی هەڵبژارد و بڕیارێدا بـڕوات بۆ پاریس کە بە وتەی هاوسەرەکەی، لەوێ پێویستیان پێی هەبوو.

هەنـدێ لە منداڵەکان، شـانازی بە دایک و بابیانـەوە دەکەن. خەبات و ورەبەرزییـان و هەروەهـا ڕابوونیـان بۆ دەسـتەبەرکردنی ئامانجە بەرزەکانیـان دەبێتە هـۆی فەخریان. بە پێچەوانەشـەوە منداڵگەلێکیش هـەن کـە لێکدانەوەیـان ئەوەیـە کە خەبـات و ماندووبوونـی دایک و بابیـان، بووەتە هۆی ئازار و خەسـار گەیاندن بـەوان. کچەکانی لێنا و عەبدولڕەحمان لەم دەستە بوون. ئەوان، جگە لەو «تێکهەڵچوونەی لە

نێوان بەرەکان» دا هەیە و گرفتی هەموو گەنجەکانە، هۆکاری گونجاوی خۆشـیان هەبـوو: هەرچەند ئەوان لـەو چەرمەسـەرییانەی تا تەمەنی شـەش ساڵ بەسەریاندا هاتبوو، شتێکی ئەوتۆیان لەبیر نەمابوو، بەڵام ئـەو نەهامەتییانە لە نەسـتی ئەواندا کاریگەریـی زۆری دانابوو: ژیانی نهێنـی درێژخایـەن لە تاران و بەغا کە ببـووە هۆی بێبەش بوونیان لە هەموو ئەو شتانەی لە ژیانی منداڵێکدا پێویستن، ببووە دڵگرانییان. هەر بەو هۆیەشەوە، زۆر دڵیان بە دایکیان خۆش نەبوو.

سەرەڕای ئەوەش، لینا پێش بەجێهێشتنی چێکۆسلۆڤاکی، دەیویست لە هۆکاری دەرکردنەکەیان ئاگادار بێت. لە بەڕێوەبەرایەتیی پێڕاگەیشـتن بـە کاروبـاری بیانییەکانەوە، ناردیـان بۆ کومیتـەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیست. لەوێ، کەس ئاگای لەو بابەتە نەبوو. دیارە ئەوە، ئەو شتە بـوو کە ئەوان دەیانگوت. بەڵام لینـا دەیزانی کە ئەوان هەم لەو بابەتە ئـاگادارن و هەم باش دەزانن کـە لیناش دەزانێ کە ئەوان ئاگادارن. لە کومیتەی ناوەندیشەوە ناردیان بۆ وەزارەتی ناوخۆ. لەوێش سەرەڕای دیاریکردنی چەندین ڕێکەوتی چاوپێکەوتن لە ڕێی تەلەفۆنەوە، هەرگیز لینایان نەبینی.

لـە ڕاسـتیدا، کارەکـە ببووە بێنەوبـەرە و یاری پێکردن. بـەڵام لینا، سـەرەڕای ئـەوەش کە دەیزانی هیـچ وەڵامێک وەرناگرێتەوە، لەسـەر بڕیارەکەی خۆی پێداگر و سوور بوو و نەیدەتوانی پێشی خۆی بگرێت و لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە هەڵسوکەوتـی مەئموورەکان، بـە درۆ کردن و ئـاکاری لووتبەرزانەیانـەوە بـە جۆرێک سـووکایەتی پێکردن بوو بەرانبەری، لە هاتوچۆ لە نێوان ئەو سـێ دامـەزراوەدا، کۆڵی نەدەدا. حـەزی دەکـرد لێیان بدات، هـاوار بکات و بقیژێنـێ و بەوجۆرە خۆی سـوکنایی بێـت. بەڵام دەشـیزانی کە تەنانەت ئـەوەش دادێک بە حاڵی نادات!

جگەلـەوەش، ئەو دەبوو هەوڵی چارەسـەر کردنـی هەندێ گرفت و کێشـەی دیکەش بـدات کە هەندێکیـان هەر چاریان نەدەهـات، کاتێکی

وایشی بەدەستەوە نەمابوو و زەمەن بە خێرایی تێدەپەڕی. ئەمجارەش دەبوو بە تەنێ شان بداتە بەریان و دەرەقەتیان بێت.

ڕێژیمــی کۆمۆنیســت دەری کــەردن، بەڵام دەستبەســەری نەکردن، تەنانــەت ڕێــی پێدان کەل و پەلەکانیشــیان لەگەڵ خۆیــان بەرن. دیارە ئەگــەر لە دەرەوەی بابەتەکەوە ســەیری بکەیــن، دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە، لەو ڕووەوە کە ئەوان شــارۆمەندی چێکۆســلۆڤاکی نەبــوون، ڕێژیــم بــە شــێوەیەکی «شارســتانییانە» لــە کــۆڵ خــۆی کردبوونــەوە. بە بێ هیچ ئــازار و ئەزیەتێک ڕێگەیان دا عەبدولڕەحمان و هەردوو کچەکەی بڕۆنە دەرەوە. بەڵام لێنا کە دوا کەس بوو، دەبوو کاروبارە ئیدارییەکان ڕاپەڕێنێت و بە تەنێ لەگەڵ دام ودەزگای ئیداریی چەوسێنەر و ڕووهەڵماڵڕاودا ڕووبەڕوو بێتەوە.

هاوڕێکانــی لێنــا، کەســانێکی زۆر دڵســۆز بــوون و هەوڵیــان دەدا یارمەتی بدەن و ئەوەش دەبووە هۆی دڵخۆشــی لێنا. بەڵام بە گشــتی کەشــی وڵاتەکە لێنای وەڕەز کردبــوو و وەک دەڵێن «نەهامەتی خۆی خــراپ نییــە، قۆرتەکانی خراپن» مامە فرانتس، مێــردی پووری لێناش لــەو کاتــەدا مرد و لــەوە بەدوا، پــوورە زێدێنکا دەبوو بــە تەنێ بژی. لێناش بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی چەرمەسەریی پووری، نەیوێرابوو باسی چارەڕەشــییەکانی خۆی بۆ بکات. دوو ساڵ پاش ئەوەی بە تەواوی لە پاریــس جێگر بوون، لێنا ڕاســتیی کۆچەکەیانی بۆ پــووری باس کرد. بــە ماوەیەکــی کەم پــاش ئەوە، پــووری لێناش کۆچی دوایــی کرد. بە وتەی دوکتورەکان، هیچ نەخۆشــییەکی نەبــوو و هەرگیزیش هۆکاری مردنەکەی ڕوون نەبووەوە. بەڵام لێنا دەیزانی هۆکاری مردنی پووری بێهیوایــی و ناهومێــدی لە ژیان بوو و ئەو چیدیکە نەیدەویســت بژی. ئــەو لە درۆ و شــاردنەوەی ڕاســتییەکان بێزار بوو و خوشــکەزاکەی وەکوو دوایین کەس کە خۆشیدەویســت و حیســابی لەســەر دەکرد، درۆی لەگەڵ کردبوو. لێنا ببووە هۆی ناهومێدیی ئەو.

مینا، بە ســەرکەوتوویییەوە بەکالۆریۆسەکەی وەرگرت. کاتێکیش لێنا

باسی دەرکردنەکەیانی بۆکچەکەی کرد، مینا هیچی نەگوت. چەمەدانەکانی پێچایەوە و لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە هاوڕێکانی کە بۆ بەڕێ کردنی هاتبوون، چوو بۆ وێستگەی شەمەندەفەر. لەو کاتەدا کە شەمەندەفەرەکە ئامادەی بەڕێ کەوتن دەبوو، مینا لە بەرهەیوانە بچووکەکەی ڤاگۆنەکە ڕاوەستابوو و بە ڕوانینێکی وشک و بێ هەستەوە سەیری دەکردن، وەک بڵێی ئیتر نایانبینێت. لێناش بە چاوی فرمێسکاوییەوە دەستەکانی بۆ ماڵئاوایی ڕادەوەشاند و سەیری دوورکەوتنەوەی کچەکەی دەکرد و پرسیاری لە خۆی دەکرد : بڵێی کەی بێت کە جارێکی دیکەش یەکتر ببیننەوە؟

هیوا هێشتاش لە براتیسلاوا مابووەوە و سەرقاڵی تاقیکردنەوەکانی ساڵی دووهەمی زانکۆ بوو لە بواری ئابووریدا. ئەویش پاش ئەوەی بە سەرکەوتوویییەوە تاقیکردنەوەکانی تێپەڕاند، گەڕایەوە بۆ پراگ. لە براتیسلاوا شێتانە عاشقی پیاوێکی ئۆسلۆڤاکیایی ببوو بە ناوی ئالێکساندێر کە بە شانیۆ (SHanyo) بەناوبانگ بوو. هیوا ئەوی وەکوو پیاوێکی هەڵکەوتوو، سی ساڵان، ڕاستگۆ و خاوەنی گەلێک سیفەتی جوانی دیکە کە سروشت پێی بەخشیوە ناساندبوو. بڕیار وابوو شانیۆ بێت بۆ پراگ.

لێنا چاوەڕوانی دەکرد کە شانیۆ خوازبێنی لە هیوا بکات. بەڵام کاتێک شانیۆ هات و خۆی پێ ناساندن، گەلێک جیاواز بوو لەو شتەی لێنا لە مێشکی خۆیدا وێنای کردبوو. پیاوێکی تەمەن چل ساڵ، زەبەلاح و تا ڕادەیەک کورتەباڵا و بە ڕواڵەتیدا دیار بوو کە وورزشی لەش جوانی دەکات. هێشتا لێنا خولکی نەکردبوو بچێتە ژوورەوە، ئەو لە پڕ بە لووتبەرزییەوە دەستی کرد بە گوتنی زنجیرە زانیارییەک سەبارەت بە چالاکییەکانی خۆی، کە هەرئەوەش لێنای تووشی گومان و دوو دڵی کرد. بەهەرحاڵ، ئەو کەسە نەبوو کە لێنا لە مێشکی خۆیدا وەکوو هاوسەری داهاتووی هیوا لەبەرچاوی گرتبوو. شانیۆ تەنانەت خوازبێنیشی لە هیوا نەکرد. ئەو بابەتە گەلێک لێنای کەیف خۆش کرد و ئارامی کردەوە.

هیــوا هیــچ کام لەو عەیبانەی شــانیۆی نەبینیبوو. ئەو تەنیا ٢١ ســاڵی تەمــەن بوو. دەڵێن عەشــق چــاوی مرۆڤ کوێــر دەکات! لێنا داوای لە هاوڕێکانی کرد ســەبارەت بە شــانیۆ زانیاری کۆبکەنەوە. بەم چەشنە، لێنا ئاگادار کرایەوە کە شانیۆ کارمەندی شیرکەتێکی ئۆسلۆڤاکیاییە کە دەرمان دروســت دەکەن و هەرگیزیش ناچێتە ســەر کارەکەی. دواجار لێکۆڵینــەوەکان ســەریان لە وەزارەتی ناوخــۆ دەرهێنا و دەرکەوت کە شانیۆ، یەکێک لە مەئموورە نهێنییەکانی ئەو وەزارەتخانەیە بوو.

هیواش چوو بۆ لای مینا لە سۆئێد.

■ ڕۆیشتنی لێنا لە پراگ

پێش ڕۆیشــتن، لێنا بە مەبەســتی ماڵئاوایی کردن، سەردانی هاوکارە کۆنەکانــی خــۆی لــە قوتابخانەی باڵای ئابــووری کرد. هێشــتا بەڕێ نەکەوتبوو، بیری دەکردن و دەیزانی کە پاش ڕۆیشتنیشی زیاتر بیریان دەکات. لێنا، لەگەڵ ئەوان ســەردەمی خۆشی بەهاری پراگ و هەروەها توندوتیــژی و دڵڕەقییەکانــی ســەردەمی داگیرکاریــی ســاڵی ١٩٦٨ و پاش ئەوەشــی بینیبــوو. لەم ســاڵانەدا، لێنا بەچاوی خــۆی، ئاڵوگۆڕە پێکهاتــووەکان لە بنیاتــە دەوڵەتییەکان و هەروەهــا ئاڵوگۆڕەکانی نێو کۆمەڵــگای بینیبــوو. تەنانەت زماناســەکانیش ناچار ببــوون ملکەچی خواستەکانی ڕێژیم بن...

کاتژمێــر ٦ی بەیانیــی ئــەو ڕۆژەی دیاریکــرا بوو بۆ ئــەوەی پراگ بەجێبهێڵــن، لــە دەرکــەی ماڵەکەیــان درا. نوێنەرەکانی خاچی ســوور هاتبــوون بــۆ ئەوەی ماڵەکە داگیر بکەن. لەو ڕووەوە کە هێشــتا چوار کاتژمێــری مابــوو بــۆ کاتــی دیاریکــراو، لێنا لــە مــاڵ دەری کردن و ناچاربــوون لە دەرەوەی ماڵەکە و لە ژێــر پەنجەرەکەدا، ماوەی چوار کاتژمێر چاوەڕوان بن.

کەســانێکی زۆر بۆ بەڕێ کردنیان هاتبوونە وێستگەی شەمەندەفەر. جگە لە هاوڕێ نیزیکەکانی لێنا، هەندێ ناسیاری دیکەشیان هاتبوون کە

زۆریش لێیانەوە نیزیک نەبوون و ئەوەش، لەو سەردەمە پڕ مەترسییەدا، ببووە هۆی سەرسووڕمانی لینا. هەندێکیان دیارییان بۆ هێنابوون و هەندێکی دیکەشیان، چەپکە گوڵیان بەدەستەوە بوو. هەندێکیان هیوای بەختەوەرییان بۆ دەخواست و هەندێکی دیکەیان داوایان لێدەکرد نامەیان بۆ بنووسێت. هاوکارێکی بە نێوی فرانتیشک (Frantisek) بتڵێک لیکۆری دەستکردی خۆی بۆ هێنا بوو. خانمی «والاستا»ش (Valasta) کە هەم هاوڕێی بوو و هەم دوکتوری، چەند حەبێکی ئازارشکێنی دایە و گوتی: «ئەمانە بگرە، پێویستت پێیان دەبێ!» کەسێکی دیکە کاغەزێکی نایە گیرفانی کە پەندێکی ئینگلیسیی لەسەر نووسرابوو: «ژیان، ئەم سۆزانییە، بەدوای ئەوەوەیە کە مرۆڤ بۆ تاهەتا بڕوای پێی هەبێت. چ بڕوات بەو بابەتە هەبێت و چ نەتبێت، شتێک هەیە کە نەگۆڕە و ئەوەش ئەوەیە کە بڕوادار بوون بە هەر شتێک یان هەر کەسێک پێویستی بەوە هەیە کە یان خۆت فریو بدەی و یان لە بنەڕەتەوە ساویلکە بیت.»

شەمەندەفەر بەڕێ کەوت. پاش چەندین حەوتوو چالاکیی چڕ و پڕ، لینا لە پڕ خۆی بە ناچالاکیی بینییەوە، چیدیکە کەس داوای هیچی لێ نەدەکرد، ئەویش هیچی شک نەدەبرد کە داوای بکات، چیدیکە، پێویست نەبوو پەلە بکات و کاتیش بۆ هیچ شتێک درەنگ نەبوو. لە دۆخێکی ئەوتۆدا، لینا لە پڕ، هەستی بە بۆشاییەک کرد کە دڵی لە ژێڵڵا دەهێنا.

لە کووپەی شەمەندەفەرەکەدا بە تەنیا بوو، سەیری باخەکان و گوندە بچووکەکانی دەکرد. بەخۆی دەگوت کە ڕەنگە ئەمە دواجار بێت! ئەو بەرەوڕووی مۆتەکەیەک ببووەوە. لەسەر سەکۆی وێستگەی شەمەندەفەرەکە، کەسێک کتێبێکی پێدابوو، دەستی بۆ برد بیخوێنێتەوە، بەڵام مەیلی خوێندنەوەی نەبوو. هەستی بە چەشنێک مردوویی لە ناخی خۆیدا دەکرد. نە خۆی بە پێوە ڕادەگرت و نە دەیتوانی دابنیشێت، نە خەوی مابوو و نە مەیلی خوێندنەوە و هاوکات نەیدەزانی چلۆن هێمنی خۆی ڕاگرێت، حەبەکانی والاستای هەڵگرت و بە لیکۆرەکەی فرانتیشکەوە خواردی. بەڵام تێکەڵکردنی دەرمان و لیکۆریش کاریگەرییەکی ئەوتۆی

نەبــوو. لەگەڵ داهاتنی شــەو، لێنا لەســەر جانتاکانی خۆی کە لەســەر زەوییەکــە داینابــوون، ڕاکشــا و دواجار خەوی لێکــەوت. پاش نیوەی شەو، شەمەندەفەرەکە لە پەردەی ئاسنین تێپەڕی و لێنا ئیتر وڵاتەکەی خۆی بەجێهێشتبوو.

■ پاریس

لێنا لە تاریکیی شــەودا ســەیری دەرەوەی دەکرد. پاریس کە شاری خەونەکانــی ئەو بوو، لەم کاتەدا بۆ ئەو وەبیرهێنەرەوەیەکی ســەیر و نەناسراو بوو. لێنا هیواداربوو کە عەبدولڕەحمان لەو دڵەڕاوکێیە تێبگات کــە دەرئەنجامی ژێروژوور بوونــی ژیانەکەی بوو و بۆ خۆگونجاندنی لەگــەڵ وڵاتــە نوێیەکەی زەمەنــی پێویســتی بداتــێ و یارمەتیی بدات بــۆ ئەوەی ژیانەکەی دەســت پێبکاتەوە. چونکوو لێنــا ئەوەی هەیبوو، لەدەستی دابوو.

کچەکانی ناچار ببوون لە ســۆئێد بژین، خۆیشــی ئیشەکەی لەدەست چووبوو. ئەو ئیشــەی کــە لە باری ئابوورییەوە ســەربەخۆی کردبوو و ئێســتا بە تەواوی لە مێردەکەی دەبەســتراوە، لە هەموو هاوڕێکانی دابڕابوو و لە فەرانســەش کەســی نەدەناســی و چیدیکە، شاری زێدی خۆی، ئەو شــارەی تا ئاســتی پەرستن خۆشی دەویست، نابینێتەوە و.. جگە لەوانەش، دەبوو زمانی فەرانســی فێر بێت و هەروەها دەیویســت بــڕوا بــە بەڵێنەکانی هاوســەرەکەی بکات کە پێی گوتبوو ســەرلەنوێ ژیانێکــی ژن ومێردایەتی ئاســایی بنیات دەنێنەوە. لــەو کاتەدا تەمەنی ٤٣ ســاڵ بوو، تەندروســتی جێگر نەبوو و تا ســەر ئێسقان هەستی بە ماندوویەتــی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشــدا، پێی دەنایــە وڵاتێک کە بە وڵاتی هەمــوو ئازادییەکان ناســراو بوو. لەوێ، شــتێکی دەســت دەکەوت کە هەرگیــز، نــە لە زێدی خــۆی و نە لە ئێران، واتە وڵاتــە دووهەمەکەی، نەیناسیبوو و ئەویش بریتی بوو لە ئازادی.

بەڵام، کاتێک هەموو جەســتە و ڕۆحی مرۆڤ شەکەت و داهێزراوی

هــەزاران ئــازار و ژان بێت، چلــۆن دەتوانێت لەو ئازادییــە بەهرەمەند بێت؟

عەبدولڕەحمان لە وێستگەی ڕێگەی ئاسن بەرەو ڕۆژهەڵات، چاوەڕێی بوو. «ماڵەکەیان» کە لە پاریسی ١٦ هەڵکەوتبوو، ژێربیناکەی ٢٨ میتری چوارگۆشە بوو. هەموو شمەکی ماڵەکەیان بریتی بوو لە: مێزێک و چەند کورســی، چرپایەک و تەلەڤیزیۆنێک و دیواری ڕووت و قووت. لێنا کە هێشــتاش لەژێر کاریگەریی دەرمانە ئازارشکێنەکاندا بوو، تەنیا حەزی لە نوســتن و بە تایبەتی لەبیرکردنی هەموو شتێک بوو. بە پێچەوانەوە عەبدولڕەحمان دڵخۆش بوو و لەپەستا قسەی دەکرد و هیچ پرسیارێکی لە لێنا نەدەکرد کە پاش ڕۆیشتنی عەبدولڕەحمان لە پراگ، چی لێ بەسەر هاتــووە، ئەوە هەمان شــت بوو کە لێنا لەو کاتەدا پێویســتی پێی بوو. چونکوو ئەو مۆتەکەیەی کە ئەو تێیپەڕاندبوو، هێشــتاش لەســەری بار بوو. ســیوران دەنووسێت: «نووسین، شفابەخشە»، لێناش لە نەبوونی هاوسەرەکەیدا، هەموو ئەو شــتانەی بەسەری دەهات، دەینووسینەوە. چونکوو غەریبی لە مێژوویەکی ڕاســتەقینە بێبەشــی کردبوو. پێویست بوو شــەپۆلەکانی ژیانی کە بۆنزمترین قووڵاییەکان ڕۆچووبوو، وردە وردە و دواجار هەڵکشێتەوە، ئایا لێنا بژاردەیەکی دیکەشی لەبەردەستدا هەبوو؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە کە یان دەبوو هەڵکشان هەڵبژێرێت و یان بە قووڵاییە بێگەڕانەوەکاندا ڕۆچێتەوە.

■ فەرانسە ـ ئێران

عەبدولڕەحمان و خومەینی

هاوینی ســاڵی ١٩٧٨بوو. زیاتر لە دوو ســاڵ بەسەر دەرکردنیان لە پراگــدا تێدەپەڕی. هێندەی نەخایاند کە ڕێژیمی پاشــایەتیی ئێران پاش ٢٥٠٠ ســاڵ پاشــایەتی، لە ســاڵی ١٩٧٩دا بەرەو ڕووخان دەڕۆشــت. ئایەتوڵــڵا خومەینی کە لــە عەراقەوە پەنای بردبووە بەر فەرانســە، لە شــوێنی نیشــتەجێ بوونی خۆی لە نۆڤل ـ لو ـ شاتوو (Neauphle – Le

Shateau)، خەڵکی سەردانکەری دەبینی. ڕۆژنامەنووسەکان، ئێرانیەکان و کەسـانی دیکەش، لە باخچە ڤێللاییەکەی شـوێنی مانەوەی خومەینی چـاوەڕوان دەبوون تا لە لایەن «ڕزگارکەرە مەزن»ەکەوە وەربگیرێن. عەبدولڕەحمانیش بەنیاز بوو سەردانی بکات.

لینا بڕوای بەوە هەبوو کە پیاوێکی ئایینی نابێت دەست لە کاروباری حکوومەتـی وەربدات، بڕوای نەدەکرد کە ئایینییەکی پیر شـوێنی شـا بگرێتەوە و ئێرانییەکانیش قبووڵی بکەن. بەڵام ئێرانییەکان بە بۆچوونە جیاوازە سیاسـییەکانیانەوە، خومەینییان بە چاوی ڕزگاریدەری خۆیان لە چنگی دیکتاتۆریی شا سەیر دەکرد. دیارە ئەوەش ڕاستە کە خومەینی ڕایگەیاندبوو کە بە هیچ شـێوەیەک بە نیاز نییە دەسـەڵات بەدەستەوە بگرێت. بەهەرحاڵ، ئەو هەموو جۆش و خرۆشە لە لایەنگریی خومەینیدا، ئەوی بەرەو لاڕێ برد.

لینا بە سـەرنجدان بە لێهاتوویی سیاسی هاوسـەرەکەی، سەرەڕای نـاڕەزا بوونەکەی، قبووڵی کرد کە بە ئۆتۆمبیل هاوسـەرەکەی بەرێتە نۆڤـل ـ لو ـ شـاتو. لەوێ، لینـا لە ئۆتۆمبیلەکەدا مایـەوە و چاوەڕوانی هاوسەرەکەی کرد و لەبەر ئەوەی پێی وابوو گەڕانەوەی هاوسەرەکەی زۆر دەخایەنێـت، دەسـتی کرد بـە خوێندنەوەی کتێب. بـەڵام، هێندەی نەخایاند، عەبدولڕەحمان بە تووڕەییەکی لەڕادەبەدەرەوە گەڕایەوە.

کاتێک خومەینی ناوی عەبدولڕەحمانی بیستبوو، بە سەرسووڕمانەوە دەنگی هەڵێنا بوو و گوتبووی: «کێ ڕێی پێداوە بێتە ژوورەوە! من هیچ قسـەیەکم نییە لەگەڵ ئەم پیاوە بیکەم.» سەرئەنجام، عەبدولڕەحمانیان لـەوێ دەر کردبوو. عەبدولڕەحمان سـواری ئۆتۆمبیلەکە بوو و گوتی: «بڕۆیـن، لێرە بڕۆین!» تووڕەیی هەمـوو ئۆتۆمبیلەکەی تەنیبوو و بە درێژایـی ماوەی گەڕانەوە، عەبدولڕەحمان بە تاقە وشـەیەکیش نەهاتە گۆ.

تووڕەبوونی عەبدولڕەحمان دەگمەن بوو و زۆر زووش دەڕەوییەوە. تەنیـا بـە سـووکایەتی پێکردنێـک، عەبدولڕەحمـان لە مەبەسـتەکەی

پاشــگەز نەدەبووەوە. پــاش چەند ڕۆژ، ســەرلەنوێ بیرۆکەی دیداری ئایەتوڵــڵا خومەینی کەوتەوە ســەری، ئەمجارەیان، لینــا ئامادە نەبوو بە ئۆتۆمبیل بیگەیەنێتە شــوێنی مەبەســت. باشتر وابوو کە لە ئەگەری شکستێکی دیکەدا، هاوسەرەکەی تەنیا بێت. لە ڕاستیدا، ئەم جارەشیان دەسکەوتێکی بەرچاوتری لە جاری پێشوو نەبوو.

■ چوونی عەبدولڕەحمان بۆ ئێران

عەبدولڕەحمان لە ڕێکەوتی، ٣١ی ئووتی ١٩٧٨، پاریســی بەجێهێشت و لــە کاتــی بەجێهێشــتنی پاریســدا بە لینای گــوت: «یان بــۆ مانگێک دەڕۆم و یــان بۆ هەمیشــە» ئەو کەڵکی لە پشــێوی تــاران وەرگرت و بە یاســایی داخڵی ئێران بوو. لە تارانیشــەوە، بەرەو کوردستانی زێدی خۆی بەڕێ کەوت، عەبدولڕەحمان پێنج ســاڵ بوو ســکرتێری گشــتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوو و لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا ســەردانی کوردســتانی نەکردبوو. لــەو ماوەیەدا کە ڕێبــەری حیزبی دێموکراتی کوردســتان لە کوردســتان نەبوو، جەلال تاڵەبانی، ڕێبەری یەکیەتی نیشــتمانیی کوردستانی عەراق، شوێنی غاییبەکانی گرتبووەوە. تاڵەبانــی زۆر چــالاک بوو و هەندێ جار دەچوو بــۆ کەرەج و ئاقاری تاران و هەندێ جاریش هاتوچۆی کوردستانی عەراق و ئێرانی دەکرد. ساڵی ١٩٧٨، ناوی عەبدولڕەحمان قاسملوو، لە کوردستاندا زۆر ناسراو نەبوو، ســەرەڕای ئەوە، ئــەو زۆر زوو، حیزبــە کوردییەکانی ئێران و عەراقــی لە دەربەنــدی حیزبەکان کۆ کردەوە بۆ ئــەوەی بەرنامەیەکی هاوبەش لە ســەر بنەمــای هاوکاری و یارمەتی و دەســتێوەرنەدان لە کاروباری یەکتر دابڕێژن. ئەوەش بووە هۆی ئەوە کە هاوکاری لەسەر بنەمــای مافــی بەرانبەر لە نێوانیاندا دەســت پێبکات. لەم ســەردەمەدا، حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران، تەنیا سەد کەس ئەندامی هەبوو. بەڵام زۆری نەخایاند کە دۆخەکە گۆڕدرا و ڕێژەی ئەندامانی حیزب بە شــێوەیەکی موعجیزەئاسا پەرەی سەند، بە شێوەیەک کە بە ماوەیەکی

کورت پاش بەدەسـەڵات گەیشـتنی خومەینی لە ساڵی ١٩٧٩دا، ڕێژەی ئەندامانـی حیـزب گەیشـتبووە زیاتـر لە پەنجـا هەزار کـەس، دەبێت ژمارەی ئەو لایەنگرانەش لەو ڕێژەیە زیاد بکەین کە لە ئێران و عەراق و تورکیە، پشتیوانییان لە بۆچوونەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەکرد.

■ دیداری هەیئەتی دەفتەری سیاسـی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵ خومەینی

مەبەستی هەیئەتی دەفتەری سیاسی حیزب، وتووێژ لەگەڵ خومەینی بـوو سـەبارەت بـە خودموختاریـی کوردسـتان. خومەینـی هەیئەتی حیزبی بە سەرپەرشـتیی عەبدولڕەحمان بینی. ئایا ئەندامانی دەفتەری سیاسـیی حیزب هیوادار بوون کە خومەینی ئەمجارەیان بە پێچەوانەی هەڵسوکەوتـی جـاری پێشـووی لەگەڵ عەبدولڕەحمان لـە نۆڤل ـ لو ـ شـاتو، هەڵسوکەوتێکـی باشـتر، ئاوەزمەندانەتر، بەخشـندەتر و جێی تێگەیشتنی زیاتر بنوێنێ؟ ئایەتوڵڵا ئاماژەگەلێک لە قورعانی بۆ هێنانەوە سـەبارەت بەوەیکە، ئێمە هەموومان، بە بێ جیاوازیی ئێتنیکی و شـتی وەک ئەوە، ڕۆڵەی یەزدانین و ئەوەیکە جیاکردنەوەی کوردەکان لە یاسا قورعانییـەکان جێی باس کردن نییە. لەو ڕووەوە کە حیزبی دێموکرات حیزبێکی لائیک، بەهێز و خۆشەویسـت بوو، جێی سەرسـوڕمان نییە کە ئەندامانی دەفتەری سیاسی بوونبێتنە هۆی تووڕە بوون و غەززەبی ئەو پیرە پیاوە.

ئەمجارەشـیان، ئەندامانی دەفتەری سیاسی بە بێ هیچ دەسکەوتێک، بە ڕێگای خۆیاندا گەڕانەوە. بەو حاڵەشەوە، ئەمجارەیان ماوەیەک پاش چاوپێکەوتنەکەیـان، خومەینی ئەمری کرد تا شـارە کورد نشـینەکانی سـنە و نەغـەدە بۆمباران بکەن. هەموو هەوڵەکانـی حیزبی دێموکرات بـۆ ڕاگرتنی شـەڕ، سـەرەڕای پێداگرییان لەسـەر ئەوەیکە هیچ کەس بـە نیاز نییە کوردسـتان لە ئێران دابڕێت (ئەمـە هەمان بابەت بوو کە

عەبدولڕەحمان بێ بڕانەوە لە ڕادیۆ و ڕۆژنامەکان دووپاتی دەکردەوە) بێئاکام مایەوە. لەگەڵ ئەوەشــدا، بە پێچەوانەی تۆمەتەکانی خومەینی، حیزبی دێموکرات بۆ کوردەکان، تەنیا داوای مافە سەرەتاییەکان، بریتی لە مافە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی دەکرد.

■ هەڵبژاردنی مەجلیسی خوبرەگان

سەرەتاکانی مانگی مارسی ١٩٧٩، هەڵبژاردنی مەجلیسی خوبرەگان، لە سەرانسەری ئێراندا دەستی پێکرد. لە کوردستان، عەبدولڕەحمان بە زۆرینــەی دەنگ هەڵبژێردرا و بڕیار بوو لــە ڕۆژی دیاریکراودا بچێت بۆ تاران و وەکوو ئەندامی هەڵبژێردراو، خۆی بەو مەجلیسە بناسێنێت. ڕۆژێک پێش ڕۆیشــتنی عەبدولڕەحمان بۆ تاران، هاوڕێیەکی مەهابادی بــۆ خواردنــی ئێوارە لــە عەبدولڕەحمانــی گێڕابــووەوە. لەوکاتەدا کە عەبدولڕەحمــان پێی نایە ماڵی ئەو هاوڕێیە، ڕێک لەو کاتەدا، خومەینی لــە تەلەڤزیۆنــدا لێدوانی دەدا. هێشــتا چەنــد ســاتێک تێنەپەڕیبوو کە عەبدولڕەحمــان بــە گوێی خۆی بیســتی کە خومەینی لــە دژی ئەو بە تووڕەیی و هەڕەشەوە گوتی: «ئەم قاسملوویە کێیە ئیتر؟ ئەگەر دەستم پێی ڕابگات، دەزانم چلۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەم».

ڕوون و ئاشــکرا بوو کە خومەینی، بوونی قاســملوو لە مەجلیســی ناوبــراودا قبوڵ نــاکات، هەموو هەڵبژێردراوانی مەجلیســی خوبرەگان مەلای موســولمان بوون، تەنیا دوو کەســیان لائیک بوون کە یەکێکیان عەبدولڕەحمــان بوو. هەڕەشــەکانی خومەینی لــە دژی عەبدولڕەحمان لەو لێدوانەدا و هەروەها لە دژی دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکرات، بــووە هۆی ئــەوەی کە عەبدولڕەحمان ڕای خۆی بگۆڕێت و نەچێت بۆ مەجلیسی خوبرەگان.

لــە کۆتایــی بەهــاری ســاڵی ١٩٧٩دا، خومەینــی فتــوای کوشــتنی عەبدولڕەحمــان قاســملوو، ســکرتێری گشــتیی حیزبــی دێموکراتــی کوردســتانی ئێرانی دەرکرد و لە مانگی ئووتی هەمان ساڵیشدا، ڕێژیم

لــە دژی خەڵکی کورد شــەڕی دەســتپێکرد. بەشــێکی زۆری نەتەوەی کورد لەگەڵ حیزبی دێموکرات و حیزبە کوردییەکانی دیکە کەوتن و بە هەموو بوون و توانای خۆیانەوە خەباتیان کرد.

عەبدولڕەحمــان لــە دەفتــەری یادداشــتەکانی خۆیــدا، ڕســتەیەکی بەناوبانگی «ئاندرێ مالرۆ»ی نووســیبووەوە: «من شــەڕم کرد بە بێ ئەوەی حەزم لێی بێت.» حیزبی دێموکرات بەشــێکی خاکی کوردستانی لە ناوەندی کوردســتان ئازاد کرد و لــەو ناوچانە، بە پێی بەرنامەکانی خۆی ڕێکخســتنی ژیانی خەڵکی کرد و ئاڵوگۆڕی پێویســتی لە بواری سەقامگیر کردنی ڕێژیمێکی دێموکراتیک پێکهێنا. ئەم ناوچانە لە ماوەی سێ مانگدا بوونە خاوەنی ئازادییەکی تەواو.

هاوکات، ڕێژیم سیاسەتی دوژمنکارانەی خۆی لە سەرانسەری وڵاتدا دەست پێکردبوو و دەستی کردبوو بە لەناوبردنی هەموو ئەو کەسانەی کــە لە چوارچێوەی خواســت و حەزەکانی خومەینیــدا نەدەگونجان. لە ڕاســتیدا، ئەوە تەنیا هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن نەبوون کە کەوتبوونە بەر شــاڵاوی ڕاوەدوونان و کوشــتار، بەڵکوو هیچ جیاوازییەکی بۆ ڕێژیم نەبوو کە ســزادراوان ســەر بە هێزەکانی ئۆپۆزیســیۆن بن یان نەبن، هەمــوو، تەنانەت منداڵان و بەســاڵاچووانیش کەوتبوونە بەر هێرشــی سیاسەتی پاکتاو کردن. گوتنی گاڵتەیەک لە ئامادەبوونی ئەوپەڕگیرێکی نەناســراودا بۆخۆی بــە تەنێ بەس بوو بۆ ئەوەی کەســی خۆنەپارێز تووشــی چارەنووســێکی شــووم بێت. ژنانیــان ئاخنیە ناو هێشــخانی ماڵەکانەوە و پیاوانی خومەینی ســەرلەنوێ ســەرلەبەری ئیختیاراتیان کەوتەوە دەست. گوللەبارانەکان و لەسێدارەدانەکان، ئیتر ببوونە شتێکی ئاســایی و ڕەوا.. و خومەینی «موسوڵمانە ڕاســتەقینە»کانی کردبووە ســیخوڕ و دووزوان و شۆفار بەسەر خەڵکەوە. لە بەرانبەر ئەم دۆخە نائاســاییەدا کە تــا ئەوکاتە، مەزهەب ڕۆڵی ســازان و هێمن کەرەوەی هەبوو و ئێســتا ببووە ئامرازێک بۆ بانگەشــەی دڵڕەقی و توندوتیژی، خەڵکێکــی زۆر وڵاتیــان بەجێدەهێشــت و ڕێژەیەک لــە ئێرانییە غەیرە

کوردەکانیــش هاتنــە لای حیزبی دێموکرات و لــەو حیزبەدا خزمەتیان کرد.

■ چوونی لێنا بۆ کوردستان

ســـەرەتاکانی مانگی مارســـی ١٩٨٠ بوو. سەفەری لێنا بۆ کوردستان بـــەرەوڕووی چەند ڕێگرییـــەک دەبوویەوە، وەکوو: «ناوی قاســـملوو، سزای دەستبەسەربوونەکەی کە لە کاتی ڕێژیمی شادا بۆی دەرکرابوو و بە دڵنیاییەوە وەکوو خۆی مابووەوە و بوونی شــەڕ لە کوردســـتان، کــە نەک هــەر یارمەتیــدەری نەبــوو، بەڵکــوو دۆخەکەی لــێ ئاڵۆزتر کردبوو. لەگەڵ ئەوەشــدا، ئەو پشــێوییەی کە لە ساڵی یەکەمی ڕێژیمی خومەینیــدا کەوتبــووە وڵاتەوە، گەڕانەوە و چالاکــی ئەوی تا ڕادەیەک مســـۆگەر دەکرد. لە پاریس، کوردێکی زیرەک و بەئاگا لە دۆخی وڵات، ســـەفەرەکەی لێنای ڕێکخســـت. لێنا لە ڕێی ســـتۆکهۆڵم و کۆپێنهاگەوە گەیشتە تاران و پاشانیش چوو بۆ کوردستان.

لەوکاتــەوە کــە لێنا چووبوو بۆ ئێران و لــەو ماوەیەدا لەگەڵ مێژوو، داب و نەریتــە تۆکمە و جۆراوجۆرەکانی خەڵکی ئەو وڵاتە و هەروەها ڕۆژەڕەشــییە فراوانەکانیان ئاشــنا ببوو، نزیکەی ٣٠ ســاڵ تێپەڕیبوو، خەڵکانێک کە هەرگیز ئازادیخوازییان وەلا نەنابوو و بەردەوام هەوڵیان بۆ دەستەبەرکردنی دەدا. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٩وە، بنکەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردســـتانی ئێران گوێزرابووەوە بۆ گوندی «گۆگ تەپە». ئەم گوندە کە لە نزیکەی شاری مەهاباد هەڵکەوتبوو، خانووەکانی چوارگۆشە و بتۆنی بوون. لە کۆتایی تاکە کۆڵانی گوندەکەدا، ماڵێکی تا ڕادەیەک گەورەی لێبوو کە بنکەی ناوەندیی حیزبی دێموکرات بوو.

لە مانگی مارسدا، لەم ناوچەدا خۆرەتاو زۆربەی کاتەکان بزرە، بەفر و باران دەبارێ و بە هۆی توانەوەی بەفرەوە، زەوی شێدار و قوڕاوی و هەواش سارد دەبێت. ئەو ماڵەی کە بنکەی ناوەندیی حیزبی لێ بوو، هیچ کەرەســـتەیەکی گەرم کـــەرەوەی لێ نەبـــوو. جلوبەرگی کوردی، مرۆڤ لە سەرما دەپارێزێ. بەڵام لێنا کە جل و بەرگی ئورووپایی لەبەر

کردبوو، لە سەرمادا هەڵدەلەرزی. عەبدولڕەحمان کە بە درێژایی ڕۆژ لە ژووری میوانان سەرقاڵی گرتنی کۆبوونەوە و بینینی خەڵک بوو، شەوان شەکەت و ماندوو دەبوو. هاتنی هاوکارەکانی عەبدولڕەحمان کە بڕیار بوو بێن بۆ ئەوێ و سەبارەت بە ئەرکەکانی داهاتووی لینا لە ئورووپا بڕیار بدەن، وەدرەنگ کەوتبوو.

هەربۆیەش، لینا کاتەکانی خۆی بە گەڕان لەو دەوروبەرە پڕ دەکردەوە. دیارە نەدەبوو زۆر لە بنکەی ناوەندیی حیزب دوور بکەوێتەوە، لەو حاڵەتەدا، دەبوو قبووڵی بکات کە پێشمەرگەکان ئاگایان لێی بێت. لە گردە ڕووت و قووتە بێ دار و بنچکەکانی ئاقاری بنکەی ناوەندی، چەوەکان لە بن پێی لینادا هەڵدەخلیسکان. چەوگەلێک لە بەردی رەش، بەردی ڕەنگامە، بەردی خارا، بەردی ئاسن و چەشنەکانی بەردی مەڕمەڕ، لە مەڕمەڕی سپیی و زەردەوە هەتا مەڕمەڕی ڕەگەدار و ...هتد، لینا کە کاپشەنی هاوسەرەکەی پۆشیبوو، گیرفانەکانی پڕ کردبوو لەو چەوانە.

لە خوارووی یەکێک لە گردەکاندا، لینا خۆی لە نێوان پۆلێک پێشمەرگەدا بینییەوە. ئەوان لە دەوری لینا کۆ ببوونەوە و دەیانویست، ئەم تازە هاتووە بناسن. بەڵام لینا، بە مەبەستی دوورکەوتنەوە لە فەرمییاتی تایبەت بە ژنی ڕێبەرێک، چەوەکانی نیشان دان و سەبارەت بەو گەنجینانەی لە بن پێیاندا بوو، قسەی بۆ دەکردن.

یەکێک لە پێشمەرگەکان بە هەڵخرانەوە گوتی: «جا ئەوە خۆ هیچ نییە، ئەم ناوچەیە پڕە لەم بەردانە».

یەکێکی دیکەیان گوتی: «بەو پێیە، کاتێک بە ئازادی بگەین، بە هەڵگرتنەوەی ئەم بەردانەوە ساماندار دەبین».

پێشمەرگەیەکی گەنج بە دەنگی بەرز، گوتی: «لەو کاتەدا ئێمەش عەجەمەکان دەچەوسێنینەوە!»

یەکێکی دیکە لە گەنجەکان پرسیاری کرد: «ئەوسا، چ جیاوازییەک لە نێوان ئێمە و ئەواندا دەبینی؟» ئەو گەنجە وەڵامی دایەوە: «ماوەیەکەی

دوور و درێــژە کــە ئەوان ئێمە دەچەوســێننەوە و ئێمــەش مافی تۆڵە کردنەوەمان هەیە!»

یەکــی دیکەیان گوتی: «مەگین تۆ بۆ دەســتەبەرکردنی دێموکراســی خەبــات ناکەیــت؟ مرۆڤێکی دێموکرات مافی خەڵکــی دیکەش لەبەرچاو دەگرێــت و دادپەروەریــی بــۆ هەمــووان دەوێت. خەباتی تــۆ لە دژی عەجەمەکان، خەباتێکی دادپەروەرانەیە و ئەگەر لەم خەباتەدا سەرکەوی، بە ئازادی دەگەیت. ئایا پاش دەستەبەر کردنی ئازادی، تۆش دەتهەوێ ڕێک وەک عەجەمەکان هەڵسوکەوت بکەیت؟»

پێشــمەرگەیەکی بەتەمــەن گوتــی: «بــاش گــوێ بگرە کــوڕم، ئێمە دێموکراتین و ئەوەش بەو مانایەیە کە ئێمە لەوان باشترین.»

باســەکە بــەردەوام بوو بەڵام لێنا، لە ســەرمادا هەڵدەلەرزی. لێنا، لە هاوڕێ نوێیەکانی ئیزنی ڕۆیشــتنی وەرگرت. پێشــمەرگە تۆڵەستێنەکە، کەوتــە تەکی و دەیویســت ئــەوەی گوتوویەتی بۆی ڕوونتــر بکاتەوە. پاشــان بــەردەوام بوو و گوتی: «بــۆ خواردنەوەی چایەک تەشــریف بهێننــە لای ئێمــە! ئەو لێنــای وەک خانمی ڕۆژنامەنووس ناســاند. لەو ڕووەوە کە ڕۆژنامەنووســەکان لە هەموو لایەکەوە ڕوویان لە «گۆگ تەپە» دەکرد، ئەو پێشمەرگەیەش وایزانیبوو کە لێناش ڕۆژنامەنووسە. بە چوونەژوورەوەی لێنا، دوو پێشمەرگەی بە تەمەن لە بەری هەستان و وێڕای تۆقە کردن لەگەڵ لێنا، داوایان لێکرد دابنیشــێت. لێنا ئێستکانە چایە گەرمەکەی گرت بە دەســتەوە و دەســتە ســڕبووەکانی پێ گەرم دەکردەوە. چەند ساتێک بە هێمنی و بێدەنگی تێپەڕی. پاشان یەکێک لەو پێشــمەرگە بە تەمەنانە کە لە تەنشت لێناوە دانیشتبوو، پرسیاری کرد: «بەڕێــزت میوانی دوکتوری ئێمەیت؟» (بۆ هەمــووان، عەبدولڕەحمان «دوکتور» بوو. لێنا وەڵامی دایەوە: «بەڵێ.»

پیــاوە بەتەمەنەکە پرســیاری کــرد: «ئەم هەمووە چــەوە بۆچی کۆ دەکەیتەوە؟»

ئەو پێشمەرگە گەنجە، هەموو چەوەکانی لە پێش لێنا، لەسەر زەوییەکە

بڵاو کردبووەوە. لەم کاتەدا، ژوورەکە پڕ ببوو لە پێشـمەرگە و هەموو گوێیان لە باسـەکان ڕاگرتبوو و قسـەیان تێدا دەکرد و سـەبارەت بە کانگا ژێرزەوینییە دەوڵەمەندەکانیان قسەیان دەکرد و ئەوەیکە لە فڵانە شوێن کانگای زێڕی لێیە و لە شوێنێکی دیکە، کانگای زیو و ...هتد.

پاشـان، کەسـێکیان پرسـیاری کرد: «بە نیازیت سـەبارەت بە کانگا ژێرزەوینییەکانی ئێمە بنووسیت؟»

لێنا وەڵامی دایەوە: «بەڵێ، هەروەها سەبارەت بەوەش دەنووسم کە ئێوە چەند وڵاتەکەتان و ئازادیتان خۆش دەوێت!»

یەکێک لەوان، بە بیسـتنی وەڵامەکەی لێنا، گوتی: «باشە، زۆر باشە، دەبێ ڕاسـتییەکان سـەبارەت بە عەجەمەکان و ئەوەیکە ئێمە لە لایەن ئەوانەوە، تەنیا بە هۆی کورد بوونمانەوە و ئەوەیکە لە ماف و شەرەفمان داکۆکی دەکەین، ئەشکەنجە دەدرێین و دەکوژرێین، ئاشکرا بکرێت».

لەم کاتەدا، کەریم، یەکێک لە پێشمەرگە سکۆرتەکانی عەبدولڕەحمان، هاتـە ژوورەوە و گوتـی: «خانم، هەم دوکتور ئیشـی پێتە و هەم ئەو کەسانەی کە بۆ دیداری بەڕێزت هاتوون».

بنکـەی ناوەندیـی حیزبـی دێموکـرات پـڕ بـوو لـە ڕێژەیـەک لـە ڕۆژنامەنووسـان و حەشـیمەتێکی زۆر لە کـوردەکان. عەبدولڕەحمان بە ڕۆژنامەنووسـەکان ڕادەگەیشـت و لێناش بە کـوردەکان. لە نێوان کوردەکاندا، دوو کەس هەبوون بە نێوی ئەبووبەکر و هاوسـەرە زۆر گەنجەکـەی پەروین. یەکەمین خولی هەڵبژاردنی پارلەمان تازە کۆتایی پێهاتبـوو و حیزبـی دێموکرات لـە هەموو شـوێنێک دەنگی زۆرینەی هێنابـووەوە. ئەبووبەکریش بە زۆرینەی دەنگ وەکوو نوێنەری بۆکان دەنگـی هێنابـووەوە. ئەو هەوڵـی دەدا لێنا ڕازی بکات لە کوردسـتان بمێنێتەوە و هۆکارەکەشـی ئـەوە بوو کە لێنا دەتوانـێ کاریگەرییەکی قـووڵ لەسـەر ژنـان دابنێ و بەڵێنـی دەدا کە هـەزاران ژنی کورد کۆ دەکاتـەوە و لێنـاش لێدوانیان بۆ دەدات و.. ڕەنگـە ئەگەر بیزانیبایە کە لێنـا چەنـد وتەبێژێکی خـراپ و نەگونجاوە، وازی بهێنایە. سـەرەڕای

ئەوە، لێناش زۆر حەزی دەکرد لەوێ بمێنێتەوە و لەگەڵ ژنان بکەوێتە چالاکییــەوە. بەڵام عەبدولڕەحمان بڕوای بەوە هەبوو کە بوونی لێنا لە ئۆرووپا زیاتر بە سوودی کوردەکان دەبێت.

هاوسەری لێنا، کەیفخۆش، ڕازی و تەژی لە ئیرادە دەهاتە پێش چاو. بەڵام، ئەو هەڵگری بەرپرســایەتییەکی مەزن بوو. چونکە هاوکارەکانی، بە بێ ئەو هیچ بڕیارێکیان نەدەدا و هەموو بۆ چارەسەری کێشەکانیان دەهاتنــە لای ئــەو. تەنانەت کاتی پێویســتی بۆ نــان خواردنیش نەبوو چونکە لە کاتی نان خواردندا، بە هۆی کاری زۆر و هاتوچۆ و سەردانە بەردەوامەکانەوە، ناچار بوو لە پەســتا لە ســەر مێزی نان خواردنەکە هەستێت و بە کاروبارەکان ڕابگات. هەربۆیەش، لێنا بیری لەوە دەکردەوە کە ئەو هەموو بەرپرسایەتییە بۆ یەک کەس، لەڕادە بەدەرە.

■ مەهاباد

لەبــەر ئــەوەی ئــەو کۆبوونەوەیــەی کــە قــەرار بوو ســەبارەت بە چالاکییەکانــی لێنــا بڕیاری تێدا بدرێت، بەو حــاڵ و دۆخەوە نەدەگیرا، لێنا بڕیاریدا ســەردانی مەهاباد، شــاری قارەمان و پێتەختی کۆماری تەمەن کورتی کوردستان بکات. لەوێ لێنایان بۆ بینی بەنداوی مەهاباد و دەوروبەری برد. ئەم بەنداوە جێی شــانازیی خەڵک و ســەیرانگەیان بــوو. لە ئاوی بەنداوەکەشــدا مەلەیان دەکرد، دیــارە تەنیا پیاوەکان و منداڵــەکان بۆیان هەبــوو مەلە بکەن و ژنان لەو مافــە بێبەش بوون و هەڵبەت لەو بوارەدا، ئەوە خودی ژنانی کورد بوون کە دەرسی لێنایان دادەدا! و دەیانگــوت لێــرە، ئەگەر ژنێک دامەنی کــورت لە پێ بکات، بە چــاوی بێحەیا و خراپە ســەیری دەکەن (دەڵێن چ ژنێکــی بێحەیایە کە خــۆی ڕووت دەکاتەوە). لێنا کە جل و بەرگی ئورووپایی لەبەردابوو و تەنوورەکەی هەتا قولاپەی دەهات، بە گاڵتەوە دەیگوت: «هیوادارم بەم قولاپە ڕووتمەوە نەبمە هۆی سەرشۆڕیی پیاوەکان».

لێنــا ژنان و کچانی ڕەزاییەی لە ســاڵی ٢٧دا وەبیر دەهاتەوە. ئەوان

دامەنی کورتیان لە پێ دەکرد و کەسیش پێی سەیر نەبوو. ئەگەر لە مەهاباد لە ساڵی ١٩٨٠دا، لەبەرکردنی دامەن نەگونجاو و دژەباو بوو، بێگومان سەبارەت بە لەبەرکردنی جلو بەرگی تایبەت بە مەلە (مایۆ) هەر نەدەکرا باسیشی بکرێت. ئاڵوگۆڕە ئیسلامییەکان لە دۆخی ژناندا، نەک هەر لە لایەن پیاوانەوە بەو پەڕی مەیلەوە پێشوازی لێکرابوو، بەڵکوو بۆ بەکردەوە کردنیشی، هەموو توانای خۆیان خستبووە گەڕ. لە ڕاستیدا، پاشەکشە بەرەو دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی بە خێرایی بە کردەوە کرابوو. ژنان کە مافی هەڵبژاردنیان نەبوو، ناچار بوون ملکەچ بن. سەرەڕای ئەوەش، لە ماڵەوە، کچان و ژنان بە پرسیاری بەردەوام دەورەی لێنایان دەدا، ئەوەش دژی ئەو بۆچوونەی دەسەلماند کە لەسەرەوە باس کرا: ئەوان پرسیاری سیاسی و هەندێ جاریش ورد سەبارەت بە دۆخی ژنان لە نیزامی کۆمۆنیستیدا، هەڵسوکەوتی پیاوانی دێموکرات بەنیسبەت ژنانەوە، مافەکانی ژنان و چۆنایەتی ڕەچاوکردنی ئەو مافانە لە وڵاتە سوسیالیستییەکان و هەروەها چۆنیەتی دانی مووچە لە بەرانبەر کاری وەک یەکی ژن و پیاو لەو وڵاتانەیان دەهێنایە بەرباس و...هتد.

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە لە ڕیزی بزووتنەوەی چەپدا بوو و تازە لە دۆخی نایاسایی بوون هاتبووە دەرەوە، هێشتا پێگەی خۆی لە کۆمەڵگەی سەرانسەر ئاڵۆزی ئێراندا قایم نەکردبوو، کە لەگەڵ شەڕ ڕووبەڕوو بوویەوە. زۆریەک لە کوردەکان ڕاستگۆیانە باوەڕیان بەوە هەبوو کە کۆمۆنیسم ئازادییان بۆ دەستەبەر دەکات. لێنا کە هاوسەری ڕێبەری ئەم بزووتنەوەیە بوو، لە بەرانبەر ئەم پرسیارە ڕاستگۆیانانەدا، هەستی بە سەرلێشێواوی دەکرد. باوەڕ بە ڕاست بوونی ڕێژیمە کۆمۆنیستییەکان، لەمێژ بوو لای لێنا کاڵ ببووەوە. چونکە، ئەو بەچاوی خۆی بینیبووی کە چی بەسەر خەڵکانی ژێر دەسەلاتی ئەم ڕێژیمانەدا هاتووە. خودی لێنا چەپ بووە، بەڵام بە تێپەڕینی ساڵەکان، چەپ بوونەکەی ببووە شتێکی شەخسی و ئەویش بریتی

بوو لە پشــتیوانیی هەژاران و ئەوانەی ســووکایەتییان پێکراوە، بە بێ ئەوەی پشــت بە حیزبە سیاسییەکان ببەســتێت، ئەوەش بە سەرنجدان بــەو زانیاری و ئەزموونانە بوو کە لەو حیزبانە بە دەســتی هێنابوون. هەربۆیەش وەڵامدانەوە بەو کچانە و بەو ژنانە زۆریش سانا نەبوو. لە لایەکەوە، ئەو نەدەبوو زەبر لە بزووتنەوەی هاوســەرەکەی بوەشێنێت و ببێتــە هــۆی بریندار کردنی هەســتی ئەو گەنجانەی بــە هەموو مانا ئۆگــری ئەو بزووتنەوەیە بوون. لینا گومانی لە بەردەوامی و مانەوەی ئەو ئازادییە پێڕەوکەیە هەبوو کە لە بەشــێکی کوردستان و ئەویش بە دەڵەمەیی، جێگیر ببوو، لە لایەکی دیکەشــەوە، درۆ کردن لەگەڵ ژنان، بەهــا نەدان بوو بە تێگەیشــتوویی و ئاوەزیــان و بێگومان ڕۆژێک بەو ڕاستییە دەگەیشتن و ئەوەش زەربەی لە متمانە هێنانیان بە دێموکراسی دەدا. هەربۆیەش، لینا وەڵامی پرســیارەکانی بە شــێوەیەکی ڕووکەشی و ناورد دەدایەوە.

ئەم سەردەمە ئاڵۆز و دژوارە، بە بێ ئەوەی بەرچاو بێت، سەرەتای شــکۆ و ناوبانگ دەرکردنی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوو. ئەم حیزبە بەرەو ئەوە دەچوو کە لە ساڵانی داهاتوودا، وەکوو هێزێکی دیاریکەر و جێی ڕێز لە بەشێکی گەورەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا ڕۆڵ بگێڕێت.

■ چیرۆکی ژنێک بە نێوی جوان

باســی ڕۆژەڕەشــییەکانی ژنان کرا. لێرەدا وەکوو نموونە، ئاماژە بە دوو نموونــەی زینــدوو دەکرێــت. ڕۆژێکیان، پاش نیــوەڕۆ، لینا جل و بەرگە کوردییەکەی لەبەر کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ ژنێکی تەمەن ٣٩ ساڵدا دابنیشــێت. نێوی ئەم ژنە دەنێین جوان کە لە زمانی کوردیدا بە مانای «ژیکەڵــە و لەبــەردڵان»ە، چونکــوو ئەو هەم لــە گەنجییەتیدا جوان و ســەرنجڕاکێش بــووە و هەم لــە کاتی ئەم چاوپێکەوتنەیــدا لەگەڵ لینا، هێشتاش هەر جوان بوو. لینا ئەو ژنەی لەو کاتەوە کە منداڵێکی تەمەن

٩ ســاڵ بوو دەناســی. باوکی بەنیاز بوو جوانی تازە پێگەییو بدات بە ناســیارێکی خۆی کە ژنەکــەی تەڵاق دابوو و دوو کــوڕی هاوتەمەنی جوانــی هەبوو. بەهەرحــاڵ، ڕەنگە ئەو پیاوە، لەو کاتەدا، پیاوێکی زمان لووس و کەشخە بووبێت و ئەو کچە زۆر گەنجەش، توانای هەڵسەنگاندن و جیاوازی دانان لە نێوان پیاوی عاقڵ و پیاوی زمان تەڕی نەبووبێت. هەرچۆنێک بێت ئەو کچە شێتانە عاشقی ئەو پیاوە دەبێت و بەم چەشنە چارەنووسی جوان دەگۆڕێ.

باوکی جوان، ڕای خۆی گۆڕیبوو و چیدیکە ڕێی بە «مەناف» (پیاوی داواکار) نــەدەدا بچێتە ماڵــی. بەڵام جوان بە نهێنــی هاتوچۆی مەنافی دەکــرد. کاتێــک باوکــی بەم کەیــن و بەینەی زانی، ڕێی لــە پەیوەندیی کچەکەی و مەناف گرت. شایانی باسە کە لە کۆمەڵگەیەکی موسوڵماندا، ڕێ بــەو هەڵسوکەوتــەی جوان نادرێت و یاســاغ بوونی ئەو بابەتە لە لایەن باوکەوە، وەک ڕۆن بە ئاگردا بکرێت وابوو. جوانی لاســار ماڵی باوکــی بەجــێ دەهێڵێت و لە ماڵــی مەناف جێگر دەبێــت. دایکی جوان لــەو کردەوەی کچەکەی بەڕادەیــەک زویر دەبێت کە خۆڵەمێش دەکات بە ســەروڕووی خۆیدا و دواجار بنەماڵەکە لەبەریەک هەڵدەوەشێتەوە. بــەڵام جوان لە مافــی خۆی لەســەر هەڵبژاردنی ژیانە هاوبەشــەکەی داکۆکی دەکات. هەربۆیەش باوکی تووکی لێدەکات و لێی ناپرســێتەوە. لــەم چەشــنە کۆمەڵگەیانەدا، پیاوێــک کە بە نیســبەت ژنەکەیەوە ڕێک و پێــک نەبێــت و پەیوەنــدی لەگەڵ ژنانی دیکە دروســت بــکات و یان ژن بێنێتــەوە، وەکــوو پیاوێکی بەهێز، خۆشــڕابوێر و چاوحیز ســەیر دەکرێــت و بە دەگمەن لــە لایەن کۆمەڵگەوە بە تاوانبــار ناوی دەبەن. بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەگەر ژنێک ورەی ئەوەی هەبێت کاری وا بکات، دەســتبەجێ بە تاوانبار دەناســرێت و سووکایەتیی پێدەکرێت و قسەی ســارد و ســووکی پێدەگوترێت و هەموو خوازیاری توندترین سزاکان بــۆ ئەو ژنە دەبن. ئەو ژنە دەبێ داوای بەخشــین بــکات و تۆبە بکات. بەڵام جوان کە تەبعێکی سەرکەشی هەبوو، هەرگیز نە داوای بەخشینی

کرد و نە پەشـیمانیی دەربڕی. هەربۆیەش، سـاڵانێکی زۆر لە دۆخێکدا دەژیا کە زۆربەی خەڵک تێی نەدەگەیشـتن. پاشـان شـووی بە مەناف کرد و کچێکیشی لێی بوو. بەڵام هێندەی نەخایاند کە خوو و سروشتی سـووکی مەنـاف سـەری هەڵدایـەوە و جوان بـوو بە کەرەسـتەیەک بـۆ بەتـاڵ کردنەوەی گـرێ دەروونییەکانـی. تەنیا دڵخۆشـیی جوان، کچەکەی بوو. بەڵام گرفتەکە گەیشـتە ئاسـتێک کە جوان ئیتر بڕسـتی لێ بڕا و هەربۆیەش، کچەکەی هەڵگرت و ماڵی مێردەکەی بەجێهێشت. دیسـانەوەش کردەوەیەکی لێبڕاوانە لە لایەن ژنێکەوە سەری هەڵدابوو. بـەڵام ئەم کردەوەیە لە لایەن کۆمەڵگەوە ڕەت دەکرایەوە. هەربۆیەش، جارێکی دیکە، هەموو لە دژی جوان هەسـتانەوە. دواجار، برای جوان، لەگەڵ مێردەکەی یەکی خسـتنەوە و بەم شێوەیە پێشی بە ڕیسواییەکە گرت.

لـە بنکـەی ناوەندیی حیزبـی دێموکرات، لینا بـەرەوڕووی «جوان»ێکی چارەڕەش بووەوە. پاش تەڵاق، بە پێی ڕێوشـوێنە قورعانییەکان، مافی سەرپەرەشـتی کردنـی منداڵ بە باوک دەدرێـت و مەنافیش ئەو پیاوە نەبوو دەستبەرداری ئەو مافەی بێت. سەندنەوەی منداڵ لە دایک، سـزادانی ئەو ژنەیە کە ملکەچی مێردەکی نابێت. ڕاسـتە کە بۆ دایکێک، هەڵگرتنەوەی منداڵەکەی لە داوێنی تاقەتپڕووکێنە و ژیانەکەی ئاستەم دەکات، بـەڵام ئایـا ژیان لەگەڵ پیاوێکی ئاوا ئاسـانە؟ لەو وڵاتانەدا کە ژن هیـچ پشـتگیرییەکی یاسـایی لە پشـت نییە، بێبـەش کردنی ژن لە منداڵەکەی، بارتەقای چارەڕەشییەکی هەتاهەتاییە. هەربۆیەش، ئەم ژنە بـە ناعیلاجـی ملکەچی پیاوێکی بێئینسـاف دەبـێ و گوێڕایەڵ بوونی خۆی قبووڵ دەکا.

■ ئێستاش چیرۆکی ئامینە

ڕۆژێکیان لینا لە پشـت پەنجەرەی ماڵێکدا، چاوی بە ژنێک دەکەوێت، بـەرەو درگای ماڵەکـە دەچێت و لـە درگا دەدات. هەندێجـار، ژنەکان

بــە ڕوانینێکی هەڵــە و تەنانــەت دوژمنکارانەوە ســەیریان دەکرد. ئەم بەشــە لە ژنان، ڕاســتگۆیانە هەســتەکانی خۆیان باس دەکرد و لینێاش پێویســتی بەو وتە ڕاشــکاوانانە هەبوو و یەکێک لەو ژنانە، هەمان ژنی پشــت پەنجەرەکە بوو کە نێوی فاتمە بوو. لە حەوشــەیەکی بچکۆلەدا، لەبەر دەرکەکە، دیڵە ســەگێکی گەورە ڕاکشــابوو و تووتکەکانی وەک تۆپەڵە بەفر، تووکن و ســپی تێی ئاڵابوون. ژنەکە بۆ دوورخســتنەوەی تووتکــەکان کە لە نیزیکەی دەرکەکەوە یارییان دەکرد، چەند شــەپێکی بەملاوئەولادا تێگرتن و پاشــان بــە ڕوویەکی گرژ و مۆنەوە ڕووی لە لینا کرد و هۆکاری سەردانەکەی لێ پرسیار کرد.

لینا وەڵامی دایەوە: «هاتووم تۆ ببینم خوشکە».

ئــەو ژنــە، دەســتێکی ڕاوەشــاند و ئاماژەی بــۆ لینا کرد کــە بچێتە ژوورەوە. کابانی ماڵ، نارەزایەتیی خۆی لە ســەردانە ناوەختەکەی لینا نەدەشــاردەوە. بەڵام لیناش سوور بوو لەســەر ئەوەی ئەو ژنە بێنێتە قســە. لینا لە زەینی خۆیدا سەرقاڵی ئەوە بوو لە کوێوە دەست پێبکات، ژنێکــی دیکەی لە نێــوان دەرکەیەکی نیوە کــراوەدا بینی و هەربۆیەش پرسیاری کرد: «ئەوە خوشکتە؟»

لینا قسەکانی بە پرسیارێکی باشەوە دەست پێکردبوو. فاتمە ورووژا و چیرۆکی ئامینەی بە تێروتەسەلی بۆ لینا گێڕایەوە.

ئامینــە شــووی بە پیاوێکــی تووڕە و بەدفــەڕ، لە ناوچــەی باکوور کردبوو و دوو منداڵیشــی لێی هەبوو. زۆر جاران کەوتبووە بەر لێدان، ئەشکەنجە و دەستدرێژی و...هتد. لە لایەن هاوسەرەکەیەوە سووکایەتی پێدەکرا و جنێوی پێدەدرا. ئامینە چەندین جار منداڵەکانی هەڵگرتبوو و گەڕابووەوە بۆ ماڵی باوکی. بەڵام، هەرجارە، ماڵی بابی گەڕاندبوویانەوە بۆ لای مێردەکەی. دواجار، بەرگەی ئەو ئازار و ئەشکەنجەیە ناگرێت و ماڵئاوایــی لــە منداڵەکانی دەکات و ماڵی مێردەکەی بەجێ دەهێڵێت. ئەو کە هیچ لایەکی نەبوو پەنای بۆ ببات، ڕێگای باشــووری گرتبووە بەر. لەم ســەردەمی ئاوارەییەدا، ئامینە لە دەرەوە دەنووســت و لای خەڵکی

گوندەکە نانێکی دەخوارد، لە هێڵەکانی شەڕ تێدەپەڕی و.. بەدوای ئیش و کاردا دەگــەڕا. بــەڵام کەس پێویســتی بە کاری ئــەو نەبوو. لە گۆگ تەپــە، ڕۆژێکیان فاتمە لە بەر دەرکەی ماڵەکــەی خۆی بە نیوەگیانی و نووستوو دەیدۆزێتەوە.

فاتمــە وەکوو یاریدەدەرێک بۆ کاروبــاری ناوماڵی خۆی ڕایدەگرێت و لــەو ڕۆژە بــەدواوە، ئەو دوو ژنە پێکــەوە ئیش و فرمانی ناو ماڵیان ڕێکدەخســت و ببوونە ئاواڵ. پاش ماوەیەکی کورت، ئامینەش هات بۆ لایان. ژنێکی باڵا بەرز و نێوقەد باریک، بە هێز، بە دوو چاوی ڕەشــی مێهرەبانەوە، لێوی گۆشتن و ڕواڵەتێکی بە بزەوە. فاتمە بە تێروتەسەلی وەڵامی پرســیارەکانی لێنا سەبارەت بە چارەنووسی ئامینەی دەدایەوە و ئامینەش کە ژنێکی کەمدوو بوو، بە ڕاوەشــاندنی ســەری، گوتەکانی فاتمەی پشتڕاســت دەکردەوە. بە ڕوونی دیار بوو کە ئامینە لە بوونی خــۆی لــە ماڵی فاتمە ڕازییە. ئەو دوو ژنە هەتا بەردەرکە لێنایان بەڕێ کرد و دڵنیایان کردەوە کە هەرکات بیەوێت سەردانیان بکات، پێشوازیی لێدەکەن.

■ کۆبوونەوەی دەفتەری سیاسی

ســەرئەنجام، کۆبوونەوەی ئەندامانی دەفتەری سیاسی کە بڕیار بوو ســەبارەت بــە چالاکییەکانی حیزب لە ئورووپــا و لەوانە چالاکییەکانی لێنــا بڕیار بــدەن، بەڕێوەچوو. لە کۆبوونەوەکەدا، لێنا دەســتی کرد بە شــی کردنەوەی ئەو دۆخەی کە پێی وابوو کاریگەریی ئەرێنی لەســەر چالاکییەکانــی حیزب لــە ئورووپا دادەنێت. پێشــنیاری کرد دەفتەرێکی نوێنەرایەتی لە ناوەندی ئورووپا بکەنەوە (بە بۆچوونی ئەو، پاریس بۆ ئەو مەبەســتە، گونجاوترین شــوێن بوو). پێرسۆنێلەکەی دەبوو لە ناو کوردە پەنابەرەکان و لە کارامەترینەکانیان هەڵبژێردرێت و دەبوو لەوێ کاروباری پەیوەندییە دەرەکییەکانی حیزب ڕاپەڕێنن. ئەم نوێنەرایەتییە، وەکوو هەر ئیشێکی دیکە، بۆ بەرەوپێشچوونی چالاکییەکانیان، پێویستی

بە ئیمکانات هەبوو.

لــە ســاڵی ١٩٨٠دا، کوردســتان بــەلای ڕای گشــتیی جیهانەوە زۆر ناسراو نەبوو. بۆ ناساندنی زیاتری، پێویست بوو بۆڵتەنێک بە شێوەی ڕێک و پێک بڵاو بێتەوە. بۆ ئامادەکردنی بۆڵتەنێکی ئەوتۆ، کەســانێکی ڕۆژنامەنــووس و نووســەر و هەروەها وەرگرتنــی تەکووزی هەواڵی نوێ و دروست پێویســت بوو، تەنانەت ئەگەر هەواڵەکان سەبارەت بە کوردستان و سەرانسەری ئێران نەرێنیش بن (ئەوان زۆربەی کاتەکان بەوە ڕاهاتبوون کە بڵێن هیچ کێشــەیەک نییە و هەموو شــتێک لە جێی خۆیدایــە). دیارە ئەو کەســەش کە دەبــوو بەرپرســایەتیی پەیوەندییە گشــتییەکان لە ئەستۆ بگرێت، پێویستی بە هەموو ئەو ئیمکاناتە هەبوو. عەبدولڕەحمان وێڕای شی کردنەوە و لێکدانەوەی زیاتر، پشتیوانیی لە پێشنیارەکانی لینا کرد.

هەمــوو ئەندامانی دەفتەری سیاســی کە لــەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە بوون، پێشــنیارەکانی لینایــان قبووڵ کرد و داوایــان لێکرد کە جگە لە بەرپرســایەتیی پەیوەندییە گشــتییەکان، سەرپەرشتیاریی پێڕاگەیشتنی کاروبــاری ماڵیــی حیــزب لە بانکەکانــی دەرەوەی ئێرانیش لە ئەســتۆ بگرێت.

لینا بەو مەرجەی کە دوو هاوکاری بۆ دیاری بکەن، بەرپرســایەتیی پەیوەندییــە گشــتییەکانی حیزب لــە دەرەوەی وڵاتی وە ئەســتۆ گرت. ئــەو بــاش دەیزانی کەســێک بە تەنیا بــۆ بەرەوپێشــبردنی کاریگەری ئەم بەرپرســایەتییە بەس نییە (ئەو پێشــتریش ئــەو کارەی کردبوو و دەیزانی باسی چی دەکات)، جگە لەوەش، لە ئەگەری لەناوچوونی لینادا، پێویســتیان بە کەســانێک هەبوو کە لەو بوارەدا ئەزموونی پێویستیان پەیدا کردبێت.

لینــا وێڕای شــی کردنــەوەی ئەوەیکە هیــچ ئەزموونێکــی لە بواری کاروبــاری ماڵیدا نییە، خۆی لە بەرپرســایەتیی کاروباری ماڵیی حیزب لە بانکــەکان دەبوارد. بەڵام عەبدولڕەحمــان پێداگریی دەکرد و بەڵێنی

پێدا کە بۆخۆیشــی لەو بــوارەدا هاوکاری دەکات. ئــەوان پێیان وابوو کە لینا بەرپرســایەتیی دووهەمیشی قبووڵ کردووە، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە لە کاتی هێنانە ئارای باســی سەرپەرەشــتیاریی کاروباری ماڵی، لە لایەن دەفتەری سیاسییەوە، لینا پێکەنیبوو، دیارە پێکەنینەکەی لینــا لەبەر ئەوە بوو کە داخوازەکەی ئــەوان جیددی نەبوو. لەو کاتەدا حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران زۆر هەژار بوو و لینا نەیدەزانی کە پاش ماوەیەک دۆخەکە دەگۆڕدرێت و حیسابەکانی حیزب پەرەیەکی بەرچاو دەسێنێت.

لەو ڕۆژەدا، لە لایەن ئەندامانی دەفتەری سیاسییەوە، گەلێک بەڵێنی بە لینا درا . سەرەڕای ئەوەش، ئەزموونەکانی لینا لەگەڵ هاوسەرەکەی و کوردەکانی دیکە، نەیدەهێشت هەست بە دڵخۆشی بکات. لینا لە ئاسمان و زەوی دەپاڕایــەوە کــە ئــەوان، ئەمجارەیان بەڵێنەکانیــان فەرامۆش نەکەن. بەڵام ئەمجارەشــیان ئاســمان گوێی لە نزاکانی نەگرت. دواتر، کاتێــک لینا هەوڵــیدا لە هۆکاری ئەو خەمســاردییە بکۆڵێتەوە، تێگەیی کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە هۆی ئاڵوگۆڕی دۆخەکەی، ناچــار ببــوو هەموو توانای خۆی لەســەر ڕێکخســتنە نوێیەکەی و بە تایبەتی لەســەر شــەڕ چڕ بکاتەوە. لە ڕاســتیدا چالاکی لە ئوروپا، بۆ حیــزب لە پلــەی دووهەمی گرینگی پێداندا بوو. بــەڵام بۆ لینا، ئوروپا واتە «کرانەوەی پەنجەرەیەک بەرەو جیهان» کە دەیتوانی جێی حیزب لــە نــاو بزووتنــەوە گرینگەکاندا بکاتــەوە و هێزی حیــزب بۆ چالاکیی کاریگــەر و بە کەڵک لە بەرژەوەندیی وڵات بەرز کاتەوە. جگە لەوەش، سەرنج نەدان بەم بابەتە، مەترسیی ئەوەی لێدەکرا کە جارێکی دیکەش حیزب بگەڕێتەوە بۆ دۆخی حیزبێکی لۆکاڵی و بێبایەخ.

لەو ســەردەمەدا، حیزب هێشــتاش چەند ســاڵێکی مابــوو کە وەکوو حیزبێکی خاوەن دەســەڵات و گرینگ دەرکەوێت. ســەرەتاکانی ســاڵی ١٩٨٠، لە ڕاستیدا سەرەتای ئەو دۆخە بوو.

لەو ڕۆژەدا کە لینا لەگەڵ ئەندامانی دەفتەری سیاســی کۆبوونەوەی

هەبــوو، پاســدارەکان بەرەو مەهابــاد بەڕێ کەوتبــوون و دەوری ١٢ کیلۆمیتریــان مابــوو بگەنــە مەهابــاد. هەربۆیەش، دەفتەری سیاســی دەیویست کە لینا بە زووترین کات بگەڕێتەوە بۆ ئورووپا.

ســەفەرەکەی لینــا، تێپەڕین بە وڵاتێکــی کاول کراودابوو. ئەویان بە کوێســتانە ئەمینەکاندا دەبرد کە هیچ خاڵێکی پشــکنینی نیزامیی لەسەر نەبــوو. بــە درێژایی ڕێگاکە، بینــای کاول کراوی کارگــەکان، ناوەندی گەیاندنــی کارەبــا و هەروەها کۆگا کشــتوکاڵییەکان ســەرنجی لینایان ڕادەکێشا...

لە ڕاســتیدا تەنیا یەک ســاڵ و شــتێک بەســەر شۆڕشــی ئیسلامیدا تێپەڕیبوو، بەڵام هەر ئەو ماوە کورتە بۆ داڕمانی ئابووریی کوردستان بەس بوو.

خومەینی لە یەکێک لە لێدوانەکانیدا، کە لە فەرانسە لە سەر شریت تۆمار کرابــوو، دەیگوت: «تەنانەت ئەگــەر خەڵکی ئێران، من بۆ بەڕێوەبەریی وڵات هەڵبژێــرن، تەنیا تا ئەو کاتە لەو بەڕێوەبەرییە بەردەوام دەبم کە دڵنیا بم ئەوانەی شوێنم دەگرنەوە، مرۆڤگەلێکی دروستکارن و توانایی دابین کردنی دێموکراسی بۆ هەموو خەڵکی ئێرانیان هەیە».

بەڵام بینیمان کە دێموکراسیی خومەینی بریتی بوو لە پێدانی ئازادی بــە فێناتیکەکان «دەمارگرژەکان». شــەڕ لە دژی کوردەکان و لە دژی عەراق، وڵاتی بەرەوڕووی ڕۆژەڕەشــی و نەهامەتی کردەوە. خومەینی لە هەســتی مەزهەبیی کوڕانی گەنج کە هێشــتاش منداڵ بوون، کەڵکی وەردەگرت، «کلیلی ئاسمان»ی دەخستە ملیان و بۆ بەرەکانی پێشەوەی شــەڕ بەڕێی دەکردن. پێش ئەوەی هێزە چەکدارە شەڕکەرەکانی بگەنە بەرەکانی شــەڕ، پۆل پۆل دەیناردنە ســەر زەوییە مینڕێژ کراوەکان و ئــەو ناوچانــەی لە مین پێ پــاک دەکردنەوە و پێــی دەگوتن کە ئەگەر کوژران، بەو کلیلانە دەرکەی بەهەشــت بکەنەوە و بڕۆنە بەهەشــت و ...هتد.

کاتێــک ڕەنگەکان، دەنگــەکان و بزووتنەوە جۆراوجــۆرەکان، بە بێ

پێکـدادان و بەریەک کەوتن، تێک دەچڕژێن، وڵاتێکی هەمەجۆر و تەژی لە ئاشتی و هێمنایەتی وێنا دەکەن. لە وڵاتێکی ئەوتۆدا، مرۆڤ هەم خۆی دەژی و هــەم مافــی ژیان بە خەڵکی دیکــەش دەدات. کاتێک لە هەموو ناوچەکانــدا، تەنیــا یەک مەزهــەب یان دین لە باتی دەوڵەت سیاســەت بەڕێــوە ببات، ئەو ڕەنگانە، ئەو دەنگ و بزووتنەوانە لە خۆپەســەندیی خۆیاندا و لەسای دەسەڵاتێکی پاوانخوازدا، ڕەنگ و بۆنی یەکتر دەگرن و ئەوســایە کە ئەو وڵاتە هێزی بیر هێنانەوەی خۆی لەدەســت دەدات و دەبێت بە وڵاتێکی بێڕەنگ، بێچێژ و هەڕەشــەکەر. ئێرانی خومەینی بەهــۆی بێبەزەیــی مەزهەبییــەکان و دەمارگرژیی گشــتییەوە، بەرەو ئیفلیج بوون دەڕۆشت.

بەوحاڵەشەوە، سەرەڕای بوونی ترس و توندوتیژی، هەمیشە پیاوان و ژنانێک هەن کە خاوەنی هەڵوێستن و خۆڕاگری دەکەن. شەڕی نێوان ئێران و عەراق و هەروەها شــەڕ لە کوردســتانیش کۆتایی پێهاتووە. بەرەیەکــی نــوێ لەدایک بــوون و خۆڕاگــری بەرانبەر بیــری تاریکی مەلاکان بەردەوامە.

لە لایەکەوە، بیرکردنەوەی خەڵک لە کوردستان گۆڕدراوە، و لە لایەکی دیکەشەوە، بەرنامەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە لە مافی مــرۆڤ، بە ژن و پیــاوەوە، بەرگــری دەکات، کاریگەریی خۆی داناوە. جگە لەوەش، لە ماوەی ئەو چەند ســاڵەدا کە حیزب بەشــێک لە خاکی کوردســتانی ڕزگار کردبــوو و بەڕێوەبەریی ئەو ناوچانەی وەئەســتۆ گرتبــوو، خەڵک تامی ئازادییان چەشــت و باشــتر بوونــی بارودۆخ لە ســای ئەو ئازادییەیان بە گۆشت و پێســتەوە هەست پێکرد و ئەوەش، شتێک نییە کە بە خێرایی فەرامۆش بکرێت. دەبێت دان بەوەدا بنێین کە بەرنامەی ئەو ئاڵوگۆڕە بەرفراوانانەی کە حیزب و خەڵکی کوردســتان دەســتیان پێکرد، پێویســتی بــە کات و زەمەن بــوو، مەخابن حیزب و خەڵک ئەو دەرفەتەیان بۆ نەڕەخسا.

■ کار کردن لە ئورووپا و کوردستان

لەگـەڵ گەڕانـەوەی بۆ ئورووپـا، لینا بێـکار دانەنیشـت. پاش یەک ساڵ، کاتێک گەڕایەوە بۆ کوردسـتان، ڕاپۆرتی چالاکیەکانی ئەو یەک سـاڵەی بریتی بوو لە: دامەزراندنی ئا. ئێف. کا. (ئەنجومەنی فەرانسـە - کوردستان بە مەبەستی ئاسانکاری لە کاروباری دەفتەری نوێنەرایەتی حیزب)، دامەزراندنی دەفتەری نوێنەرایەتی، ئەنجامدانی سـەفەرگەلێک بە مەبەسـتی کۆکردنەی یارمەتی و هەروەهـا کۆمەڵێک چالاکیی دیکە کە دەسکەوتێکی ئەوتۆی نەبوو. ئەوەش دەرئەنجامی بێئەزموونی لینا و پێش هەرشـتێکیش نەبوونی هـاوکار بوو. دەرئەنجامەکەشـی ئەوە بـوو کـە: لینا ناچار بوو تەنیا پشـت بە خۆی ببەسـتێت. پیاوی کورد، لەگەڵ ئەوەدا کە ڕێزی لێدەگرت و هەڵسوکەوتێکی دۆستانەی لەگەڵی هەبوو، کەچی بایەخێکی بۆ کارەکەی دانەدەنا و پێداویستییەکانی ئەوی لـە ڕەوتی کارکردنیـدا دابین نەدەکرد. عەبدولڕەحـان گوێی لە گازندە و گلەییەکانـی لینـا ڕادەگـرت و لەو ڕووەوە کە بۆخۆشـی ئەزموونی هاوشـێوەی ئـەوەی تێپەڕاندبوو، تێدەگەیشـت و بەڵێنیـی هاوکاری و یارمەتیی پێدەدا. بەڵام ئەو هاوکارییانە هەرگیز بە کردەوە نەکران.

بەوحاڵەشـەوە، لینا دیدارەکانـی عەبدولڕەحمانی لەگـەڵ کابینەکان، وەزارەتخانەکان و دەفتەری حیزبە سیاسـییەکان ڕێکدەخسـت. خودی لینـاش لەگەڵ ڕێکخراوە ناحکوومیەکان دیداری دەکرد و لە فرومەکاندا وەکـوو نوێنەری حیزبی دێموکرات بەشـداریی دەکرد و سـەبارەت بە پرسی کورد قسەی دەکرد و هەر بەو مەبەستەش، سەفەری دەرەوەی فەرانسەشـی دەکرد. بە یارمەتیی عەبدولڕەحمان و ڕاوێژکارانی بانک، بەڕێوەبەریـی کاروباری بانکیـی حیزب فێر دەبـوو و تەنانەت توانیی بگاتـە قۆناغـی دروسـت کردنـی داهـات و قازانجیش بۆ حیـزب. لینا هەمیشـە ڕاپۆرتی چالاکییەکانی خۆی ئامادە دەکـرد و دەیناردەوە بۆ دەفتـەری سیاسـی حیزب لە کوردسـتان. هەرگیز لە لایـەن دەفتەری سیاسـییەوە وەڵامـی پێنەدەگیشـتەوە و ئـەوەش بەو مانایـە بوو کە

ئــەوان ڕەخنەیەکیــان لە کاری ئەو نەبوو. عەبدولڕەحمان لە ســاڵدا بە پێــی بەرنامەکانــی خۆی، جارێک یــان دوو جار ســەردانی ئورووپای دەکرد و لێناش ئەو پلان و بەرنامە نوێیانەی بە پێی ویست و خواستی عەبدولڕەحمان داڕشتبوون، پێشکەش دەکرد.

لە ڕەوتی چالاکییەکانیدا کە زۆرجاران دڵ ســارد و بێهیواش دەکرا، لێنــا هەندێجار تووشــی حاڵەتی سەیروســەمەرەش دەهــات و غافڵگیر دەبــوو. ڕۆژێکیــان، لێنا لە لۆزانەوە دەگەڕایەوە بۆ فەرانســە. هۆکاری ســەفەرەکەی بۆ لــۆزان، هەندێ داواکاری و لەوانە داواکردنی شــیری وشک بۆ منداڵە کوردەکان لە ڕێکخراوی ناحکوومیی (Tree Des Hommes) (ســەرزەمینی مرۆڤــەکان) بوو. لێنا، بۆ ئەوەی هیچــی لەبیر نەچێتەوە، بە خەتی خۆی پێرســتی داواکارییەکانی نووســیبووەوە. لە ســنووری فەرانســە ـ ســوویس، مەئموورەکانی گومروک، ئۆتۆمبیلەکەیان ڕاگرت و داوایــان لێکرد لەگەڵیان بچێتە نێو بینای گومروکەوە. لە نێو بیناکەدا، پرسیاری هۆکاری سەفەرەکەی بۆ سوویسیان لێکرد. لێناش بۆ ئەوەی زۆر ڕای‌نەگــرن، وەڵامی دابووەوە کە وەکوو تووریســتێک ســەفەری کردووە. پاشان، لێنا لە پەنجەرەکەوە بینی کە یەکێک لە مەئموورەکانی گومروک، چووە نــاو ئۆتۆمبیلەکە و جانتا بچووکەکەی لێنای هەڵگرت. هەمــوو بەڵگەنامەکان و لەوانە پێرســتی شــتومەکە داواکراوەکەش لە جانتاکــەدا بــوو. مەئموورەکە هاتــە ژوورەوە و پێرســتەکەی لە پێش چاوی لێنا ڕاوەشــاند و بــە درۆزنی تاوانباری کرد. وتەکەیان ڕاســت بــوو، لێنا درۆی لەگــەڵ کردبوون. هەربۆیەش بێدەنگ بوو و چاوەڕێی کرد بزانێ چی دەبێت.

پــاش ماوەیەک، پیاوێکی تەمەن چل ســاڵ هاتە ژوورەوە و لەوەیکە لێنــای ڕاگرتــووە، داوای لێبووردنــی کرد. ئــەو پیاوە بەرپرســی ئەو بازگــە سنوورییە بوو. لێنا ســەبارەت بــە هەڵسوکەوتــی نەگونجاو و ســەرەڕۆیانەی مەئموورەکانــی گومــروک ناڕەزایەتــی دەربــڕی و پیاوەکەش داوای لێبووردنی لێکردەوە و شــەرمەزاریی خۆی دەربڕی.

لێنا سەری سوورِ مابوو و لەو کەین و بەینە سەری دەرنەدەکرد. بەڵام، بەرپرسی بازگەکە دەستبەجێ هۆکارەکەی بۆ لێنا ڕوون کردەوە. پاش ئەوەی ناوی لێنای لە پاسپۆرتەکەیدا بینیبوو، حەزی کردبوو لێنا ببینێت و هەربۆیەش داوای لە بندەستەکانی خۆی کردبوو کە هەتا ماوەیەک لێنا ڕاگرن بۆ ئەوەی کارەکانی خۆی تێپەڕێنێت. ئەو پیاوە ئاگای لە دۆخی کوردستان بوو و ڕێزێکی زۆری بۆ عەبدولڕەحمان هەبوو. هەربۆیەش، داوای لە لێنا کرد کە سەبارەت بە شۆڕش و خەباتی کوردەکان زانیاری زیاتری بداتێ. پاشان بە ڕێزەوە داوای لە لێنا کرد لە نووسینگەکەی خۆی دابنیشێت و بە بندەستەکانی خۆیشی گوت کە ئەگەر بەلایانەوە سەرنجڕاکێشە، بێنە ژوورەکەی. هێندەی نەخایاند کە نووسینگەی سەرۆکی گومروک پڕ بوو لە مەئموورەکانی گومروک و پۆلیسی سنووریی سوویس و هەموو گوێیان لە کۆنفرانسی لێنا سەبارەت بە کوردەکان و شەڕی داسەپاوی کۆماری ئیسلامیی ئێران بەسەر کوردەکاندا، ڕاگرت. پاش وتەکانی، لێنا وەڵامی پرسیارە جۆراوجۆرەکانی بەشداربووانی دایەوە. بەڕاستی سوورپڕایزێکی خۆش بوو، بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ ئەزموونە ناخۆشەکانی لێنا لە فڕۆکەخانەی (Heathrow)ی لەندەن و یان هەڵسوکەوتی نەگونجاو و سووکایەتی پێکردن لە سنووری بێرلین بەرانبەر بە لێنا، بەراوردی بکەین، ئەم سوورپرایزە، گەلێک دڵنشین بوو.

لە ١٩٨٠ەوە هەتا ١٩٨٣، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ناوچە ئازاد کراوەکانی کوردستان هەندێ پێکهاتەی نوێی بنیات نابوو کە بەرلەوە، ئەو ناوچەیە بەخۆیەوە نەیبینیبوو: پەروەردە و ڕاهێنان بۆ منداڵان بە کوڕ و کچەوە ئیجباری کرا، پەروەردە و ڕاهێنان بە زمانی دایکی واتە کوردی بەڕێوە دەچوو، کتێبی دەرسی بۆ پۆلەکانی یەکەم و دووهەم بە زمانی کوردی داڕێژرا و لەچاپ درا، مامۆستاگەلێک کە تا ئەو کاتە بە فارسی وانەیان گوتبوەوە، خولی تایبەتیان بۆ کرایەوە. ڕادیۆ و ڕۆژنامە بە زمانی کوردی بوون و...

ڕێژەیـەک لـە ئەندامانـی ڕێکخـراوە ناحکومییـەکان، لەوانـە: AMI (یارمەتییە پزیشـکییە نێونەتەوەییەکان)، MSF (پزیشکانی بێ سنوور)، MDM (پزیشـکانی جیهانی) و ...هتد، سـەرقاڵی «کوتان»ی منداڵەکان و هەروەها تیمار و نەشـتەرگەریی نەخۆشـە ئاساییەکان و بریندارانی شـەڕ بـوون و لە ڕادیـۆدا سـەبارەت بە تەندروسـتی و سـەلامەتی منـداڵان بەرنامەیان بڵاو دەکـردەوە و.. دوکتور فریدریک تیسـۆ (Dr. Fredreic Tisso)، لە پزیشکەکانی AMI، بینای کۆنی ژاندارمێری نۆژەن کردبووەوە و وەکوو نەخۆشخانەیەکی ڕاستەقینە ڕێکی خستبوو.

بـۆ تاوانبـاران و زیندانیەکانـی شـەڕ، زیندانیان دروسـت کردبوو. زیندانەوانەکان بە مەبەستی ڕەچاوکردنی مافی زیندانیانی دوژمن، خولی تایبەتیـان بینیبوو. بڕیـار بوو بۆ ئەم زیندانەوانانـەش پۆلی فێرکاریی خوێندن و نووسین بکرێتەوە.

ئـەو گەمارۆ ئابوورییەی کە ڕێژیم خسـتبوویە سـەر خەڵکی ناوچە ئازاد کراوەکانی کوردسـتان، لەسـەر شـانیان قورسـایی دادابوو. لەم ناوچانـەدا، خەڵـک لەگـەڵ کەمیـی زۆری پێداویسـتییە ڕۆژانەکانیان بەرەوڕوو بوون. عەبدولڕەحمان کە خۆی ئابووریناس بوو، سـەرقاڵی ڕێکخستنی ئابوورییەکی هاوتەریب لەگەڵ ئابووری حکوومەت بوو لەو ناوچانەدا. لە هەمانکاتدا فێری هونەری جەنگیش دەبوو.

■ ژیان لە بنکەی ناوەندیی حیزب

ڕۆژەکان یـەک لـە دوای یـەک تێدەپەڕیـن و هەر ڕۆژێـک هەواڵی تایبـەت بـە خـۆی، بریتی لە بـاش و خراپـی هەبوو و ژێسـتەکان و چالاکییـە ڕۆژانەکان دووپات دەبوونەوە: لینا و هاوسـەرەکەی، ئەگەر هەموو شـتێک باش بڕۆشـتایەتە بەرەوە، پاش نیوەشەو دەنووستن و کاتژمێـر حەوتی بەیانـی ڕادەبوون. عەبدولڕەحمان بەیانیان، سـەرەتا سـەردانی ئەو کەسانەی دەکرد کە بەرپرسایەتیی ڕادیۆ و چاپەمەنییان لـە ئەسـتۆ بـوو، پاشـان کاروبـاری بنکـەی ناوەندیی ڕێکدەخسـت،

کۆبوونـــەوەی دەگـــرت و یـــان دەچوو بـــۆ مەئموورییەت کـــە زۆربەی جـــارەکان چەنـــد ڕۆژی دەخایانـــد، لێنـــاش بۆ ئـــەوەی دواتـــر بتوانێت شـــاهێدی بۆ ئـــەو ڕووداوانە بدات، بیرەوەرییەکانی دەنووســـییەوە، بە نێومالّدا ڕادەگەییشـــت، جلی دەشووشـــت (دیارە بە دەست) و ئۆتووی دەکـــرد (ئەگەر کارەبـــا هەبووایە)، لەگەڵ دەعباکان کە شـــەوانە خۆیان دەخزاندە نوێنەکانیانەوە ململانێی دەکرد، هەندێک لە دەعباکان تەنانەت لە بەرانبەر دەرمانەکانیشـــدا خۆڕاگرییان دەکرد، لێنا تەنانەت لە ڕووی خوێندنەوەی کاغەزی سەر مەکینەکانەوە، خۆی فێری چاک کردنەوەی مەکینەکانیش دەکرد. لە ڕاســـتیدا، ئەو نووســـراوە ئینگلیســـییەکانی بۆ میکانیکەکان تەرجەمە دەکرد و ئەوانیش کەرەستە پەک کەوتووەکانیان چاک دەکردەوە. خەڵک ســـەردانی لێنایان دەکرد، یان داوای یارمەتییان لێدەکرد، یان هەواڵیان بۆ دەهێنا و یانیش تەنیا ســـەردانێکی ئاســـایی و بۆ بینینی بوو.

زۆربـــەی ئەوانەی لە بنکەی ســـەرەکیی حیزب کاریـــان دەکرد، گەنج بـــوون، ژیانیان، نائاســـایی و بێبەش لە هەموو شـــتێک بـــوو. ئەوان، لە کوێستان و بە دوور لە بنەماڵەکانیان، هەرگیز دڵنیا نەبوون کە سبەینێ زیندوون. ئەوان دەیانتوانی، بە بێ ئەوەی کەس ڕێگرییان لێ بکات، پۆستی بەرپرسایەتییەکەیان بەجێبهێڵن و بگەڕێنەوە بۆلای بنەماڵەکانیان، بەڵام ئەوان بە عەشـــقی ئازادییەوە دەمانەوە. ئیسکۆرتەکانی عەبدولڕەحمان لەو دەستە بوون. عەبدولڕەحمان سەرجەم ١٢ ئیسکۆرتی هەبوو. دیارە ئـــەو ڕێژەیە، هەموو پێکەوە و هاوکات پارێزگارییان لە عەبدولڕەحمان نەدەکرد. لێنا زۆر حەزی دەکرد بزانێت کە پاش کۆتایی شەڕ، ئەوانە چ ڕوانگەیەکیان بۆ داهاتووی خۆیان هەیە. ڕۆژێک لێنا، کە بۆ خواردنەوەی چا بانگێشت کرابوو، دەرفەتەکەی قۆستەوە و پرسیاری لێکردن. ئەوان تەنیا بیریان لە خەبات تا دوا هەناسە دەکردەوە.

لێنا لەو بارەوە، لەگەڵ عەبدولڕەحمانیش قسەی کردبوو. بە بۆچوونی عەبدولڕەحمان، پێشـــمەرگەکان دەیانتوانی تێکەڵ بە پۆلیســـی ناوخۆی

کوردســتانی خودموختــار بن. ڕۆژێک لێنا، پرســیاری لێکــردن ڕاتان چییــە بەرانبەر بــەوەی لە داهاتوودا ببنە پۆلیس؟ و ئەوان، ناڕەزایەتیی خۆیــان دەربــڕی و ڕایانگەیاند: «پۆلیس؟! هەرگیــز!!!» چارەنووس، لە ســووڕانەوەی چەرخێکی ئــازاد دەچێت، ئەمڕۆکە، ئەم پرســیارە ئیتر بێواتــا بــووە، چونکوو ژمارەیەک لەو پێشــمەرگانە لە ژیاندا نەماون و ڕێژەیەکیشیان کۆچیان کردووە و لە هەموو دونیادا بڵاو بوونەتەوە.

لــە بنکــەی ناوەندیــی حیزبــدا، تەنیا کــوردەکان نەدەژیــان، بەڵکوو ئێرانیگەلێکــی دیکەش کە لەدەســت ڕێژیم ڕایانکردبــوو، پەنایان بەوێ هێنابــوو و چاوەڕوان بوون کە حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران، تێپەڕینیان لە ســنوور مســۆگەر بکات. پەڕینەوە لە ســنوور هەندێجار چەنــد حەوتــوو و تەنانەت چەنــد مانگی دەخایاند. لەو مــاوەدا، ئەوانە میوانی بنکەی ناوەندیی حیزب بوون.

لــەوێ، زۆر باســی ئاغای بەنی ســەدر دەکرا. کوردەکان خۆشــیان نەدەویست. چونکوو لە کاتی دەسپێکی شەڕ لە دژی کوردستاندا، بەنی ســەدری کۆماریخواز کە گەیشــتبووە پلەی سەرۆک کۆماریی ڕێژیمی کۆماری ئیســلامی، بە بەرچاوی ڕای گشــتییەوە ڕایگەیاندبوو کە هەتا پاکتــاو کردنــی دوا یاخیبــووی کورد لە کوردســتان، پۆســتاڵەکانیان لــە پێ دەرناهێنــن. ئەویش پاش ئەوەی خومەینــی ڕووی لێ وەرگێڕا، بۆخۆیشی بووە پەنابەری ئورووپا. بەڵام هەر ئەم ئاغای بەنی سەدرە بوو کە پاش تیرۆری سادق شەرەفکەندی (جێگرەوەی عەبدولڕەحمان) ساڵی ١٩٩٢ لە بێرلین، دڵخوازانە ئامادە بوو لە دادگای بێرلین لە دژی ڕێژیمی ئێران و تیرۆریسمە دەوڵەتییەکەی لە بەرژەوەندیی کوردەکان، شاهێدی بۆ کوردەکان بدات.

لێنــا، جاروبــارە سەفەریشــی دەکــرد: ســەردانی نەخۆشــخانەکانی حیــزب، قوتابخانە ســەرەتاییەکان و هەروەها ئەو قوتابخانانەی دەکرد وا گەنجــەکان ڕاهێنانــی نیزامییــان تێــدا دەکــرد. هەندێجاریش، لەگەڵ هاوســەرەکەی لــە کۆبوونــەوەی مامۆســتاکاندا بەشــداریی دەکرد و

سـەردانی ئەو پێشـمەرگانەی دەکرد کە لە گردەکانـی ئەو دەوروبەرە جێگر ببوون و خۆراگرییان دەکرد.

■ شنۆ

ڕۆژێکی هاوین، لێنا لەگەڵ سادق کە ئەفسەر و یەکێک لە نەوە زۆر و زەوەندەکانی بنەماڵە بوو و هەروەها بە هاوڕێیەتی چەند پێشمەرگەیەکی هێزی پاراستن بە نێوەکانی فارووق، عەلی و عومەر، بەرەو شنۆ بەڕێ کەوت. ئەو بۆ بینینی بنەماڵەی عەبدولڕەحمان سەردانی شنۆی دەکرد. زیاتر لە بیسـت ساڵ بوو نەیبینیبوون. لێنا، لەم سەفەرەدا بەرەوڕووی چەرمەسەریی زۆر بوویەوە.

سـێ تەپۆڵکە لەسـەر ڕێگای نێوان بنکەی ناوەندیی حیزب و شاری شـنۆدا هەبوو. لە مەودای نێوانیاندا، دەشتێکی بەرفراوان، پان و بەتاڵ هەبـوو، لە نێوەڕاستەکەشـیدا تەنیا خانوویەکـی تێدا بوو کە هەندێ لە پێشـمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران تێدا جێگر ببوون و لـە بەرانبـەر پاسـدارەکاندا، بەرگرییان لـە ناوچە ئـازاد کراوەکان دەکرد. ئەو سـێ تەپۆڵکەیە لە لایەن پاسـدارەکانەوە دەسـتی بەسەردا گیرابـووەوە، ناوچە ئازاد کراوەکان، لە پشـت تەپۆڵکەکانەوە دەسـتی پێدەکرد. ئەوان دەبوو بە شـەو لەو دەشـتە بپەڕنەوە، چونکە بە ڕۆژ، موسافیرەکان دەکەوتنە بەر تیرڕەسی پاسدارەکان و ئەوانیش تەقەیان لە هەر شـتێک دەکرد کە جووڵەیەکی لێوە بهاتایە. بە پێچەوانە، دوژمن شـەوان لە ترسی هێرشی کوردەکان، دەخزانە کون و کەلەبەرەکانیان. عەبدولڕەحمان، ڕێژەی ئەو هێزەی دوژمنی کە دەسـتیان بەسـەر ئەو تەپۆڵکانەدا گرتبوو، بە ٣ هەزار کەس مەزەندە دەکرد.

لە خانووەکەدا، ڕێژەیەکی بەرچاو چەک بە دیوارەوە هەڵواسـرا بوو کـە زۆربەیان کلاشـینکۆف بوون. لەو خانووەدا تەنیا ٩ پێشـمەرگەی لـێ بوو. ٩ شۆڕشـگێر لـە دژی دوژمنێکـی ٣ هەزار کەسـی و تەیار بـە چەکـی جۆراوجۆر، لـە عەقڵـدا نەدەگونجا! لە بەرانبەر حەپەسـان

و سەرسوورمانی لێنادا، ئەرخایەنیان کردەوە کە تا سپێدەی بەیان کۆمەڵێکی دیکەش پێشمەرگە دەگەنە لایان. چەند کەس؟ نزیکەی پەنجا کەس.

لێنا: «ئەگەر دوژمن بەمە بزانێت، هەمووتان دەکوژێت!»

کوڕێکی گەنج وەڵامی دایەوە: «نەخێر، ئەوان باش دەزانن کە ئەگەر بێنە پێشەوە چییان بەسەر دێت!»

چاوەکانی ئەو پێشمەرگە گەنجە دەبریسکانەوە و چاوەڕوان بوو کە لێنا بە هۆی ئەزموونە جەنگییەکەیەوە، دەستخۆشی لێبکات. بە دڵنیاییەوە ئەو گەنجە شایانی دەستخۆشی بوو. لێنا دەیزانی کە کوردەکان زیاتر لەوەیکە پشت بە کەل و پەل و کەرەستەی شەڕ و ڕێژەی نەفەرەکان ببەستن، پشت بە تکنیک و ورەی خۆیان دەبەستن.

کاتێک بەڕێ کەوتن، تاریکیی شەو باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشابوو. چواریەکی مانگ لە پشت کێوەکانەوە حەشاردرابوو و تروسکایی ئەستێرەکانیش زۆر کز بوو. ئەوان دەبوو هەم بێدەنگی ڕەچاو بکەن و هەم هەتا دەوری تەپۆڵکەکان دەدەنەوە، گڵۆپی جیپەکان بکوژێننەوە. بە لێنایان گوتبوو کە ئەو دۆخە ١٥ خولەک دەخایەنێت. پاش ئەوەی لە داوێنی تەپۆڵکەکەدا گەیشتنە جادە ئیسفاڵتەکە، سادق کە شۆفیری دەکرد، خێرایی جیپەکەی کەم کردەوە. لە مەودای نێوان تەپۆڵکەکاندا، تاریکاییەکی نووتەک زاڵ ببوو. عەلی و عومەر لە جیپەکە دابەزین بۆ ئەوەی پێش جیپەکە بکەون و ڕێگاکە بە شۆفیرەکە پیشان بدەن. ئەوان نیو کاتژمێر، کاتژمێرێک و ڕەنگیشە دوو کاتژمێر بە گڵۆپە کوژاوەکانەوە ڕێگایان بڕی.

لێنا سەیری ئەستێرەکانی دەکرد. درێژەی کلکی «ورچی گەورە» لەپێش چاوی خۆی دەنواند. چەن شەوێک لەوەپێش، لێنا و هاوسەرەکەی پێکەوە سەیری ئاسمانیان کردبوو. شەوان، لێرە جوانیی ئاسمان بەڕادەیەکە کە مچورک بە لەشی مرۆڤدا دەهێنێت. هاوسەرەکەی ورچی گەورەی نیشانی لێنا دابوو و پێی گوتبوو کلکەکەی بەرەولای

گەورەترین پایەگای پاسدارەکان لە کوردستان ڕاکێشراوە.

لێنا بە شۆفیرەکەی گوت ڕایگرە. موسافیرەکان خۆیان لەسەر زەوییەکی بەرینی بتۆنی بینییەوە. ئەم حاڵەتە لە زەوییەکانی دەرەوەی شار دەگمەن بوو. هاوڕێکانی لێنا، دواجار دانیان پێدانا کە ئەو شوێنە بۆیان نامۆیە. فەڕڕۆخ گوتی لەم نزیکانەدا ناسیارێکی هەیە کە ناوچەکە وەک لەپی دەستی دەناسێت. ٣ کەسیان چوون بە دوای ئەو کەسەدا و لێنا و عومەر لە جیپەکەدا مانەوە. عومەر پێش ئەوەی پەیوەست بە ڕیزەکانی پێشمەرگە بێت، وەرزێر بوو و لەسەر زەوی کاری دەکرد. هەردووکیان وەکوو یەک بوون، بێدەنگ بوون و چاوەڕێی فەرمان بوون بۆ ئەوەی چی پێویست و زەرووڕە، جێبەجێی بکەن. هەردووک ڕاستگۆ، ئەمین، زیرەک و بەوەفا بوون.. لێنا سەیری عومەری کرد و سەرنجی دا ئەویش نیگەرانە. لێنا پارچەیەک شۆکۆلاتی دەرهێنا و کردی بە دوو بەشەوە، عومەر هەمیشە بە بینینی خواردەمەنی دەگەشایەوە.

پاش نزیکەی دوو کاتژمێر، ئەو ٣ کەسە لەگەڵ پیرە پیاوێکی لاواز و کورتەباڵا گەڕانەوە. پیرە پیاو، بە تیزەبزەیەکەوە، بە سەر ئاماژەی بۆ ڕێگاکەی سەر ڕێیان کرد و گوتی: «لەم ڕێگایەوە، پاش چەند خولەک دەگەنە پایەگای پاسدارەکان».

پیرەپیاوەکە لەو ڕێگا پڕمەترسییە دووری خستنەوە و لەگەڵیان کەوت و پاش ماوەیەک پێی گوتن: «ئەم ڕێگایە بگرنە بەر و ڕێک بڕۆن، دەگەنە ئەو شوێنەی کە مەبەستتانە». دواتریش، بە پێ ملی ڕێگای گرتەبەر و ڕۆشت. فەڕڕۆخ ڕوونی کردەوە کە ئەو پیرەپیاوە بە تەنیا لەماڵۆچکەیەک لە دەوروبەری گوندەکە دەژی و لە بەپێ ڕۆیشتندا ئازایە و لەبەر ئەوەی گژ و گیا دەرمانییەکان باش دەناسێ قەت نەخۆش ناکەوێ، کەم دووە و زۆر شت دەزانێ.. ئەو پیاوە ئیختیارە کە لایەنگری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوو، ئەوانی لە کەوتنە نێو زاری گورگ ڕزگار کردبوو. لای کاتژمێر چواری بەیانی گەیشتنە شنۆ. لێنا چاوەڕوانی دەکرد لەگەڵ شارێکی نووستوو بەڕەوڕوو بێتەوە. بەڵام

بینی کە کۆڵانەکان پڕە لە خەڵک. خەڵک بۆ بەپیرەوە هاتن و پێشــوازی لەوان ئەو شــەوە نەنووســتبوون و هەموو لــە دەرەوە بوون و دیارە هیــوادار بوون کە لینا لەگەڵ هاوســەرەکەی بێت. ســەرەڕای ئەوەش، بێهیوایی و دڵســاردبوونەوە بە ڕواڵەتی هیچ کەســەوە دیار نەبوو و زۆر بە گەرمی پێشوازییان لە لینا کرد.

ماڵی زیبا خانمیان بۆ شوێنی حەسانەوەی لینا لەبەرچاو گرتبوو. زیبا خانــم هەر ئەو ژنە بوو کە کاتێک لینا لە ســاڵی ١٩٥٤دا، لای بنەماڵەی هاوســەرەکەی لــە ڕەزاییە دەژیا، ئــاگای لە لینا بوو. لــەم کاتەدا زیبا شــووی بــە محەممەد ئاغا لــە بنەماڵەی مەزنــی زەرزاکان کردبوو کە خزمایەتیشــیان لەگەڵ بنەماڵەی قاسملوو هەبوو و دوو منداڵی هەبوو، کچێک و کوڕێک.

لینــا کــە لە ماندوویەتیــدا لە پێ کەوتبوو، دەســتبەجێ نوســت. لای کاتژمێــر پێنجــی بەیانی بــوو. کاتژمێرێک دوای ئەوە، زیبا ڕایوەشــاند و گوتی: «هەســتە، میوانت هەیە!» لینا بەسەرســووڕمانەوە پرسیاری کــرد: «من میوانم هەیە؟» پاش ئەو ســەفەرە تەژی لە جم وجۆڵە، لینا لە شــەکەتیدا تووشی خەمساردییەک ببوو. هەربۆیەش بە زیبای گوت: «زیبا گیان وازم لێبێنە با بنووم!»

بەڵام زیبا لەکۆڵی نەبووەوە و گوتی: «هەستە، خانمەکان لە حەوشە چاوەڕێی تۆ دەکەن!» حەوشی خانووەکەی زیبا تەژی بوو لە ژنان و لە نێوانیاندا گوڵاڵە خانم، خوشکی زیبا و دایکی ئەسمەریش دەبینرا. گوڵاڵە خانم هاتبوو بۆ ئەوەی هەواڵێکی لە ئەسمەری کچی کە پێشمەرگە بوو دەســت بکەوێت. ئەو ماوەیەکی زۆر بوو کچەکەی نەبینیبوو و تەنیا لە ڕادیۆ «کوردستان»ەوە دەنگی دەبیست.

زۆربەی ئەو ژنانەی لە حەوشی ماڵی زیبا کۆ ببوونەوە بۆ ڕامووسین و بینینــی لینا هاتبوون. بەڵام لە نێوانیاندا هەبوون ژنانێکیش کە وەکوو ژنێکی بەهێز ســەیری لینایان دەکرد و داواکار بوون لینا کێشــەکانیان چارەســەر بــکات. لیناش نــاو و کێشــەکانی دەنووســینەوە و بەڵێنیی

پێدەدان کە کێشەکانیان لەگەڵ سەرۆکی شارەداری باس دەکات، بەڵام ئەوان نەیاندەویست لینا کێشـــەکانیان بەرێتە لای سەرۆکی شارەداری و خوازیار بوون وەکوو خۆی کێشـــەکانیان چارەســـەر بکات. ئەوەش دەبووە هۆی سەرسووڕمانی لینا! هەمان ڕۆژ، لینا سەرۆکی شارەداریی بینی و ســـەبارەت بەو کێشـــانە قســـەی لەگەڵ کرد. ئاغای شارەدار کە تا ڕادەیـــەک دوودڵ دەینواند، دواجار گوتی: «خاتوو نەســـرین، خەڵک پێیان وایە کە دەکرێت کێشـــەکان دەستبەجێ چارەسەر بکرێن. ئێمە لە شـــەڕداین، گرفت و کێشـــەی گرینگترمان هەیە کە دەبێ چارەســـەریان بکەین. ئەم خاتوونانەش کە تۆ باسیان دەکەیت، من هەموویان دەناسم و دەبێ چاوەڕوان بن.»

خەڵکانێکـــی دیکـــەش هەبـــوون کە تەنیا بـــە نیەتی گەیاندنـــی پەیامی بەخێرهاتنی گوندەکەیان هاتبوون. ئەوانە باسی ئۆگریی خۆیان بۆحیزبی دێموکراتـــی کوردســـتانی ئێران و بە تایبەتـــی عەبدولڕەحمانیان دەکرد و هیوای ســـەرکەوتنیان بۆ دەخواســـتن. هیـــوا و متمانەیان بە خەباتی حیزب، لە نیگایاندا دیار بوو و لە وتەکانیان زیاتر خۆی دەنواند.

فـــەڕۆخ و عومـــەر گەڕانەوە بۆ بنکەی ســـەرەکیی حیزب. ســـادق و عەلیش سەردانی بنەماڵەکانی خۆیان کرد. لینا بە نیاز بوو ماوەی دوو حەوتوو لە شـــنۆ بمێنێتەوە. دوو پێشـــمەرگەی بەهێز و کەڵەگەتیشیان بـــۆ پارێـــزگاری کردن لە لینا دیاری کردبوو. یەکیان گەنج بوو و ئەوی دیکەیان پیاوێکی تەمەن شەست ساڵ بوو بە نێوی ئیبراهیم ئەحمەدی، بـــەڵام هەموو بە «مـــام برایم» بانگیان دەکرد. مـــام برایمیش لینای بە «دایـــە» بانـــگ دەکـــرد، تەنیا لـــە ماڵەکەی زیبـــا خانمدا لینـــای بە تەنیا دەهێشتەوە و جگە لەوێ، لە هەموو شوێنێ لەگەڵی بوو.

لینا و مام برایم زۆر زوو بوونە ئاواڵ. ڕۆژێکیان، مام برایم وێنەیەکی خۆی نیشانی لینا دا کە لە وێنەکەدا سواری ئەسپێک ببوو و گوتی: «من پێشـــمەرگەی قازی محەممەد بووم (لەو کاتەوە ٣٥ ســـاڵ تێدەپەڕی) و لـــەو کاتەوە بێ بڕانـــەوە، لە دژی هەموو ڕێژیمـــەکان خەباتم کردووە،

دایکە، ئەمەش ئەو نامەیە کە سـەرۆک کۆمارەکەمان، بۆ دەستخۆشـی کردنی خزمەتەکانم، بۆی ناردووم و لەو ڕۆژەوە و بە درێژایی هەموو ئەم سـاڵانە، من ئەو نامەیە لەسـەر دڵم ڕادەگرم. بیگرە و چی بە باش دەزانی پێی بکە».

لینا سەیری ئەو کاغەزەی کرد کە بە هۆی تێپەڕینی زەمەنەوە زەرد هەڵگەرابـوو و لـە شـوێنە نووشـتاوەکانیەوە پرتووکابـوو. نامەکە لە سـاڵی ١٩٤٦دا، قازی محەممەد یەکەمین و دواهەمین سەرۆک کۆماری کوردسـتان، واژۆی کردبـوو. دیارییەکـی گەلێـک ئەنتیکە بـوو و لینا نەیدەزانی چ هەڵوێستێک بنوێنێت. لینا بینیبووی کە مام برایم نامەکەی لە کیفی پارەی (جنیردان) دەرهێنابوو و بە چ ڕێزێکەوە مامەڵەی لەگەڵ کردبوو، ڕێک وەک ئەوەی لەگەڵ شـتێکی پیـرۆز هەڵسوکەوت بکات. ئێستا داوای لە لینا دەکرد ڕایبگرێت. بە گوتنی ڕستەی: «تۆ سەربەستی لـەوەی چی لێ دەکەیت»، لە ڕاسـتیدا داوای لـە لینا دەکرد بەو نامەیە شتی گرینگ بکات.

لە کوردستان بە چاوی کەرەستەیەکی ئەنتیکە سەیری کامێرای وێنە گرتنیـان دەکـرد. هەربۆیەش، لینا، کامێراکەی دەرهێنـا و وێنەیەکی لە نامەکـە گرت و پاشـان نامەکـەی گێڕایەوە بۆ مـام برایمی هاوڕێی و گوتـی: «ئـەم نامەیە بە جوانی لەسـەر دڵت ڕاگرە، ئـاوا، هەرکامەمان یەکێک لەو نامەیەمان هەیە».

مام برایم کە هەست و سۆزی ورووژابوو، سەرلەنوێ نامەکەی قەد کردەوە، خستیەوە نێو کیفەکەی و کیفەکەشی نایە گیرفانی و لە نزیکی دڵیەوە دایناییەوە.

منداڵەکانیش کەوتبوونە ژێر کاریگەریی شۆڕش و خەبات بۆ ئازادی. کوڕێکی منداڵ بە نێوی نادر، خۆی وەکوو پێشـمەرگە و پارێزەری لینا دەناسـاند. بە باوکی دەگوت کە ناتوانێت لینا بە تەنیا بهێڵێتەوە، چونکە ژیانی لە مەترسـیدایە. هەرچی ڕۆژە دەهات بۆلای لینا. منداڵێکی جوان و حـەوت سـاڵان بوو، لینـای دادەنا و لە بەرانبەریدا، شـانۆی بەڕێوە

دەبـرد و هاواری دەکرد و دەیگوت: «نەســرین خانم، نەســرین خانم، مــن ئاوا دوژمنەکەم لەپێ دەخەم!» و لێناش ســەیری جووڵە پانتۆمیم ئاساکانی ئەو منداڵەی دەکرد کە بە دارێکەوە، وەکوو «چەک» بەکاری دەهێنا. ئــەو ڕۆژەش کە لینا ناچار بوو بەجێیبهێڵێت، نادری بچکۆلانە دەگریا.

یەکێک لە دەوڵەمەندەکانی شار، بە نێوی محەممەد ئەمین، کە پیاوێکی کورتەبــالا، ســاماندار، زۆربڵــێ و مێردی ســێ ژن و باوکی ١٩ منداڵ بــوو، داوای لــە لینا دەکرد کە ســەردانی قەلاتــان (گوندێک لە نزیکەی شــاری شــنۆ) بکات و ماڵەکەی ببینێت کە پاش بۆمبارانی گوندەکەیان بــە ناپاڵــم لە لایــەن ڕێژیمەوە، وێران ببــوو و دواتر لــە هەموو دونیا سەبارەت بە کەڵک وەرگرتنی ڕێژیم لە بۆمبی ناپاڵم لە دژی کوردەکان شــاهێدی بــدات. لێنا چوو بۆ ئــەو گوندە و بینی کە ئەو پیاوە ڕاســت دەکات و ماڵــی ئەو پیاوە بە بۆمباران وێران ببوو، بەڵام ئاســەوارێکی لــە ناپاڵــم نەدۆزییەوە. بۆ دڵنیا بــوون لەو بابەتە، حیزبــی دێموکراتی کوردســتانی ئێران، پسپۆڕێکی بۆ هەڵسەنگاندنی بابەتەکە ناردە ئەوێ. ئەویش هیچ ئاســەوارێکی لە پاشماوە و لێکەوتەی ناپاڵم لەوێ نەبینی. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە هێزەکانی ڕێژیم لە دژی کوردەکان لە بۆمبی ناپاڵم کەڵکیان وەردەگرت، بەڵام لە گوندی قەلاتان ئەو جۆرە بۆمبەیان بەکارنەهێنابــوو. ئــەوەش محەممــەد ئەمینی بێهیوا کــرد. پاش ئەوە، لێنایــان بۆ بینینی شــانۆیەک بانگهێشــت کرد. هۆڵی شــانۆکە پڕ ببوو لــە خەڵــک. بنەماڵــەکان بە گــەورە و بچووکەوە و تەنانــەت بە منداڵی بچووکیشــەوە بەشــدارییان کردبوو. هونەرمەندەکانی ئــەو ناوچە، بە کەمترین ئیمکاناتەوە شــانۆیەکیان ئامادە کردبوو کە تێیدا باس لە بەها مرۆییەکان و خۆشەویســتی و ئۆگریی ئەوان بۆ ئازادی دەکرا، ئەویش ڕێک لەو کاتەدا کە دوژمن وڵاتەکەی وێران کردبوون و هەڕەشــەی لە شارەکەیان دەکرد.

حەوتوویەک پاش ئەوەی گەیشتە شنۆ، ساڵح زەرزا و ئەفسەر خانمی

هاوسەری بۆ نانی نیوەڕۆ لە لینایان گێڕایەوە. پێش نان خواردن، لینا و ئەندامانی بنەماڵە لە باخچەی خانووەکە سەرقاڵی چا خواردنەوە بوون. لای کاتژمێر ١١، مام برایم خۆی گەیاندە لای لینا و بە گوێیدا چرپاندی: «ئەمڕۆ چواردەی گەلاوێژە. نیوەڕۆ دەبێتە تۆفان، بەڵام جێی نیگەرانی نییە، زۆر ناخایەنێت».

هەوا گەرم و دڵنشین بوو، ئاسمان ساماڵ و شین و بێهەور. ئارامییەکی تەواو بەرقەرار بوو، لەو دۆخەدا چلۆن باوەڕ بە قسەی مام برایم بکرێت؟ لینا لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «بەڵام خۆ مام برایم قەت گاڵتەی وای لەگەڵ نەکردووە و هەربۆیەش پێدەچێت قسەکانی بەڕاست بگەڕێت...» هەربۆیەش لینا بیری مەشغووڵ بوو و سەیری ئاسمانی دەکرد. کاتژمێر ١١:٣٠ خولەک، کەشەکە وەکوو خۆی ئارام مابووەوە و تەنیا جاروبارە بە دەنگی قاقای پێکەنینی ژنان لە چێشتخانەکەوە و هەروەها دەنگ و هەرای وێک کەوتنی قاپ و قاچاخ، بێدەنگییەکە دەشکا، هەم شەڕ و هەم تۆفان زۆر دوور دەهاتنە پێش چاو..

پاش چارەکێک، لە پڕ بایەکی توند هەڵی کرد، وەها کە نەمامەکان چەمانەوە و لق و پۆپیان شکا و گەڵاکانیان، لەگەڵ هەر شتێکی دیکە کە بە شوێنێکەوە گیر نەبوون، بە ئاسمانەوە دەسووڕانەوە. ئەوانەش کە چایان دەخواردەوە، ڕایانکرد و بە شوێن سەرپەنایەکدا دەگەڕان، بەڵام پێش ئەوەی بگەنە سەرپەنا، بە هۆی بارشتەوە سەرتاپا خووسابوون. تۆفانەکە ڕێک پازدە دەقەی خایاند و دامرکایەوە و بەدوای خۆیدا قوڕوچڵپاو و وێرانیی بەجێهێشت. خەڵکی ئەو ناوچەیە، شارەزای ئەو یارییەی سروشت بوون و ئاگایان لە ڕێکەوت و کاتژمێری ڕوودانەکەی هەیە. بەڵام لەو ڕووەوە کە پێشی ڕووداوەکەیان پێ ناگیرێ، بەرانبەری خەمساردن.

ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوەکان، بێکۆتایی بوون. لە کاتی نان خواردنـدا، پێشمەرگەیەک هاتە ژوورەوە و گوتی سپای پاسداران بەرەو شاری شنۆ بەڕێ کەوتوون و تەنیا دە کیلۆمیتریان ماوە بگەنە

ناوشـــار. هەربۆیەش لێنا و پێشـــمەرگە پارێزەرەکانـــی ناچار بوون بە پەلــە خانەخوێکەیان بەجێبهێڵن و بە مەبەســـتی گەڕانـــەوە بەڕێکەوتن. ڕێگایەکی ناوبڕیان گرتە بەر کە لە ڕەوتی هاتنەپێشـــی سپا دوور بوو. ئـــەو ڕێگایـــە، باریکە ڕێیەک بوو کە لە کێوەکـــە هەڵقەندرابوو و ڕێگاکە بەســـەر بەردی گەورە گەورەدا تێدەپەڕی. بەردەکان بە هۆی بارانەوە خز ببوون. ئەو جیپەی ئەمان سواری ببوون، وەکوو هەموو جیپەکانی دیکەی حیزب، بەســـەر تایەی سافدا دەڕۆشت. لە پڕ جیپەکە، نەک هەر بەرەو پێشەوە نەڕۆشت، بەڵکوو بە ئارامیی بەسەر بەردەکاندا خلیسکا و بەرەو هەڵدێرەکە ڕۆشـــت. شـــۆفیرەکە هەرچەند زەختی خستە سەر مەکینـــەی جیپەکـــە، کەڵکی نەبـــوو و جیپەکە بـــەرەو هەڵدێرەکە دەخزا. ڕێـــک لەو کاتەدا، شـــتێک ڕوویدا کە لێکدانەوەی قورســـە. دەســـتەیەک پێشمەرگەی نەناسراو، دەرپەڕین و هاواریان کرد: «بێدەنگ بن! وکەس لە جێی خۆی نەجووڵێت!»

ئەو پێشـــمەرگانە، جیپەکەیان لەسەر دەســـت هەڵگرت و لە شوێنێکی ئەمین دایاننا و پاشـــان بە ڕاکردن بەرەو جیپەکەی خۆیان ڕۆیشتن کە ٢٠ میترێک لەولاتر ڕایانگرتبوو، سوار بوون و ڕۆیشتن.

بەڵام لێنا و پێشـــمەرگەکانی بە تەنیا لەشـــار دەرکەوتبوون و تا ئەو شوێنەش، هیچ جیپێکیان لەسەر جادەکە نەبینیبوو. ئەوان خۆیان ئامادە دەکـــرد کە وەدوای جیپی ڕزگارکەرەکانیـــان بکەون. بەڵام جیپەکە بزر ببوو و هیچ ئاســـەوارێکی لێ نەمابووەوە. یەکێک لە هاوڕێکانی لێنا بە دەنگی بەرز گوتی: «موعجیزەیەک ڕووی داوە».

ڕەنگە. بەڵام ئەی ئەگەر کەسێک بڕوای بە موعجیزە نەبێت چی؟

لــە بنکەی ســـەرەکیی حیزب، هەموویان یارمەتیـــی یەکتریان دەدا کە ئـــەو بابەتە بشـــارنەوە. عەبدولڕەحمان لەســـەر نەخشـــەی فەرماندەیی ئەرتەش کە لە پێشـــی دابنابوو، پلانی هێرشـــی گشتیی دوژمنی نیشانی لێنا دا. عەبدولڕەحمان شانازیی بە کاری تیمە ئەمنییەتییەکانی حیزبەوە دەکـــرد. بەڵام لە ڕۆژی دیاریکراودا هیچ ڕووی نەدا. هێزەکانی دوژمن

لـە پادگانەکانـی خۆیاندا مانەوە. سـتراتژییەکانی دوژمن، زۆرجار لەم یـاری مشـک و پشـیلە و چاوشـارکێیەیان لەگەڵ حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران کردبوو. عەبدولڕەحمان دەیگوت: «چ باشـتر، ئەوە دەرفەتێکـی زیاترمان بۆ دەڕەخسـێنێت بۆ ئەوەی خۆمـان بۆ خەبات ئامادە بکەین».

ئـەو بە هێمنی قسـەی دەکرد، وەک ئەوەی لە شکسـتی دوژمنەکەی دڵنیا بێت.

■ پۆلی فێرکاریی زمانی ئینگلیسی

لە نێوان گەنجەکانی بنکەی سەرەکییدا، هیچ کەسێک نەبوو کە بەسەر زمانێکـی بیانیـدا زاڵ بێت. هەربۆیەش، لێنا بڕیـاری دا پۆلی فێرکاریی زمانـی ئینگلیسـی بکاتـەوە. کۆنگـرەی پێنجەمی حیزب بڕیـاڕ بوو لە زستاندا بەڕێوە بچێت و لێنا وەکوو وێنەگر بانگهێشتی کۆنگرە کرابوو. لێنـا تا بەسـتنی کۆنگرە لە کوردسـتان دەمایەوە و پـاش ئەوە دەبوو بگەڕێتەوە بۆ ئورووپا. هاوین گەیشـتبووە چڵەپۆپە و لێنا بۆ فێرکاریی زمانی ئینگلیسی چەندین مانگی لەبەردەستدا هەبوو. ئەندامانی دەفتەری سیاسی و لەوانە هاوسەرەکەی، لەگەڵ بۆچوونەکەی ئەو هاوڕا بوون. لەگەڵ ئەوەشـدا ئامادەکارییە پێویسـتەکان، ئاڵۆز و خەمهێنەر بوو. بە خێرایی ٣٦ کەس ناونووسـیان کرد. ژوورێکی گەورە و تەختەڕەشێک و تەباشـیری پێویسـت بۆلێنـا دابیـن کـرا. بـەڵام حیزب، بـەردەوام، فێرخوازەکانـی داهاتووی لێنـای دەنارده مەئموورییـەت. هەربۆیەش، هەرجـارە ڕێکەوتی کرانـەوەی پۆلەکەی لێنا دوا دەکـەوت. ڕۆژێکیان لێنـا لەو دۆخە قەڵس بوو و دەنگی ناڕەزایەتیی خۆی هەڵبڕی و گوتی: «هەر ئێستا بە من بڵێ، من کەی دەتوانم پۆلەکەم بکەمەوە؟»

ئەمجارەیان، دوکتور سەعید بەرانبەری وەستا بوو.

دوکتور سـەعید: «ئێسـتا کە ئەوەنـدە پێداگری دەکەی، هەر ئێسـتا دەسـتی پێبکە». لێنا لە شـوێنی خۆیدا واق و وڕ ما و چووە بیرەوە و

بە خۆی گوت: «بۆچی هەموو ئەو ماوەیە ئەوەندە بە ڕێزەوە مامەڵەی لەگـەڵ کـردوون و ئەوەنـدە لەسـەریان ڕاوەسـتاوە؟ ئەگـەر زووتر تـووڕە بوایە و هـاواری بکردایـە، پێدەچوو ئەو وەڵامـەی لەو کاتەدا وەریگرتبووەوە، زووتر وەریبگرتایەتەوە. هەربۆیەش، لەبری خۆشحاڵ بـوون، بە هـۆی هەموو ئەو کاتانەوە کە بەفیڕۆی دابوو، سـەرکۆنەی خۆی دەکرد!

هەربۆیەش، لینا بەنیاز بوو دەستبەجێ خولی فێرکارییەکەی بکاتەوە، بەڵام بەو سـانایيەش نەبـوو: ڕێژەیەکی زۆر لـە فێرخوازەکانی لەوێ نەبوون، تەختە ڕەشەکەی، لەباتی ئەوەی ڕەش بێت، خۆڵەمێشی بوو و نووسین بە تەباشیر لەسەری خوێندنەوەکەی تووشی کێشە دەکرد. لینا بە ئیملای سـادە و سەرەتاییەوە دەسـتی پێکرد و سەرنجی دا تەنیا ٣ کەس لە قوتابییەکانی دەزانن بە بێ کێشە بە پیتی لاتینی بنووسن. دیارە ئیملاکەی ئەوانیش پڕ بوو لە هەڵە. لەکاتێکدا کە هەموویان، تەنیا چەند سـاڵێک لەوەبەر دیپلۆمیان گرتبوو و دەیانگوت کە وانەی ئینگلیسـییان خوێندووە. هەربۆیەش، پێویست بوو لینا پێش هەموو شتێک ئەلف و بێ و پیتی لاتینیان فێر بکات. جگە لە چەند کەسـێک، هەموویان لە ماوەی ٣حەوتوودا فێری بوون. بە سەرنجدان بەوەیکە هەمیشە ڕێژەیەکیان، بە هۆی مەئموورییەتەوە لە پۆلەکان ئامادە نەدەبون و لەگەڵ گەڕانەوەیاندا لینـا ناچار دەبوو وانەکانی دووپـات کاتەوە، دەتوانین بڵێین فێر بوونی ئەلـف و بێی لاتینی بە سـەرکەوتوویی چووە پێـش. پاش ئەوەش، لینا دەیتوانی ڕاهێنانی زمان دەست پێبکات. بەڵام، لینا تەنیا ڕاهێنانی زمانی نەدەگوتەوە. قوتابییە پرسـۆکەکانی پرسیاری جۆراوجۆریان دەهێنایە بـەر بـاس. زانیارییەکانیان سـەبارەت بە ژیانی ئورووپـا و بەتایبەتی تێگەیشـتنیان لە دیموکراسـی گەلێک تێکەڵ و پێکـەڵ بوو. هەربۆیەش، باس کردن سـەبارەت بەو پرسـیارانەش لە کاتەکانی پشـوودا و پاش کاتی پۆلەکە، لە فێرکارییەکەی لینا زیاد دەکرا و بەم چەشنە، فێربوونی زمانی ئینگلیسـی لە ژیانی ڕۆژانەی دۆڵی دیموکراتدا وەکوو ڕەوتێکی

ئاسایی لێهاتبوو.

لە مانگی ئۆکتۆبردا، کاروباری ئامادەکاریی کۆنگرە بووە هۆی ئەوە کە قوتابییەکان زیاتر لە جاران بچنە مەئمووریەت. پاش مانگێک، ڕێژەی قوتابییەکان گەیشتبووە ٢٠ کەس. لە نیوەڕاستی مانگی نۆڤامبردا، ڕێکەوتی بەستنی کۆنگرە دیاریکرابوو و بڕیاربوو لە مانگی دێسامبردا بەڕێوە بچێت. دوکتور سەعید بە لینای ڕاگەیاند کە پۆلەکەی پاش حەوتوویەکی دیکە ڕادەگیرێت، چونکە پێویستیان بە هەموو فێرخوازەکان هەبوو. دەرئەنجام، لینا بۆ ئەوانەی هەوڵیان دابوو و لە فێربوونی زمانی ئینگلیسی بەردەوام ببوون، تاقیکردنەوەیەکی کۆتایی بەڕێوەبرد. لە دەرئەنجامی تاقیکردنەوەکەدا، جگە لە دوو کەس هەموو باش بوون و لینا شەهادەی دیپلۆمی سەرەتایی ئینگلیسی بە دەرچووان بەخشی.

ئێوارەخوانێک بە بۆنەی کۆتایی هاتنی وانەی ئینگلیسییەوە ساز درابوو. زۆر کاریگەر و دڵنشین بوو. وتەبێژەکە خۆی بەو پەڕی لێهاتووییەوە کلاسەکەی شرۆڤە کرد و بە و ڕستەیە کۆتایی بە وتەکانی هێنا: «نەسرین خانم زۆر زوو بگەڕێوە بۆلامان!»

■ موجاهیدینی خەڵق

بەسەرنجدان بەو زانیاریانەی کە لە ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقی مەسعوود ڕەجەوی هەمانە، ناکرێت لێرەدا خۆمان لە باس کردنیان ببوێرین. ڕێکخراوی موجاهیدین ڕێکخراوێکی پان ئێرانیستە کە هاوکات پڕوپاگەندە بۆ مارکسیسم و ئیسلام دەکات.

گرووپێکی چل کەسی لە ئەندامانی موجاهیدین پەنایان بە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هێنابوو. حیزب لە ماڵێکی گەورە جێگیری کردبوون و لە لایەن بنکەی سەرەکیی حیزبەوە نانیان بۆ دەچوو و هەموو چەشنە یارمەتییەک دەدران و ڕێزێکی زۆریان لێ دەگیرا. کەچی لە لایەن موجاهیدینەوە هەڵسوکەوتی هاوشێوە نەدەبینرا و هەڵسوکەوتی

زۆربـــەی نەفەرەکانـــی ئـــەو گرووپە بەرانبـــەر بـــە خانەخوێکانیان، بە جۆرێک لووت بەرزی و خۆبەزل زانینی پێوە دیار بوو. عەبدولڕەحمان گاڵتەی بەو هەســـتەیان دەهات. پاش گەیشتنە بەرەوەی ئەو گرووپە لە موجاهیدین، ڕۆژێک عەبدولڕەحمان بۆ بەخێرهاتنیان ســـەردانی کردن و وەکوو خوویەکی هەمیشەیی خۆی، لەگەڵ پیاوەکان تەوقەی کردبوو و کاتێک ویســـتبووی لەگەڵ ژنەکانیش دەســـت بداتەوە،هەموو ژنەکان، دەســـتی خۆیان لە پشـــتەوە شـــاردەوە. عەبدولڕەحمان بەو کردەوەی ئەوان لە قاقای پێکەنینی دەدا!

حەوتووی جارێک، هەموو ئەو کەسانەی کە لە شوێنی بنکەی سەرەکیی حیـــزب دەژیـــان، کۆدەبوونـــەوە بۆ ئەوەی گوێ لـــە ڕاپۆرتی یەکێک لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی سەبارەت بە هەواڵەکانی کوردستان، ئێران و جیهان بگرن. بەرپرســـی موجاهیدینیش ســـەبارەت بە ئێران قســـەی کرد و لە قســـەکانیدا باســـی باڵادەستیی موجاهیدین بە نیسبەت حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانی کرد.

موجاهیدین سەر بە مەزهەبی شیعەن کە لقێکە لە دینی ئیسلام، بەڵام زۆربەی کوردەکان ســـوننە مەزهەبن. ژنانی شـــیعە بۆیان نییە ڕێ بە پیـــاوان بدەن تەوقەیان لەگەڵ بکەن، ئەگەر ئەندامی بنەماڵەکەی خۆیان نەبـــن. ئـــەو ژنانەی گەیشـــتبوونە بنکەی ســـەرەکیی حیـــزب، بە توندی ڕەچـــاوی ئـــەو دۆگمەیان دەکرد و ئـــەوەش لەحاڵێکدا بوو کە لە ئێران، زۆرێک لە ژنانی شیعە مەزهەب خۆیان لە تەنگەبەری ئەو سووکایەتییە ڕزگارکردبوو. لە ڕاســـتیدا، شـــیعەکان ژیان زۆر بەجیددی وەردەگرن، کەچی کوردەکان، بریتی لە سوننە و شیعە، خەڵکانێکی شادن. کوردەکان حەزیـــان لێیە کەڵـــک لە چێژەکانی ژیان وەربگـــرن، پێبکەنن و خەریکی گاڵتە و گەپ بن. ئەوان بە ژن و پیاوەوە، موســـوڵمان و ناموســـوڵمان، هەژار و دەوڵەمەند، گۆرانی دەڵێن و دەست لە دەستی یەکتر هەڵدەپێکن و بە شێوەی بازنەیی هەڵدەپەڕن. ئەوان بڕوایان بە خودایەک هەیە کە نەک هەر خراپەی ئەوانی ناوێ، بەڵکوو سەرتاپا خودای خێرە.

ســاڵی ١٩٨١، بە سەرپەرەشــتیی مەســعوودی ڕەجەوی، شــووڕای نەتەوەیــی موقاومــەت دامــەزرا. ڕێکخــراوەکان و حیزبــەکان، لەوانە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و هەروەها کەسایەتییە بەناوبانگە دژبەرەکانی ڕێژیمی خومەینی، بە مەبەســتی دروســت کردنی هێزێکی هاوبەش لە دژی بیری تاریکی مەلاکان، پەیوەست بەو شووڕایە بوون. عەبدولڕەحمان و دوکتور ســەعید کە نوێنــەری حیزبی دێموکرات لەو شــووڕایەدابوون، زۆر زوو تێگەییــن کــە لــە نێوان بەشــداربووەکاندا بەرابــەری نییــە و مافەکانیــان ڕەچــاو ناکرێــت. حیزبــی دێموکراتــی کوردســتانی ئێــران لەو شــوورایە چــووە دەرەوە. بــە دوای حیزبدا، ئەندامانــی دیکــەش نەیاندەتوانی تەحەمولی ملکــەچ بوون بۆ ڕەجەوی بکەن و لە شوورا چوونە دەرەوە.

■ ناتەباییەکان، ناڕوونییەکان، تاوانکارییەکان ـ یان پێکەنین

ماوەیەک بوو کــە ڕەخنەگرتن لە عەبدولڕەحمان بۆی هەبوو وەکوو هەڵە یان سەربزێوی لێکبدرێتەوە. شەوێک کە لینا لەگەڵ هاوڕێکانی بە نێوی: ئەبوو، ئاراز و ئەســمەر دانیشــتبوو. هاوڕێکانی ئازادانە قسەیان دەکرد، لینا سەرنجی دایە کە ئەوان بڕوایان بەوە هەیە کە ئەو دەتوانێت قەناعەت بە هاوســەرەکەی بهێنێت. ئەوان لــە هەڵسوکەوتی ئاغایانەی سکرتێرەکەیان بەرانبەر بە هەندێک لە ئەندامانی حیزب نیگەران بوون، لەحاڵێکــدا کە بە نیســبەت هەندێکی دیکە، نەرم ونیانتــر دەجووڵایەوە و ئەوە بە نیســبەت ئەو کەســانەوە کە دەچوون بۆ شــەڕ خراپتریش دەردەکەوت. لینا بەرگری لە ڕێبەرەکەیان کرد، بەڵام ئەوان بەرپەرچیان دایەوە و گوتیان: «تۆ هەرگیز لە جەنگەی شەڕدا نەبوویت و کاتێکیش دوکتور هەستیان بریندار دەکات، ئەوکاتەش لێرە نیت تا بەچاوی خۆت بیبینی!» ڕاســتیان دەگوت، ئەو نە شــەڕی بینیبوو و نە شــاهێدی ئەو ڕووداوانەش بوو.

پاش ماوەیەک، ســەری باســەکەی لای هاوســەرەکەی کــردەوە. بە

ڕێکـەوت، ئەبوو و ئارازیـش لەو دەوروبەرانە بـوون. عەبدولڕەحمان چـاوی پێیان کـەوت و چووە دەرەوە و بەهـۆی «پڕوپاگەندە لە دژی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران» لۆمەی کردن.

لینا: «ئەم هەڵسوکەوتە، قێزەون و جێی باوەر نییە! لەباتی بیرکردنەوە، تۆ وتەکانی من دەگۆڕیت و ناحەقییان بەرانبەر دەکەیت!»

عەبدولڕەحمان کە بەشـێوەی کەسی سـێهەم قسەی دەکرد، وەڵامی لینای دایەوە و گوتی: «ئەوە من نیم کە ژنەکەم چۆنیەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ بندەسـتەکانی خۆمم فێر بکات!» بەڵام زۆر بە خێرایی، وتەکەی خۆی ڕاسـت کردەوە و جەختی کردەوە کە مەبەستی تەنیا گاڵتە کردن بووە.

سەرەڕای ئەوەش، عەبدولڕەحمان مرۆڤێکی دڵاوا و تەنانەت بە نیسبەت ماڵی دنیاوە خەمسارد بوو. خزمێکی هەبوو بە نێوی سۆهەیلا، ئەندامی ڕێکخراوی «چریکە فیدائییەکانی خەلقی ئێران» بە ڕێبەریی ئەشـرەف دێهقان بوو. ئەم ڕێکخراوە لە دۆڵێکی نزیک بە حیزبی دێموکرات جێگر ببوو. ئەشـرەف هەندێجار سۆهەیلای بۆ وەرگرتنی پێداویستییەکانیان دەنارده لای عەبدولڕەحمان. عەبدولڕەحمان نە ڕێکخراوەکەیانی بەهەند وەردەگرت و نە سۆهەیلاش، بەڵام هەمیشە یارمەتی دەدان. جارێکیان، سۆهەیلا هات و بۆ ڕۆژنامەکەی ئەشرەف دێهقان داوای کاغەزی کرد و دەوری سـەدان لاپەڕەی وەرگرت. ئەم کاغەزانە بە مەبەسـتی بڵاو کردنەوەی وتارێکی ئەشـرەف دێهقان کەڵکی لێوەرگیرا، وتارێک تەژی لـە بوختـان و تاوان وەپاڵ نانی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران و سـکرتێرەکەی، و عەبدولڕەحمـان لەبەرانبەر ئـەو کردەوەیاندا تەنیا پێکەنی.

ڕۆژێکیان لە مانگی نۆڤامبردا، عەبدولڕەحمان بە دەنگی نووسـاوەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. لە مزگەوت بە هەوای سـاردەوە وتەی پێشـکەش کردبوو. هەندێ لە گەنجەکان لە ماڵەوە چاوەڕوانی بوون. عەبدولڕەحمان لە یەکێک لە گەنجەکان تووڕە بوو، دەنگە گڕ و نووساوەکەی بەڕاستی

جێگای پێکەنین بوو. گەنجەکان بەزۆر خۆیان ڕاگیر دەکرد، لەپڕ، خۆیان پێ ڕاگیرنەکرا و لە قاقای پێکەنینیان دا. عەبدولڕەحمان مرۆڤێکی زیرەک بوو. پێکەنین کۆتایی بە شاڵاوی لۆمەکانی هێنا و عەبدولڕەحمانیش بە پێکەنینە درمییەکەیەوە تێکەڵ بە گەنجەکان بوو. پێکەنینی گشـتی بووە هۆی دامرکاندنەوەی تووڕەییەکەی.

لە هەموو شوێنێک، بەتایبەت بەلای مرۆڤە ساویلکە و سەرەتاییەکانەوە، هەڵدەکـەوێ کە سـاویلکەیی و کاڵفامـی، تاوانی لێبکەوێتەوە. سـەنار کـە ببـووە ئەندامی حیـزب، دووجـار حیزبـی بەجێهێشـتبوو. جاری سـێهەم، دەیویست بیسەلمێنێت کە ئەوجارەیان بە نییەتێکی جیددییەوە دەگەڕێتـەوە. بەو بیرۆکەوە لە مێشـکیدا، سـەنار یەکێک لـە ئەندامانی «تاقمی حەوت کەسی» (ئەو گرووپەی ئینشعابیان لە حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێـران کردبـوو) بە نێـوی «ڕەحمان قادری»ی کوشـت و یەکێکـی دیکـەش لە ئەندامانـی ئەو گرووپەی گرتبـوو و لە زیندانی خسـتبوو. هەرکـە عەبدولڕەحمان بـەو ڕووداوەی زانی، دەسـتبەجێ ناوبژیکەریـی کرد و بـووە هۆی ئازاد کردنی زیندانییەکە و سـەناری کـە لەوکاتەدا لە حیزب چووبووە دەرەوە، هەرگیز لە ڕیزەکانی حیزبدا وەرنەگرتەوە. بەڵام سەبارەت بە ڕەحمان قادری تازە کار لە کار ترازا بوو و عەبدولڕەحمان نەیدەتوانی ڕۆحی بەبەردا بکاتەوە.

ئەگەر کەسـێک یان لایەنێک داخوازێکی لێی هەبوایە، عەبدولڕەحمان درێغـی نەدەکـرد و یارمەتـی ئـەو کەس یـان لایەنەی دەکـرد. بەڵام نێوانگیـری و ناوبژیوانی کردن لە نێـوان دوو لایەندا، هەندێجار دەبێتە هۆی ناڕوونی و خراپ تێگەیشتن. دوو کەسی فەرانسەوی کە لە لایەن بەشـی نیزامیی حیزبـی کۆمۆنیسـتی عەراقەوە بە بارمتـە گیرابوون، گەیشـتبوونە بنکەی سـەرەکیی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران. ئـەو دوو کەسـە بریتی بوون لـە دوو ئەندازیاری سـازکردنی بەنداو بۆ ئاوداشـتن. ئەوانە کارمەنـدی کۆمپانیایەکی فەرانسـەوی بوون کە لەگـەڵ دەوڵەتی عـەراق ڕێککەوتنیـان واژۆ کردبـوو. عەبدولڕەحمان

توانیبووی بەشـی نیزامیی حیزبی کۆمۆنیسـتی عەراق ڕازی بکات کە ئەو دوو فەرانسـەوییە ڕادەستی بنکەی سـەرەکیی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران بکـەن (دۆخی ژیانـی نهێنیی حیزبی کۆمۆنیسـتی عەراق زۆر سـەخت بـوو، و وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەرانسـە داوای یارمەتیی لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کردبوو). بەڵام عەبدولڕەحمان ناچار ببوو کە بەڵێن بە حیزبی کۆمۆنیستی عەراق بدات کـە هەتا ئـەو بڕە پارە زۆرەی کە حیزبی کۆمۆنیسـت داوای کردبوو، نەگاتە دەسـتیان، بارمتـەکان ڕادەسـتی دەوڵەتی فەرانسـە نەکاتەوە. عەبدولڕەحمـان بەو گریمانەوە کە بەرپرسـی کۆمپانیاکە دابین کردنی پارەکە وەئەستۆ دەگرێت، مەرجەکەی قبووڵ کردبوو. بەو حاڵەوە، لەو ڕووەوە کە پارەی داواکراو نەدەگەیشـتە دەسـتی، ڕەوتی ئازاد کردنی بارمتەکان وەدوا دەکەوت.

سـکرتێری گشـتی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران ناچار بوو گفتەکـەی بەرێتەسـەر، ئەگینا پێگـە و متمانەپێکراویی خۆی لەدەسـت دەدا و چیدیکـە نەیدەتوانـی لـە ئەگـەری ڕوودانـی کێشـەی ئەوتـۆ، یارمەتیـی کەسـی دیکە بدات. دەسـا، پـاش چەند مانـگ چاوەڕوانی، دواجـار عەبدولڕەحمان کەسـێکی لە حیزبـی دێموکراتەوە بە بڕە پارە داواکراوەکـەوە نـاردە لای حیزبی کۆمۆنیسـتی عـەراق، بۆ ئەوەی بە نوێنەرایەتیـی حیزبـی دێموکـرات، پارەکەیان ڕادەسـت بـکات و پاش ئـەوەش کە حیزبی دێموکـرات بارمتەکانی ناردەوە بۆ فەرانسـە، زۆر کـەس پێیـان وابوو ئـەو پارەیە لە لایـەن حکوومەتی فەرانسـە و یان بنەماڵەی بەبارمتە گیراوەکانەوە دابین کراوە.

لـە پاریـس، هەنـدێ لـە مەئمـووورە ئیدارییەکانی فەرانسـە، حیزبی دێموکراتیان بە کلاوبەرداری تاوانبار دەکرد.

■ ئامـــادەکاری بـــۆ بەڕێوەبردنـــی پێنجەمیـــن کۆنگـــرەی حیزبـــی دێموکرات

شـــەوانی ســـارد و بارینی باران پەرەی گرتبـــوو. لای کاتژمێر ١١ی بەیانی، خۆرەتاو مژی چڕی بەربەیانی ڕەواندبووەوە و ســـەهۆڵەکانی دەتوانـــدەوە. ڕێگاکان کەڵکی هات وچۆیان نەمابوو و ئاســـمانی تاوتاو، ڕێی لە بۆمباران کردنی فڕۆکە شـــەڕکەرەکان دەگرت. دوژمن چیدیکە نەیدەتوانی ئازاریان بدات و کێشـــەیان بۆ بنێتەوە، هەرچەند هێشـــتاش جاروبـــارە فڕۆکـــە شـــەڕکەرە «میـــگ»ەکان بـــە ئاســـمانی دۆڵەکـــەدا دەسووڕانەوە.

بـــاران شـــاخەکانی ئەو دەڤـــەرەی تێراو کردبوو و بـــە گرم وهۆڕ بە دۆڵی دێموکراتدا شۆڕ دەبووەوە. قوڕوچڵپاو هەموولایەکی گرتبووەوە. خانووەکان شـــێدار و ســـارد بوون. شـــەڕیش بەرەو خەوێکی زستانە هەنـــگاوی دەنا. دۆڵی دێموکراتەکان لە جۆش وخرۆشـــێکی نائاســـاییدا قوڵتی دەدا. بەرپرســـان، بە مەبەســـتی بەشداری کردن لە پلینۆمی پێش کۆنگرەدا، لە هەموو بەرەکانەوە بەرەو بنکەی ناوەندی کەوتبوونە ڕێ. عەبدولڕەحمان بەهۆی کاری زۆرەوە، کاتی حەسانەوەی بۆ نەمابووەوە. نامەیـــەک، هەواڵی ئەوەی هێنا بوو کە جاشـــەکان بە مەبەســـتی هێرش کردنەســـەر بنکەی ســـەرەکیی حیـــزب کەوتوونەتـــە ڕێ، ڕێژەیان زۆر نەبوو، بەڵام بەهەرحاڵ، دەبوو پێشیان پێ بگیرێت.

چیرۆکـــی ئامادەکاریـــی کۆنگرە، هێندەش ســـانا و ســـاکار نییە. یان ڕەنگـــە، چونکە بە شـــێوازی تایبەتـــی کوردەکانە، پێش هەموو شـــتێک، دەبێ بگوترێت کە ئەوان شـــوێنێکیان نەدۆزییەوە کە بەقەدەر پێویست بەرفراوان بێت و هەموو ئەندامانی کۆنگرە بگرێت. سەرەتا بیریان لەوە کـــردەوە کە باشـــتر وایە لە مزگەوتێک بەڕێوەی بـــەرن، مزگەوتێک کە دەوری ٣٠٠ کـــەس بگرێت. بەڵام هیـــچ مزگەوتێک بەو تایبەتمەندییەوە لەو ناوچەیە نەبوو. دواجار، عەبدولڕەحمان، لە ٢٠ی نۆڤامبردا بڕیاری دا کـــە هۆڵێـــک لە گۆڕەپانـــە بەتـــاڵ و بەرفراوانەکەی دۆڵی قاســـملوو

ساز بکات. ڕێکەوتی کرانەوەی کۆنگرە بۆ ڕۆژی پێنجی دێسامبر دیاری کرابوو. کاری سازکردنی بیناکە، ڕۆژی ٢٧ی نۆڤامبر دەستی پێکرد. عەبدولڕەحمان داوای لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی کرد سەرپەرشتیاریی کارەکان بکەن و پاشان خۆی چوو بۆ مەئموورییەت. پاش دوو ڕۆژ، لە مەئموورییەت گەڕایەوە و داوای لە لینا کرد بۆ بینینی ڕەوتی سازکردنی بینای کۆنگرە لەگەڵی بکەوێت. عەبدولڕەحمان پێی وابوو بیناکە گەیشتووەتە دارەڕا. بەڵام بینیان کە لە هەرچوار لاوە تەنیا یەک میتر دیوارەکە بەرز کرابووەوە.

هەردوو بەنناکەش بە بێکاری و بەتاڵی لەوێ بوون و شپەرزەیی و ناڕێکی هەمووولایەکی گرتبووەوە. عەبدولڕەحمان بە دەنگێکی کپەوە ئەمری بە لینا کرد: «وەرە!»

ئەوان بەرەوخوار، بەرەولای گوندی «شیوەجۆ» بەڕێ کەوتن. عەبدولڕەحمان کە هیوادار بوو لەوێ بەرپرسانی دەفتەری سیاسی دەدۆزێتەوە، لەگەڵ سووورپرایزێکی دیکە بەرەوڕوو بووەوە: ماڵەکانی گوندەکە کە وەکوو هەمیشە بە بەردەوامی لەبەردەم با و بۆراندا بوون، بە دیوارگەلێک پارێزگارییان لێدەکرا کە بەو کەرەستە بیناسازییانەی بۆ هۆڵی کۆنگرە دابین کرابوون دروست کرابوون. عەبدولڕەحمان لە تووڕەیی خۆیدا، هاواری دەکرد و فەرمانی دەردەکرد، ڕواڵەتی سوور و ڕەش هەڵگەڕا بوو. هەموو، بە پەلە ڕۆیشتن بەدوای ئەندامانی دەفتەری سیاسیدا و دواجار ئەوانیش بە پەلە و ڕاکردن خۆیان گەیاندە شوێن و گوێیان بۆ ڕەخنەکان، بێتاقەتی و پرسیارەکانی بەرپرسەکەیان ڕاگرتبوو. لە کۆتایی تۆفانێک لە هات و هاواردا، عەبدولڕەحمان هێشتاش خوازیاری تەواو بوونی کاروباری بیناسازیی هۆڵی کۆنگرە لە ٣٠ نۆڤامبردابوو، واتە ٤ ڕۆژی دیکە. لینا بیری لەوە دەکردەوە کە شتی وا ئیمکانی نییە، چونکوو پێویست بوو سەرلەنوێ کەرەستەی بیناسازی ئامادە بکرێت. هێشتا لینا دوولێوەی نەکردبوو کە هاوسەرەکەی هاواری کرد: «ئەمجارەیان خۆم چاوەدێریی هەموو کارەکان لە ئەستۆ

دەگرم»

سروشــت لەگەڵیــان ســازگار نەبــوو. بارانێکی ســارد و بــەردەوام هەمووولایەکــی کردبووە قوڕ و چڵپاو و لیتــە و گەنکاو. پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، عەبدولڕەحمان و لینا پێکەوە بۆ ســەردانی کاروبارەکان ڕۆیشــتن. عەبدولڕەحمان کە هێور ببووەوە، ســەرنجیدا کە بەتەنیایی نــەک هــەر ناتوانێت کەرەســتەکان جێبەجــێ بکات، بەڵکــوو کرێکاری پێویستیشــی بۆ دابیــن ناکرێت. بەخت ڕووی تێکــرد. ئەوان کە بیریان مەشغووڵی کردنەوەی ئەو گرێ کوێرەیە بوو، تووشی ئاغای بەغدادی بوون. ئاغای بەغدادی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو و تازە گەیشتبووە بەرەوە. بەغدادی لەو ناوچەیە هەموو خەڵکەکەی دەناســی، پێشــنیاری کــرد تــەواو کردنی بیناکە بەو بســپێرن و دڵنیای کردنــەوە کە ئەوەی پێویســت بێت دەیــکات بۆ ئەوەی هەتا پێنجی دیســامبر هۆڵەکە ئامادە بێت.

ســەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر، لینا بە تەنیا سەردانی شوێنی هۆڵەکەی کرد. قەول و بەڵێنەکانی ئاغای بەغدادی، پەلەی پێوە دیار بوو. دروست کردنی خانوویەکی ڤیلایی بچووک لە ئۆرووپا چەندین مانگی دەخایاند و چۆنــە کە لێــرە دەکرێت بە چەند ڕۆژ هۆڵێکی گەورە ســاز بکرێت؟ بــەڵام ئــەوەی لینا کاتێک گەیشــتە شــوێنی هۆڵەکە بینــی، جێی باوەڕ نەبوو. ئاغای بەغدادی بەســەر تەلێک خۆڵەوە وەســتابوو و کارەکانی سەرپەرشــتیاری دەکرد: دیوارەکان بەقەدەر پێویست بەرزکرابوونەوە و بڕیار بوو لەوحەکانیش هەر ئەو ڕۆژە لەسەر بانەکەی دابەسترێت. کەرەســتەکان لە شــوێنی هۆڵەکە دانرابــوون و ئامــادەی دەکارکردن بوون.

لە لایەکی دیکەشــەوە، ڕێژیمیش بە مەبەســتی پێشگیری لە بەستنی کۆنگرە، هەموو هەوڵی خۆی دەدا، تۆپ بارانی گردەکانی دەوروبەریان، بە قورسی دەستی پێکردبووەوە و پادگانی سەردەشت، نزیکترین شار بە دۆڵی دێموکراتەکان، بە هێزێکی کۆماندۆیی پێکهاتوو لە ٧٠٠ «کڵاو

سەوز» بەهێز کرابوو. ئەم هێزە کۆماندۆیە ڕاسپێردرابوو تا یارمەتیی ئەرتەش بکات بۆ ئەوەی ناوچەکە لە خەڵکی سڤیل پاک بکەنەوە و هێرش بکەنە سەر حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. ڕێژەی پێشمەرگەکان زیاتر کرا و نێردرانە شوێنە گرینگەکان. گوندییەکانی دەوروبەری دۆڵەکەش ڕاسپێردرابوون کە جگە لە میوانانی کۆنگرە ڕێگەی هاتنەژوورەوە و چوونەدەرەوە لە دۆڵەکە، لە هەموو کەسێک بگرن.

ڕۆژی پێنجی دێسامبر، هۆڵێکی گەورە ئامادەی بەکارهێنان بوو، بەڵام هێشتا کەم و کووڕیی هەبوو، پێداویستیگەلێک وەک کارەبا، مایکرۆفۆن، شووشە، پەنجەرە، تریبوونی قسەکردن، زۆپا و... هێشتا مابوون. عەبدولڕەحمان واز لە کەس ناهێنێت، خۆی لە هەموو کارەکان وەردەدا، ڕەخنە لە هەموو کەس و هەموو شتێک دەگرێت، تووڕە دەبێت، دەستوور دەدات، بە کورتی ئەو پێی وایە بە بێ ئەو هیچ کارێک ناچێتە پێش. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بە بێ ئەو سروشتە پێداگرەی عەبدولڕەحمان، ئیمکانی نەبوو ئەو هۆڵە لەو ماوە کەمەدا ساز بکرێت. بەڵام لەو ڕۆژەدا، عەبدولڕەحمان زێدەڕۆیی دەکرد. پیاوێکی باڵابەرز و بێقەڵافەت لەسەر چوارپێچکەیەک وەستابوو، بە گوێی لینادا چرپاندی: «بۆ خاتری خودا! بیبەرە دەرەوە بۆ ئەوەی برێک پشوو بدات. کاتێک ئەو لێرەیە، پێش بە کارەکەمان دەگرێت!» لینا: «گیانەکەم، کاتی ڕۆیشتنەوەیە بۆماڵەوە».

عەبدولڕەحمان: «بۆچی؟» شێوازی دەربڕینی پرسیارەکەی دۆستانە نەبوو.

لینا: «تۆ دەبێ بە دەقی وتەکانتدا بچیتەوە و هەندێکیش پشوو بدەیت».

عەبدولڕەحمان: «گرینگ نییە! هێشتا کاتم هەیە»

لینا: «لێگەڕێ با خەڵک بە کارەکانیان ڕابگەن، تۆ ڕێیان لێدەگری!»

عەبدولڕەحمان: «من ڕێم لە کەس نەگرتووە! چۆنیان پێخۆشە با کار

بکەن!» ئەم ڕستەیەی بە قەڵسیەوە گوت و پاشان گوتی: «بەهەرحاڵ، بە پێی پەتی ناتوانم بۆهیچ کوێ بڕۆم، کەوشەکانمیان بردووە پاکی بکەنەوە».

عەبدولڕەحمان خۆی لە لینا قەڵس دەکات. لینا سەیری پێی هاوسەرەکەی دەکات. تەنیا گۆرەوی لە پێدایە. هەربۆیەش، لینا دەڕوات و پێڵاوەکانی لای بۆیاخچییەکە بۆ دێنێتەوە و دەیباتەوە بۆماڵەوە.

■ بەستنی پێنجەمین کۆنگرەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

لە دەرەوەی هۆڵەکە، خەڵکێکی زۆر لە هات و چۆدان. بەشدارانی کۆنگرە لە هەموولایەکەوە هاتوون، پاش ماوەیەکی زۆر دابڕان، چاویان بە یەکتر دەکەوێتەوە، باران، بەفر، سەرما، با و قوڕوچڵپاو بە هەند ناگرن.

ڕۆژی ٦ی دێسامبریش وەکوو ڕۆژی پێشووتر بوو. عەبدولڕەحمان سەردانی هەموانی دەکرد، بۆ هەموو شتێک ڕێنمایی دەدا، ڕەخنە لە هەموو کەس دەگرێت و دیارە خۆیشی هیلاک دەکات و ڕۆژی ٧ی دێسامبر، ئاسمان بۆ بەستنی کۆنگرە سازگارە: باران دەبارێت، هەورە نزم و تاریکەکان، ڕێ لە فڕینی فڕۆکەکانی دوژمن دەگرن و هەربۆیەش، کۆنگرە بە دوو ڕۆژ دواکەوتنەوە، دواجار دەتوانێت دەست بە کارەکانی بکات.

کۆنگرەی پێنجەمی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، کۆنگرەیەکی تەژی لە مشت ومڕ، تەژی لە ناکۆکی، ڕەخنە، پێشنیار و یان مل نەدان و سەرپێچی کردن بوو، بۆ نموونە: لە کاتی باس کردن لەسەر بەرنامەی حیزب، هەندێ لە نوێنەرەکان پێشنیاریان دا کە وشەی «دێموکراتیک» ی لەسەر هەڵگرن و لەباتی ئەوە وشەی «سوسیالیست» دابنێن. پێشنیارێکی دیکەش ئەوە بوو کە وشەی «ڕاستەقینە» لە سوسیالیسم زیاد بکەن (سوسیالیسمی ڕاستەقینە). پاش چەند ساتێک، عەبدولڕەحمان درێژەی بە باسەکە دا و گوتی: «ئێوە لە وشەی «دێموکراتیک»

دەترسـن؟ باشە. لە فۆرموولی: «سوسـیالیزم بە سەرنجدان بە دۆخی تایبەتی کوردسـتان» کەڵک وەربگرین. زۆربـەی نوێنەرەکان دەنگیان بەو پێشـنیارە دا. لەگەڵ ئەوەشدا، نێوی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هیچ کات نەگۆڕدرا.

لینا بیری لە «سوسیالیزمی ڕاستەقینە»ی چێکۆسلۆڤاکی دەکردەوە، لە «ئازادی» خەڵک کە لە لایەن «نۆمانکلاتۆر»ەوە بڕیاری لەسەر درابوو و خەم دڵ و دەروونی کرۆشـت. بیری لـەوە دەکردەوە کە کوردەکان چەنـد باوەڕەکانیان بەهێزە، چەند ئازادانە باس لە باوەڕەکانیان دەکەن و چەند ورەبەرزانە بۆ ئازادیی خۆیان خەبات دەکەن. ئازادییە پێشـێل کراوەکان لە وڵاتانی بلۆکی سـۆڤییەت، لە دوورەوە هەست پێنەدەکرا و لە سـاڵی ١٩٨١دا، لە نێوان بەرپرسە کوردەکاندا، هێشتاش کەسانێک هەبوون کە داکۆکییان لە سوسیالیزمی سۆڤیەت دەکرد.

دەنگدان بەشێوەی نهێنی بوو. هەرچەند کە کەمینە بەهێز بوون، بەڵام زۆرینەی کۆنگرە دەنگیان بە بەرنامەی پێشنیار کراو دا. بە سەرنجدان بە بەهێزیی کەمینە، هەم شی کردنەوەی زیاتری بەرنامە و هەم هەندێ دەستکاری کردنی پێویست بوو.

عەبدولڕەحمـان بـۆ جاری چوارەم بـە سـکرتێری هەڵبژێردرایەوە. شـایانی باسـە کە ئـەو هەرگیز لـە کۆنگرەکاندا زۆرینـەی دەنگەکانی نەهێنایەوە. لە کۆنفرانسی سێهەمی حیزب کە ئەویان بۆ سکرتێری گشتی پێشنیار کردبوو، محەممەد ئەمین سێراجی زۆرینەی دەنگی هێنایەوە، لە کۆنگرەی سێهەم کەریم حیسامی، لە کۆنگرەی چوارەم غەنی بلووریان و لە کۆنگـرەی پێنجەمیش عەزیزی ماملێ زۆرینەی دەنگیان هێنایەوە. بەڵام سـکرتێری گشـتی لە لایـەن کۆنگـرەوە هەڵنابژێردرێت، بەڵکوو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی تازە هەڵبژێردراو، سکرتێر هەڵدەبژێرن.

جەژنـی کۆتایـی کۆنگـرە لە هەمـان سـاڵۆن گیرا. پاش نیوەشـەو، پێشـمەرگەیەک بـە دەنگـی خۆش و بـەرز، گۆرانیی «مەگـری دایکی کوردسـتان»ی گوتـەوە، گۆرانییەکـی دوور و درێـژ کـە بـاس لـە

ڕۆژەڕەشــییەکانی نەتەوەی کــورد دەکات. هۆڵەکە لــە بێدەنگیدا نوقم ببــوو و هەمــوو بۆ ڕێزگرتــن و بیرئانینی ئەوانەی وا چارەنووســێکی وەهایان هەیە، گوێیان لێ گرتبوو.

■ چیرۆکی تۆقێنەری حەسەن شیوەسەڵی

حەســەن بەرپرســی نیزامیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و بەرپرســی پادگانی ڕزگار کراوی مەهاباد بوو. شۆڕشگێڕێکی بەورە و هۆشــیار کە هەموو خۆشیاندەویست. دوو کەس لە هاوڕێ کۆنەکانی، بەڵێنیــان پێدابــوو کە دیوانە شــیعری شــاعیریکی گــەورەی ئێرانی بۆ بنێرن کە حەســەن زۆر ئۆگری ئەو شــاعیرە بوو. ڕۆژێک، کارتۆنێکی قورس گەیشــتە دەســتی کە پێی وابوو کتێبەکــەی تێدایە، کارتۆنەکەی کــردەوە. لەگــەڵ کردنــەوەی کارتۆنەکە، دەنگی تەقینەوەیەکی بەســام کوێســتانەکەی هەژاند. دەرئەنجامەکەی ئەوە بوو کە حەسەن هەردوو چاوی و هەردوو دەستی لەدەستدا و شوێنگەلێکی دیکەی جەستەشی بریندار بوو. لە نەخۆشخانەی بەغا، پزیشکەکان گوتیان هیوایەکیان پێی نەماوە. بڕیاردرا بینێرن بۆ فەرانسە.

کاتێــک گەیشــتە فرۆکەخانــەی ئۆرلــی (Oraly) لە پاریس، حەســەن وڕێنەی دەکرد و تای لێهاتبوو. لە نەخۆشــخانەی Creteil، ئەو پزیشکە پســپۆڕانەی ناوبانگی نێونەتەوەییان هەبوو، گوتەی هاوکارانی خۆیان لە بەغایان پشتڕاست کردەوە و گوتیان: «هیچ هیوایەک بە مانی نییە» بەڵام پێرســۆنێلی نەخۆشخانەکە دۆخی حەســەنیان لەبەرچاو گرت و بەدرێژایــی هەموو ئــەو مانگانەی لەوێ بوو، ئەوەی لەدەســتیان هات درێخیــان نەکــرد، بۆ ئــەوەی باری ئــەو ژیانەی بۆ ئاســانتر بکەنەوە. حەسن نەمرد. بەڵام چلۆن دەکرا بە مرۆڤێکی بێ چاو و دەست، هێزی ژیان ببەخشیت؟

دەڵێــن ســەرچاوەی نەهامەتــی لــە کوێســتان نییــە، بەڵکــوو لە ناو خــودی مرۆڤەکاندایــە. لە کوردســتان، حەســەن دەزگیرانێکی هەبوو.

دەزگیرانەکـەی وازی لیٚهێنـا. دەڵێن کە چارەنـووس هەندێجار بەرگ دەگۆڕێت. خوشـکی دەزگیرانەکەی حەسـەن، شووی بە حەسەن کرد. بەلام حەسـەن بە درێژایی سـالانێک، بە دوای هۆکارێکەوە بوو کە بە ژیانەوە گرێی بداتەوە. لە سای ئەو خۆشەویستییەی کە هاوسەرەکەی پێـی بەخشـی، ئەو ئێسـتا پیاوێکی بەختـەوەرە و چەندین منداڵیشـی هەیە. دیارە بەکارهێنانی وشـەی بەختەوەر سـەبارەت بە کەسـێک کە چارەنووس بەو قورسییە مامەڵەی لەگەڵ کردبوو، کارێکی ئاسان نییە. پاش ئەوەی حەسـەن لە مەترسیی مردن ڕزگاری بوو، عەبدولڕەحمان وەکوو ڕێبەری شۆڕشـگێڕەکان، باسـی بارودۆخـی ڕۆحیی خۆی بۆ لێنا کرد: «لە سـەرەتاکانی شـەڕدا، لە باری ویژدانییەوە دڵتەنگ بووم، چونکـوو مرۆڤەکانـم دەنـارد بۆ شـەڕ و دەمزانی مردن بۆسـەی بۆ ناونەتەوە. بینینی یەکەم قوربانییەکانی شـەڕ تۆقێنەرە، شـەوان خەوم لێ نەدەکەت،... دواتر مرۆڤ بەوە ڕادێت و ئەمەیە شەڕ».

شـەڕ لـە زاتی خۆیـدا، تاوانکارییەکە کە بەشـێوەی نهێنی لە ڕۆحی ئەو کەسـانەدا کە شەڕەکە هیدایەت دەکەن، ڕۆدەچێت و ڕۆح تووشی گەندەڵـی دەکات و ئیتـر لەکۆڵـی نابێتـەوە. ڕۆحێکـی هەسـتیار بەو دۆخـە ئازار دەکێشـێ، بەڵام ناتوانێت خۆی لە بەرپرسایەتییەکانیشـی بدزێتەوە.

■ چارەنووسی ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان

هێـزە نیزامییەکانـی حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێـران لەگەڵ هێزەچەکدارەکانـی خومەینـی بـەراورد نەدەکران. لـە بەرانبەر چەکە قورسەکانی ڕێژیمدا، هێزەکانی حیزب تەنیا چەکی سووکیان بەدەستەوە بوو. هیچ هێزێک ئامـادە نەبوو یارمەتیان بکات. وڵاتە دێموکراتیکەکان تەنیا لە ئاستی پشتیوانیی مەعنەویدا، پشتگیرییان دەکردن. هەربۆیەش، حیزبـی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێران تەنیا پشـتی بـە ورە و هێزی مەعنەویی پێشـمەرگەکانی خۆی دەبەسـت، ئەو پێشـمەرگانەی کە لە

ڕەوتــی هاتنەدی ئارمانجــە دادپەروەرانەکاندا، بــە جدییەتی تەواوەوە خەباتیان دەکرد، بەڵام ئیمکانات و کەرەستەی پێویستیان بۆ ئەو خەباتە لەبەردەستدا نەبوو. لە ڕاستیدا هیچکام لەو دوو پێویستییە، بە بێ ئەوی دیکە کاریگەرییان نابێت.

پاش تێپەڕبوونی نزیکەی ٣ ســاڵ لە دەســتپێکی شــەڕێکی جەبهەیی لە دژی هێزەکانی دەوڵەت، بنکەی ناوەندیی حیزب ناچار بوو شــوێنی خۆی بگۆڕێت. گوندی دۆڵی دیموکراتەکان، درایە دەست گوندنشینەکان. تاکتیکــی شــۆڕش لەگەڵ دۆخی نــوێ گونجێندرا و شــەڕی پارتیزانی دەستی پێکرد. ئەندامانی بنکەی سەرەکیش وەکوو پێشمەرگەکان لەژێر خێــوەت و تەنانــەت هەندێجــار لە هەوای ئــازاد و لەژێر ئاســمانی پڕ ئەستێرەدا بەسەریان دەبرد. خەبات بۆ خودموختاریی کوردستان وردە وردە نســکۆی دەهێنــا و ناوچــە ئازاد کراوەکان بەرە بــەرە کەوتنەوە دەست دوژمن.

لە جەنگەی شــەڕ لــە دژی عەراق و کوردەکانــدا، خومەینی ڕێژیمی خــۆی جێگیــر کــرد و لــە دژی جیابیــران و دژبەرانی خۆی ڕەوشــی ســەرکوتی گرتەبەر. ئایەتەکانی قورعان بە پێی حەز و پێویستییەکانی خومەینــی، ئەم لایەنگرەی پاوانخوازیی مەزهەبی، تەفســیری جیاوازی بۆ دەکرا. خومەینی گڵۆپی ســەوزی بۆ خەڵکانی خۆبەزل زان و پڕ لە گرێــی دەروونی پێکردبوو و لە پلە و پێگەگەلێکدا جێگری کردبوون کە مافی ئەوەی پێدەدان کۆنترۆڵی ژیانی شارۆمەندان بکەن و سەرکوتیان بکــەن. هەموو چیــن و توێژەکان، بە منداڵ و بەســاڵاچووانەوە، ئێعدام دەکران و ڕێژیم شانازیی بەخۆیەوە دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشــدا، ئــەو دیموکراســییە پێڕەوکەیەی لــە لایەن حیزبی دیموکراتــی کوردســتانی ئێرانــەوە لــە ناوچــە ئــازاد کراوەکانی ژێر ســەیتەرەی حیــزب دەســتی پێکردبــوو، نەک هــەر لە لایــەن هەموو دانیشــتوانی ئــەم ناوچانــەوە ڕەچاو دەکــرا، بەڵکوو لە لایــەن هەموو خەڵکانی ئێران و لەوەش بەولاوەتر، لە پارچەکانی دیکەی کوردستانیش

لە وڵاتە دراوسێکان ببووە سەمبۆلێک لە ورەبەرزی و شنەیەک لە هیوا هەموو ناوچەکانی گرتبووەوە.

■ دڕدۆنگییەکان

لێنا لە ناو کوردەکاندا، هاوڕێی زۆری هەبوو و زۆربەشیان ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوون. لێنا لە کاتی چالاکیدا دەیبینین، گوێی لێ دەگرتن و دەمەتەقەی لەگەڵ دەکردن. مرۆڤ نەیدەتوانی بۆ ساتێکیش گومان لە فیداکارییان لە ڕێی وەدی هاتنی ئامانجی گەلی کورد و حیزبی دێموکرات بکات. بەڵام لێنا، وردە وردە هەواڵی دانیشتنی ڕێژەیەک لە هاوڕێیانی لە حیزب، بەرگوێ کەوت و کۆمەڵێک پرسیار لە مێشکیدا بیچمی گرت، وەک ئەوەیکە هۆکاری ئەو ڕاگۆڕینە چییە و چی هەموو ئەو ئۆگرییانەی شکاندووە؟ لێنا لە هۆکارەکەی تێنەدەگەیشت. کاتێکیش لەو بارەوە لەگەڵ عەبدولڕەحمان قسەی دەکرد، وەڵامەکەی ئەوە بوو کە ڕۆیشتنی ئەوانە لە حیزب دەبێتە هۆی پاکژ بوونەوەی حیزب لە مرۆڤە ناتەواوەکان و ئەوەیکە ئەوانە هەموو کاروباریان بۆتە ئاژاوەگێڕی لە ڕیزەکانی حیزبدا و حیزب پێویستی بەو گێرەشێوێنیانە نییە.

ئایا، لێنا تا ئەو ڕادەیە سەبارەت بەو مرۆڤانەی جێی ڕێزی بوون، بەهەڵەدا چووبوو. ڕەنگە. بەڵام ئەی ئەگەر ئەوانیش هۆکارێکی لۆژیکییان بۆ خۆیان هەبێ و ئەوە هاوسەرەکەی بوو کە نەیدەویست لەوبارەوە لەگەڵ لێنا قسە بکات چی؟ لە پەیوەندی لەگەڵ بابەتە حیزبییەکاندا، عەبدولڕەحمان زۆر نهێنی پارێز بوو و لێناش ڕێزی لەو نهێنی پارێزییە دەگرت، بەڵام، هەندێجار، خۆی لە بابەتگەلێک کە بە بۆچوونی هاوسەرەکەی پەیوەندی بەوەوە نەبوو، هەڵدەقوتاند، بەتایبەتی ئەگەر پەیوەندی بە دوورکەوتنەوەی هاوڕێکانی خۆی لە شۆڕشەوە بووایە. ئەو وەڵامانەی لە کاتوساتێکی ئەوتۆدا پێی دەدرایەوە، دڵی دانەدەمرکاند. لێنا زانستی سیاسی نەخوێندبوو. هەربۆیەش، نە زۆر پێداگری دەکرد

و نــە هەڵدەچــوو. هەڵبەت تەنیا تــا ئەو کاتە. شــک و گومانەکانی لێنا، لەگەڵ دانیشــتنی سەرپەرشتیاری ســکۆرتەکانی عەبدولڕەحمان ڕەنگ و قورســاییەکی زیاتــری بەخۆیــەوە بینی. پێش ڕۆیشــتنەوەی لێنا بۆ ئورووپــا، ڕۆژێک، خاڵند ســەردانی کرد و لەبەر دەرکەکە ڕاوەســتا و گوتی: «نەســرین خانم دەمهەوێ قســەت لەگەڵ بکەم». خاڵند دوودڵ دەینوانــد، نەیدەزانــی لــە کوێوە دەســت پێبکات. ئــەو پیاوێکی گەنج و فیداکار بوو و بە خاکەڕاییەکی ژێرانەوە کاریگەریی لەسەر لێنا دادەنا.

لێنــا: «ســەبارەت بــە چــی دەتهەوێ قســەم لەگــەڵ بکەیــت؟ وەرە ژوورەوە». خاڵند تەنگاو دەهاتەبەرچاو، گوتی: «نەســرین خانم مەڕۆ، لەگەڵمان بمێنەوە!» لێنا: «بۆچی داواکارییەکی ئاوات هەیە؟»

خاڵند: «تەنیا دەمویست پێت بڵێم کە نابێ بڕۆیت!» داخوازێکی سەیر و جێی تێڕامان بوو. خاڵند دەیزانی کە لێنا دوو ڕۆژی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ ئورووپا.

لێنــا: «بــەڵام تۆ دەزانی کــە من لە ئورووپا بۆ ئێــوە چالاکی دەکەم. ئەگەر لێرە بمێنمەوە، چلۆن کاروباری ئەوێ ڕاپەڕێنم؟»

خاڵند خۆی لێ نزیک خستەوە و بە چاوی پڕ لە نیگەرانی و سکاڵاوە سەیری دەکرد، گوتی: «ڕاستە، بەڵام مەڕۆ...».

لەم کاتەدا، دەرکەی ماڵەکە کرایەوە و عەبدولڕەحمان هاتە ژوورەوە. لــە حاڵێکــدا کە تووڕەیی بــە چاو و دەنگییەوە دیار بوو، پرســیاری لە خاڵند کرد: «چی دەکەیت لێرە؟»

لێنا لەباتی خاڵند کە شــڵەژابوو و بەرەو دەرکەی ماڵەکە دەڕۆشــت، وەڵامی دایەوە: «هاتبوو ماڵئاوایی لە من بکات».

کەشێکی ناخۆش بەسەر ماڵەکەدا زاڵ ببوو و هەرچی دەچووە پێش ناخۆشــتریش دەبوو. پاش ڕۆیشــتنی خاڵند، عەبدولڕەحمان سووربوو لەســەر ئەوەی کە لێنــا پێی بڵێت لە نەبوونی ئەودا، ســەبارەت بە چی قسەیان کردووە. لێنا تووڕە بوو و گوتی: «تکایە بە من بڵێ، لە کەیەوە خەڵک بۆیان نییە لەگەڵ من قســە بکەن؟!» دیار بوو ئەو لەوە دەترســا

کە ڕەنگە سکۆرتەکەی شتێکی ئاشکرا کردبێت. لەوساوە، داخوازەکەی خاڵند و هەڵس‌وکەوتە تووڕەکەی هاوسەرەکەی، تۆوی نیگەرانییەکی بەئازاری خستە دڵی لێناوە.

پاش نۆ مانگ، لێنا کە گەڕابووەوە بۆ کوردستان، لەباتی خاڵند، کەریمی برای خاڵندی بینی. کاتێکیش پرسیاری خاڵندی لە کەریم کرد، کەریم وەڵامی نەدایەوە و سەیری خوارەوەی کرد. دواتر، هاوسەرەکەی لێنا، بۆی باس کرد و گوتی کە خاڵند دەستبەسەر بووە و پاش ئەشکەنجەیەکی زۆر، لە یەکێک لە زیندانەکانی ڕێژم ئێعدام کراوە.

لێنا: «ئاخ خودایا! بلێ، تکایە بۆم باس بکە هۆکارەکەی چی بوو؟ خۆ خاڵند هەرگیز لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دوژمن، نەدەچووە مەئمووریەت!»

هاوسەرەکەی: «ماندوو ببوو و نەیدەویست لای من بمێنێتەوە، هیچم لەدەست نەدەهات».

لێنا: «خاڵند و ماندوو بوون؟! تۆ باشتر لە هەمووان لەو مەترسییەی لەسەری بوو ئاگادار بوویت، سا دەبوو ئەوەی وەبیر بێنیتەوە و نەهێڵیت بڕوات!»

لێنا لە تووڕەیی خۆیدا گێنگڵی دەدا و دڵی لە سکرتێری گشتی حیزب پڕ بوو. خاڵند چەند منداڵی هەبوو و بنەماڵەکەی بەو یارمەتییەوە کە لە پۆستی سکۆرتی وەری دەگرت بەخێو دەکرد. ئەو کە ساڵانێک بوو، ئەمەگدارانە خزمەتی بە بەرپرسەکەی خۆی کردبوو، بۆچی کارێکی وەهای کردبوو! شکێکی گوماناوی سەری کردبووە جەرگی لێنا و بیری لەوە دەکردەوە کە نەکا دانیشتنەکەی خاڵند پەیوەندیی بە داخوازەکەی ساڵی پاریەوە بووبێت...

شک و دڕدۆنگی ئەگەر نەڕەوێتەوە، وردە وردە گەرای گومان دادەخا و سات بە سات دووقات و چەندقات دەبێتەوە.

هەموو حیزبە سیاسییەکان، سەبارەت بە هەندێ بابەت، لە گوتنی ڕاستییەکان بە ئەندامەکانیان خۆ دەبوێرن، یان بە هێنانەبەرباسی

هۆکارگەلێـک کـە بۆخۆیـان گونجـاوە، دەیگـۆڕن و یان بـە تەواوی دەیشـارنەوە. حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێرانیش لـەو ڕووەوە جیاواز نەبوو. لینا بە سـەرنجدان بە بوونـی بابەتگەلێک وەک دوژمن، شـەڕ، مەترسـیی مردن، کەموکوڕییەکان...ئەو بابەتەی دەرک دەکرد... بـەڵام ڕووداوگەلێکی وەک ئەوەی بەسـەر خاڵنـد هاتبووی پێ قبووڵ نەدەکرا.

■ بڕیار

لێنا دەبوو بڕیاری خۆی بدات. ماوەیەکی زۆر بوو کە هاوسەرەکەی دووری لێدەگرت و ژیانی تاکەکەسیی خۆی بە بێ لێنا دەبردەسەر. ئەو ئارمانجەی کە هاوسەرەکەی داکۆکی لێدەکرد، بەسەر پەیوەندییەکانیاندا زاڵ ببوو. ئەو مەئمووریيەتەی کە هاوسەرەکەی بۆ خۆی هەڵیبژاردبوو، هەموو کاتەکانی بۆ خۆی تەرخان کردبوو و ژیانی تاکەکەسـی، بەلای ئـەوەوە، هیـچ واتایەکی نەمابوو، سـەرەڕای ئەوەش، پێویسـتی بەوە هەبوو کە ئەو کەسانەی کە خۆشیان دەویست، بە دەوریيەوە بمێننەوە، تەنانـەت ئەگەر بەتەنیا لەبـەر ئەوەش بووبێت کە بە بوونی خۆیان، بۆ سـاتێکیش بووبێت ببنـە هۆی لەبیرکردن و یان سـووک کردنی باری قورسـی بەرپرسـایەتییەکانی. لێنا، هاوسـەری بوو، وەکوو شاهێدێکی دەروەست، چیدیکە لەو دەستەدا جێی نەدەبووەوە.

عەبدولڕەحمان لە لووتکەی ناوبانگ و شـۆڕەتدا بوو و لێنا دەیزانی کـە جیابوونەوەیان لە یەکتر، هیچ کاریگەرییەکی خراپ لەسـەر دۆخی عەبدولڕەحمـان دانانێـت. هەربۆیـەش، لێنـا داوای جیابوونەوەی کرد. زۆرکەس وایاندەزانی کە ئەوەش فێڵێکە و مەبەستی سیاسی لە پشتە. بەڵام ئەوانە بە تەواوی لە هەڵەدا بوون. ژیانی هاوبەشـی ئەوان ئیدی هیچ مانایەکی نەمابوو.

دیـارە جیابوونـەوە، هیـچ ئاڵوگۆڕێکـی لـە ئۆگریی لێنا سـەبارەت بـەو کوردانەی کـە زۆربەی تەمەنی خۆی بۆ خزمـەت بەوان تەرخان

کردبوو، دروست نەکرد. ئەو وەکوو جاران خزمەتی کوردەکانی کرد و تاسەر، ڕازداری عەبدولڕەحمان مایەوە، جارجارە دیلمانجی بۆ دەکرد و بەرپرسایەتیی هەندێ لە کاروباری حیزبیشی لە ئەستۆی خۆی هێشتەوە.

■ دوایین سەفەری لێنا بۆ کوردستانی شەڕلێدراو

هەر لە سەرەتاوە، دوایین دیدار لە کوردستانی شەڕلێدراو چەرمەسەریی بۆ لێنا پێوەبوو. لێنا و مەلا ڕەحمان، نوێنەری حیزب لە بەغدا، دەبوو ئەو شارە بەجێبهێڵن. مەلا ڕەحمان هەتا شاخەکانی کوردستانی عەراق لەگەڵ لێنا دەهات. هەڵبەت، ئەمجارەیان لە ئیسکۆرتە هەمیشەییەکانیش نەهاتبوون بەدوایدا، ئەمجارەیان، بنکەی سەرەکیی حیزب بە پێچەوانەی جاران، قبووڵیان نەکردبوو پێشمەرگە بۆ پاراستنی بنێرن.

مەلا ڕەحمان، هاوکات کە ئۆتۆمبیلەکەی دەئاژۆت، گلەیی لە هەڵسوکەوتی بەرپرسەکەی خۆی دەکرد و لە گازند نەبووەوە هەتا گەیشتنە باریکە ڕێیەک. لەوێ، بەرپرسی زیندانی حیزب، کاک عەبدوڵڵا کە لەسەر بەرزاییەک وەستابوو، ئەمانی ناسییەوە و هاواری کرد: «پێشمەرگەکانتان لە کوێن! کۆمەڵە لە نزیکەی میراوە (Miraweh)، ڕێگەی بنکەی ناوەندیی حیزبیان گرتووە. ئێوە ناتوانن بە تەنیا بەو ڕێگایەدا بڕۆن».

دوو کەس لە پێشمەرگەکانی کاک عەبدوڵڵا لە کورسیەکانی پشتەوەی جیپەکە سوار بوون. لە نزیکەی میراوە، کۆمەڵەییەکان جیپەکەیان ڕاگرت. مەلا ڕەحمان بە لێنای گوت: «ئەوان نابێ بزانن تۆ ژنی کێیت. من پێیان دەڵێم تۆ ڕۆژنامەنووسیت. ئەگەر ئەوان بزانن تۆ هاوسەری دوکتوریت، دەتوانن بە بارمتە بتگرن».

لێنا: «بارمتە چ کەڵکێکی بۆ ئەوان هەیە؟»

ڕەحمان: «ئەوان لە بەرانبەردا، داوای ئازاد کردنی نەفەرەکانی خۆیان

دەکەن کە لای ئێمە دەستبەسەر کراون، یان ڕەنگە داوای ئەو شتانە بکەن کە خۆیان کەمیان هەیە...یان داوای پارە، تەقەمەنی، ئازووخە و شتی ئاوا دەکەن...».

لینا، بیری باسێک کەوتەوە کە ماوەیەک پێش لەوە عەبدولڕەحمان لە پەیوەندی لەگەڵ ئازاد کردنی بارمتە فەرانسەویی و کاناداییەکان لەگەڵی کردبووی. ئەوسا، عەبدولڕەحمان پێی گوتبوو: «تۆ دەبێ زۆر وریا بیت کە بە بارمتە نەگیرێی! ئەگەر بگیرێیت، بۆ ئازاد کردنت هیچم لەدەست نایە».

عەبدولڕەحمان: «دەتوانم بۆ خەڵکانی دیکە ئەو کارە بکەم، بەڵام بۆ ئەندامانی بنەماڵەی خۆم ناتوانم».

لینا: «بەڵام.. بۆچی؟»

عەبدولڕەحمان: «لەبەر ئەوەیکە».

ئەو باسانەی پاش ئەوە کران، لە ڕاستیدا دەمەتەقە نەبوو، بەڵکوو قسەکردنێکی یەک لایەنەی لینا بوو. چونکوو هاوسەرەکەی چیدیکە وەڵامی نەدەدایەوە. ئایا بە بایەخ نەدان بە ئەندامانی بنەماڵەکەی خۆی، هیوادار بوو زاری ئەو کەسانە ببەستێت کە بەوە تاوانباریان دەکرد کە ئیمتیاز بە هەندێک کەس دەدات و هەندێکی دیکەش بەهەند وەرناگرێت؟

نەفەرەکانی کۆمەڵە، پاش پرسیار کردن لە مەلا ڕەحمان و ڕاوێژ کردن لەگەڵ بەرپرسەکانیان، ڕێگەیان پێدان کە بڕۆن. لە ماوەی مانەوەی لینا لە بنکەی ناوەندی، بەرەی شەڕ لە گۆڕاندا بوو و هێزەکانی دوژمن لێیان نزیک دەبوونەوە. زۆر بە خێرایی ناچار بوون بارگە و بنەیان بپێچنەوە و بەرەو دۆڵی «دۆڵەتوو (Dolatou)» بچن. لەوێ، پێشتر خێوەتەکانیان لە لێژێکی ڕژددا هەڵدابوو. لینا و ئەسمەر خێوەتێکیان هەبوو. بەدرێژایی ئەو شەوە، بارانێکی بەخوڕ بەسەر کەمپەکەدا باری و هەموویان ناچار بوون لە پەناگەکانیان بێنە دەرەوە. ئاو دزەی کردبووە ژێرخێوەتەکان و پێچکە و کۆڵەکەکانی تێک دەشکاند. دۆخێکی زۆر ئاڵۆز بوو.

لەم کاتەدا، لینا دەبوو بگەڕێتەوە بۆ ئورووپا. بەڵام دەبوو چاوەڕێی بڕیاری سکرتێری گشتی بێت. ڕۆژەکان تێدەپەڕین و هەرجارە و بێبڕانەوە گەڕانەوەکەی وەدوا دەکەوت. زۆربەی ئەو ڕێگایانەی بەرەو عەراق دەڕۆشتن، گیرابوون و ئەوانەشی کە هێشتا بۆ هاتوچۆ دەبوون، وردە وردە مەترسیدار دەبوون. عەبدولڕەحمان، ڕێگایەکی هەڵبژارد کە بە واواندا (Vavan) تێدەپەڕی. ئەو ڕێگایە لە تیرڕەسی تۆپخانەکانی دوژمندا بوو کە لە لایەکەی دیکەی ڕووباری کەڵوێ (Kalveh) جێگیر ببوو. لەگەڵ ئەوەشدا، بە داهاتنی شەو، ڕێگاکە بۆ هاتوچۆ دەبوو. ڕۆژێکیان، بەیانیی زوو، عەبدولڕەحمان بە لینای ڕاگەیاند کە دەبێ هەر ئەو کاتە بەڕێ بکەوێت. لینا بیری لەوە کردەوە کە «بە دڵنیاییەوە سەفەرێکی دوور و درێژ دەبێت» و ئەوەیکە: «لەگەڵ داهاتنی شەودا دەگاتە شوێنی مەبەست». لینا ئامادە بوو، شۆفیرەکە و سێ پێشمەرگەی پارێزەریش لەوێ ئامادە بوون، جیپێکی کۆن بۆ ئەو ٥ کەسە و جانتاکانی لینا ڕەچاو کرابوو.

ئەوان، پاش تێپەڕین لە دوو شارۆچکەی میراوە و واوان (Miraveh، Vavan) کە بە هۆی بۆمبارانی فڕۆکەشەڕکەرەکانی ڕێژیمەوە کاول ببوون و خەڵکیان تێدا نەمابوو، لای نیوەڕۆ گەیشتنە مەترسیدارترین شوێنی جادەکە. شارەزایی لینا لە جوگرافیای کوردستان، شارەزاییەکی نیوەناچڵ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، هەستی بەوە کرد کە هەندێ زوو گەیشتوونەتە ئەو شوێنە. لینا و هاوڕێکانی خۆیان لە نێوان بنچک و گیاکاندا حەشار دابوو و بیریان لەوە دەکردەوە کە لەو ڕێگەیەوە دەتوانن تێپەڕن یان نە. ڕێک لەو کاتەدا، کۆمەڵە خەڵکێک، لە لای کێوەکەوە دەرکەوتن و سەرسوورماو پرسیاریان لێکردن: «بەم جیپەوە بۆ کوێ دەچن؟!»

کاک فەتحوڵڵا کە لەباتی هەموویان قسەی دەکرد، بە سەر ئاماژەی بە جادە کرد و گوتی: «لەوێوە دەڕۆین بۆ نەخۆشخانە». خەڵکەکە واق و وڕ ماو سەیری فەتحوڵڵایان کرد و گوتیان: «ئەوە دەڵێی چی! ئێوە

ناتوانن لێره‌وه‌ بڕۆن، به‌ سه‌لامه‌ت ده‌رباز نابن. باشتر وایه‌، بۆ هه‌ڵگرتنی جانتاکان گوێدرێژێک به‌ کرێ بگرن و به‌ پێ له‌ ڕێی شاخه‌که‌وه‌ بڕۆن و یان بگه‌ڕێنه‌وه‌!» و دواتر ملی ڕێگایان گرته‌به‌ر و ڕۆیشتن.

فه‌تحوڵڵا بیر بردیه‌وه‌ و به‌ره‌و به‌رزاییه‌ک ڕۆشت که‌ لێیه‌وه‌ ڕووباره‌که‌ و به‌شێک له‌ جاده‌ به‌رده‌ڵان و ته‌پ و تۆزاوییه‌که‌ ده‌بینرا و گوتی: «ناتوانین بگه‌ڕێینه‌وه‌ بۆ بنکه‌ی سه‌ره‌کی حیزب وپاره‌ی ئه‌وه‌شمان پێ‌نییه‌ گوێدرێژ به‌کرێ بگرین». لینا ده‌یزانی که‌ هه‌ر ئه‌و ڕۆژه‌ بنکه‌ی ناوه‌ندیی حیزب شوێنی خۆی ده‌گۆڕێت و پێیشیان نه‌گوتبوون که‌ بۆ کوێ ده‌چن. هه‌ربۆیه‌ش، ڕووی له‌ فه‌تحوڵڵا کرد و پرسیاری لێکرد: «ڕێگاچاره‌یه‌کت پێ شک دێت؟»

فه‌تحوڵڵا وه‌ڕه‌ز و بێتاقه‌ت ده‌هاته‌ پێش چاو و وه‌ڵامی دایه‌وه‌: «ئێستا، هیچ ڕێگاچاره‌یه‌کمان نییه‌».

لینا بیرۆکه‌یه‌کی هه‌بوو به‌ڵام نه‌یده‌زانی گونجاوه‌ یان نه‌، ڕووی له‌ شۆفیره‌که‌ کرد و پرسیاری لێکرد: «ئه‌وپه‌ڕی خێرایی لێخوڕینی ئه‌م جیپه‌ چه‌نده‌؟»

شۆفێرکه‌: «ڕه‌نگه‌ ٦٠ ...ڕه‌نگه‌، به‌ڵام له‌بیرتان بێت که‌ باره‌که‌ی زۆر قورسه‌ و جاده‌که‌ش پڕه‌ له‌ که‌ند و قوڵک».

لینا ڕوو له‌ شۆفیره‌که‌ گوتی: «له‌ بیرم ده‌بێ. تۆ ده‌بێ له‌ په‌ستا خێراییه‌که‌ت بگۆڕیت، واته‌ سه‌ره‌تا به‌ خێرایی ده‌ڕۆیت، دواتر خاوی ده‌که‌یته‌وه‌. ئه‌م کاره‌ ڕێگر ده‌بێت له‌ سێره‌ گرتنی وردی تۆپ هاوێژه‌کان. باش تێگه‌یشتی؟ ئایا هه‌مووتان له‌ گه‌ڵ من هاوڕان و یان ڕێگاچاره‌یه‌کی دیکه‌تان پێ شک دێت؟»

ڕێگاچاره‌یه‌کی دیکه‌یان نه‌بوو و هه‌موو بیرۆکه‌که‌ی لینایان په‌سه‌ند کرد. هه‌موویان بۆ خۆشاردنه‌وه‌، سه‌ریان نه‌وی کردبووه‌وه‌ و شۆفیره‌که‌ش خۆی له‌ پشت فه‌رمانه‌که‌وه‌ کۆکردبووه‌وه‌ و به‌حاڵ دیار بوو. ته‌نیا چه‌ند کیلۆمیترێک ڕێگایان له‌به‌رده‌مدا بوو. له‌ نیوه‌ی ڕێگاکه‌دا، هاوه‌نێک ڕێک له‌ پشت جیپه‌که‌وه‌ ته‌قییه‌وه‌ و جیپه‌که‌ی به‌ توندی ڕاوه‌شاند. بۆ درێژه‌ی

ڕێگاکە، بیرۆکەکەی لێنا کاریگەر بوو. نەخۆشـــخانەکە لە دۆڵێکی گچکە و لە قەدپاڵی شاخێکی چڕ لە لێڕەوار و تا ڕادەیەک دوور لە تیرڕەسی تۆبخانەکان هەڵکەوتبوو. بۆ گەیشتن بە نەخۆشخانەکە پێویست بوو لەو ڕێگایــەی هاوتەریبی ڕووبارەکە بوو، لابدەن و لــە تووڵەڕێیەکەوە، بە هەورازەکەدا سەرکەون و بەرەو نەخۆشخانەکە بڕۆن. جیپەکە خڕەخڕی پێکەوتبوو و بەگیانەڵڵا سەردەکەوت و نەیدەتوانی خێراییەکەی بگۆڕێت. هاوەنــەکان لەملاوئــەولای جادەکە دەکــەوت و ئاگری لــە لێڕەوارەکە بەردەدا. هەرکە گەیشــتنە نەخۆشــخانەکە، بە پەلە دابەزین و ڕایانکرد و خۆیان شــاردەوە. ئەوان بەسەلامەت دەرچووبوون، بەڵام شۆفیرەکە جیپەکەی لە شوێنێک ڕاگرتبوو کە لەبەر سێرەی تۆپ هاوێژەکاندا بوو و هەربۆیــەش جیپەکە درابووە بــەر ڕێژنەیەک لە هاوەن. بەختەوەرانە نیشانەگرتنەکەیان ورد نەبوو و هاوەنەکان تەنیا ئاگریان لە دارستانەکە بەردەدا. شــۆفیرەکە لە دەرفەتێکی کورتدا کە تۆپخانەکە بێدەنگ ببوو، جیپەکەی بۆ شوێنێکی ئەمین گواستەوە. هەرچوار تەگەرەکەی جیپەکە پەنچــەر ببــوو و نیشــتبووە زەوی. لە درێژەی ســـەفەرەکەیاندا، ناچار بوون هـــەر بەو ڕێگایەدا بڕۆن، هەربۆیەش چاوەڕوانی داهاتنی شـــەو بوون. شۆفیرەکەش لەو دەرفەتەدا تەگەرەکانی پەنچەرگیری کرد.

نەخۆشــخانەکە چۆڵ بوو. نەخۆشخانەکەیان چۆڵ کردبوو. تەنیا ژن و مێردێــک بۆ وەرگرتنی ڕاکــردووان لەوێ مابوونەوە. ئازووخەکەیان تــەواو ببوو و شــتێکی وایــان بۆ خــواردن پێنەمابوو، کــە ئەویش بە زوویی تەواو دەبوو و ئەو ژن و مێردەش ناچار دەبوون ئەو شـــوێنە کارەســتبارە بەجێبهێڵن. پێشبینی دەکرا کە ســوپای دوژمن بە زوویی بگاتە ئەو گردەش.

■ بەرپرسێکی نابەرپرس

پاشنیوەڕۆ، دەنگێکی سەیروسەمەرەیان بیست و پاش چەند ساتێک، چوار پێشمەرگە و بەرپرسەکەیان، یەک لە دوای یەک، بازیان دایە بەر

پێی ئەوان. ئەوانە لەو دیوی شـــاخەکەوە دەهاتن و لەکاتی داگەڕانیاندا، کەوتبوونە بەرچاوی تۆپچییەکانی دوژمن و هاوەنیان تێدەگرتن. ئەوان، ڕێک پێش ئەوەی جیپەکەیان بپێکرێت، توانیبوویان گیانی خۆیان دەرباز بکەن. لەو پشـــێوییەی دەرئەنجامی ترس و تۆقینەدا، لە ســـەرەولێژایی شـــاخەکەوە خۆیان گلۆر کردبووەوە و بە نێو بنچکەکاندا هەتا دەوری نەخۆشـــخانەکە کە داری پێوە نەمابوو، تلیان خواردبوو. تەندروست و ساغ بوون و تەنیا جەستەیان لە چەند شوێنەوە بە سووکی داڕووشابوو. بەم شـــێوەیە بوو کە لینا لەگەڵ بەرپرسێکی حیزبی دێموکرات بە نێوی ح.م، ئاشنا بوو.

ئەوەی ئەو ڕۆژە لینا بەچاوی خۆی لەو پیاوە بینی و ئەوەی سەبارەت بەو پیاوە بیســـتی، نـــە بۆ خودی ئەو پیاوە و نـــە بۆحیزبی دێموکراتی کوردســـتانی ئێران جێی شـــانازی نەبوو، ئەو پیاوە هەرکە هەستایەوە ســـەرپێ، داوای کرد ئاوی بۆ گەرم بکەن بۆ ئەوەی ســـەروملی بشوات و خواردنیشـــی بـــۆ ئامادە بکـــەن. ئەو ژنـــەی لەوێ خزمەتـــی دەکرد، وەڵامی دایەوە کە شتێکی وایان بەدەستەوە نەماوە و ئەوەی ماوەتەوە، هەندێ برنج و یەڕەڵماسی و تەماتەیە، ئایا جگە لە برنج، یەڕەڵماسی و تەماتەشی دەوێت...

ئەو پیاوە لەپێش چاوی هەموویان خۆی ڕادەنا و لاســـایی سەرکردە گەورەکانـــی دەکـــردەوە و بـــە بێئەدەبی و بە بێ هیچ ســـپاس کردنێک، خۆی لەسەر هەڵدەسووڕاندن و فەرمایشتی دەفەرموو. پاشان هاوکات کە بەســـووکی تێی دەڕوانین، بـــە لووتبەرزییەوە داوای کرد کە ئەوەی هەیانـــە بـــۆی ئامـــادە بکەن. ئەو ژنە دامـــاوە، ڕووی لە ماڵـــەوە کرد و هـــەرای لـــە مێردەکەی کرد، ئاوەکە گەرم بکات بۆ ســـەروملی شـــتن و خۆیشـــی چووە چێشتخانەکە و بزر بوو. تەنانەت سکرتێری گشتی ئەو حیزبـــەش، مافـــی ئەوەی بە خـــۆی نەدەدا کـــە چاوەڕوانییەکی ئەوتۆی هەبێت و ئاوا لەگەڵ خەڵک بدوێت.

ئاغای ح.م، دوور لە هەموویان وەستا بوو، پێشمەرگەکانیش لەدەوری

یەکتر کۆببونەوە و بێدەنگ بوون. پاش ئەوەیکە ح.م، ســەروملی خۆی شوشــت، لینا ویســتی هەندێ زانیاری لەسەری کۆکاتەوە. هەربۆیەش، پرسیاری کرد: «ئایا ئەو پیاوە هەمیشە ئاوا هەڵسوکەوت دەکات؟»

فەتحولــڵا وەڵامــی دایەوە: «بەڵــێ و لەوە خراپتریــش دەکات». لەم کاتــەدا، لینا ڕووی تێکــرد و گوتی: «وەکوو چی؟» جەماعەت لە وەڵام دانەوەدا دوودڵ بوون.، سەیری فەتحوڵڵایان کرد و ئەویش بە ئیشارەت تێی گەیاندن کە غەریبەمان لە نێواندا نییە.

ئەوەی ئەوان بە پەلە گێڕایانەوە، عەقڵ نەیدەگرت. بەڵام ئایا دەکرێت بڕوا بە شاهێدیی هەشت کەس نەکەیت؟ ئاغای ح.م، وەکوو بەردەستێکی ســووک هەڵسوکەوتــی لەگەڵ دەکــردن و ئەوەی پێی خــۆش بووایە بەســەری دەهێنان. ئەو دەیویســت هەمیشە لەبەردەســتیدا بن و تەنیا پاشــماوەی خۆراکەکەی خۆی دەدانێ، هەمــوو بەیانییەک پێڵاوەکانیان بۆ بۆیاخ دەکرد و جل و بەرگەکانیان بۆ دەشوشت و ئوتوویان دەکرد. ئــەو کە گەلێکش چاوحیز و مێباز بوو، چەندین کاتژمێر لەبەر گەرمای خۆرەتــاو و یان لەنێو بەفردا ڕایدەگرتن، کچان و ژنانی گەنجی خەڵکی بە زۆر وەپاڵ خۆی دەخســت و بە ڕیشــی مێرد و یان باوکەکانیشیان پێدەکەنــی و بــە زەبــری هەڕەشــە بێدەنگــی دەکردن. چەند کەســێک شکاتیان بردە لای عەبدولڕەحمان و لە دژی ح.م، سکاڵایان کرد، بەڵام ح.م، نکۆڵی لە هەموو شتێک دەکرد، پێدەکەنی و بابەتەکەی بە گاڵتە لە مل خۆی دادەماڵی.

ح.م، نیــوەڕووت لە حەمامەکە هاتە دەرەوە، خۆی ئیشــک کردەوە و لەبەر چاوی هەمووان جلو بەرگەکەی کردەوە بەری و پاشان دانیشت بــە تەنیا دەســتی بە نان خواردن کرد. لەپێشــیدا، بڕێکــی زۆر برنج و یەڕەڵماســی و تەماتە لەســەر مەجومعەیەک دانرابوو کە بەشــی پێنج کەســی دەکــرد. ئەو ژنــە خزمەتکارەش، ســەیری ح.م ی دەکرد کە بە تەنیایی سەری کردبووە خواردنەکە. پەنجەکانی خۆی هەڵگلۆفی و چووە ژوورەوە. پێشــمەرگەکانی ح.م چــاوەڕوان بوون ئــەو لە نان خواردن

بکشێتەوە. لەو هەموو خۆراکە، تەنیا بەشی یەک کەسی هێشتەوە.

لە یەکەمین دەرفەتدا، لێنا لەو بارەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی قسەی کرد. ئەو ئاگاداری هەموو شتێک بوو، بەڵام گوتی: «هیچم لەدەست نایە! چونکە تەنانەت یەک کەسی دیکەش شک نابات کە وەکوو ئەو شارەزای تۆپۆگرافیای کوردستان بێت!»

لێنا: «ئەی قوربانییەکانی ئەو بەڕێزە چییان بەسەر دێت؟ ئەو زەبرەی بەو هۆیەوە لە حیزب دەوەشێندرێت چی؟»

عەبدولڕەحمان: «هەتا کەسێکی دیکەمان بەو شارەزاییەوە دەست کەوێت، دەبێ چاوەڕوان بین. هەربۆیەش ئێستا هیچم لەدەست نایە»

کەسێکی ئەوتۆ، هەتا کاتی مردنی عەبدولڕەحمان و تەنانەت پاش مردنیشی نەدۆزرایەوە، دواجار ح.م، کوردستانی بەجێهێشت و لە ئورووپا نیشتەجێ بوو.

تاریکایی شەو بەهۆی بڵێسەی ئاگری دارستانە سووتاوەکەوە، چراخانی ببوو. ئەوان دەبوو هەرچیزووترە ئەو جەهەننەمە بەجێبهێڵن. دوژمنیش کە بەجوانی جادەکەی دەبینی، کاتی بەفیڕۆ نەدا و دانیە بەر گوللەهاوەن. بەڵام نیشانەگرتنەکەیان وەکوو پێشوو ڕێک و ورد نەبوو. ڕێژنەیەک لە گوللەهاوەن بەسەریاندا دەباری.

هەرکە گەیشتنە شاخەکە، ڕزگاریان بوو. لەوە بەدوای سەفەرەکەیان بە بێهیچ گرفتێک تێپەڕی. لینا لە بەغا،ماڵئاوایی لە هاوڕێکانی کرد و بەرەو پاریس ڕۆشت.

■ لە گەڕانەوەدا

پاش گەڕانەوە بۆ پاریس، لێنا دەستی کردەوە بە کاروباری پەیوەندییەکانی حیزب. زۆربەی خەڵک بە خۆشی و حەزەوە گوێیان بۆ قسەکانی ڕادەگرت و یان لانیکەم وایان دەنواند. سەرەڕای ئەوەش بابەتێکی ناخۆش هاتەئاراوە. بەرپرسی نووسینگەی یەکێک لە وەزیرەکان، قسەکانی پێبڕی و بە لووتبەرزییەوە گوتی کە ئەو نابێت

هەرگیز، هیچ هیوایەکی بەوە هەبێت کە بەڕێز وەزیر، چاوی بە بەرپرسی ئۆپۆزیسیونێکی ڕێژیمی خومەینی بکەوێت. لێنا پێداگری کرد کە ئەو بەرپرسە لانیکەم گوێ لە قسەکانی بگرێت. بەڵام بەرپرسەکە ڕایگەیاند: «خۆت ماندوو مەکە! بە قاسملوو بڵێ خۆی سەردانم بکات».

لێنا، وتەکانی ئەو بەرپرسەی بە هاوسەرەکەی ڕاگەیاندەوە و لەگەڵ ئەوەشدا پێی گوت کە ئەمجارەیان لەگەڵی ناچێت (زۆربەی جارەکان عەبدولڕەحمان داوای لە لێنا دەکرد لە چاوپێکەوتنەکانی ئامادە بێت). لێنا ئامادەنەبووە جارێکی دیکە بەرەوڕووی ئەو پیاوە بێتەوە.

ڕۆژی دیدارەکە، هاوسەرەکەی بە تەنیا ڕۆشت و لێناش لە کافەیەک لە بینای شوێنی چاوپێکەوتنەکە دانیشت و چاوەڕێی کرد. عەبدولڕەحمان بەگشتی مرۆڤێکی هێمن بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە، پاش پێنج دەقیقە بە تووڕەییەکی زۆرەوە گەڕایەوە. ئەو بەرپرسە چاوی پێی نەکەوتبوو و هەر لەبەر درگاکەوە گەڕاندبوویەوە. عەبدولڕەحمان تووڕەییەکەی خۆی بە لێنا ڕشت. لەوکاتەدا، پێویستی بە کەسێک بوو جەوری بکێشێت. لێناش لێیگەڕا خۆی بەتاڵ کاتەوە و چاوەڕوانی کرد هەتا هێور بێتەوە.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هاوکاری کردنی عەبدولڕەحمان، پێویستی بە دانبەخۆداگرتنێکی زۆر هەبوو. ئەو هەمیشە وەک قەرزیان بەسەرەوە بێت، سەیری چالاکیی هاوکارەکانی دەکرد و وەکوو شتێکی زۆر ئاسایی دەیڕوانییە کارامەییەکانیان، وەک بڵێی شایانی باس کردنیش نەبێت.

جگە لەوەش، عەبدولڕەحمان لە ئۆرووپا بەهیچ شێوەیەک خۆی نەدەپاراست و سەرەتاییترین ڕێوشوێنەکانی خۆپاراستنی ڕەچاو نەدەکرد. تەنیا یەک پارێزەر (ئیسکۆرت)ی هەبوو کە تەنانەت چەکیشی پێ نەبوو. زۆربەی کاتەکان بزر دەبوو و پارێزەرە داماوەکەشی کە لە نیگەرانیدا گێنگڵی دەدا لە چاوەڕوانیدا دەهێشتەوە. هەم ئیسکۆرتەکانی و هەم کوردەکانی دیکە دەهاتنەلای لێنا وداوایان لێدەکرد لەوبارەوە هۆشداری بداتە مێردەکەی. ئەوان نیگەرانی پاراستنی گیانی عەبدولڕەحمان

بوون. بەڵام لینا زۆرجار ئەوبابەتەی دووپات دەکردەوە و پێی دەگوت کە تۆ بەرانبەر بەگەلی کورد و پارێزەرەکانت بەرپرسیاری، بەڵام خۆت دەخەیتــە بــەر هەڕەشــە و مەترســیی ڕێژیمێک کە بۆ کوشــتنی تۆ لە بچووکتریــن دەرفەت دەگەڕێ. لینا زۆر جار هەموو ئەو هۆشــدارانەی بە عەبدولڕەحمان دابوو. دوایین پارێزەریشی، کاک عەبدوڵڵا[٤]، زۆرجار دەهاتە لای لینا و لەوبارەوە قســەی لەگەڵ دەکرد. جارێکیش، لەکاتێکدا کە عەبدوڵڵا ئیسکۆرتی دەکرد،گوتی: «نەسرین خانم، فەرامۆشی مەکە، ئەو ڕۆژەی دوکتور دەکوژرێت، منیش لەگەڵی دەکوژرێم». هەر وایشی لێهات. ئەویش لە ڤییەن لەگەڵ دوکتور کوژرا.

کاتێــک، لینا ســەبارەت بەو دڵەڕاوکــێ و نیگەرانییانــەی کوردەکان ســەبارەت بە پاراستنی گیانی قســەی لەگەڵ دەکرد، زۆربەی جارەکان یــەک وەڵامی وەردەگرتــەوە، ئەویــش ئەوەبــوو کەپەیوەندیی بەتۆوە نییە.

بــەڵام، هەندێ جاریش، لۆمەکانــی لینا دەبووە هۆی لەخۆباییبوونی، چاوەکانــی پێدەکەنیــن و لای لێــوی ڕادەکێشــرا. لــەم کاتانــەدا، ئــەو زیاترئامادەیــی ئــەوەی تێدا بووکــە دەروونی خۆی بکاتەوە. لەســاتی ئــاوادا، لە منداڵێکــی هاروهاج دەچوو کە هەڵەیەکــی کردووە، منداڵێکی هاروهاج کە بۆخۆیشــی دەیزانی هەڵەی کردووە، بەڵام گوێی نەدەدایە و تەنانەت کەیفخۆشــبوو بەوەی فێڵی لە دایک وبابی کردووە. ئەونەک هــەر لۆمەکانی بەهەند وەر نەدەگــرت، بەڵکوو بەجۆرێکیش کەیفی پێی سازدەبوو. عەبدولڕەحمان کە بەردەوام لەژێر چاوەدێریدا بوو، هەستی بــە خنکان دەکــرد. ئەو جگە لەوەی ڕێبەری حیزبێــک بوو و لە هەمان کاتیشــدا ڕێبەرایەتیی شۆڕشــێکی چەکداریی دەکرد لە دژی دوژمنێکی بەهێز و فێڵباز، لەبەرپرســایەتیی هەمیشەیی بێزار بوو و حەزی دەکرد ئازادییە تاکە کەسییەکانی بپارێزێت. ئەو وتەیەکی لە کتێبی ماریاکالاس

٤. کاک عەبدوڵڵا قادری ئازەر لەو کاتەدا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بووە.

(Maria Callas) هەڵگرتبوو و نووســیبوویەوە: «دەمتوانی بەختەوەر بم. بــەڵام ئازادی وســەربەخۆییم هەڵبژارد. بەگشــتی، بەختەوەری مرۆڤ بەخەڵکانێکی دیکەوە دەبەستێتەوە وئەوەش واتە دەسپێکی کۆتایی».

بــەڵام جێــی پرســیارە کــە ئایــا ڕێبەرێــک، مافــی ئــەوەی هەیە کە وەکوو مرۆڤێکی ئاســایی هەڵسوکەوت بــکات؟ ئایا مافی ئەوەی هەیە بەرپرســایەتییەکانی شۆڕشــگێڕێک لەگەڵ خەمساردیی و بێموبالاتیی مرۆڤێکی ئاسایی تێکەڵ بکات؟

عەبدولڕەحمان شــەڕی دەکرد، بە بێئەوەی حەزی لێی بێت: مرۆڤ زۆر زوو لەو شتەی بە دڵی خۆی نییە ماندوو دەبێت.

پێدەچــێ مــرۆڤ ئــەو کەســە تاوانبــار بــکات بەوەیکە ڕاســتگۆیی ئیدئۆلۆژیکی خۆی لە دەستداوە و یان ئەوەیکە ئاوەزی خۆی لەدەستداوە و هاوســەنگیی مەنتیقــی نەماوە. تەنانەت دەکرێــت واش بۆی بڕوانیت کە دەســەڵاتداری، تووشــی گەندەڵی کردووە و ڕێبەرێکی لووتبەرزی لێدەرچووە. بەڵام ســەبارەت بە عەبدولڕەحمان بەشێکی ئەو ئەگەرانە دروســت نەبــوون. ئیدئۆلــۆژی و لۆژیک بۆ ئەو نەک هەر زانســتێکی نەناســراو و دوورە دەســت نەبون، بەڵکوو پێکهێنــەری بیرۆکەکانی و ڕێنمای بوون لە دیاری کردنی ڕێبازەکانیدا، بەڵام نەیاندەتوانی لە داو و بنبەستەکان ڕزگاری بکەن.

بەسەرنجدان بە پێگەکەی، ئەو دەبوو لە بەرژەوەندیگەلێکی ڕانەهێنراو و تووشــبوو لەگــەڵ دوژمنێکی دڵــڕەق، بڕیاڕ بدات. مــاوەی زەمەنیی نێــوان ئاگادار بوونــەوەی لەبابەتێک و ئەو بڕیــارەی لەو پەیوەندییەدا دەبــوو بیدات، زۆر کورت و تەنانەت هیچ بــوو. لەجەنگدا، دوودڵبوون واتاکەی مردنە. گومان کردن و فەلســەفە هۆنینەوە لە دۆخی ئەوتۆدا، هەم مەترســیدارە و هەم خۆشبژیوییێکی دوورە دەستە. لەم بارەشەوە، ئــەو بەتەنیــا بــوو. تەنیایی، هەندێجــار دەبووە هۆی کەســەر و زۆر جاریش ســارد بوونەوە. جگە لەوەش، ئەو، بەردەوام وەکوو مرۆڤێکی ئاســایی بە بێ پلە و بەرپرســایەتی هەڵسوکەوتی دەکــرد، ئەو ژیانی

خۆشدەویست.

بـەم حاڵـەوە، مەرگ بووە هـۆی زەقبوونـەوەی بابەتگەلێـک کە لە ژیانـی ئەو کۆچکردووەدا بایەخیان هەبوو و لە هەمانکاتدا بووە هۆی لەبیرکردنی ئەو شتانەی کە لە ژیانیدا گرینگ نەبوون.

ڕۆژەڕەشیی نەتەوەی کورد دەرئەنجامی ئەوەیە کە بوونی بە فەرمی نەناسراوە و یان بە دروستی قبووڵ نەکراوە. ئەم نەهامەتییە، هەروەها بـە هۆی ئەو نادادپەروەرییانەوەیە کە بە درێژایی مێژوو دەرحەق بەم گەلە کراوە.

دەسـەڵاتەکان، بریتی لە دەسـەڵاتە ناوچەیـی و نێونەتەوەییەکان، لە قەرەبـوو کردنەوەی ئـەم نادادپەروەریی و دەسـتدرێژییە لەمێژینەیە، هێشتاش خەمساردن. گەلی کورد چاوەڕوانیی ئەوەی لە عەبدولڕەحمان هەبوو کە جارێک و بۆ هەمیشە کۆتایی بەم نادادپەروەرییە بهێنێت.

عەبدولڕەحمـان بە باشـی دەیزانی کە وەهـا چاوەڕوانی و هیوایەک زێدەڕۆییە، سەرەڕای ئەوەش، پاشەکشەی نەدەکرد.

ئەو خودموختارییەی کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران داوای دەکرد، جگە لە بە فەرمی ناسـینی شـوناس و کولتووری کورد نەبوو و عەبدولڕەحمـان بـڕوای بـەوە هەبوو کـە ئەگەر بتوانێـت دەوڵەتی ئێران لەو تایبەتمەندییە ئاشـتیخوازانەیە تێبگەیەنێت، دەکرا هیوایەک بە دەرئەنجامی خەبات و تێکۆشانی حیزبی دێموکرات ببەسترێت.

هیـوا، لەنگەری ئیمانە بـە داهاتوو. عەبدولڕەحمان لەدەسـتدانی ئەم لەنگـەرەی بـە خەیاڵیشـدا نەدەهـات. لـەو ڕووەوە کەعەبدولڕەحمان وەڵامی ئارمانجی کوردەکان، کە گەیشـتن بـە ئازادی بووی دەدایەوە، کـوردەکان ئەویـان بـە مایەی شـانازی دەزانی و لە باڵاترین ئاسـتدا بایەخیان پێدەدا و لە سـەر بەرزترین کۆڵەکەی شـانازیی نیشـتمانی دایاننـا، ئەویش هەسـتی دەکرد با و بـۆران کاری تێناکات، ڕێک وەک ئەوەی زەربە هەڵنەگر بێت! بەڵام بەداخەوە، وا نەبوو!

لـەو کاتەدا کـە حیزبـی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێران، بەشـێکی

ئازادکراوی خاکی کوردســتانی بەڕێوە دەبرد، عەبدولڕەحمان توانی لە نیشتمانەکەیدا، هیوا و ئۆگریی لەڕادەبەدەر دروست بکات.

ڕۆژێک، لینا لەگەڵ ئیکیپێکی ڕێکخراوە ناحکوومییەکان بە مەبەستی کوتانی منداڵەکان، ســەردانی گوندەکانی کوردســتانی کــرد. لە ڕێگادا، لــە چاخانەیــەک لایاندا، خاوەنی چاخانەکە کە پێیوابــوو لینا دیلمانجە، ئاماژەی بۆ دوو وێنەی گەورە کرد کە بەدیواری چاخانەکەوە هەڵواسرا بوون و پرسیاری کرد: «ئەزانی ئەو دووانە کێن؟»

لینا: «بلێ براکەم. ئەو دووانە کێن»

خاوەنــی چاخانەکە: «نەفەری لای ڕاســت، قازی محەممەد، یەکەمین و دوایین ســەرۆک کۆمارمان بوو. ســاڵانێک لەوە پێش، ڕێژیمی شا لە ســێدارەی دا. بەڵام ئەوی دووهەم زیندووە! ئەوە دوکتور قاســملووە. ئەو، لەم چارەڕەشییە ڕزگارمان دەکات، دەبینی! ئێستا گوتەکانم بۆ ئەم پیاوە و ئەو ژنە بگێڕەوە!»

ساڵی ١٩٨٤، پاشماوەی ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانیش کەوتەوە دەست هێزەکانی خومەینی. ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێــران لــە ڕووبــاری «زێی بچــووک» پەڕینــەوە و پەنایــان بردەبەر کوردستانی عەراق.

■ تراژێدی

پێش تراژێدییەکە، سەرەتاکانی مانگی دێسامبری ١٩٨٨، عەبدولڕەحمان هــات بۆ پاریــس. بە دووقۆڵی ســەبارەت بە کێشــە و ئاســتەنگەکانی کارەکانیان کەوتنە قسەکردن و لە دووگیان بوونی کچە گەورەکەیان و لەدایک بوونی ســێهەمین منداڵەکەی لەمانگی ژوئەن‌دا ئاگادار بوونەوە. ڕۆژی ١٦ی دێســامبر، عەبدولڕەحمان کە لە لایەن حیزبی کۆمۆنیستی فەرانســەوە بانگهێشــت کرابــوو تا لــە بۆنەی ســەدەمین ســاڵڕۆژی ســروودی ئەنێرناســیۆناڵدا بەشداری بکات، ســەفەری کرد بۆ شاری «لیل»ی فەرانســە. ڕۆژی ٢٢ی دێسامبر، ئەوان پێکەوە جێژنی پەنجاو

هەشــتەمین ساڵڕۆژی لەدایکبوونی عەبدولڕەحمانیان گرت. ڕۆژی٢٧ی هەمان مانگیش، وەک خۆی باسی کرد، سەردانی وڵاتێکی بیانی کرد.

لە ڕاســتیدا، ئەو چووبوو بۆ ڤییەن، پێتەختی ئۆتریش، بە مەبەســتی دەســتپێکردنی دانوســتان لەگەڵ نێردراوەکانی ڕێژیمی مەلاکان. ئەو نێردراوانە بریتی بوون لە: جەعفەری سەحراڕوودی و حاجی مستەفەوی. ئەوان دەبوو ســەبارەت بە کۆتایی هێنان بە شــەڕ لە کوردستان کە ٩ ساڵ لەوەبەر دەستی پێکردبوو، گفتوگۆ بکەن. شێوازی خودموختاریی کوردســتان و چۆنیەتــی ڕێککەوتنــەکان لــەو بوارەدا لە دەســتووری کاری دانوســتانەکەدابوو. ئــەوان دوو ڕۆژ گفتوگۆیان کرد. پاش ئەوە، نێردراوانــی ڕێژیم گەڕانەوە بۆ تاران بۆ ئــەوەی داخوازەکانی حیزبی دێموکراتــی کوردســتانی ئێران بە ئاگاداریی بەرپرســەکانیان بگەیەنن. لەمانگی ژانوییەی ١٩٨٩دا، ئەوان سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ ڤییەن، بەڵام نەگەیشتنە هیچ ڕێککەوتنێک.

لینا ئاگای لەو دانوستانانە نەبوو. بەڵام عەبدولڕەحمان هەموو ڕۆژێک تەلەفۆنی بۆ دەکرد. پاشان، لینا نامەیەکی بچووکی لە عەبدولڕەحمانەوە گەیشتە دەست، ئەوەش وەرگێڕدراوی ئەو نامەیە:

«لینا گیان، ئازیزم، هیوادارم ســاڵی نوێت بە خۆشی بێت. بەداخەوە، دەرەتانی گەڕانەوە بۆ پاریسم نییە. لێرە سەرقاڵی دانوستانگەلێکی زۆر گرینگم لە گەڵ نوێنەرانی ڕێژیمی ئێراندا. بە دڵنیاییەوە ئەم دانوستانانە، دانوســتانگەلی کۆتاییــن. هەربۆیەش، هیچکەس جگە لــە تۆ نابێت لێی ئــاگادار بکرێتەوە. عەبدوڵڵام لەگەڵە و بەباشــی نازانــم ئەو بزانێت کە تۆم ئاگادار کردۆتەوە. پاش یەکەمین خولی دانوســتانەکان، کەمتر پێی خۆشبینم. ســەرەڕای ئەوەش، دانوستانەکان بەردەوامە و هەربۆیەش، پێدەچێت سەرێکیش لە پراگ بدەم...».

عەبدولڕەحمــان، ڕۆژی ٢١ی ژانوییــە گەڕایــەوە بــۆ پاریس و پاش ئــەوەش چوو بــۆ کوردســتان. لەمانگــی ژووئەنــدا، واتە پێنــج مانگ دواتــر، دووبارە گەڕایەوە بۆ ئورووپا و لە کۆنگرەی ئەنتێرناســیۆنال

سووسیالیست لە ستۆکهۆڵم بەشداری کرد. لەو ماوەیەدا لە ماڵی میناى کچی و «ئـۆلا»ی (Ola) زاوایدا مایەوە و هەربۆیەش توانی چوارەمین نــەوەی خــۆی ببینێت و لە ئامێزی بگرێت کە نێــوی ماکس (Max) بوو و تــازە هەشــت ڕۆژ بوو لەدایک ببوو (توانــی ڤێرا (Vera)، منداڵی کچە بچکۆلەکەشــی ببینێــت) و هەروەهــا لەگــەڵ براگەورەترەکانی ماکس، واتە ڕۆبێــرت (Robert) و مارتینیش (Martin) فتبۆڵی کرد. ڕۆژی ٢٦ی ژووئەنیش گەڕایەوە بۆ پاریس.

لەوکاتەدا، لێنا سەرقاڵی کاری دیلمانجی بوو، ناچار بوو بەپەلە دەست لە کارەکەی بکێشــێت. چونکــە عەبدولڕەحمان بۆ هەندێ کاری بە پەلە پێویســتی پێی بوو. یەکێک لــەو کارانە، پەیوەندیی بە ســەفەرەکەیەوە هەبــوو بۆ ویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەو کە لەلایەن ســەنای ئەمریکاوە بانگهێشــت کرابوو، بڕیار بوو ڕۆژی ١٩ی ژوئییە بچێت بۆ ئەو وڵاتە.

ئــەو وتەگەلێکی بە فارســی بۆ ئەو مەبەســتە ئامــادە کردبوو و لێنا دەبوو وەریان بگێڕێتەوە ســەر زمانی ئینگلیســی.. ئــەوان پێکەوە هەتا ڕۆژێک پێش ســەفەرەکەی بۆ ڤییەن کاریان کرد. پێشــبینییان کردبوو کە ڕۆژی ١٦ی ژوییە لە ڤییەن بگەڕێتەوە. لە ڕاســتیدا، عەبدولڕەحمان و لێنــا، پێکــەوە ئکیپێکی کاری بــوون کە هەندێجار هــاوکاری کاتیی دیکەشیان دەبوو.

عەبدولڕەحمان دوا پاشنیوەڕۆی پێش سەفەرەکەی بۆ ڤییەنی لە ماڵی لێنا بردە ســەر و هەر لەو پاشنیوەڕۆیەشدا بوو کە ڕازی سەفەرەکەی خۆی بۆ ڤییەنی لای لێنا ئاشکرا کرد. بڕوای بەوە هەبوو کە ئێرانییەکان زۆر مەیلیــان لێیە پرســی کورد لە ئێران چارەســەر بکرێت و زۆریش متمانــەی بــەو وتەیەی خــۆی هەبوو. بــەڵام لێنا بە ئاســتەم دەیتوانی بــڕوا بەو گفتوگۆیە بکات، گوتم: «ئێســتا، بۆ ڕێژیــم گونجاوترین کاتە بــۆ ئەوەی تــۆ لەناو بەرێت. خومەینی مردووە. چارەنووســی ســمکۆ لەیاد مەکە». (ســمکۆ یەکێــک لە ڕێبەرانی بزووتنــەوەی کورد بوو لە

کوردستانی ئێران، کە کەوتە ئەو داوەی کە نێردراوانی ڕێژیمی شا پاش دەستپێکردنی دانوستانەکان بۆیان نابووەوە و لەساڵی ١٩٣٠دا، کوژرا).

عەبدولڕحمان: «من پێم گوتوون کە ئاگاداری ئەوە بن کە من بەقەدەر سمکۆ سادە نیم».

لێنا: «بەڕاست؟ بلێ بزانم، ئەگەر ڕۆژێک لەناو بچیت، چارەنووسی حیزب چی بەسەر دێت؟ تۆ کە هێشتاش جێگرەوەت نییە».

عەبدولڕەحمان: «لە ئێستادا دوکتور سەعیدمان هەیە و لە سێ تا چوار ساڵی داهاتووشدا چەند کەسێکی دیکەشمان دەبێت».

لێنا هەست و بۆچوونێکی باشی بەرانبەر بەو دانوستانانە لەگەڵ ڕێژیم نەبوو. بەڵام عەبدولڕەحمان، بە هۆی ئەو متمانەپێنەکردنەوە، بە گاڵتەوە سەری دەختستە سەر لێنا.

ئەو ڕۆژی سێشەممە، ١١ی ژوئییە بە پێی خۆی بە پیری مەرگەوە چوو. هەر ئەو ڕۆژە و ڕۆژی دواتریش، تەلەفۆنی بۆ لێنا کرد. بەڵام ڕۆژی ١٣ی ژوئییە، عەبدولڕەحمان تەلەفۆنی بۆ لێنا نەکرد.

■ ڕوودانی تراژێدی

هەینی، ١٤ی ژوئییە، لای کاتژمێر پێنجی بەیانی، زرڕەی دڵتەزێنی تەلەفۆن، لێنای لە خەو هەستان. کاک خۆسرۆ، لە دەفتەری نوێنەرایەتیی حیزب لە پاریس، ڕوودانی تراژێدییەکی بە لێنا ڕاگەیاند: ڕۆژی پێشوو، واتە١٣ی ژوئییە لای کاتژمێر ٧ی ئێوارە، عەبدولڕەحمان و کاک عەبدوڵڵا و فازڵ ڕەسووڵ کوژرا بوون.

لێنا لە ئاپارتمانەکەیدا، بە چەپ و ڕاستدا دەهات و دەچوو و هەوڵیدەدا باوڕ بهێنێت کە ئەوە مۆتەکەیەکە و کاتێک بەئاگا بێتەوە، دەڕەوێتەوە. بەڵام وردە وردە ناچاربوو ملکەچی ئەو ڕاستییە بێت. بە بێئەوەی بەرنامەیەکی دیاریکراوی هەبێت، چوو بۆ دەفتەری حیزب. لەوێ هەموو دەگریان. لەزەینی ئەودا هەموو شتەکان ئاڵۆز و

تێکەڵوپێکــەڵ و تێکچڕژاو بــوو، هەربۆیەش، لەوەیکە دەبوو چی بکات و یــان بیــری لە چی دەکــردەوە، هیچی پێنەدەگوترا. ئەو، ســەرەڕای ئەوەیکە هێشــتاش لە شــۆکدا بــوو، دەبوو «کار»ێک بــکات و ئەوەی لــەو چــاوەڕوان دەکــرا جێبەجێی بکات. لینــا، هەرچەند کە هێشــتاش شــۆک بەرینەدابوو، نەبوورایەوە. تەنانەت خۆی ســەرقاڵی نووســین کرد. نووســین و دەستبردن بۆ قەڵەم، یارمەتی دەدا بەسەر شڵەژان و ئاڵۆزیی مێشکی خۆیدا زاڵ بێتەوە. لۆمەی خۆی دەکرد کە بۆچی باسی مەرگی لەگەڵ عەبدولڕەحمان کردووە، دڵی خۆیشی دەدایەوە کە هەموو دڵنیگەرانییەکانی ئەو بۆ پاراستنی گیانی ئەو بوو. بەهەرحاڵ، دەتوانین بڵێیــن کــە لینا هەر چەند بڕوای بەو ئەندێشــە خورافییــە نەبوو، بەڵام لەوەیکە بەســانایی دان ئێشــەیەک، باسی مردنی لەگەڵ عەبدولڕەحمان کردبوو، زۆر بێتاقەت بوو.

لینا لە شەهید عەبدولڕەحمانیش تووڕە بوو، لەوەیکە خۆی بەکوشت دابوو، لەناخی خۆیدا تاوانباری دەکرد بەرانبەر بەو غەدرەی لە گەلەکەی خــۆی کردبــووی و جێی بەخشــینی نەبوو و بەتونــدی لۆمەی دەکرد. قاتڵەکانی توانیبوویان ســەبارەت بە گرینگیی دانوســتانەکان سەرنجی ڕابکێشن و ئەویش بڕوای بە قسەکانیان کردبوو. قاتڵەکان پێشمەرجیان بۆ دانوستانەکە دانابوو و ئەویش ئەوە بوو کە دانوستانەکان دەبێت بە تەواوی بە نهێنی بمێنێتەوە و عەبدولڕەحمان دەرکی بەوە نەکردبوو کە بە نهێنی هێشــتنەوەی دانوستانەکان، ئاڵقەیەک لە زنجیرە نەخشەیەکی جینایەتکارانەی ئەوانی پێکدەهێنــا. عەبدولڕەحمان داوای لە ئەندامانی حیزب لە ڤییەن نەکردبوو کە پاراســتنی بگرنە ئەستۆ و هەرسێکیان بە پێی خواســتی جینایەتکارەکان جووڵابوونەوە و بە بێ چەک چووبوونە شــوێنی دانوســتان. هەڵبەت ڕێژیمی ئێران، پێش لــەوەش، دووجار لە کوردستان هەوڵی کوشتنی ئەوی داوبوو. بەڵام ئەمجارەیان، نەخشەکەی خۆیان بەوردی و ڕێکوپێک داڕشتبوو.

کاتێــک لینا لەوە ئــاگادار کرایەوە کە عەبدولڕەحمان بە بێ ئاگاداریی

هاوکارەکانی و بەشێوەی نهێنی چووەتە دیداری قاتڵەکانی خۆی، لە تاو خەم و توورەییدا گێنگڵی دەدا. لە ڕاستیدا، پاش شکستی دانوستانەکان لە زســتانی ١٩٨٩دا، دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، بڕیاری دابوو کۆتایی بە دانوســتانەکان بهێنێت. ئەوان گومانیان لە پرۆسەکە کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، عەبدولڕەحمان بڕیاری دەفتەری سیاسی لەبەرچاو نەگرتبوو و ڕەنگە بیری لەوە کردبێتەوە کە دەتوانێت لەو ڕێگەیەوە بەســەر هاوکارەکانیدا زاڵ بێت. بەڵام لێنا پرســیاری لە خۆی دەکرد، ئەو کە بە تەواویی شارەزای فێڵبازیی مەلاکان بوو، چۆن لەو پلانە تێنەگەیشــتبوو؟ ئــەو کە مرۆڤێکی لۆژیکــی بوو،چلۆن خۆی ودووکەسی دیکەشی خستبووە داوی ئەم چەقەڵانەوە؟

جێگرەوەکانــی خومەینی بەنیازبوون ڕێبەری بزووتنەوەی کورد، کە سەرئێشــەیەکی زۆری بۆ دروست کردبوون، لە ناوبەرن و دواجاریش توانییان ئەوە بکەن کە ویستیان.

پێــش ئــەوە، ڕێژەیەکــی بەرچاو لــە ئێرانییە دژبەرەکانــی ڕێژیم، لە دەرەوەی وڵات، کوژرابوون، سەبارەت بە کوشتنی ئەوان لە بەرزترین ئاســتی دەســەڵاتدارانی حکوومەتــەوە بڕیــار درابوو. بــەڵام لێنا، هیچ نموونەیەک لەو کوشــتنانەی شک نەبرد کە لەسەر مێزی دانوستان بۆ دەستەبەرکردنی ئاشتی کوژرابێتن.

■ پاش ڕوودانی تراژێدی

پۆلیســی ئۆتریــش زۆر بەخێرایــی ڕاســتیی ڕووداوەکەی کەشــف کردبــوو. پیاوکوژەکان لە ڕاســتیدا هەمان ســێ کەســی ئێرانی بوون کــە لە دانوســتانەکاندا بەشــدار بــوون. ڕاگەیەنــە نێونەتەوەییەکان و بەتایبەتــی ڕاگەیاندنی ئۆتریــش، هەواڵەکەیان بڵاو کــردەوە و هەموو لایەک لێی ئاگادار کرانەوە. حکوومەتی ئۆتریش تووشی سەرئێشەیەکی گەورەببوو. تاوانباران بە پاســپۆرتی دیپلۆماتیک سەفەریان کردبوو و دەوڵەتــی ئۆتریــش پەیوەندیی ئابــووری گرینــگ و بەرفراوانی لەگەڵ

ئێـران هەبوو. فشـارێکی زۆر لە لایەن دەسـەڵاتدارانی باڵای ئێرانەوە خرابـووە سـەر دەوڵەتی ئۆتریـش. لاوازیی جێی نیگەرانـی و بەژانی دێموکراسـی، بە ئاشـکرا خۆی دەردەخسـت. حکوومەتەکانی دونیا کە خۆیان بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئێران ئامادە دەکرد، بەباشیان زانی حکوومەتی تیرۆریسـتی ئێران لە ڕیسوایی و شەرمەزاری ڕزگار بکـەن. بۆ ئـەم وڵاتانە، تاوانبـار کردنی نەتەوەیەکـی بێدیفاعی وەکوو کـورد ئاسـانتر بـوو. هەربۆیەش، ڕاگەیەنـەکان، لەوانـە ڕادیۆ بی بی سـی و ڕادیۆی نێونەتەوەیی فەرانسـە، لە شـرۆڤەکانی خۆیاندا، وەها لێکیاندایەوە کە کوژرانی ئەو سـێ کوردەی کە لە ئۆتریش ڕوویداوە، دەرئەنجامی پاکانەحیسـابەکان بووە و پەنجەی تاوانیان بۆ لای ڕەوتە ڕادیکاڵە کوردەکان ڕاکێشا و ئەوانیان بە دەست هەبوون لەو جینایەتەدا تاوانبـار دەکرد. لە ئۆتریش، ڕاپۆرتی سـەرەتایی و فەرمیی پۆلیس، بە پێی خواستی ڕۆژ، ئاڵوگۆڕی بەسەردا دەهات، دوو کەس لە بکوژەکان کە دەستبەسەر کرابوون و لەژێر چاوەدێریی پۆلیسدا بوون، ئازادکران و توانییـان بگەڕێنـەوە بـۆ ئێران. وەزیـرەکان و بەرپرسـانی دیکەی ئۆتریـش، ڕووداوەکەیان دیزەبەدەرخۆنەکرد و وەکوو گەرد وتۆزێکی بێبایەخ کردیان بەژێر فەرشەوە.

لێنا لە بەرانبەر ئەو دەسـەڵاتدارە خاوەن هێزانەدا کە دەسـتیان لەو ڕووداوەدا هەبـوو، هەسـتی بە دەستەوەسـتانی دەکـرد. بەڵام بڕوای بەشتێک هەبوو و ئەویش ئەوە بوو کە دەبێ دژکردەوەی هەبێت. بەڵام، لـە چ ڕێگایەکـەوە؟ کاتێک دایکـی کوژرابوو، ئەوتەنیا ٦ سـاڵ تەمەنی بوو. هەربۆیەش، گەورەترەکانی خێزانەکەیان ئەو ئەرکەیان وەئەسـتۆ گرتبوو. ئێسـتا ئەو خۆی لە گەورەکانی خێزانەکە بوو، دەبوو هەوڵێک بدات. پێویسـتی بـەوە هەبوو لە چۆنیەتیی دەسـتبەکاربووندا یارمەتی بدەن، نەک ئەوەی ئامۆژگاریی بکەن دەسـت لە سەردەسـت دابنێت و هیـچ نەکات! بەلای لێناوە ئـەوکارە دەبوو بە پەلە جێبەجێ بکرێت. ئەو دەبوو دەینی خۆی بەرانبەر بە عەبدولڕەحمان بەجێبێنێت. ڕەنگە بڵێن

چ دەبینێک؟

ئـەو دەبینـەی کە چارەنووس خسـتبوویە ئەسـتۆی ئـەو، نەک هیچ کەسێکی دیکە: عەبدولڕەحمان، وەسییەتنامەکەی و هەموو ئەو شتانەی لە پاش خۆی بەجێیهێشـتبوو و لێناش بە درێژایی تەمەنی لە بەشێکی گەورەیدا بەشـدار بووە و هەروەها پەیوەندیی لێنا و کوردەکان.. وەک دەڵێـن مرۆڤـەکان لە باری مـاف و کەرامەتی مرۆییـەوە وەکوو یەک لەدایک دەبن. بەڵام ڕاسـتییەکان مرۆڤ ناچار دەکەن کە بڵێت، ڕاسـتی شـتێکی دیکەیە و ئەویش ئەوەیە کە لە ئێسـتادا، مرۆڤەکان وەک یەک لەدایـک نابـن و کەرامەتـی مرۆڤـەکان، لەوانە کەرامـەت و گەورەیی کوردەکان نکۆڵی لێدەکرێت. لێنا پرسیاری لە خۆی دەکرد کە دەبێ چی بکات کە لانیکەم ئەمجارەیان دادپەروەری بەڕێوە بچێت؟

سـادقی شەرەفکەندی، جێگری دوکتور قاسـملوو، بۆخۆی سەردانی لێنای کرد. حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران لە هیچکوێ بەفەرمی نەناسـرابوو، هەربۆیـەش نەیدەتوانی هیچ هەڵوێسـتێک بگرێت. بەپێی ڕێوشـوێنی دەزگای دادی ئۆتریش، لێنا تەنیا کەس بوو کە بە شـێوەی یاسـایی دەیتوانی سـکاڵا تۆماربکات و داوای دادپەروەری بکات و لە ڕەوتـی لێکۆڵینەوەکاندا یارمەتیدەر بێت. سـادقی شـەرەفکەندی داوای لێکرد ئەو ڕۆڵە بگێڕێت.

لە ڤییـەن، پارێزەرێکی گەنج و ورە بەرز بەنێـوی مانفرێد وایدینگێر (Manferd Weidinger) پارێزەریـی لێنـای وەئەسـتۆ گـرت. وەئەسـتۆ گرتنـی پارێـزەری لـە دۆخێکـی ئەوتـۆدا و ئەنجامدانـی لێکۆڵینـەوە پێویسـتەکان دەیتوانی بـۆ پارێزەرەکە مەترسـیدار بێت. جگە لەوەش، ئەو کە شـارەزای هەموو لایەنەکانی دۆسـییەکە بـوو، هیچ هیوایەکی بـە دەسـکەوتێکی دڵخۆشـکەر نەبوو. هـەم حیزبی دێموکـرات و هەم لێنـا، هەر دووکیان خوازیـاری دادگاییکردن و سـزادانی تاوانبارەکان بوون و خوازیاری ئەوەش بوون کە دەزگای دادی ئۆتریش ڕاشکاوانە تیرۆریزمی دەوڵەتیی حکوومەتی ئیسـلامیی ئێران ئاشکار بکات. بەڵام

لە لایەکیشەوە، بکوژەکان چیدیکە «لەبەردەستدا» نەمابوون و لەلایەکی دیکەشـــەوە، حکوومەتی ئۆتریش و دێموکراســییەکانی دیکەی ڕۆژئاوا بیریــان لــە هەوڵەکانی خۆیــان دەکردەوە بۆ نزیک بوونـــەوە لە ئێران. هەربۆیەش، هیوایەک نەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، لێنا بڕیاریدا کە ناوەرۆکی تیرۆریستیی حکوومەتی ئیســلامیی ئێــران و سیاســەتە وشــترمرییەکەی وڵاتــە دێموکراتیکــە ڕۆژئاواییەکان بۆ ڕای گشــتی ئاشکرا بکات. ڕاگەیەنە نێونەتەوەییەکان و بەتایبەت ڕاگەیەنە ئۆتریشییەکان، لەم بڕگەیەدا، بەشێوەیەکی جیددی دەستبەکاربوون. بە هاوکاریی کوردەکان و داکۆکیکارانی مافی مرۆڤ، لێنا سەفەری بۆ هەموو لایەک دەکرد، پرێس کۆنفرانسی بەڕێوە دەبرد و بەدرێژایی ســاڵانێکی زۆر، لەهیچ هەوڵێک بۆ ئاگادار کردنەوەی ڕای گشتی لە ئاستی جیهاندا نەپرینگایەوە.

لەو ڕووەوە کە لێکۆڵینەوەکان بە هۆی کارشــکێنی و ئاستەنگنانەوە لە لایەن بەرزترین بەرپرســانی ئۆتریشـــەوە بەهێچکوێ نەدەگەیشــت، چەندین ســاڵی خایاند. لێنا بڕیاریدا دادخوازیی خۆی بەرێتە ئاستێکی باڵاتر و لە دیوانی باڵای ئەو وڵاتە، ســکاڵا لەسەر حکوومەتی ئۆتریش تۆمــار بکات. لــە کۆتاییدا، دیوانی باڵای ئۆتریش نەک هەر ســکاڵاکەی لــەدژی حکوومــەت ڕەت کردەوە، بەڵکوو، لەوەش زیاتر، ســزای دانی بڕی هەشتاهەزار شیلینگی ئۆتریشیشی بەنێوی تێچووی بەڕێوەچوونی دادگاییەکەی بەســەردا سەپاند. کاتێک لێنا لەبڕیارِی دیوانی باڵا ئاگادار کرایەوە، نامەیەکی بۆ دیوانی باڵای وڵات نووسی و ئاگاداری کردنەوە کە ئەگەر ناچار بکرێت ئەو تێچووە بدات، ئامادەیە وەکوو قەرزدارێکی کەمدەســت کــە توانای دانـــەوەی قەرزەکەی خۆی نییــە، بچێتەزیندان، بــەڵام ئامادە نییــە تەنانــەت «پەنابات»ێکیش بەدەزگایەکــی داد بدات کــە لایەنگری لە تیرۆریزمی دەوڵەتــی دەکات. لەو ڕۆژە بە دواوە، لێنا هەرگیز بانگ نەکرایەوە بۆ دادگا: ئۆتریشییەکان دواجار، لە ساویلکەیی خۆیان لە پەیوەندیی لەگەڵ بەتاوانبار ناساندنی لێنا تێگەیشتن.

زۆرجار مرۆڤ ئەو شتەی کە ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەری دانانێت، بەسانایی لەبیر دەکات. کەچی، مرۆڤ بە سانایی بیرەوەرییەکانی تەمەنێک ژیانی هەژارانە وپڕ لە نەهامەتی لەبیر ناکات. بەهەرحاڵ، بیرکردنەوە پەیمانێکە کە لەسەرەتای لەدایکبوونەوە دەبەسترێت. ئەگەر مرۆڤ پشت لە ڕابردووی خۆی بکات، هێزی فانتازیای خۆی خاپوور دەکات و مەیل و حەزی ژیان لەدەست دەدات و بە فەرامۆشکردنی ڕابردوو، لەڕاستیدا، هەستی مرۆڤ لەگەڵ بەتاڵی و پووچی بەرەوڕوو دەبێتەوە.

لینا پێویستی بە ١٠ ساڵ زەمەن بوو هەتا دوایین وەسیەتی عەبدولڕەحمان بەجێبهێنێت، بەڵام، «بابەتی کوشتنی قاسملوو» هێشتاش لە چاوەڕوانیی بەڕێوە چوونی دادپەروەریدایە.

■ ئەوەی ماوەتەوە بوترێت

دڵنیام خوێنەر حەزی دەکرد کتێبەکەم ڕەهەندێکی جیاوازی هەبووایە. منیش، حەزم دەکرد وا بووایە. منیش حەزم دەکرد پشتڕاستی بکەمەوە کە دەوڵەتی ئۆتریش وەکوو وڵاتێکی دیموکراتیک، سیاسەتێکی دادپەروەرانە و بێلایەنانەی بردۆتە پێش و بەچاوێکی بەرابەر ڕوانیویەتە مرۆڤەکان. بۆ من گەلێک جێی شانازی دەبوو کە بتوانم بە خوێنەر نیشان بدەم کە دنیا ئازادەکەی ئێمە بە شەهامەتەوە ڕووبەڕووی هەڕەشەکانی وڵاتێکی تیرۆریستی دەبێتەوە و ئەوەیکە دیموکراسی لە زەرەر و زیانی بازرگانی ناپرینگێتەوە، ئەویش زیانی وا کە کاتین، کەچی، لە درێژخایەندا لەباری ئەخلاقییەوە دەسکەوتی زیاتری لێ شین دەبێتەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئەمانە تەنیا ئاواتگەلێکی پیرۆز سەبارەت بە دیموکراسییەکی نوقوستانە. لە ڕاستیدا، ئەمە تەنیا، دەربڕینی هیوایەکە بە نیسبەت دۆخی دەزگای داد لە وڵاتە ئازادەکانی ئێمەدا، دەزگایەک کە سەربەخۆییەکەی لە یاسا بنچینەییەکانی ئەم وڵاتانەدا تۆمارکراوە، بەڵام لە ڕاستیدا بەرانبەر بە «بەرژەوەندیی دەوڵەت و حکوومەت»

لە ســەربەخۆیی ڕاســتەقینە بێبەشە. ســەرەڕای ئەوەش، خواستی من ڕوونکردنــەوەی هۆکارێکــە کە بووە هۆی ئەوەی مــن نەتوانم ناوەندە حکوومەتییەکانی ئۆتریش لەوە تێبگەیەنم کە ڕەچاوی دادپەروەری بکەن بە نیسبەت ئەو قوربانییە کوردانەوە کە ساڵی ١٩٨٩ کوژران. لەکاتێکدا کــە هەم ئەوانەی فەرمانی کوشــتنەکەیان دەرکردبــوو و هەم ئەوانەی ئەمرەکەیــان جێبەجێ کرد دیار و ناســراو بوون. بــەڵام، بۆ نەهامەتی، ئەو پلەبەندییانەی کە بەسەر جیهانی ئێمەدا زاڵن، بڕیاری خۆیان دابوو و ئەویش ئەوە بوو کە دەبێ دەســت لەو دۆســیەیە وەردرێت، چونکە مەترسییەکەی بەو چەشنە کەمترە و هەر وەها دەبێت گیراوەکان ئازاد بکرێن، چونکوو ڕاگرتنیان مەترسیدار دەبێت.

ڕووداوی کوشــتار لە ئاپارتمانێک لە ڤییەندا، بابەتێکی هەســتیاربوو. پێتەختــی ئۆتریــش ژێــر و ڕوو ببــوو، ڕۆژنامەنووســەکان، بریتی لە ئۆتریشــی و بیانی، لە هەموو شوێنێکەوە، بۆ ڕووماڵکردنی ڕووداوەکە بەپەلــە ڕوویان لە ڤییەن کردبــوو. بابەتەکــە وردە وردە نێونەتەوەیی دەبووەوە. عەبدولڕەحمانی قاســملوو لــە پێتەختی ئۆتریش کوژرا بوو. ئەو ڕێبەری بزووتنەوەی کورد لە کوردســتانی ئێران بوو، حیزبەکەی و پێشــمەرگەکانی ساڵانێکی زۆر بە شەهامەتەوە لە بەرانبەر بۆمباران و هێرشــە نیزامییەکانی کۆماری ئیســلامیدا ڕاوەســتا بوون. خومەینی هێشتا مابوو کە دەسەڵاتدارانی کۆماری ئیسلامی پلانیان بۆ سڕینەوەی فیزیکیی سکرتێی گشتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران داڕشتبوو. دووجــار لەکوردســتان، پلانەکەیــان بــۆ لەناوبردنــی عەبدولڕەحمان شکســتی هێنابوو. بەڵام ئەوان لە ڤییەن لە پلانەکەیاندا ســەرکەوتن و دیارە بە شــێوازی دیپلۆماتیک دەســەڵاتدارانی ئۆتریشیان تێگەیاند کە دەبێ شــارۆمەندە ئێرانییــەکان [٥] ئازاد بکەن و لێکۆڵینەوە ســەبارەت

٥. مەبەســت ئــەو دوو بەکرێگیراوەیــە کە بەرپرســانی کۆماری ئیســلامی بە مەبەســتی تیرۆرەکە بەڕێی کردبوون و لە لایەن پۆلیسی ئۆتریشەوە دەستبەسەر کرابوون و لەژێر چاوەدێرییدا بوون.

بەو دۆسـیـیەیە بەلاڕێدا بـەرن، ئەگینا لەو ڕووەوە کە ئۆتریشـییەکان نەیان‌توانیوە گیانی شـارۆمەندانی ئێرانی [6] لە خاکی خۆیاندا بپارێزن، ئێرانیـش بەرانبـەر بـە پاراسـتنی گیانی شـارۆمەندانی ئۆتریشـی لە خاکی خۆیدا بەرپرسـیار نابێت. واتـە کەڵک وەرگرتن لە پەیوەندییەکی دیپلۆماتیکـی قێـزەون و ئەهریمەنـی، لەوپـەڕی بێ‌ویژدانیدا. چەشـنە دیپلۆماسـییەک کە مەلاکان لە بەکارهێنانیدا وەسـتان. بەو حاڵەشەوە، ئـەو هەڕەشـانە بەتەنیا خۆیان، بۆ دژوارکردنی پرسـەکەی ئێمە بەس نەبوو.

لـەو سـەردەمەدا، وڵاتانێک کـە پەیوەندیی دیپلۆماتیـک و هەندێ لە سات‌وسەودا بازرگانییەکانی خۆیان لەگەڵ ئێران[7] ڕاگرتبوو، سەرلەنوێ خەریکـی پەیوەنـدی سـازکردنەوە لەگەڵ ئێـران بـوون. قبووڵکردنی ئەوەیکە کوشـتنی کوردەکان لە ڤییـەن ڕێگربێت لەو نزیک بوونەوەیە، بـۆ ئەو وڵاتانە و لەگەڵ پرۆژەکانیان، گونجـاو نەبوو. لە بەرانبەر ئەو هەڕەشانەدا و لەئارادابوونی هەندێ مەبەستی نێونەتەوەییش، دەوڵەتی ئۆتریـش ملکەچ بوو، بکوژەکان ئازادکران و لێکۆڵینەوەکان سـەبارەت بەو تاوانە وەلانران. پێی بەرژەوەندیی حکوومەت هاتبووە ئاراوە.

کاتێـک گەنج بووم، دێموکراسـی بـەلای منەوە، سـەمبۆلێک بوو لە بەرابەریـی مرۆڤەکان لەبەرانبەر یاسـادا، واتە بنیاتنانی هاوبەشـییەک لـە بیرکردنـەوەی چالاک و دادپەروەرانە لەنێوان کەسـی خاوەن ڕۆڵ و دادپەروەریـی حکوومەتیـدا.. مـن هێشـتاش بـڕوام بـەوە هەیە کە دێموکراسی دەبێ ڕەچاوی ئەو بەهاگەلە بکات، بەڵام بە سەرنجدان بەو شتەی لەماوەی ژیانمدا فێری بووم، باوڕەکانم تا ڕادەیەک گۆڕدراون. دەگوترێت کە دەبێ ڕابردوو لەبیر بکەیت و گرینگی بە داهاتوو بدەیت.

٦. بەجۆرێـک دەوڵەتـی ئۆتریـش بەوە تاوانبار دەکـەن کە نەیان توانیوە گیانی ئـەو دوو کوردە لە خاکی خۆیاندا بپارێزن.

٧. پـاش بـە بارمتـە گرتنـی ئەندامانـی سـەفارەتی ئامریکا لە تـاران، کە لـەو سـەردەمەدا چیدیکە ئازاد کرابوون.

لــە یەکەم ڕوانیندا، بۆچوونێکی جوانە! بەڵام بەڕوونی دەردەکەوێت کە ئەم بیرۆکەیە، دێر یا زوو، درز دەبات، باڵەکانی ماندوو دەبن و دواجار جگە لە چوارچێوەیەکی بەتاڵ و زۆرجار مەترســیدار، هیچی دیکەی لێ نامێنێتــەوە (ئایا لەبیرکردنی ڕابردوو بۆ ئەو کەســانەی کە ویژدانێکی ناپاکیان هەیە، دەبێتە هۆی ســووک بوونی باری سەر شانیان؟) زەینی مــرۆڤ وەکوو گــۆی زەوی، بەهایەکی بۆ خەلق دەکات کە ڕابردوو بە ئێستاوە و ئێستاش بە داهاتووەوە گرێ دەداتەوە و بەمشێوەیە دەبێتە میراتگــری ئەزموونگەلێک کە مرۆڤ بەدرێژایــی ژیانی تێیپەڕاندوون. زەینــی ئێمەش پارێــزەری ڕابردوویەکە کە بایەخی پاراســتنی هەیە و جگە لەوش ڕۆڵی هەڵسەنگاندنی ژیانی ئێمە لەم جیهانەدا دەگێڕێ.

جگــە لــەوەش، نابێت ئــەوەش لەبیــر بکەین کە مرۆڤ حــەز دەکات لەو شــتەی بەســەری دێت، ئــاگادار بکریتەوە و تەنانــەت چاوەڕوانی ڕوونبوونەوەیەتــی و ئەگینــا، مــرۆڤ خــۆی لــە بازنــەی بۆشــایی زانیارییەکانــدا دەبینێتــەوە و من تەنیا توانیم گۆشــەیەکی بچووک لەو پەردەیە هەڵبدەمەوە کە ڕاستیی شکست هێنانی هەوڵەکانم بە مەبەستی ناچارکردنی دەزگای داد بە گوتنی ڕاســتییەکان، لە پشــتیەوە حەشــار درابوو. دێموکراســیەکانی ئێمــە، دادپەروەرییــەک دەکار دەکەن کە لە ڕێی ســنوورەکان، یاســا بازرگانییەکان، هەڵبژاردنــی داهاتوو و ترس بەرتەســک کراوەتــەوە. لەگــەڵ ئەوەشــدا و ســەرەڕای هەمــوو ئــەم ڕاستییانە، ئاواتەخوازم ڕۆژێک دابێت کە ئەم کردەوانەی ئەمڕۆ بەسەر دێموکراســییەکانی ئێمەدا زاڵن، هەڵوەشــێنەوە و کۆن بن و کەس لێیان تێنــەگات و دەرکیان پێنەکەن و ئەوســەردەمە نوێیەی دەســتپێدەکات ئاوڕ لەو پاکانە حیسابە مێژووییانەی ئێمە بداتەوە.

هــەر چەنــد کــە لــە دوو دەیەی ڕابــردوودا، کوردســتان کــە لەناو ســنوورەکانی چوار وڵاتدا هەڵکەوتووە، لە هەندێ لایەنەوە گۆڕدراوە، بەلام هێشــتاش لەژێر ئەزیەت و ئازاردایــە و مەخابن، نەتەوەی کورد هێشــتاش لــەو مافــە نەتەوەییانــەی کە مافــی بێئەملاوئــەولای هەر

نەتەوەیەکە، بێبەشن. تەنیا کوردستانی عەراق لە چوار چێوەی دەوڵەتی عەراقدا نیمچە خودموختارییەکی هەیە و هەرچەند هێشتا هەموو کێشەکانیان چارەسەر نەکراوە و عەراق و کوردستان بە قۆناغێکی بەینابەیندا تێدەپەڕن، قۆناغێک کە هێشتا زۆرشت ماوە تێیدا کە پێویستە فێری بن وئەنجامی بدەن، بەڵام لە بوارەگرینگەکاندا پێشکەوتنی بەرچاو دەبینرێت.

لەلای ڕۆژهەڵاتەوە، عەراق لەگەڵ ئێران هاوسنوورە. حکوومەتی ئیسلامی بە کۆمەڵکوژیی ڕێژەیەکی بەرچاو لە دژبەرەکانی لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵات، ئێستاشی لەگەڵ بێت بۆ لای «خاشەبڕکردنی یەکجاریی جیابیران» هەنگاو هەڵدەگرێ.

عەبدولڕەحمان یەکێک لە قوربانییەکانی ئەم ڕێژیمە بوو. بەڵام، نموونەی عەبدولڕەحمان لە نموونەکانی دیکە جیاوازبوو، چونکە جگە لە عەبدولڕەحمان، هیچکام لە دژبەرەکانی ڕێژیم لەسەر مێزی دانوستان بەمەبەستی ئاشتی لە نێوان دوولایەنی دژبەیەکدا نەکوژراون و ئەمەیان کردەوەیەکی دیکەی ئەو ڕێژیمەیە کە دەبێ لە کارنامەی کردەوە دزێوەکانی لە کوشتاری دژبەرەکانی خۆیدا زیاد بکرێت.

ئێمە کە لەو ڕۆژانە ماوینەتەوە، لەگەڵ ڕابردوویەک کە تێنەپەڕیوە و تەژییە لە بیرەوەرییە قورسەکان، چلۆن ڕووبەڕوودەبینەوە؟ واتە، ئێمەمانان کە شاهێدەکانی ڕابردوویەکی تەژی لە شۆڕش، ململانێ، خەیانەت، دڵسارد بوونەوە و هەروەها سەرکەوتن و شادکامی...و تراژێدی بووین، چلۆن بەرەو ڕووی ئەو ڕابردووە دەبینەوە؟ لێرەدایە کە بابەتی ژان و خەفەت، ملکەچ بوون و تێگەیشتن لەوەیکە دەبێ چیبکرێت بۆ ئەوەی یاد و بیرەوەریی گیانبەختکردووەکان بەزیندوویی بمێنێتەوە، دەستبەجێ دێتە ئاراوە. چەشنێک لە گفت وگۆ و وتەی خەیاڵاوی بەڵام ڕاستەقینە دێتە کایەوە. تراژێدیگەلێک کە ڕوو دەدەن، ئەگەر پەیوەندیی بە خۆتانەوە هەبێ و کاریگەریتان لەسەر دابنێت، نە دەتوانن فەرامۆشی بکەن و نە دەتوانن لە مێشکی خۆتان

بیسڕنەوە.

ئـەو بابەتانە بەدەورتاندا پەرژینێک دروسـت دەکەن کە قورسـایی دەخاتـە سەرجەسـتەتان و هەنگاوەکانتـان شـل دەکاتـەوە و لەپێتان دەخات. ئەوانە ڕێگەتان پێدەدەن کە بژین و لەهەمان کاتیشدا، ناچارتان بکـەن پرسـیار لە خۆتـان بکەن و بەشـوێن ڕێگـەی دەربـاز بووندا بگەڕێـن و ئەوەی کـە چلۆن دەربازبـن؟ و ئـەوەش داوە. هەڵبژاردن و دەرچوون لەو بازنەیەش لەئەسـتۆی ئێوەدایە. سـڕینەوەی بیرگە و فەرامۆشکردنی هەموو بابەتەکان و دۆزینەوەی ئارامیی هزری، هەرگیز نایەتـە دی. مـرۆڤ هەرگیز نەبـوون و لەدەسـتدانی یەکجاری قبووڵ نـاکات. گیانبەختکـردووەکان پێویسـتە بەدەورتانەوە و لـە ناختاندا لـە ژان بـەردەوام بن و بژین و ئەوەش خەمێکی سـاڕێژ نەبووەوەیە، ڕابردوویەکە کە بیرگە ناتوانێت خۆی لێ دەرباز بکات. ڕاسـتییەکە کە لە ژیانی مرۆڤدا نەخش دەبەسـتێت و دەبێ وەکوو ڕاستییەکی ئەبەدی و نەسـڕاوە قبووڵ بکرێت. خەباتێکی هەمیشـەییە کە ڕابردوو بەسـەر ئێستادا دەیسەپێنێ.

تێپـەڕ بوونـی زەمەن پێشـی پـێ ناگیردرێـت. لەژیانـی بنەماڵەیی عەبدولڕەحماندا ئاڵوگۆڕی خۆش و شـادی هێنەر ڕوویداوە. نەوەکانی گـەورە بـوون و دوو کچی بچووک کـە دەبنە نەتیجـەی ئێمە، لەدایک بوون.

بنەماڵە پەرە دەسێنێت و ئەندامەکانی لە شارەکانی ستۆکهۆڵم، پراگ، لەنـدەن و پاریس، بتهـەوێ یان نەتهەوێ، خۆیان لەگەڵ مێژوو و ژیان دەگونجێنێن.

خودی منیش پاش تراژێدییەکە، تەنیا یەکجار چوومەوە بۆ کوردستان. سەفەرەکەم بۆ کوردستان پێش شەڕی دووهەمی خەلیج و سەقامگیریی «ناوچـەی دژە فڕین» لە کوردسـتان بوو. لەوێ، لـە نۆڤامبری ١٩٨٩، نوێنەرانـی حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێرانم لە بنکەی سـەرەکی حیـزب بینـی. پاش ئەوە، وێڕای دڵنیا کردنـەوە و گەرەنتی دان لەلایەن

سـادق شەرەفکەندی، سکرتێری گشـتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران (جێگرەوەی عەبدولڕەحمان قاسـملوو) و پشـتیوانیی ڕێبەرایەتیی حیـزب و وەرگرتنـی بەڵێنیـی دابینکردنـی پێداویسـتیی زەروور بـۆ دەسـتپێکردنەوەی کارەکـەم و هەوڵدان بۆ ڕوونکردنـەوەی کردەوەی تیرۆریسـتیی لـەدژی عەبدلڕەحمان قاسـملوو و عەبدوڵڵا قادری ئازەر (کەپێشترلە ڤییەن دەستم پێکردبوو)، گەڕامەوە بۆ پاریس.

منیـش بەڵێنمـدا کە لـە هەوڵەکانم بـۆ ئاگادارکردنەوەی ڕای گشـتی نێونەتەوەیـی لەم کردەوە جینایەتکارانەیە بەردەوام بم. هاوکات، ئەرکی جێبەجێ کردنی وەسیەتنامەکەی عەبدەلڕەحمانیش خرایە ئەستۆی من.

پاش سـێ ساڵ، واتە ساڵی ١٩٩٢، دیوانی باڵای ئۆتریش، سکاڵاکانی منـی لە دژی حکوومەتـی ئۆتریش ڕەت کردەوە و کۆتایی بە پابەندییە یاسـاییەکانی ئێمـە هێنا. پاش ئـەوەش، من سـاڵانێکی زۆر هەوڵەکانم لەسەر ڕای گشتی چڕ کردەوە و بەردەوام بووم لە ئاگادار کردنەوەی ڕای گشـتی لـە چۆنیەتی «کارەسـاتی ڤییەن». هەر چەند کە شـوێنی ژیانی خۆمم لە پاریس بەجێهێشـتبوو و بە مەبەسـتی ئارامبوونەوەی فیکر و گەڕانەوەی پارسـەنگی ڕۆحیم چووم بۆ گوندێک لە باشـووری فەرانسە، دیسانەوەش بە مەبەستی لەقاودانی ئەو کارەساتەی کە ساڵی ١٩٨٩ ڕوویـدا بوو، سـەفەرم دەکرد. لەو گوندە، تەنانەت سـەگێکم بە جەسـتەیەکی مامناوەندییـەوە هەڵبژارد کە بە درێژایی سـاڵانێک و تا ئەوکاتەی بەهۆی پیرییەوە مرد، بوو بە هاوڕێم.

زەمەن تێدەپەڕی و بیرۆکەی پەیوەسـتبوون بە بەشێک لە ئەندامانی بنەماڵەکەم کە لە پراگ، شاری زێدی خۆم دەژیان، بەمێشکمدا هات. هەر بۆیەش، چووم بۆ پراگ و لە نیشـتمانی پێشـووی خۆم کە لەو کاتەدا کۆمارێکـی ئازاد بوو و ببووە ئەندامی یەکیەتی ئۆرووپا، گیرسـامەوە. بەڵام، بەرە بەرە هەستی غەریبی و تەریک کەوتنەوە بەسەرمدا زاڵبوو و سـەرلەنوێ مێشـکم ئارامیـی خۆی لەدەسـت دەدایـەوە.. بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ فەرانسـە و دواجار لـە دەور وبەری پاریس خانوویەکم

دۆزییەوە و تێیدا دانیشــتم. ئێستا شارۆمەندێکی فەرانسەویم و هەر لە فەرانسەش، پارەکە کتێبی بەسەرهاتی ژیانم چاپ و بڵاو کرایەوە.

ئەگــەر عەبدولڕەحمــان بمایە، چەندمانگی دیکــە، تەمەنی دەبووە ٨٢ ساڵ. هەندێجار، هەوڵدەدەم ئەو کاریگەریانەی کە ئەو دەیتوانی لەسەر ڕووداوەکانی پاش مەرگی لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دایبنێ، بهێنمە پێش چاوی خۆم و ئەوەیکە کاریگەریی ئەو لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان دەکــرا چ جیاوازییەکی هەبوایــە. چونکە بە دڵنیاییــەوە جیاوازیگەلێکی دەبوو. عەبدولڕەحمان دیپلۆماتێکی کارامە و سیاسەتمەدارێکی ڕادیکاڵ بوو، دیارە بەدوور لەخەون و خەیاڵ و دەوەهم کەوتن .

بێگومان، لە ناو ئەو بەرانەی پاش مەرگی عەبدولڕەحمان لەدایکبوون، کەســانێک هــەن کە میراتگری کــردەوە و کاریگەرییەکانی ئەو بن و بە تێپەڕینی زەمەن، ئارمانجەکانی ئەو، بە ســەرنجدان بە پێویســتییەکانی کۆمەڵگەیەکی لەحاڵی ئاڵوگۆڕدا دەبەنە پێش و پەرەی پێدەدەن.

پاش تێپەڕینــی دوو دەیە، گەلی کــورد، عەبدولڕەحمانیان فەرامۆش نەکردووە. ئەو بووە بە ســیمبۆلی خەباتی گەلەکەی لەڕەوتی هاتنەدی مــاف و ئازادییەکانیــان، خەباتێک کە هێشــتاش بەردەوامــە و هەموو ســاڵێ، لەگەڵ ســاڵوەگەڕی مەرگە تەژی لە تونــد و تیژییەکەی، گەلی کورد یادی عەبدولڕەحمان بەرز ڕادەگرێت: بازاڕییەکان دووکانەکانیان دادەخەن،گڵۆپــی ماڵەکانیان دەکوژێننەوە و کوردســتان نوقمی تاریکی دەبێت، چونکە کاتی ئەوە هاتووە کە بیر لەو کەســە بکەنەوە کە گیانی خۆی فیدای خەبات لە پێناوی کوردستاندا کرد.

لــەدەرەوەی وڵاتیش، وەکوو ناوخۆی کوردســتان، ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران و دۆستانی گەلی کورد، لەکۆڕیادەکانی بیرئانینــەوە و ڕێزگرتــن لــە بیرەوەرییەکانــیدا، کۆدەبنــەوە و ڕێزی لێدەگرن. نا، عەبدولڕەحمان لەبیر نەکراوە.

هێلێن کرۆلیش ـ قاسملوو

ژوئییەی ٢٠١٢

## پاشکۆ

- عەبدولڕەحمان لە ژیاندا
- نووسینی: مارک کراوتس (Marc Kravetz)
- ڕۆژنامەنووس لە ڕۆژنامەی لیبراسیۆن

لە ڕێکەوتی ١٣ی ژوئییەی ١٩٨٩، عەبدولڕەحمان قاسملوو لە ڤییەن کوژرا. سکرتێری گشتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ڕۆژێک لەوەبەر، سەفەری بۆ پێتەختی ئۆتریش کردبوو بۆ ئەوەی لەگەڵ نوێنەرانی کۆماری ئیسلامی، خولێکی نوێ لەو دانوستانە نهێنییانەی کە ٦ مانگ لەوە پێش بێئەنجام مابوونەوە، دەست پێبکەنەوە. وتووێژەکانی پێشوو بێئەنجام بوون. عەبدولڕەحمان دەیگوت کە ڕێژیمی تاران، لەگەڵ ئەوەدا کە ئامادەبوو هەندێ ئاڵوگۆڕ لە بەرژەوەندیی کوردەکان پێکبهێنێت، بەڵام وەکوو پێشوو سوور و پێداگربوو لەسەر قبووڵ نەکردنی خودموختاریی کوردستان.

بەڵام، دۆخەکە گۆڕدرابوو. ئایەتوڵڵا خومەینی مردبوو.

پیاوی دەسەڵاتداری نوێی ئێران، هاشمیی ڕەفسنجانی، وەکوو پیاوێکی واقیعبین و کردەوەخواز ناسرابوو. ئەو بوو کە لە سەپاندنی بڕیاڕی کۆتایی هێنان بەشەڕی هەشت ساڵە لەگەڵ عەراق بەسەر خومەینیدا،

ڕۆڵێکی دیاریکەری گێڕابوو.

وڵاتــی ئێران دۆخێکی ئاڵۆزی هەبــوو و ئەوەش بە تەنیاخۆی بەس بوو بۆ ئەوەیکە ڕێژیم، بەدوای ڕێگاچارەیەکدا بگەڕێت بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ لە گەڵ کوردەکان.

عەبدولڕەحمانیــش هــاوکات کــە بزووتنــەوەی خۆڕاگریــی کورد لە دژی «پاســدارانی شــۆڕش»ی ڕێبــەری دەکرد، بەدرێژایی ١٠ ســاڵ خۆڕاگری هەمیشــە بەدوای چارەســەری بابەتەکە لــە ڕێی دیالۆگەوە بوو، ڕەنگە بیری لەوە کردۆتەوە کە ئەمجارەیان بارودۆخەکە لەبارترە و چوارەمین بڕیاڕی دانیشــتنەکەیان، دواجار دەســکەوتێکی لێ شــین دەبێت. بە هەرحاڵ، ئەمە ئەو شتە بوو کە ئەو چاوەڕوانی دەکرد.

لــە نێــوان کەســانی دەوروبــەری خــۆی و تەنانــەت نزیکتریــن هاوکارەکانیشی‌دا، کەسانێکی زۆر کەم هەبوون کە ئاگایان لە مەبەستی ســەفەری ئەمجــارەی عەبدولڕەحمان بێت. زۆربــەی ئەوانە کاتێک لەو بابەتە ئاگادار بوونەوە کە ئیتر کار لە کار ترازا بوو و هەموو دەیانزانی کە نێردراوانی ڕێژیمی تاران کە بە پاســپۆرتی دیپلۆماتیکەوە هاتبوون، ئیزنــی وتووێژیــان نەبــوو، بەڵکــوو ئیزنی کوشــتنیان هەبــوو و ئەمە ڕاستییەکی سادە و لەهەمان‌کاتدا گەلێک بە ئازار بوو.

چەنــد حەوتوویــەک پێش لــەوە، لە پاریــس، عەبدولڕەحمــان داوای لێکــردم پێکێــک شــەراب پێکــەوە بخۆینــەوە. زیاتر لە ســاڵێک دەبوو یەکترمان نەبینیبوو. بەدەماخ و کەیف‌خۆش هاتەبەرچاوم. تازە لە تاران گەڕابوومەوە. من بە نوێنەرایەتیی ڕۆژنامەی لیبێراســیۆن بە مەبەستی بەدواداچوونــی پرۆگرامەکانــی بەڕێکردن و ئەســپەردەکردنی تەرمی خومەینــی چووبــووم بۆ تاران. هەر ئەم بابەتــەش یەکێک لەو بابەتانە بوو کە باســمان لێوە کرد، عەبدولڕەحمان گوتی: «تۆکاتی گەڕانەوەی بۆتاران لەوێ ئامادە بوویت و ئێستاش شاهێدی ڕۆیشتنەکەی بوویت». وتەیەکی کورت بوو، بەڵام بەجوانی مەبەستەکەی دەگەیاند.

منیش وەبیرم هێنایەوە کە لە ناســینی ئــەودا مەدیوونی خومەینی و

ئەو شەڕەم کە خومەینی لە دژی کوردەکانی ئێران وەڕێیخست. ئەویش وێــڕای پشتڕاســتکردنەوەی، وەبیری هێنامەوە کــە: «کەواتە ئێمە ١٠ ســاڵە یەکتر دەناســین». پاشان باســی بیرەوەرییەکانی مەهاباد و ئەو گوندەمان کرد کە لەوێ یەکترمان ناســیبوو. لەکاتی قسە کردنیدا گوتی: «تۆ بڕیارت دابوو کتێبێک بنووســیت» منیش پرســیارم کرد: «کتێبێک سەبارەت بە تۆ؟ ئەگەر سەبارەت بە تۆ بێت، زۆر باشە».

وەڵامــی دایــەوە: «نــا، ســەرنجی هیچکــەس ڕاناکێشــێت. بــەڵام، ئەگەر ســەبارەت بە مێژووی کــورد بێت، دەتوانم لەو بــارەوە بابەتی سەرنجڕاکێش بخەمە بەردەستت». پاشان گوتی کە بە نیازە ماوەیەک، لە هاویندا، ســەرلەنوێ بگەڕێتــەوە بۆ پاریس. پاشــان، بەدەم ئەوەوە کە ئامادەی ڕۆیشــتن بۆ دیدارێکــی دیکە دەبوو، گوتی: «بیر لەو کتێبە بکەرەوە».

لــە نێوان گفتوگۆکەدا، پرســیارم لــە عەبدولڕەحمان کــرد کە ئایا بە بۆچوونــی ئەو، مەرگــی خومەینی دەتوانێ دەســپێکی ئاڵوگۆڕ لەئێران بێــت، لە بەرژەوەندیی کوردەکان؟ ئەو زۆر بەکورتی وەڵامی دایەوە و گوتی: «دۆخێکی نوێ هاتۆتە ئارا، بەڵام دەســەڵات هێشتاش بە دەست ئەو کەسانەوەیە، دەبێت هەندێ دان بە خۆماندا بگرین، بزانین چی ڕوو دەدات» و ئێمە، باســی زۆر شــتی دیکەشمان کرد. بەڵام نازانم کە ئایا لەو کاتەدا بڕیاری دانیشتنەکەی ڤییەن درابوو یان نە. بەڵام هەر چۆنێک بێت، عەبدولڕەحمان باســی ئەگەری دەست پێکردنەوەی دانوستانەکان لەگەڵ نوێنەرانی ڕێژیمی بەلای منەوە نەکرد. دیارە دیدارەکەی ئێمەش دیدارێکــی کاری نەبــوو. بۆ باســێکی جیددی، بڕیار بوو لە ســەفەری داهاتوویدا بۆ پاریس، پێکەوە دابنیشــین و بەداخەوە، من نەمدەزانی کە ئــەوە دوا دیدارمان دەبێت و بــە ماوەیەکی کورت پاش ئەوە، لە ڤییەن سەبارەت بە کوشتنەکەی لێکۆڵینەوە دەکەم.

ئەوقاســملوویەی کە من ناســیم، ســەر لە نوێ لە گێڕانەوە کاریگەر و دروســتەکەی هێلین کرۆلیشدا، دۆزیمەوە. بێگومان لە نێوان هەموو

شاهێدەکان‌دا، هێلێن کە خۆشی و ناخۆشی و سارد و گەرمی ڕۆژگاری لــە گــەڵ تێپەڕانــدووە، پلەی یەکــەم و باڵاترین پێگەی هەیە. لە ســای هێلێن‌دا، ســەرەڕای ڕێبەرێکی سیاســی و نیزامی کە من ناســیبووم و لەڕاســتیدا لەو بوارەشــدا شــتێکی ئەوتــۆم نەدەزانی، لەگــەڵ ڕواڵەتی ڕاســتەقینە و کەسایەتیی قاسملوو ئاشــنا بووم. عەبدولڕەحمان کاتێک ســەبارەت بە ئارمانجــی کوردەکان دەدوا، هیــلاک نەدەبوو. لە ماوەی ١٠ ســاڵدا کــە من ئەوم ناســی، زۆرجاران هەڵکــەوت و هەر جارەش ســەبارەت بە بابەت و بوارە جیاوازەکان کە جێی سەرنجی ئەو بوون، وەک فەلســەفە، ئەدەبیات، شــیعر و شەرابی فەرانسە قسەی دەکرد، بە ڕاستی مامۆستا و شارەزا بوو.

بەڵام لە پەیوەندی لەگەڵ ژیانە شەخســییەکەی، بەگشــتی مرۆڤێکی نهێنی‌پارێز بوو و ڕاســتییەکەی ئەوەیە کــە منیش هەرگیز لەو بوارەدا پرســیارم لێ نەکرد. پاش تێپەڕینی زیاتر لە بیست ساڵ بەسەر مەرگە تراژیکەکەیدا، لە کتێبەکەی هێلێن کرۆلیشدا، هەمان قاسملوو دەدۆزمەوە کە زیندوو بوو و ماڵئاواییمان لە یەکتر کردبوو.

لێرەدا بە پێویســتی دەزانم سوپاسێکی زۆر لە ڕۆژنامەی لیبراسیۆن بکەم کە لەو کاتەدا دەرفەتی پێویستی بە من دا کە لە ڤییەن بمێنمەوە و لێکۆڵینەوە بکەم و پاش ئەوەش، لاپەڕەی پێویســتیان بۆ ڕەچاو کردم. بێگومان ئەوەی من کردم لێکۆڵینەوەیەکی ڕۆژنامەنووســی بوو، بەڵام هــاوکات بەجێهێنانــەوەی ئەو پــەڕی ڕێزم بوو بەرانبــەر بە یەکێک لە بلیمەت‌ترینــی ئەو مرۆڤانەی لە ماوەی کاری ڕۆژنامەنووســیی خۆمدا ناســیبێتم و من خۆم بە ئەمەکداری دەزانی. من لەگەڵ عەبدولڕەحمان و لە ســای ئەودا کوردەکانم ناســی، لەگەڵ توانا بێ‌هاوتاکانی ئەم گەلە لە بواری خۆڕاگری و عەشــقەکەیان بۆ بەئازادی ژیان ئاشــنا بووم و لەوەش باڵاتر، ڕێبەرێکی سیاســیم ناسی کە نموونەی لەسەر ئەم گۆی زەوییــە کەمە، هەربۆیەش حەزدەکەم ئاماژە بە هەندێ لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی بکەم.

هەموو بە «دوکتور» بانگیان دەکرد. دەبێ دان بەوەدا بنێم کە منیش، کاتێـک بۆ یەکەمینجار دوکتـور عەبدولڕەحمانم لـە ژووری کارەکەی خـۆی لـە مەهاباد بینی، لـەڕووی نیاز پاکییەوە پێموابـوو کە ڕێبەری حیزبـی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێـران لـە ژیانی شەخسـیی خۆیدا پزیشـکە. بـەڵام زۆر زوو تێگەیشـتم کە ئەو پلەی دوکتـورای هەیە لە بـواری ئابووری و لقوپۆپەکانیدا. دیارە لەو بـارەوە بەتەنێ نەبووم، بەڵکوو ئەمکردەوە سـاویلکانەیەی من، دەرخەری ڕادەی ئەو بێئاگاییە بوو کە لەو کاتەدا بە زۆری لە هەموو ڕۆژنامەکانی ئێمەدا سەبارەت بە کوردەکان دەبیندرا (لێرەدا نامەوێ پاکانە بۆ خۆم بکەم و ئەو نەزانیی و بێئاگاییە سـەبارەت بە بابەتگەلێکی لەودەسـتە، بە خەمساردییەکی بـاو لە ڕاگەیەنـە گەورەکانی ئێمەدا تۆختر دەبـووەوە و زۆرجاران لە ژێرنێـوی بابەتگەلێکـی ئاڵـۆز، بۆخەڵک شـی دەکرایەوە. لـە زاراوە و دەسـتەواژەیەکی بێشەرمانەی دەستەی نووسەرانەکاندا دەیانگوت کە ئەوبابەتە بۆ «فرۆشتن» نابێت.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئەگـەر لـە ڕوانگەی ئێرانـەوە سـەیری بابەتەکە بکەیـن، بابەتـەکان هەندێ جیـاواز دەبن. لە هاوینـی ١٩٧٩دا، نزیکەی ٦ مانـگ پاش گەڕانـەوەی خومەینی بۆ وڵات، کـوردەکان لە پڕ بوونە گەرمەباسی ڕۆژ. عەبدولڕەحمانی قاسملوو بۆ نوێنەرایەتیی «مەجلیسی خوبرەگان» هەڵبژێردرابوو، کە لە بنەڕەتدا بڕیار بوو یاسای بنەڕەتیی وڵات داڕێژنـەوە. نوێنەری ناوچەی کوردسـتان تاکـە نوێنەری لائیکی هەڵبژێردراو بوو. ئەو بەهۆکارگەلی جیددی وەک ئەمین نەبوونی گیانی لە تاران، پێی باشـتر بوو لە دانیشتنی کرانەوەی مەجلیسی خوبرەگاندا بەشـداریی نـەکات. لێکدانەوەکـەی ئـەو دروسـت بـوو. خومەینی لە بـەر چاوی ڕای گشـتی داخ و کەسـەری خۆی دەربـڕی و لەبەرانبەر کامێراکاندا گوتی: «بەداخەوەم کە نەهات! ئەگەر بهاتایە، دەستبەسەرم دەکرد و دەسـتبەجێ دەمدا تیربارانی بکەن». ئەم وتانە، وتەی پووچ و بێبنەما نەبوون و هیچکەسیش نەیدەتوانی گومانی لێ بکات.

لەو کاتەدا، ڕۆژێک نەبوو کە مرۆڤگەلێکی زۆر پاش دادگایی کردنێکی چەند خولەکی و تەنانەت بەبێدادگایی کردنیش، تیرباران نەکرێن.

ئەم کردەوە، هاوکات، هێما و سیگناڵی دەسپێکی هێرشێکی هەمەلایەنە لە دژی خەڵکی کوردستان بوو و نووکی ڕمبەکەش ڕووی لە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و ڕێبەرەکەی بوو. خومەینی بە کەڵک وەرگرتن لەنێوی خودا، ئەوانی وەکوو دوژمنی پلە یەکی شۆڕش ڕاگەیاند بوو. لە نێوان هەواڵە ئاساییەکانی ئەو هاوینەدا، دواجار هەواڵێکی جیددی هاتبووە ئاراوە. ڕێژەیەکی کەم لە ڕۆژنامەنووسەکان و نێردراوە تایبەتەکان کە هێشتاش لە تاران مابوونەوە، بە پەلە و بە برە پارەیەکی سەرسووڕ هێنەر، تاکسییان دەگرت و بەرەو کوردستان دەچوون. بەڵام لەو ڕووەوە کە بەکرێ گرتنی تاکسی بۆ بەشیماڵیی ئەو ڕۆژنامەیەی من کارم بۆ دەکردن، نەگونجاو بوو، بڕیارمدا بە پاسی نەفەر هەڵگری شەوانە، کە هەموو ڕۆژێک لە نێوان مەهاباد و تاراندا هاتوچۆی دەکرد، سەفەر بکەم و هەر ئەوەش بووە شانسێک بۆ من.

هێزەکانی ئەرتەش و پاسدارەکان، ئۆتۆمبیلی ڕۆژنامەنووسەکانیان لە پشت وێستگەکانی پشکنینەوە ڕاگرتبوو. پاسدارەکان کە لە ڕاستیدا میلیشیاکانی ڕێژیمە نوێیەکە بوون، بە هێرش کردنەسەر کوردستان لە ڕاستیدا یەکەمین ڕاهێنانی جەنگیی خۆیانیان ئەزموون دەکرد. بە هاوکارەکانی منیان گوتبوو کە لەبەر «پاراستنی گیانیان» چوونە ژوورەوەیان بۆ ناوچەکە یاساغ کراوە. کەسیش نەیزانی کە ڕۆژنامەنوسێکی دیکە بە پاسی نەفەرهەڵگر بەرەو کوردستان بارگەی تێکناوە.

کاتێک پاسەکەی ئێمە گەیشتە وێستگەکە، لەلایەن پیاوە یۆنیفۆڕم پۆشەکانەوە کۆنترۆڵ کرا. بە منیان نەزانی و بەم چەشنە، پاش ١٤ کاتژمێر سەفەر، بەرەبەیانێکی ساماڵ گەیشتمە مەهاباد. سەرەڕای ئەو هەڕەشە دوژمنکارانانەی لە تارانەوە دەهاتە بەرگوێ و لەحاڵێکدا کە

لەمـــەودای چەند کیلۆمیتـــردا، لە لای ڕۆژهەڵاتی شـــارەکە و لەودیوی گردەکانـــەوە، هێزەکانـــی ڕێژیم تەیـــار بە چەکی قـــورس کۆببوونەوە، مەهاباد بەشـــێوەیەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر سیمای شارێکی هێمن و بێدەنگی هەبوو.

جگـــە لـــە ژمارەیەک پێشـــمەرگە کە چەکـــی کڵاشـــینکۆفیان پێبوو و لێرەولەوێ سەرقاڵی پاراستنی هەندێ بینا بوون و چەند قەبزەیەک تۆپی هەوایی کە سیرەیان لە ئاسمانێکی بەتاڵ گرتبووەوە، هیچ جموجۆڵێکی نیزامی بەرچاو نەدەکەوت.

لێرە، هیچ شتێک لە لوبنان و جێگر بوونی میلیشیاکانی ئەو شارە، کە بۆ من حوکمی سەرچاوەی فیکریی ڕێفرێنسی هەبوو، نەدەچوو. لەحاڵێکدا کە دەیانگوت ڕێژەی چەکدارانی حیزبی دێموکراتی کوردســـتانی ئێران، بە هەزاران کەس دەبێت. ئەی لە کوێ بوون؟ بۆمن بووە ناڕوونییەکی سەیر.

لەبیر نەکردنی یەکەمین هەســـت بەرانبەر بە بابەتێک، یەکێک لە بنەما ئاڵتوونییەکانە لە پیشەی ڕاپۆرتنێریدا.

بـــۆ مرۆڤێکـــی تـــازەکاری وەک من، بابەتـــی هەرە بەرچـــاو، هەمان کەشـــوهەوای ئارام و بەگەشـــە بوو کە لە کووچە و کۆڵانەکاندا لەگەڵی بەرەوڕوو دەبووم. لێرە، پیاوانێکی هێمن و ژنانێکم بینی کە پرچیان بە دەرەوە بوو و چاویان لە چاوی بەرانبەرەکەیان نەدەدزییەوە و ئەوش هەڵسوکەوتێکی زۆر ئاسایی دەینواند. لە حاڵێکدا کە لە تاران دۆخێکی دیکـــەم بینیبـــوو. لـــەوێ، بـــە زۆری ڕەگـــەزی ژن لە دیمەنی شـــارەکە ســـڕدرابووەوە و تا ئاستی تارماییەکی ڕەش و بێدەنگ ڕووی لە کزی نابوو و بوونی بیانییەک، دەبووە هۆی نیگایەکی دوژمنکارانە و یان پڕ لە ترس و تۆقین. لە ٦٠٠ کیلۆمیتریی پێتەختدا، وەکوو ئەوە وابوو پێت نابێتە ســـەر ئەردێکی دیکە. لە مەهاباد هەســـتت دەکـــرد کە ئازادییەکی تەواو باڵی بەسەر شارەکەدا کێشاوە.

بەبێ‌ئەوەی شـــارەزاییەکم لە شـــارەکە هەبێت، بەبێ‌گرفت، دەفتەری

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانم دۆزییەوە. سەرەتا، خاوەنی هۆتێلەکە هەندێ ڕێوشوێنی نیشاندام و دواتر بۆدڵنیایی، یەکێک لە بەردەستەکانی خۆی لەگەڵ ناردم. ئەو بەردەستە کە ناونیشانەکەی بەوردی نەدەزانی، لە ڕێگادا، پرسیاری دەکرد. شارەزا نەبوون لە زمان، ڕێگر بوو لەوەی تێبگەم چی لە نێوان بەردەستەکە و بەردەنگەکانیدا ئاڵوویر دەکرێت. تەنیا وشەی «دوکتور» بە گوێم ئاشنا بوو کە بەزۆری لە نێواخنی وتەکانیاندا دووپات دەبووەوە و بە زاردا هاتنی دەبووە هۆی کرانەوەی زمانی بەردەنگەکان. دیاربوو کە نێوی قاسملوو بۆ هەموو ئاشنا بوو و ئەوەیکە بیانییەک هاتووە سەردانی بکات، دەبووە هۆی خۆشحاڵیی بەردەنگەکانمان. زۆریش بە سانایی گەیشتمە ژووری دوکتور. لێرە، کەس داوای کارتی پێناسی لێنەکردم و نەشیانپشکنیم. ئەوەش، جیاوازییەکی تەواوی لەگەڵ تاران هەبوو. پاش خۆناساندن و ڕوونکردنەوەکانم سەبارەت بە چۆنیەتی گەیشتنم هەتا نووسینگەکەی، «دوکتور» گوتی: «بەڵێ لێرە هەموو من دەناسن» و بە پێکەنینێکەوە کە من هەستم بە چەشنێک تەنز کرد لە پشتی، گوتی: «ڕاستە، وابزانم چیدیکە هیچ ڕکەبەرێکم نییە» و پاشان پرسیاری کرد: «بارودۆخ لە فەرانسە چۆنە؟» گفتوگۆکانی ئێمە چەند خولەکێک بە ڕواڵەت سەبارەت بە شتی ئاسایی تێپەڕی. لەو کاتانەدا، بەتایبەتی قاسملوو بوو کە پرسیاری دەکرد. دەیویست بزانێ چۆن گەیشتوومەتە مەهاباد. سەفەر کردن بە پاسی نەفەرهەڵگرم بۆ گێڕایەوە. لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی: «ئەوان هێشتا بە تەواوی بەسەر دۆخەکەدا زاڵ نین. تۆ شانست هەبووە. هاوکارێکتان لە تارانەوە تەلەفۆنی کرد و گوتی لە نیوەی ڕێگاکەوە گەڕاندوویانەتەوە». پاشان سەبارەت بە دۆخی تاران و ئەوەیکە لەوێ سەبارەت بە کوردەکان و خودی ئەو، بۆچوونەکان چۆنە،پرسیاری لێکردم و گوتی: «ئایا دەزانی کە خومەینی دەیهەوێ تیربارانم بکات؟» لانیکەم، ئاگام لەو بابەتەیان هەبوو و گوتم: «ئەو دەڵێت کە تۆ دژە شۆڕشیت». ئەم وتەیە، سەرلەنوێ هێنایەوە

پێکەنین.

داوام لێکرد بۆم ڕوون بکاتەوە کە بەڕای ئەو، ئەو تاوانە ڕاستەقینانەی کە دژبەرەکانی وەپاڵی دەدەن چین؟ بە گۆڕینی سیمای‌دا، وای بۆچووم کە دەیهەوێت بڵێت: «بەرنامەیەکی بەرفراوانە». زۆر بە کورتی گوتی: «من، هەم منم و هەم کوردم و ئەوەش بۆ ئەوان بەسە. ئەوەش بۆ من شانازییەکی گەورەیە». پاشان بە هێنانەبەرباسی نەریتی میوانخۆشەویستیی و پێکەوەگونجان و لێبووردەیی گەلی کورد، باسی «جیاوازیی کوردەکان» ی لەگەڵ ئەوانی دیکە کرد و گوتی: «هەر ئەم بابەتەیە کە ئەوان پێیان قبووڵ ناکرێت. لە مەهاباد مرۆڤگەلی جیاواز، بریتی لە جوولەکە، مەسیحی، بەهایی، بێدین و زۆر خەڵکی دیکەش کە لە تاران ڕایانکردووە، دەدۆزیتەوە. ڕوانگەی ئێمە لە دینی ئیسلام، لەگەڵ ڕوانگەی ئاغای خومەینی چون‌یەک نییە. کوردەکان باشتر لە هەرکەسێکی دیکە لە دەردی کەمینەکان دەگەن».

ئەو، باسی ئەو هیوایانەی کرد کە شۆڕشی گەلانی ئێران دروستی کردبوو، باسی بەشداریی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانی کرد لەو شۆڕشەدا و ئەو نرخە قورسەی وەک ئەشکەنجە و کوشتاری شۆڕشگێڕەکان لە لایەن ساواک ـ ڕێکخراوی نهێنی ڕێژیمی ڕابردوو ـ لەو پەیوەندییەدا داویەتی. گوتی ئێمە یەکەمین کەسەکان بووین کە هەم وەکوو کورد و هەم وەک ئێرانییەک لە دژی ڕێژیمی شا خەباتمان کرد و تۆش دەزانی کە دروشمی ئێمە: «دێموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستانە».

بەڵام هەموو ئەو هیوایانە، بە زوویی گۆڕدران بە بێ‌هیوایی و کەمینەکان، بریتی لە کەمینە نەتەوەیی و ئاینییەکان، تێگەیشتن کە لە کۆماری ئیسلامیدا، فرەڕەنگی و جیاوازییەکان جێیان نابێتەوە. کوردەکان یەکەم کەسەکان بوون بەوەیان زانی و عەبدولڕەحمان لەوبارەوە گوتی: «کوردەکان هەرگیز دەست لە خەبات بۆ بەرگری کردن لە مافەکانیان هەڵ ناگرن. ئێمە لە دژی ڕێژیمی شا خەباتمان

کـرد و ئەگەر ڕێژیمی نـوێ پێداگربێت لە پێشـێلکردنی مافە ڕەواکانی ئێمـە، لە دژی ئەویش لـە خەباتەکەماندا بەردەوام دەبین. ئازادیخوازی بـووە بە بەشـێک لـە ژێنێتیکـی ئێمە». ئـەم وتانە دەکـرا وەکوو ئەو وتەگەلەی کە ڕێبەرانی «شۆڕشـگێڕ» بە مەبەسـتی کەیفخۆشکردنی ڕۆژنامەنووسـەکان دەیڵێن، بەراورد بکرێت، وتەگەلێک کە خودی خۆم زۆرجـار لە شـوێنی دیکەش بیسـتبووم. بەڵام ئەمجارەیان شـێوازی گوتنەکـەی زۆر جیاواز بوو. وشـەکان سـادە و دوور لـە بریق و باق بوون و شێوازی ڕوونکردنەوەیان پێوە دیاربوو، نەک پڕوپاگەندە.

لـەو کاتـەدا، من توانای شـی کردنـەوەی ئەو بابەتـەم نەبوو. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو پیاوەی ئەو قسانەی دەکرد، لە هیچکام لەو ڕێبەرانە نەدەچوو کە پێشتر ناسیبووم. باس و گفتوگۆی ئێمە، لەپەستا بەهـۆی هاتنـە ژوورەوەی خەڵکەکـەوە دەپچڕا. دیالۆگێکـی کورت لە نێوان دوکتور و ئەو کەسانەدا ئاڵوێر دەبوو کە من لێی تێنەدەگەیشتم. بەڵام گومان لەوەدا نەبوو کە قاسـملوو بە ڕاسـتی ڕێبەرێکی جێی ڕێز و باوڕپێکـراو بوو و هەموو بەقسـەیان دەکرد. پاش چوونە دەرەوەی میوانەکان، ئەو سەرلەنوێ بەهێمنی و بەدەم بزەیەکی هەمیشەیی سەر ڕوخساریەوە درێژەی بە قسەکانی پێشووی دەدا و بە ڕوونی دیار بوو کە مەبەستی لەو قسانە ڕازی کردنی من نییە، بەڵکوو، وەکوو شاهێدێک بۆ ئەندێشەکانی خۆی سەیری من دەکات.

یەکەم کارتێکەری و هەسـتێک کە لەو هەمبوو، لە ڕەوتی دیدارەکانی دواترماندا پشتڕاسـت کرایەوە. لە دیرۆکی ژیانی شەخسـیی ئەو هیچم نەدەزانـی. بـەڵام تێگەییـم کە سـکرتێری گشـتی حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێـران، بـە واتایەکی دیکـە، ڕێبەری سیاسـی و نیزامیی بزووتنەوەیەکـی ڕزگاریـدەری جیهانـی سـێهەم، ئـەو چەمکـەی کە ئەوسـا بەکارمان دەهێنا، لەوەیکە وەکوو ڕۆشنبیر حیسابی بۆ بکرێت، ناترسێت.

لەو کاتەوە کە ئەم ڕستەگەلەم دەنووسی، زیاتر لە سێ دەیە تێپەڕیوە،

بـــەڵام، یەکـــەم دیـــدارم لەگەڵ ئەو، لـــە ژیانی کارییـــمدا، وەکوو کات و ســـاتێکی بەرجەســـتە، وەکوو خۆی ماوەتەوە. وێنەکانـــی ئەم یەکەمین ســـەفەرەم بۆ مەهاباد و بردنەســـەری چەند ڕۆژێک لـــە دڵی مێژوویی کوردســـتانی گەمـــارۆ دراودا، لەگەڵ بـــاس و گفتوگۆکانمان لە ژووری کارەکەی قاســـملوو، تێکدەچڕژێـــن. دۆخەکە تایبەت بـــوو و لێرەدا بە پێویســـتی نازانم هیـــچ لە تایبەتمەندییە دراماتیکەکـــەی ئەو هەلومەرجە زیاد بکەم. سەرەڕای ئەوەش، وەکوو بیرەوەرییەکی خۆش، ئەو دۆخەم لـــە یادە کە بەدڵنیاییـــەوە دەرەنجامی میوانداری جوان و لەوەش زیاتر، دەرەنجامـــی هێمنایەتـــی پەیوەندی و خۆشمەشـــرەبیی پیاوێک بوو کە ســـەرەڕای ئەو هەموو بەرپرســـایەتییەی لە ئەســـتۆی بوو و باشتر لە هەر کەسێکی دیکە دەیزانی کە هاکا تۆفانەکە هەڵکات، کەچی خۆی تێک نەدەدا و هێمن بوو.

هەڵکردنی تۆفانەکە، بابەتی چەند ڕۆژ یان چەند کاتژمێری دیکە بوو و خەڵکی شارەکەش ئەوەیان دەزانی. بە هیچ شێوەیەک جێی باوەڕ نەبوو کە خەڵک ئاگایان لەو هێرشە نەبێت کە لەو دیوی دۆڵەکەوە ڕێکدەخرا؟ کەچی واپێدەچوو هێچ شتێک ناتوانێت کاریگەریی لەسەر ڕووگەشی و پێکەنینەکانـــی «دوکتور» دابنێت. ئەم پێکەنینە کە بەدەگمەن لە ڕواڵەتی دوور دەکەوتەوە، بە بۆچوونی من پەیامێکی مەزنی پێبوو، خوێندنەوەی منیش لەو پەیامە ئەوە بوو کە کاتێک مرۆڤ تووشـــی ئاستەنگ دەبێت، نابێت تووشی سەرلێشێواوی و لەوەش زیاتر بێهیوایی بێت، لەو کاتەدا بوو کە تێگەیشـــتم عەبدولڕەحمان مرۆڤێکی خۆشـــبین بوو و بەرەبەرە تێگەیشـــتم کـــە ئاشـــتی بۆکوردەکان زیاتر شـــتێکی دەگمـــەن بوو هەتا بنەمایەک و ئاشـــتی لە ئازادیدا، لەوەش دەگمەنتر. هەر بۆیەش دەتوانم بڵێـــم کە لەو کاتەدا، هەموومان کات و ســـاتێکی گرانباییمان تێدەپەڕاند و زێدەڕۆییـــم نەکـــردووە ئەگـــەر بڵێم بیرەوەرییەکانی ئەو ســـەردەمە، هەرگیز فەرامۆش ناکرێن.

بـــە خوێندنەوەی بەســـەرهاتی ژیانـــی هێلێن کرۆلیش، تێگەیشـــتم کە

هاوسەرەکەی لە شوێنێک، ئەو ڕستەیەی «ئاندرێ مالرۆ»ی Andre Malraux نووسیوەتەوە کە: «بە بێئەوەی حەزم لە شەڕ بێت، شەڕم کرد». قاسملوو لە نێوان گفتوگۆکانمان‌دا، کاتێک پرسیارم لێکرد کە ڕوانگەی ئەو بەرانبەر بە شەڕ چییە، بە بێئەوەی ئاماژە بە سەرچاوەکەی بکات، ڕێک هەمان ڕستەی پێگوتم و ئەویش ڕێک لەو کاتەدا کە لەو دیوی گردەکانەوە، کەسانێکی دیکە خۆیان بۆ شەڕ ڕێکدەخست. خۆیشم بەو پرسیارانەوە کە دەمکردن، هەستم بە ئاسوودەیی نەدەکرد. بەڵام مەگین من هەر بۆ ئەو مەبەستە لە تارانەوە نەهاتبووم؟ بەهەرحاڵ، پرسیار کردن بەشێک لە پیشەکەی من بوو و هەر بۆیەش نیگەرانی ئەوە نەبووم وەکوو لاشخۆر سەیر بکرێم. داوای لێبوردنم کرد و گوتم: من حەزم لە شەڕ نییە. قاسملوو وەڵامی دایەوە: «منیش حەزی پێناکەم. شەڕ ژیان و ماڵ و حاڵی خەڵک کاول ئەکات و دەبێتە هۆی کوشتاری مرۆڤەکان. بەڵام دەسەڵاتدارانی ڕێژیم بژاردەیەکی دیکەمان بۆ ناهێڵنەوە و پێشمەرگەکانی ئێمەش جەنگاوەرانێکی شایستەن». تا ئەوکاتە، من نەمدەزانی وشەی «پێشمەرگە» بە مانای ئەو کەسەیە کە بەپیریی مەرگەوە دەچێت. پاشان قاسملوو گوتی: «ئەوانن کە لەدژی ئێمە شەڕدەکەن، ئێمە تەنیا بەرگری دەکەین».

بە قاسملووم گوت کە هەر لە یەکەم ڕوانیندا دیارە کە باڵانسی هێز لە بەرژەوەندیی ئێوە نییە. وەڵامی دایەوە: «ئەگەر مەبەستت ئەوەیە کە ئێمە دەبابە و فڕۆکەمان نییە، قسەکەت تەواوە. جگە لەوەش، ئەگەریش هەمانبووایە، بەکارمان نەدەهێنا. ئێمە لەوە باشترمان هەیە، ئێمە شاخەکانمان هەیە و بە ڕێکوپێکیش خۆمان ڕێکخستووە». ئەزموونەکانم فێری کردبووم کە لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا نابێت زۆر پرسیار بکەم، چوونکە کەڵکی نییە و وەڵام وەر ناگریتەوە. سەرەڕای ئەوەش، ڕیسکم کرد و دوایین پرسیاری خۆم کرد: ئەگەر ئەوانەی لەو لایەی دیکەن، بڕیاری هێرشیاندا، لەمەهاباد چی ڕوو دەدات؟

وەڵامی دایەوە و گوتی: «ئەوەندەی پێمان بکرێ خۆڕاگری دەکەین،

ئەویش لە دەرەوەی شار. ئەگەریش نەتوانین پێشیان پێ‌بگرین، ڕێگای هاتنەژوورەوەیان بۆ مەهاباد کراوە دەبێت. شۆڕشــگێڕەکانمان لە شار دەبەینە دەرەوە، ئەوە تاکە ڕێگەیە کە مەترســـی و کاولکاری لە خەڵک دوور خەینەوە. ئەوان هەموو کەرەســـتەیەکی پێویستیان بەدەستەوەیە بۆ ئەوەی شـــارەکە کاول بکەن و ئێمەش ناتوانین پێش بەو کاولکارییە بگریـــن. پێـــم گوتی کە خاڵی بەهێـــزی ئێمە شـــاخەکانمانن. وابزانم ئەم ڕادەیە لەزانیاری بۆ تۆ بەس بێت، وانییە؟»

لە ڕاستیدا، ئەوە پرسیار نەبوو قاسملوو لە منی کرد، بەڵکوو بەڕێزەوە تێی گەیاندم کە ڕێبەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، لە ئێستادا کاری گرینگتـــر و بە پەلەتری لـــە وەڵامدانەوە بـــە لێوردبوونەوەکانی نێردراوێکی تایبەتی ڕۆژنامەی لیبراســـیۆن (Liberation) بەدەستەوەیە، تەنانـــەت ئەگەر ئەم نێـــردراوە تایبەتە، تاکە هەواڵنێر بێت کە لەو کاتەدا لەمەهابـــاد ئامادەیە. حەزم دەکرد زانیاری زیاتر بەدەســـت بهێنم. بەڵام هەرکارێـــک کات‌وســـاتی گونجـــاوی خۆی هەیـــە. نەمدەتوانـــی دڵنیابم لەوەیکـــە ئەو گفتوگۆیە، لانیکەم لەو شـــوێنە، دواییـــن گفتوگۆ دەبێت و چیدیکە، بەو زووانە بنکەی ســـەرەکیی حیزبی دێموکراتی کوردســـتانی ئێران لە مەهاباد نابینمەوە.

ســـەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر، بەدەنگـــی تەقینەوەی یەک لەدوای یەک لەخـــەو هەســـتام. دووکەڵێکـــی ســـپی، وەک هـــەور، بنـــاری گردەکانی داپۆشیبوو و لەسەربانی هۆتێلەکەوە بەجوانی دیار بوو. هەر لەوکاتەدا، خاوەنـــی هۆتێلەکە هـــاواری کرد: «فڕۆکـــە». هـــاوکات، دوو فڕۆکەی شـــەڕکەری بۆمب هاوێژ بەئاســـمانی شـــارەکەدا تێپەڕی و سەرلەنوێ نزیکـــەی ١٠ بۆمبی لە دەور و بەری شـــارەکە خســـتە خوارەوە. بەڵام دەنگـــی تەقینـــەوەی بۆمبەکان هێنـــد بەرز بوو کە مـــرۆڤ وای دەزانی لـــە کۆڵانێک ئەولاتـــر کەوتۆتە خـــوارەوە. پاشـــان بێدەنگـــی زاڵبوەوە. بێدەنگییەکی وەها بەسام و تۆقێنەر کە دەتگوت لەو شارەدا هیچشتێک ناجووڵێتـــەوە. تەنانـــەت چۆلەکەکانیش لە جریـــوە کەوتبوون. ڕەنگە بە

هۆی ئەوەوە بوو کە تەقینەوەکەوە، گوێی کپ کردبووم.

چەند خولەکێک دۆخەکە هەروا تێپەڕی. من هێشتاش لە سەربان بووم. پاشان بینیم کە ئەندامانی بنەماڵەیەک لە ماڵێکی نزیکی هۆتێلەکە هاتنە دەرەوە، پاش کەمێک، ئەندامانی بنەماڵەی دووهەم و سێهەم.. کاتێکیش لە سەربانی هۆتێلەکە هاتمە خوارەوە و گەیشتمە کۆڵان، خەڵک هەموو لە دەرەوە بوون. خەڵک بە گرووپی بچووک کە بەرەبەرە زیاتر دەبوو، وەکوو ڕووبارێک بەرەو شەقامە سەرەکییەکانی شار بەڕێوە بوون.

بۆ کوێ دەڕۆشتن؟ بۆ من ناڕوون بوو.

لە ماوەی دوو کاتژمێردا،خەڵکی مەهاباد، شاریان بەجێهێشتبوو، ڕێک وەک جەستەیەک کە خوێنی تێدا نەمابێت. کەمێک پێش نیوەڕۆ، دەنگی گرمەی دەبابەکان، هاتنەژوورەوەی هێزی براوەکانی بە شارە چۆڵوهۆڵەکە ڕاگەیاند. تەنانەت فیشەکێکیش نەتەقا بوو [١]. دواتر،

١. سەبارەت بەم کورتە چیرۆکە، پێویستە ڕوونی بکەمەوە کە پێرسۆنێلی هۆتێلەکەش هۆتێلەکەیان بەجێهێشتبوو. کاتێک پاش پیاسەیەکی کورت لە ناوشاردا گەڕامەوە بۆ هۆتێل، بینیم کە خاوەنی هۆتێلەکە Mahabad Innیش خەریکی بار کردنی هەندێ لە کەلوپەلەکانی بۆ نێو ئۆتۆمبیلەکەیەتی. پێش چوونە دەرەوە لە هۆتێل، کلیلی نووسینگەی هۆتێلەکە کە تاکە تەلەفۆنی هۆتێلەکە و چرپایەکی خەویشی تێدا بووی دایە دەستم و پاشان ڕۆشت. بڕیارم دا ئامێری تایپ کردنەکەم بێنمە ئەو ژوورە، بە بێ ئەوەی بیر لە چوونە دەرەوە لەو هۆتێلە بکەمەوە. لەو کاتەدا، گرینگ ترین بابەت، نووسینی وتارێک بوو سەبارەت بە ڕووداوەکانی مەهاباد. دواتر بیرم لەوە کردەوە خۆ من هیچ کەرەستەیەکم لەبەردەستدا نییە بۆ ئەوەی وتارەکەم بگەیەنمە ڕۆژنامەکەم. بەڵام هەڵە بووم، هەرکە تەلەفۆنەکەم هەڵگرت، خاتوونێکی ئۆپێراتۆریس لەوپەڕی هێڵەکەوە وەڵامی دایەوە و بە ئینگلیسیش قسەی دەکرد. بە بێ ئەوەی هیوایەکی ئەوتۆشم هەبێت، پرسیاری چۆنیەتی پەیوەندی گرتن لەگەڵ پاریسم لێ کرد. ئەو خاتوونە بە ئینگلیسی پرسیاری لێ کردم: «چ ژمارەیەک بەڕێز؟» (Which number sir) پاش چەند ساتێک لەگەڵ ڕۆژنامەکەی خۆم لە پاریس قسەم دەکرد. جگە لەوەش، پاش ماوەیەکی کورت، تەلەفۆنەکە زڕەی لێوە هات. لە یەکێک لە ڕادیۆ گرینگەکانی پاریسەوە پەیوەندییان پێوە کردبووم کە دەستبەجێ، ڕاپۆرتێکی خێرام لە ڕووداوەکانی مەهاباد پێدان. پاشان لە نووسینگەی ئاژانسی فرانس پرێس AFP (ئاژانسی هەواڵدەریی فەرانسە) لە تارانەوە پەیوەندییان پێوە کردم. بەڕاستی بابەتی ئەو تەلەفۆنە سەرسووڕهێنەر بوو. پێویستە بۆ خوێنەرانی ئەم سەردەمەی ڕوون بکەمەوە کە لە ساڵی ١٩٨٠دا، ئەو کەرەستە سەرسووڕهێنەرانەی کە ئەمڕۆکە لە پێویستییە گرینگەکانی ئێمەن، هێشتا کەشف نەکرابوون. هەربۆیەش ئێمە بە تەلەفۆن یان تێلێکس پەیوەندیمان دەگرت کە هەم تێچوویەکی زۆری هەبوو و هەم بە ئاستەم وەچنگ دەکەوت. سەرەڕای ئەوەش بەرپرسانی حکومەتی بە توندی کۆنترۆلیان دەکردن و ئەگەر گومانیان لە پەیوەندییەک هەبوایە دەستبەجێ دەیانبڕی. بۆچی؟ چۆن بوو کە تەلەفۆنی مەهاباد بەو باشییە کاری دەکرد، تەنانەت باشتر لە تارانیش و ئەویش لە کاتێکدا کە شار لە لایەن پاسدارەکانەوە گەمارۆ درابوو؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە کە وەکوو خۆم هیچ وەڵامێکم

زانیم کە خەڵکی شار، زۆریش دوور نەکەوتبوونەوە. ئەوان بەشێوەی کاتی بەرەو شاخەکان ڕۆشتبوون و لە دەور و بەری شارەکە گیرسابوونەوە. زۆربەیان، پاش چەند ڕۆژ گەڕانەوە بۆشار. بەو حاڵەشەوە، پاشنیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، بێژەری هەواڵەکانی تەلەفزیۆنی حکوومەتی ئێران بەشێوازێکی حەماسییانە «ئازادکردنی» شاری مەهابادی ڕاگەیاند و گوتی سەربازە قارەمانەکان لە سای کەرەمی خودادا «گرووپە دژە شۆڕش»ە کانیان شکستداوە و بە چەپڵەڕێزان و ئاهەنگ گێڕان و شادی و گوڵبارانی خەڵکی شارەکەوە چوونەتە ناوشار. ناوی ڕێبەری ئاژاوەگێڕەکان نەبراو تەنیا گوتیان ئەو خائینە تەنانەت هاوڕێکانی خۆیشی بەجێهێشتووە و ڕایکردووە و زۆر ناخایەنێ کە بەو سزایەی بۆی ڕەچاو کراوە دەگات.

بەڵام ئەوکەسانەی کە ئەم چیرۆکەیان بەڕووەکەی دیکەیدا بینیبوو، بە بیستنی ئەم پڕوپاگەندە درۆیینانە، بە چاوی ڕێزەوە دەیانڕوانیە بزووتنەوەی خۆڕاگریی کوردەکان و ڕێبەرەکەیان و تەنانەت ستایشیان دەکرد.

هەر چەند کە بێژەری تەلەفزیۆن تەنیا دەقێکی تەبلیغیی دەخوێندەوە. بەڵام نیزامییەکانی ڕێژیم کە بۆخۆیان لەو شوێنە بوون، دەیانزانی کە چ کاریگەرییەکی پێچەوانەی دەبێت و هەربۆیەش، ڕاپۆرتیان بۆ سەرەوەتری خۆیان ناردبووەوە. هیچ شەڕێک ڕووی نەدابوو، بۆ پێشوازیی براوەکانیش نە گوڵباران کرابوو و نە شاییولۆغان.

بۆی نییە. دواتر کاتێک عەبدولڕەحمان قاسملووم لەو گوندە بچووکە لە شاخەکانی کوردستان بینییەوە، ئەم چیرۆکەم بۆ گێڕایەوە. ئەو گوتی کە کارمەندەکانی ناوەندی تەلەفۆنی ناوچەکە لە شۆڕشگێڕەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوون. دیارە من هەرگیز نەمتوانی بەدواداچوون بۆ ئەو وردەکارییانە بکەم، بەڵام ئەوەی ڕوون و ئاشکرا بوو، ئەوە بوو کە سەرکەوتووانی ئەو ڕۆژە، ئاگایان لەو بابەتە نەبوو. جگە لەوەش، تێنەگەیشتم کە چلۆن ژمارە ٢ی مەهاباد، واتە ژمارەی هۆتێلەکە، ڕاستەوخۆ لە دەرەوەوە وەردەگیرا. سەرەڕای ئەوەش دووپاتی دەکەمەوە کە لە ماوەی ٤٨ کاتژمێردا، هەواڵەکانی تایبەت بە شاری داگیرکراوی مەهاباد، بۆ دەرەوە دەگوێزرایەوە، بە بێ ئەوەی کەس لێی ئاگادار بێتەوە. لە پیشەی ڕۆژنامەنووسیدا، هەندێجار پێویستە مرۆڤ بەم موعجیزە بچووکانی ڕازی بێت و زۆریش پرسیار لە خۆی نەکات.

شکســتێکیش لەئارادا نەبوو. پێشمەرگەکان پاشەکشەیان کردبوو. هێزە نیزامییەکان دەستیان بەســەر شارێکی چۆڵوهۆڵدا «گرتبوو». خەڵکی شــارەکە پشــتیان تێکردبوون. بە گیرانی مەهاباد، ئەو شەڕەی ڕێژیم دەســتی پێکردبوو، بە ســەرکەوتنێکی بێدەســکەوت بۆ ڕێژیم کۆتایی پێدەهات. هێزە شۆڕشگێڕەکانی کوردیش بەبێ هیچ خەسارێک، بەرەو شــاخەکانی کوردستان پاشەکشەیان کردبوو. لە ڕاستیدا، هەمووشتێک بە پێــی پێشبینییەکانی ڕێبەری حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران چووبووە پێشەوە.

ئــەم چیرۆکــە ڕەنگــە ببێتــە هــۆی بێهیوایــی لایەنگرانــی چیرۆکــە حیماسییەکان [٢]. ڕووداوەکانی دواتر، تایبەتمەندییەکی بەرچاوی دیکەی عەبدولڕەحمــان قاســملوو وێنــا دەکەن کــە بە بۆچوونی من شــایانی ئەوەیــە لێرەدا باس بکرێــت. لێرە تا «دوایین دڵۆپی خوێن» شــەڕیان نەکردبــوو. ئەو دروشــمە بەناوبانگەی کە من لــە هەلومەرجی دیکەدا زۆرجار بیســتبووم. بێگومان ئەوەم لە قاســملوو نەبیســتبوو. بەڵکوو ڕێک بە پێچەوانەی ئەوەوە دەدوا. سەرەڕای باڵادەستیی ڕێژیم لەباری ڕێژەی هێزی چەکدار، پێشمەرگەکان لە بەرانبەر فڕۆکەی بۆمب هاوێژ و دەبابە و تۆپخانەی قورســەوە هیچ شانســێکیان نەبوو. هەر بۆیەش، بژاردەی ئەوان بەبێ سێودوو، بژاردەیەکی تاکتیکی بوو. بەڵام بابەتەکە تەنیا بە بژاردەیەکی تاکتیکی کورت نەدەکرایەوە.

قاسملوو نەیدەویست خوێنی پێشــمەرگەکانی بڕژێت، لەوەش زیاتر، نیگەرانی چارەنووســی خەڵکی شــارەکە بوو. بەرگریی نیزامی لە شار، کاولکردنی شارەکە و تۆڵە کردنەوەی تۆقێنەری لەو شارە بەدواوە بوو. ئەو هەمیشــە دەیگوت: «ئێمە شەڕ ناکەین، بەرگری دەکەین». جارێکی دیکەش پێداگری دەکەم کە مەبەستی ئەو لەو گوتەیە، دروشمدان نەبوو،

٢. دیارە من لێرەدا تەنیا باســی ڕۆژێک پێش هاتنی پاســدارەکان بۆ مەهاباد دەکەم. لە ڕاســتیدا، گەمارۆی شــاری مەهاباد ١٨ ڕۆژی خایاندبوو و پێشــمەرگەکان، لە دەرەوەی شــار و تا ڕادەیەک دوور لە شار، لە دژی هێزەکانــی ڕێژیمی تاران شــەڕێکی چڕیان دەکــرد. لەو کاتەدا ڕۆژنامەی لیبراســیۆن بە پوختی ئەم ڕووداوانەیان بڵاو کردبووەوە.

بەڵکـوو ڕوونکردنەوەی بابەتەکە بوو. لە ڕوانگەی سـکرتێری گشـتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە، خۆڕاگری و مانەوە، بە مانای ڕژانی خوێن لە پێناو شانازیی بزووتنەوە و ڕێبەرەکەیدا نەبوو. قاسملوو خەونی بە کوردسـتانێکی ئـازادەوە دەبینی و ئەوەی بـۆ زیندووەکان دەویسـت. ناتەبایـی ئەم ڕوانگەیـە لەگەڵ نەریتی شەهیدپەرەسـتی لە ئیسـلامی شیعەدا، کە لایەنگرانی خومەینی گەیاندبوویانە لووتکە، ئەرز و ئاسـمان جیاوازی هەبوو. ڕوانگەی قاسـملوو، لـە هەموو بارێکەوە، لەگەڵ ڕوانینی «شۆڕشگێڕی» باو لەو سەردەمەشدا جیاوازی هەبوو. من وتەیەکی دیکەی قاسملووشـم لەبیرە. ئەو بەو شـێوازە تەنزئاسـا هەمیشـەییەی خۆی، دەیگوت: «Viva Muerte» (بژی مردن) و پاشـان دەیگوت: «مەگەر ئەم دروشـمە، دروشـمی فاشیسـتەکان نەبوو؟ ئایا بەلای تۆوە سـەیر نییـە کە ئەمڕۆ بەناوی شۆڕشـەوە پەنا بەرنە بەر دروشمێکی ئەوتۆ؟»

خەڵکـی بێدیفاع لـە تۆڵە سـەندنەوەی ڕێژیم بێبەهـرە نەمانەوە. لە هەموو شـارەکانی کوردسـتان کە لە لایەن هێزەکانی ڕێژیمی تارانەوە گەمارۆ درابوون، کردەوەی تۆقێنەر ڕوویدا. شێخ «سادق خەڵخاڵی»ی قێـزەون کە لە لایـەن خومەینییەوە وەکوو «حاکم شـەرعی گەڕۆک» دیاریکرابوو، «دادگای شـۆڕش»ی خۆی لە هەموو لایەک خسـتبووە گەڕ و گەلێ دادگایی کردنی دەستبەجێ و بەپەلەی بەڕێوە برد. دادگایی کردنەکان تەنیا چەند خولەکێکی دەخایاند و هەمووشیان بە فتوای مەرگ و تیرباران کردنی دەسـتبەجێ کۆتاییان پێدەهات. خەڵخاڵی، نەک هەر شانازی بەو کردەوەی خۆیەوە دەکرد، بەڵکوو ئیزنی ئەوەشی دەدا کە لە تیربارانکردنەکان فیلم هەڵگیرێتەوە.

وێنـەی یەکێک لەو دیمەنانە، لەو کاتەدا، خەڵاتی پۆلیتزێری (Pulitzer) بـردەوە و لـە هەموو دنیـادا بڵاو کرایـەوە. بە دڵنیاییەوە ئـەم وێنەیە ڕاچڵەکێنەر بوو، بەڵام نە بەو ڕادەیەی ویژدانە نووستووەکان وەخەبەر بێنێـت. چونکوو لەبیرم نایە لەسـەر ئەو نیوەیە لەگۆی زەوی کە وڵاتە

ڕۆژئاواییەکانی لەسەرە، سەرکوتی کوردستانی ئێران، بچوکترین ڕێپێوانی لێکەوتبێتەوە (لەشوێنەکانی دیکەش دۆخەکە هەر وەها بوو) تەنانەت نەبووە هۆی نووسینی نووسراوێک بە ناوەرۆکی ناڕەزایەتییەوە لە لایەن ڕۆشنبیرە پێشکەوتووەکانەوە، کە لەم کاتانەدا لانیکەم ئەوان دەستقووچاو و ڕژد نین. وەی لە بێکەسیی کوردەکان! ئەم تەریک کەوتنەوەی کوردەکان بەڕاستی بەئازار بوو.

عەبدولڕەحمان لەو بارەوە زۆریش تووشی سەرسووڕمان نەدەبوو. چونکە باشتر لە هەموو کەسێک ئاگای لەو تەریککەوتنەوە بوو کە خەباتەکەی ئەو تێیدا بەردەوام بوو. ئەو لەم دۆخە، نە ڕەزایەتی دەردەبڕی و نە کەسەر، بەڵکوو دەیگوت: «ئەمە ڕاستییەکە و بۆ بزووتنەوەکەی ئێمە هێمایەکی ڕوون لە لاوازییە. لە هەمانکاتیشدا، خۆناساندن بە هەموو نرخێک و لەڕێی چالاکییە سەیر و سەمەرەکانیشەوە مەبەستی ئێمە نییە». ئەو وتەگەلە دەکرا بە وشەی حەکیمێک بەراورد بکەیت کە لە برانبەر نەهامەتیدا ڕەزایەت دەردەبڕێ، هاوکات دەکرا وەکوو وتەکانی ڕێبەرێکی سیاسی ببینی کە بەو شێوەیە دەردەبڕدرێ. هەمان ڕێبەر کە لە نۆڤامبری ١٩٧٩دا، لە هەمان یەکەم ڕۆژەوە، بارمتەگرتنی دیپلۆمات و کارمەندەکانی سەفارەتی ئامریکا لە تارانی ڕەت کردەوە و مەحکوومی کرد. بەرپرسایەتیی ئەو کردەوەیە، گرووپێکی تا ڕادەیەکی زۆر ناسراو کە ڕاگەیەندراو و بەیاننامەکانی بەنێوی «خوێندکارانی لایەنگری هێڵی ئیمام» واژۆ دەکرد، وەئەستۆی گرت. بەو کردەوەیەش، بۆ ماوەی ٤٤٤ ڕۆژ جیهانی نوقمی نیگەرانی کرد.

عەبدولڕەحمان بێزاریی خۆی لەو شێوازە دەردەبڕی و دەیگوت: «خەبات بۆ ڕزگاریی ئێران لە ژێر کۆت و بەندی ئامریکا شتێکە و بچووک کردنەوەی ئەو خەباتە تا ئاستی شانتاژێکی پڕ لە هەراوزەنا لە دژی ژیانی کۆمەڵە مرۆڤێک و ئەویش بە شێوازێکی وەک خەڵکی هەرچیو پەرچی شتێکی دیکەیە. هەروەک لە بەرنامەی حیزبی دێموکراتدا هاتبوو، ئازاد کردنی جیهانی سێهەم لەژێر کۆت و بەندی

ئێمپێریالیســمی زلهێزەکان، مەبەستی خەباتێکی درێژخایەن بوو و ئەم خەباتە لە ناوخۆ، بە مەبەســتی جێگیرکردنی بیرێکی دێموکراتیک لەنێو حیــزب و لــە کۆمەڵگەدا جیــا نەدەکرایەوە. بەلای قاســملووەوە، کاری پــەروەردە لەڕەوتی خەباتدا، لەپێش هەموو شــتێکەوە بوو. قاســملوو دەیگوت: «فێر بوونی ئازادی دژوارە» و هەربۆیەش، هەمیشە جەختی دەکردەوە کە تەنانەت لە دژوار ترین هەلومەرجەکاندا، نابێ مەبەســتە ســەرەکییەکانی خەبــات بەقوربانــی پێویســتییە کاتییــەکان بکرێــت و دەشــیگوت کە هیچ مەبەســتێک، تەنانەت جوانترینی، نابێت پاســاو بۆ بەکارهێنانی هەر ئامرازێک بێت.

ئەو لەتێرۆریسم بێزار بوو. بەردەوام دەیگوت کە گەورەترین شانازیی ئەو ئەوەیە کە توانیویەتی ئارمانجەکانی حیزبەکەی لە ڕێی کارکردن و هەڵسووڕانی ڕۆژانەوە بە خەڵکی دیکە بناسێنێت و دووپاتی دەکردەوە کــە حیزبــی دێموکراتــی کوردســتانی ئێــران هەرگیــز هەڵسوکەوتی نەگونجــاوی لەگەڵ زیندانییەکان نەکردووە، خەڵکــی بێدیفاعی ئەزیەت و ئــازار نــەداوە، فڕۆکــەی نەفڕانــدووە، بارمتەی مرۆیــی نەگرتووە، لەبازاڕ و پاســەکانی ناوشــار ودەرەوەی شــاردا بۆمبــی نەچاندووە. قاسملوو هەرچەند حەزی لە توندوتیژی نەبوو، بەڵام لە توند و تیژیش نەدەپرینگایەوە و بەتەواوی، بەرپرسایەتیی کردەوە نیزامییەکانی خۆی دەگرتــە ئەســتۆ. هەرچەشــنە کردەوەیەک کــە بۆنی تێرۆریســمی لێ بهاتبایــە، مەحکوومی دەکرد و ئەوەش هم لە بنەماکانی کاری ئەو بوو و هەم شێوازێکی پەروەردە بوو لە خەباتدا و هەڵبژاردەیەکی ئەخلاقی و لە هەمانکاتدا سیاسی، هەژمار دەکرا.

لــەم بوارەدا، لە ڕەوتــی وتووێژێکدا کە لە ڕۆژنامەی لیبراســیۆنیش بــڵاو بــووەوە، قاســملوو دەڵێــت: «ئێمــە نرخەکــەی دەدەیــن. کەمتر سەبارەت بە ئێمە قسە دەکرێت. خەباتەکەی ئێمە سەرنجی ڕاگەیەنەکان ڕاناکێشــێت. گرووپێکی بچووک بە بارمتەگرتنــی مرۆڤەکان و چاندنی بۆمــب لەسەرانســەری دنیــادا ناوبانــگ دەردەکات. بــەڵام ئــاوڕ لەو

بزووتنەوە ڕزگاریخوازانە نادریتەوە کە کردەوەی تیرۆریستی ئەنجام نادەن». پاشان گوتی: «منیش ئەمڕۆ کە ڕێبەرایەتیی بزووتنەوەیەک لە شۆڕشگێڕان دەکەم. بەڵام ئێمە بەرانبەر بە داهاتوو، بەرپرسیاریەتیمان هەیە. سبەی بەو پیاوانەی کە داواکارییەکی وەهامان لێیان هەبووە، دەتوانین چی بڵێین؟ بەوجۆرە پیاوانەوە کۆمەڵگەیەکی چۆن بنیات دەنێین و ئەوانە چۆن دەتوانن ژیانێکی ئاساییان هەبێت؟ ئەگەر ئێمەش هەمان هەڵسوکەوتی دوژمنەکانمان هەبێت، ئەوسا ئێمەش وەک ئەوانمان لێدێت و قسەکانیشمان هەمووی بەدرۆ دەردەچێت».

دوکتور قاسملوو بەمشێوەیە بۆچوونەکانی خۆی دەردەبڕی.

مرۆڤ دەیتوانی بیر لەوە بکاتەوە کە دەربڕینی وتەی ئەوتۆ کە لەو سەردەمەدا و لەو هەلومەرجەدا، دەگمەن بوو، دەبوو ببێتە هۆکاری بایەخدان بە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و ڕێبەرەکەی لەلایەن هێزە ڕۆژئاواییەکانەوە، بەتایبەتی کە لەو کاتەدا، بزووتنەوەی کورد گرینگترین هێزی خۆڕاگری لەدژی سەرەڕۆیی زاڵی مەلاکان بوو.

پێشتریش گوتوومە کە لە دەرەوە، سەبارەت بە چارەنووسی تراژیکی کوردەکانی ئێران هەڵوێستێکی ئەوتۆ نەدەگیرا. نەک هەر ئارمانجی پێنج میلیۆن کوردی ئێران، بەڵکوو ئارمانجی ٢٥ میلیۆن کورد (ژمارە و ڕێژەکان تایبەت بەو سەردەمەن) کە لەناو پێنج وڵاتدا دابەش بوون، هەرچەند پشتگیریی بەشێکی بەئاگای ڕایگشتی نێونەتەوەیی ڕاکێشابوو، بەڵام لەلایەن دیپلۆماسیی زلهێزەکانەوە سەرنجی پێنەدەرا و لە دێموکراسییە ئوروپاییەکاندا هیچ کاردانەوەیەک بەرانبەری نەدەبینرا. ئەم دێموکراسییانە، پێش لە هەرشتێک بیریان لە بەرژەوندیی تایبەت و لە هەمانکاتدا ناتەبای ناوچەیی دەکردەوە.

تەنانەت کیمیابارانی شاری هەڵەبجە لە کوردستانی عەراق لەلایەن هێزی ئاسمانیی سەدام لە ١٦ی مارچی ١٩٨٨دا و کوژرانی ٥٠٠٠ کەس، هیچ نارەزایەتییەکی فەرمی لێنەکەوتەوە. یەکێک لە یەکەمین کردەوەکانی جۆرج بووش (George Bush) (باوک)، پاش بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات،

دژایەتی کردنی بڕیارنامەی کۆنگرە بوو سەبارەت بە پەسەند کردنی سزادانی سەدام، کە لە لایەن سەرۆک کۆمارەوە ڤیتۆ کرا و پەسەند نەکرا. لەو سەردەمەدا، بابەتی گرینگ بۆ سەرۆک کۆمار ئەوە بوو کە لە بەرانبەر کۆماری ئیسلامیدا کە دوژمنی سەرەکی بوو، دەبوو چاوپۆشی لە ڕێژیمێکی پۆخڵی وەک ڕێژیمی سەدام حوسێن بکرێت. بەرلەوە، کاتێک کە ڕێژیمی بەعسی عەراق دوژمن بوو و شای ئێران دۆست، دۆخەکە جیاواز بوو. هاوپەیمانییەکان و دوژمنایەتییەکان ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دەهات. بەڵام کوردەکان هیچ هاوپەیمانێکیان نەبوو و ئەم دۆخەش نەدەگۆڕدرا.

قاسملوو بەجوانی ئاگای لەم بابەتە بوو. ئەو بە بەردەوامی لە ڕەوتی سەفەرەکانی خۆیدا بۆ دەرەوە و بەتایبەتی بۆ ئورووپا، ئەوەی ئەزموون کردبوو. هەرچەند ئەو بەگشتی ڕێزی لێدەگیرا، بەڵام بەدەگمەن لەلایەن کۆبوونەوە و بنیاتە فەرمییەکانەوە وەردەگیرا. لە باشترین حاڵەتدا، بە کەڵک وەرگرتن لە دۆستایەتیی هەندێ لە هاوڕێ کۆنەکانی خۆی و کەڵک وەرگرتن لە پەیوەندیی خۆی لە ئەنتێرناسیۆنال سۆسیالیست، هەندێجار دەیتوانی بۆ گەلەکەی چەند داواکارییەکی مرۆیی هەبێت و یان لەسای مرۆڤێکی دەست ئاوەڵاوە چارەسەری کێشەیەکی دەکرد کە بۆخۆی ئۆگریی پێ هەبوو.

ئاغای ژان ـ فرانسوا دونیو (Jean –Fransois Deniau) لە وەزیرەپێشووەکانی ژیسکار دیستێن (Giscard d/ Estaing) بە خۆشییەوە دەیگێڕایەوە کە لە کاتی وەزیر بوونی ئەودا چلۆن قاسملوو بە مەبەستی وەرگرتنی یارمەتی لە حکوومەتی فەرانسە بۆ چاپی دووبارەی تاکە قامووسی فەرانسەوی ـ کوردی کە لە بازاڕدا نەمابوو، ژووری کارەکەی ئەوی نابوو بەسەریەوە. بابەتی دەگمەنی دیکەش وەکوو خانمی دانییێل میتێران (Daiele Mitterrand) هاوسەری سەرۆک کۆمار، و دوکتور بێرنارد کوشنێریش (Bernard Kouchner) هەبوون. دوکتور کوشنێر هەر لەوکاتەوە کە لەگەڵ پزیشکە فەرانسەوییەکان ناسراو

بــە «French Doctors» کاری دەکــرد، وەکــوو «دۆســتی کوردەکان» ناوبانگی دەرکردبوو. چەند کەســایەتییەکی دیکەش هەبوون کە کەمتر لەوان گرینگ بوون.

کاتێــک لەو بارەوە لەگەڵ قاســملوو قســەم کرد، جگە لــە تەنزێک لە هەڵسوکەوتیــدا کە بەشــێک بوو لە کەســایەتیی ئەو، هەســتم بە هیچ وەڕەز بوونێک نەکرد لە قســەکانیدا. قاسملوو ڕوونی کردەوە: «دەرک کردنی ئێمە، هەمیشەش کارێکی ئاسان نییە. پرسی کوردەکان، پرسێکی ئاڵۆزە. کاتێک تا ئەم ڕادەیە دۆستمان کەمە، دەبێ لەگەڵ دوژمنەکانمان نەرمتــر بین» بەڵێ، لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاســت پەندێک هەیە کە دەڵێت: دوژمنی دوژمنەکەم ..

لــە پەیوەنــدی لەگــەڵ بزووتنەوەکانــی کــورددا، ئــەم ســەربەندە کۆنوسواوەوەی ڕێئال پۆلیتیک، لە ماوەی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عــەراق و ئێــران، ڕەوتێکی خەماوی بەخۆوە گرتبــوو. جەلال تاڵەبانی، ڕێبــەری یەکێــک لــە دوو حیزبە ســەرەکییەکەی کوردســتانی عەراق پەنای بردبووە بەر تاران و لە لایەن کۆماری ئیســلامییەوە پشــتیوانی دەکــرا. قاســملووش هاتوچــۆی بەغای دەکرد و لە لایەن ســەدامەوە پشــتیوانی دەکــرا. قاســملوو و تاڵەبانی ماوەیەکــی دوور و درێژ بوو هاوڕێ بوون. ئەم دۆخە، دۆخێکی دڵخۆشــکەر نەبوو و قاسملوو زۆر کەم باسی دەکرد. لەو گفتوگۆیانەدا کە ئەو کاتە پێکەوە هەمانبوو، ئەو تەنیا جارێک و ئەویش بە پارێزەوە ســەبارەت بەو بابەتە قســەی کرد و بەتایبەتــی جەختــی لەوە کــردەوە کە کــوردەکان هاوپەیمانی کاتیی دوو لایەنی دژبەیەکن، لانیکەم، بە مەبەستی پێشگیری کردن لە شەڕی براکــوژی لــە هیچ هەوڵێک درێغی ناکەن. لە گەڵ ئەوەشــدا کە ڕێژیمی تاران حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و ڕێبەرەکەی بە «پێکهاتن» لەگەڵ «شــەیتانی گەورە» (لەو کاتەدا ئەم وشــەیە لەلایەن دەسەڵاتی تارانــەوە بە ئامریــکا دەگوترا - وەرگێــڕ) تاوانبار دەکرد، واشــینگتۆن هیچ هاودەنگی و ئۆگرییەکی ســەبارەت بە پرســی کوردەکان لە خۆی

نیشــان نەدەدا. هــەر چەند کە دیپلۆماســیی ویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئامریــکا لە کاتی شــەڕی کوردەکانی عەراق لەگــەڵ ڕێژیمی ئەو وڵاتە (نێوان ســاڵەکانی ١٩٧٥-١٩٦١لەکاتی مســتەفا بارزانی) بەهۆی تێبینییە ژێئۆســتراتێژیکەکان بەشــێوەیەکی تایبــەت چــالاک بــوو و دوکتــور کێسینجێر (Kissinger) ڕاوێژکاری ئەوکاتی پرێزیدێنت نیکسۆن (Nixon) لەبواری تەناهی نەتەوەییدا، لە کتێبی بیرەوەرییەکانی خۆیدا بە دوور و درێژی و بەشــێوەیەکی زۆر بێشەرمانە باسی دەکات، بەڵام هەرگیز لە پەیوەندی لەگەڵ کوردەکانی ئێراندا ئۆگری لەخۆی نیشان نەدا.

دوکتور قاســملوو بەهۆی ئەوەوە کە پێشــتر کۆمۆنیست بوو و یان پێیــان وابوو کە کۆمۆنیســتە، ڕێگــەی پێنەدەدرا بچێتــە ئامریکا و بۆ ماوەی ١٠ ســاڵ واتە هەتا ژوئیییەی ١٩٨٩، ئەم دۆخە، واتە ڕێگری لە چوونی بۆ ئەمریکا بەردەوام بوو. لە بەرەبەری سەفەرەکەی بۆ ڤییەن، عەبدولڕەحمــان بــە وردی ئامادەکاریــی بۆ یەکەمین ســەفەری خۆی دەکرد بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئامریکا، هەرچەند هیوایەکی ئەوتۆی بە دەرئەنجامی سیاسیی سەفەرەکەی نەبوو، بەڵام بۆ ناساندنی پرسی کورد، چاوەڕوانیی زۆری لە سەفەرەکەی هەبوو.

هەرگیز لە چۆنیەتیی و دەسکەوتی ئەو سەفەرە کە قاسملوو بڕیار بوو بۆ ئامریکا بیکات، ئاگادار نابینەوە. چونکە گرووپی بکوژە نێردراوەکان لــە تارانــەوە بڕیارێکی دیکەیان دا. بەڵام دەتوانین بە ئاســانی بیر لەوە بکەینــەوە کە قاســملوو دەیویســت چی بــۆ بەردەنگــە ئامریکاییەکانی ڕوون کاتەوە. دروشــمی حیزبەکەی قاســملوو «دێموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردســتانی ئێران» بەتەنیا درووشمێک نەبوو بۆ ئــەوەی لە کۆنگرەکاندا بدرێت و یان لەســەر لافیتــەکان و دیوارەکانی کوردســتان بنووســرێتەوە، بەڵکــوو دەرئەنجامــی بیرکردنەوەیەکــی واقیعبینانــە و درێژخایــەن بــوو. ئــەو زۆرجار بە لێکدانــەوەی ورد و دروست ئەو دروشمەی شی کردبووەوە و بەرگری لێکردبوو.

کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٧٩م بەباشی بیردێتەوە. لەو ڕۆژەدا، قاسملوو

لە گوندێکی بچووک و ونبوو لەنێو شــاخەکانی کوردســتاندا، لەبەردەم من و دوو ڕۆژنامەنووس، یەکیان لە هەواڵنێریی فەرانسە (AFP)، ئەوی دیکەیــان لە ڕۆیتێــرز (Reuterz)، لەو بــوارەوە ڕوونکردنەوەی دا. ئەو ڕۆژە، چەنــد ڕۆژێــک پاش ئــەوە بوو کە مەهاباد لــە لایەن هێزەکانی ڕێژیمەوە دەستی بەسەردا گیرا.

ئەو نەخشــەیەکی کردبووەوە، بەئاماژەی دەست، نەخشەی هێماییی (ســیمبۆلیک) وڵاتێکی لەوپەڕی سنوورەکانی ئێران، عەراق و تورکیەی کێشا و گوتی: «ئەمەکوردستان، نیشتمانی مێژوویی کوردەکانە. لەسەر ئەم گۆی زەوییە، ئێمە پڕحەشــیمەتترین نەتەوەین کە لە سەرەتاییترین مافەکانــی بێبەش کــراوە. بەڵێ، ئێمە نەتەوەیەکین کــە خاوەنی مێژوو، زمــان و کولتــووری تایبەت بە خۆیەتی» پاشــان، بــە پەنجە ئاماژەی بــۆ لووتکــەی ئــەو شــاخانە کرد کــە بەدەور ئــەو گونــدەوە بوون و گوتــی: «وڵاتی عەراق، لەودیوی ئەم شــاخانەوەیە. ئــەو خەڵکەش کە لــەوێ دەژین هەر کــوردن. ئەوێش هەر ماڵی ئێمەیە. ئەم ســنوورانە، سنووری ئێمە نین». تۆزێک وەستا، وەک بیەوێ دەرفەتی بیرکردنەوە ســەبارەت بەو شــتانەی گوتبووی بە ئێمە بدات. دواتر دەســتیکردەوە بە قســەکردن و گوتــی: «ئەوەش دەزانم کە چیدیکــە ناتوانین ئاوا بیر بکەینــەوە. حکوومەتێکــی کــوردی کە لە چوار لاوە گەمــارۆ درابێت و ڕێگای بەرەو دەریاشــی نەبێت، ناژی و بــەردەوام نابێت و بنیات نانی دەوڵەتێکی کوردی کە نەخشــەی ناوچەکــە تێکبدات، دەبێتە هۆی ترس و تۆقینــی هەموو لایەک». ئەو وێــڕای ڕوونکردنەوەی زیاتر، دەیگوت کــە لــەو ســاڵانەی کۆتایی ســەدەدا کە یەکێــک لــە تایبەتمەندییەکانی سەلماندنی نەتەوەکانە، هیچکەس بیرۆکەی دابەش بوونی سێ دەوڵەت بۆ دروســتبوونی دەوڵەتی چوارەم» قبووڵ ناکات و پاشــانیش گوتی: «ڕێگاچارەی دروست و گونجاو بریتییە لە خودموختاری، بەڕێوەبەریی خۆجێیــی بەدەســتی خۆمان و پەروەردە و ڕاهێنــان بە زمانی خۆمان، لەچوارچێــوەی ئێرانێکــی دێموکراتیک و لــە هاوئاهەنگی لەگەڵ دیکەی

گەلانی ئەم وڵاتەدا». لەڕاستیدا قاسملوو دێموکراسی و خودموختاریی بۆ هەموو گەلانی ئێران دەویست و ئەوەی لە بەرژەوەندیی هەمووان دەزانی.

بێگومان ئەوەش، ئەو شتە نەبوو کە ڕێبەرانی کۆماری ئیسلامی بیریان لێ‌دەکردەوە. لە ڕوانگەی خومەینییەوە، کورد، فارس، ئازەری، تورکمەن، بەلووچ و عەرەب بوونی نەبوو، بەڵکوو یەک گەل هەبوو و ئەویش گەلی موسوڵمان بوو. لە ڕوانگەی ئەوەوە، دێموکراسیش ئیدئۆلۆژییەکی پەست، ڕزیو و گەندەڵ بوو کە لە ڕۆژئاواوە بە مەبەستی دروست کردنی جیاکاری لەنێوان خەڵکدا هاوردە کرابوو. لەوەش زیاتر، دژبەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە تاران، دروشمی ئەوحیزبەیان بە چەواشەکارانە و سەرپۆشێکی کاڵفامانە بۆ لێکترازانی ئێران دەزانی، کە حزب ورەی ئەوەی نییە ڕاشکاوانە دانی پێدابنێ و ئەوەی کە خودموختاری داواکراوی حیزب، یەکەم هەنگاوە بەرەو خواستی «کوردستانی گەورە»، پێکهاتوو لە کوردەکانی ئێران، عەراق، تورکیە و تەنانەت سورییە و یەکیەتیی سۆڤییەتی سوسیالیستی، و پێویستە پێش لەوەی ئەو ئاژاوە و فیتنەیە پەرەبسێنێت، خاشەکێش بکرێت. لەو بوارەوە تەنانەت «لائیک»ەکانی ڕێژیم، وەک ئەبۆلحەسەن بەنی سەدر ـ کە پاشماوەیەکی کورت وەک یەکەمین سەرۆک کۆماری کۆماری ئیسلامی هەڵبژێردرا و دواتر ئەویش بە نۆبەی خۆی لە لایەن خومەینییەوە وەلانرا ـ یش لەگەڵ «هێڵی ئیمام» هاوڕا بوون. سەبارەت بە دەرکردنی فەتوای مەرگی قاسملووش، هەموویان هاوڕا بوون و ئەم فەتوایە، ١٠ ساڵ دواتر، لەلایەن جێنشینەکانی خومەینییەوە جێ‌بەجێکرا. قاسملوو، وەکوو پرەنسیپێک، لە توندوتیژی بێزار بوو، سەرەڕای ئەوەش، لە توندوتیژی دوورەپەرێز نەبوو. ئەو لەوکاتەدا بزووتنەوەیەکی چەکداریی تا ڕادەیەک بەهێز و بەشێوەیەکی بەرچاو بەدیسیپلینی لە هەلومەرجێکی زۆر سەختدا و بەکردەوە لە دۆخی شەڕێکی بەردەوامدا، ڕێبەری دەکرد، شەڕێک کە سەرەڕای ئاگربەستە

کەم و زۆر درێژخایەنەکان، لە هەر ئان و ساتێکدا ئەگەری هەڵایسانی لێدەکرایــەوە. نهێنی کاری و کۆچکردنە بەردەوامەکان لە شــوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە، زۆربەی کاتەکان بەشێک بوون لە ژیانی ئەو. هێلێن کرۆلیــش لە کتێبەکــەی خۆیدا، باس لە ڕێژەیەکــی زۆر لەو جێگۆڕکێ بەردەوامانە دەکات. بەشــێکی گەورە لە لێهاتوویی قاســملوو لە بواری ڕێبەریدا، بۆ ڕێکخستنی بەرگری تەرخان کرابوو.

لەگەڵ ئەوەشــدا، ئەو بڕوای بەوە هەبوو کە پرســی کورد لە ڕێگەی شــەڕی چەکدارییەوە چارەسەر نابێت و هەمیشــە دووپاتی دەکردەوە کــە: «ڕەنگە ســەرکەوتن بەدەســت نەهێنیــن، بەڵام ئەوانیــش ناتوانن بەچۆکمانــدا بهێنن و لەپێمــان بخەن»، بە وتەیەکــی دیکە، حکوومەتی ناوەندی دەیتوانی دەســت بەسەر شارەکانی کوردستاندا بگرێت، بەڵام خەباتی کوردەکان لە شــاخەکان هەرگیز شکســت ناهێنێت و دەیگوت: «مەگــەر ئەوەی ئەوان بتوانن شــاخەکانمان تەخت بکەن و نەیهێڵن». ئــەو بڕوای بــەوە هەبوو کە دەبێ ڕۆژێک لەڕێــی دیالۆگەوە بەئەنجام بگەن و ئەوەی ئەمڕۆکە بەهیچ شێوەیەک قبووڵ ناکرێت، ڕەنگە سبەی، کاتێک دوو لایەنی دژبەر بەو دەرئەنجامە بگەن کە ســازان باشــترە لە شەڕێکی کاولکەر، دەگاتە ئەنجام.

بێگومان، ئەم باوەڕە ڕیشەدار و پتەوەی قاسملوو، لە بەرەکەی خۆیدا کۆدەنگیــی لەگەڵ نەبوو. ڕەخنەگرە میانەڕەوەکان بە «ڕیفۆرمیســت» بوون تاوانباریان دەکرد کە دیارە ئەو تاوانە لە ڕوانگەی قاســملووەوە پێداهەڵگوتن و وەسفکردن بوو، بەڵام لەو برگە زەمەنییەدا سووکایەتی پێکردنێکی سیاســی بوو. توندترین ڕەخنــەکان لەلایەن بزووتنەوەکانی دیکە و ئەوکەســایەتییە کوردانەوە کە کەمینە بوون، لە عەبدولڕەحمان دەگیرا. ئەوان تا ئەوڕادەیە زێدەڕۆییان دەکرد کە بە سازشــکار ناویان دەبرد و تەنانەت هەندێ کەس باسی «خەیانەت»یان دەکرد. بیرەوەریی ســتالین، هێشــتاش بەلای ڕێژەیەک لە گرووپە چەپــە ئەوپەڕگیرەکانی ئێرانەوە مابووەوە. ئەم تاوانە گاڵتەجاڕ و ســاویلکانانە کە تێگەیشــتنی

بــۆ خوێنەری ئەمڕۆکە جێی باوەڕ نییە، لەخۆیدا دەرخەری پانتای ئەو کێشــانە بوو کە عەبدولڕەحمان قاســملوو بۆ ڕێبەرایەتی کردنی حیزب و دوورکەوتنەوە لە شــەڕی براکوژی کە بە گشتی خەساری زۆری بە بزووتنەوەی کورد گەیاندبوو، دەبوو ململانێیان لەگەڵ بکات.

کارێکــی ئاســان نەبوو، کوردســتانی ئێران کە لە لایــەن حکوومەتی ناوەندییەوە هیچ ئاوڕێکی لێ‌نەدرابووەوە، ناوچەیەکی پەرەنەســەندوو بوو و لەو ڕووەوە، کۆماری ئیســلامیی ئێران باشــتر لە ڕێژیمی پێش خۆی نەبوو. مۆدێرن بوونی ڕێژەیی شاری مەهاباد، لە دەروازەی شار ئەولاتر نەبوو. قاســملوو دەبوو لەگــەڵ کۆمەڵگەیەکی «دواکەوتوو»ی دابــڕاو لە دونیا، بێبەش لە مافــی بڕیاردان، بێبەش لە خوێندن بەزمانی زگمــاک، هەڵبڕاو لە کولتووری خۆی و لەوەش زیاتر، پشتبەســتوو بە نەریتەکان و سەرۆک عەشیرەتەکانی خۆی، بسازێت و خۆی بگونجێنێت. بەوحاڵەشەوە، ئەو لەو کۆمەڵگەیەدا هەستی بە نامۆبوون نەدەکرد.

ئــەو بەدەگمــەن، لەشــوێنێکی دیکــە بەقــەدەر ئــەو کاتــەی لەگــەڵ هاونیشتمانەکانی خۆی بوو هەستی بە ئاسوودەیی و ئارامی دەکرد. بۆ نموونە: جارێکیان لە کوێرەدێیەک بەشێوەی کاتی پەنای گرتبوو، بینیم کــە چلۆن لەگەڵ گوندییەکان ڕێک وەکوو ئەندامێکی بنەماڵەکەیان، نانی دەخــوارد و گاڵتە و گەپی لەگەڵ دەکردن. لەو ڕووەوە کە زمانەکەیانم نەدەزانــی، نەمدەتوانــی لە ناوەرۆکــی قسەوباســەکانیان تێبگەم. بەڵام هەرچــی بوو، ئەوان لــە ناخەوە پێدەکەنین و قاقایــان لێ‌دەدا. دووپات بوونەوەی ئەو دیدارانەش خۆی بوو بە بەشێک لەو ساتانەی فەرامۆش ناکرێن. لە مەودایەکی نزیکی ئێمەوە، هێلی‌کۆپتێرە شەڕکەرەکانی ئێران کە بە نزمی و نزیک لە زەوی دەسووڕانەوە و بەدوای هێزەکانی ئەودا دەگەڕان، وەبیری دەهێنانەوە کە بەو نزیکانە شــەڕ هەڵدەگیرسێتەوە. ئــەوەش، دەرفەتێکی دیکەی ڕەخســاند بۆ ئەوەی بەشــێکی دیکەش لە تایبەتمەندییــە بەرچاوەکانی ئەم پیاوە و ئەم ڕێبەرە بناســم کە ئاماژە بــە هەندێکیان دەکەم. بیرەوەرییەکی دیکەم لەبیــرە کە دەگەڕێتەوە بۆ

زســتانی ١٩٨٠. ئەو ڕۆژنامەنووســانەی لەو کاتەدا لــە ئێران بوون، لە نێــوان تاران و تەورێزدا کە شــوێنی پێکدادانــە ڕەش و توندوتیژەکانی لایەنگرانــی خومەینی و شۆڕشــگێڕە ئازەرییــە لایەنگرەکانی ئایەتوڵڵا شــەریعەتمەداری بوو، لە هاتوچۆدا بوون. لەگەڵ ئاواڵێکی هاوپیشەی خۆمدا بەنێوی جاناتان ڕاندال کە نێردراوی ڕۆژنامەی واشینگتۆن پۆست بوو و ڕۆژنامەنووســێکی کارامە و یەکێک لە باشــترین کارناســەکانی پرسی کورد لە دونیادایە، پاش بەجێهێشتنی تەورێز بە مەبەستی بینینی عەبدولڕەحمان، ڕێگایەکی پێچەوانەمان هەڵبژارد و گەیشــتینە گوندێک لــە نزیکەی ورمێ کە نێوەکەیم لەبیر نەمــاوە. بیرم نایەتەوە کە ڕاندال چلۆن لەڕێی پەیوەندییەکانییەوە توانیبووی پەیوەندی بە قاســملووەوە بگرێت. لەو ڕۆژەدا، قاسملوو لەو گوندە لەگەڵ کەسایەتییە ناوچەیەکان، ڕێژەیــەک لە کادرەکانی حیزب و ڕێژەیەکی بەرچاو لە ســەرکردەکانی عەشایەرەکان کۆبوونەوەی هەبوو. کاتێک ئێمە گەیشتینە گوندەکە، شەو داهاتبوو، کاتێکیش گەیشتینە هۆڵەکە، کۆبوونەوەکە لە تەواوبووندا بوو. پێش نانی ئێوارە، لەســەر مەجوعمەکان، چایی، ئاومیوە و ســۆدا دانرا بوو. میواندارەکەمان (قاســملوو) بە گاڵتەوە گوتی: «کاتی خواردنەوەی ئەو خواردنەوانەیە کە ئیشتیامان دەکاتەوە، بەڵام لێرە کەس مەشرووب ناخواتەوە» پاشــان گوتی: «دیارە ئەم بڕیــارە بیانییەکان ناگرێتەوە» هێشتا وتەکەی تەواو نەکردبوو کە بتڵێک ویسکییان هێنا. نە جاناتان و نە من، هیچکاممان، حەزمان لە ویسکی نەبوو، بەڵام دیارە ئەوە ڕێزێکی تایبەت بوو کە لە ئێمە نرابوو.

هەرچەند زۆربەی کوردەکان موســوڵمانی «سوننە»ن، بەڵام داب و نەریتە مەزهەبییەکان زۆر بە قورســی وەرناگرن. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە لە کۆبوونەوەیەکدا بووین کە کەســایەتییە سوننەکان و چەند کەسێکی ئاینییشــی لێبــوو. هەربۆیــەش، بەڕاســتی گونجاو نەبوو ڕێوشــوێنە ئاینییــەکان لەبەرچــاو نەگرین. ئــەم چیرۆکە، ڕەنگە زۆر ئاســایی بێتە پێشچاو. بەڵام ئەگەر وەبیری بێنینەوە کە لەو کاتەدا پۆلیسی ئیسلامی

و یان شــتێکی وەک ئەو ناوە، ســەبارەت بە هەموو شتێک و لە هەموو شــوێنێک کەشــێکی تۆقێنــەری خولقاندبوو و هەرکەســێک کە گومانی شــکاندنی ئەو بڕیارە توندئاژۆیانەی لەسەر بوایە، بەتوندی سزا دەدرا، ئەوسا تێدەگەین کە ئەو چیرۆکە لەجێی خۆیدا گرینگە. لە تاران شتێکی وەها نەبوو. لێرە هەبوونی بتڵێک ویسکی، لەڕاستیدا، دەرخەری بەهایەکی پێداگوژیک بوو. قاسملوو، بەو شێوە، دەیویست هەموو لەوە تێبگەیەنێت کە هەر کەســێک ئازادە، بەپێی ویژدانی خــۆی هەڵسوکەوت بکات، بە بێئەوەی مافی ئەوەی هەبێت بۆ چوون و یاسای خۆی بەسەر خەڵکی دیکەدا بسەپێنێت. ئەو کردەوە، لە ڕاستیدا، بەجۆرێک وانەیەکی بچووک لە لائیسیتە و تولێرانسی دەنواند و ئەویش بە بێ پەنابردنە بەر هەرا و زەنا و وتاردان و خوتبە دادان. دیارە، مەبەســتی عەبدولڕەحمان ئەوە نەبوو کە ببێتە هۆی شۆک بوون و بزواندنی کەسایەتییە سوننەکان کە بڕیــار بوو پێکەوە نان بخۆین. جگە لــەوەش، گومانی تێدا نەبوو کە لە نێوان ئەو کەســایەتییانەدا، کەسانێک هەبوون کە «جاش» بوون، واتە هاوکاریــی ڕێژیمیان دەکرد و زانیارییــان بۆ دەناردنەوە. هەر بۆیەش، شــکی تێدا نەبوو کە ڕێژیم لەڕێی ئەم ســیخوڕ و جاشــانەوە زانیاری دەســتدەکەوت کە ڕێبەری کوردەکان بە خۆشــیی نوێنەرانی شەیتانی گــەورە و شــەیتانی بچووک (لەوکاتەدا ڕێژیمی ئێران، نێوی شــەیتانی گەورەی لە ئامریکا و شەیتانی بچووکی لە فەرانسە نابوو)، خوانی مەی خواردنەوە دەڕازێنێتەوە. قاســملوو بەم کردەوەی خۆی، دەیویست بە هەموویان و لەوانە، ڕۆژنامەنووسە بیانییەکان نیشان بدات کە «جیاواز بوونــی کوردەکان» تەنیا دروشــم نییە و ســەرەڕۆیی ئیســلامی لێرە نایبڕێت.

دیــارە چیرۆکــی مــەی خواردنەوە، تەنیــا نمونەیەکی بچــووک بوو. ڕێبەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵ ئاریشەی جیددیتر وەکــوو دابونەریتی کۆنوســواو، قورســایی نەریتە عەشــیرەییەکان، پێگــەی ژنان لــە کۆمەڵگەدا و...هتد لــە ململانێدا بــوو. بێگومان ئەو لە

ڕێکخستنی حیزبەکەیدا ئەو بابەتانەی لەبەرچاو بوو، بەڵام هەرگیز ئەو ئاریشـــەگەلەی نەدەکردە دەســـتەچیلەی کردەوەیەک کە لەگەڵ باوەڕە ڕاگەیەندراوەکانی خۆی لە دژایەتیدا بن.

ئەو هەرگیز لەو زمانە دووفاقیەی کە لە تاران و لەناو ئەم ڕێبەرانەی تـــازە لـــە تاراوگە گەڕابوونەوە و بـــە تایبەتی لەنـــاو «لائیکەکانی هێڵی ئیمام»دا باو بوو، کەڵکی وەر نەدەگرت، زمانێک کە ڕێبەرانی نوێی تاران بـــە کەڵک وەرگرتن لەوە، ڕاگەیەنـــدراوە بەناو دێموکراتیکەکانی خۆیان دەرخواردی خەڵک دەدا و بەتایبەت فێڵیان لە بەردەنگە ئورووپاییەکانیان دەکرد و بەنێوی «شۆڕش» پاساویان بۆ دڕندانەترین سەرکوتەکانیان دەهێنایەوە.

لەکاتـــی گەڕانـــەوە لە کوردســـتان، یەکێک لەم ڕێبـــەرە نوێیانە کە لە کۆنـــەوە لە پاریس دەمناســـی، بانگـــی کردم بۆ ئەوەی ســـەبارەت بەو شـــتەی کە لە بارەی شـــەڕ و هەڵسوکەوتی هێزەکانی ڕێژیم، بەتایبەت «دادگاکانـــی شـــۆڕش» نووســـیبووم، ناڕەزایەتیی خـــۆی دەرببڕێت و لۆمەم بکات. ئەو دەیگوت کە من لە دەرئەنجامی ڕوانگەی بەرتەســـکی ڕۆژئاوا سەبارەت بە مافی مرۆڤ گومڕا کراوم»و توانای تێگەیشتن لە «ڕیشـــە گەلییەکانی شۆڕش»م نەبووە و ئەوەش کە «تۆ لە ئێران هیچ تێنەگەیشـــتوویت» و دواجاریش ئەوە کە «(حاکمی «گەڕۆک» سادقی خەڵخاڵی) بۆ گەلی ئێمە وێناکەری غەززەبی خودایە».

ئەگەر بڵێم کە قاسملوو لەو جۆرە مرۆڤانە نەبوو، کەمم گوتووە. لانیکەم سەبارەت بەو نموونەیەی کە بۆ خۆم شاهێدی بووم و هەروەها لەسەر بنەمای گێڕانەوە وێکچووە بەراورد کراوەکان کە لەو ســـەردەمەدا کۆم کردبووەوە، دەتوانم شـــاهێدی بدەم کە بیرم نایە لەلایەن کوردەکانەوە هیچ چەشـــنە ســـەرکوت و یان ئێعدامێکی دەســـتبەجێ لەدژی زیندانیی دوژمنەکانیـــان و یـــان لەدژی ئەو کەســـانەی کە هاوکاریـــی دوژمنیان دەکـــرد، ئەنجـــام درابێـــت. قاســـملوو ئـــەوەی ڕاگەیاندبـــوو و بۆخۆی چاوەدێـــری دەکـــرد. ئەم بابەتـــە پێگە و کەرامەتی ئـــەو بزووتنەوەیەی

دەبــردە ژێر پرســیار کە ئەو ڕێبەریی دەکرد. چونکــە مرۆڤ ناتوانێت لەلایەکــەوە بۆ دەســتەبەرکردنی ئارمانجێک خەبات بــکات و لەلایەکی دیکەشەوە، بەنێوی پێویستی خەبات، چاوپۆشی لە لادان و هەڵەی ئاوا بکات.

بەرنامــەی حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران لــە خودموختاریدا کــورت نەدەکرایەوە. ئــەم بەرنامەیــە کۆمەڵێک لە ئامانجــە ئابووری، کۆمەڵایەتــی و فەرهەنگییەکانی لەخۆ دەگرت کــە بەرابەریی نێوان ژن و پیاو، پەروەردە و بارهێنانی زۆرەملی بۆ هەمووان، ئازادی سیاســی و مەزهەبی، جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت و ســەربەخۆیی دەســەڵاتی دادوەری لەوانــە بوون. ئــەم ئامانجانە، درێژخایەن و لــە هەمانکاتدا، هەڵگری بەهاگەلێک بوون کە بە باوەڕی قاســملوو دەبوو لە ئێستاشــدا بەکردەوە بکرێن. قاسملوو بە جوانی دەیزانی کە ئەو دابونەریتانەی بە درێژایی تەمەنی بەرەکان جێگیر بوون و هەروەها ئەو چەوســانەوەی کە دەرحەق بە ژنان و کچان دەکرێت، بە نووکی خامە ناســڕدرێنەوە، بەڵام هاوکات، هەمیشە ڕێگاچارە و ئیمکاناتێک هەن کە مرۆڤ دەتوانێ لەڕێی ئەوانەوە نیشــانی بدات کە دیاردەکان ئەگەری گۆڕینیان هەیە و نەریتە چەند سەد ساڵەکان، یاساگەلێکی هەرماو و نەگۆڕ نین.

بەهەرحاڵ، قاســملوو لە هەر دەرفەتێکــی گونجاو کەڵکی وەرگرت و لــە هیچ هەوڵێــک بۆ جێگیرکردنی ئەو بەهاگەلە دەســتی نەدەگێڕایەوە. لەبیرمە کە ڕۆژێک لەهەمان گوندی بچووک، قاسملووم بینی کە لەسەر کێشە شەخسی و نهێنییەکانیان سەرقاڵی ناوبژیوانیی لە نێو خەڵکەکەدا بوو. من تەنیا هەستم بە ئاڵۆز بوونی بابەتەکە دەکرد، چونکە باسەکان تێکەڵ بە هەراوزەنا و قەرەباڵغی بوون. بە وردی نەمدەزانی سەبارەت بــە چی قســە دەکەن، بەڵام ئەوەندەی تێگەیشــتم، کێشــەی نێوان دوو بنەماڵە بوو لەســەر بابەتگەلێک وەک هاوســەرگیری یان جیابوونەوە. بەڵام لەو ڕووەوە کە دیلمانجی لێ نەبوو، لەوە زیاتر هیچ تێنەگەیشتم. بێگومان بابەتەکە ببووە هۆی هەڵچوونی کەسانی تێوەگلاو لەو کێشەیە.

قاســملوو بە سەبر و تاقەتەوە گوێی بۆ قسەی هەموویان شل کردبوو و تەنانــەت داوای لــەو کەســانەش کە تــا ئەوکاتە قســەیان نەکردبوو دەکرد قسەی خۆیان بکەن، لەوانە ژنێک هەبوو کە قسەکانی بە ئاشکرا دەبووە هۆی بێزاریی بەشــێکی زۆری ئامادە بووان، بەڵام ناچاربوون هەتاکۆتایــی گوێ لە قســەکانی بگرن. کاتێک ســەبارەت بەو ڕووداوە پرســیارم لە قاســملووکرد، بەگاڵتەوە وەڵامی دایەوە: «دەڵێن شۆڕش لــە وڵاتێکــدا هەرگیز ڕوونادات. من بەوەش ڕازیم کە ئەو شۆڕشــە لە گوندێکــی بچووکدا تاقی بکەمەوە. ئێــوە بینیتان کە ژنانی ئێمە خاوەنی چ تواناگەلێکن».

قاســملوو لە هەموو بوارێکەوە کەسایەتییەکی دەگمەن و هەڵکەوتوو بــوو، هەم وەکــوو ڕێبەری یەکێک لــە لەمێژینەتریــن و جێگرتووترین بزووتنــەوە ڕزگاریخوازانــەکان لە نێــوان گەلەکەیدا و هــەم لە بواری هەڵکەوتوویی خۆیەوە، بەرفراوانی ڕوانگە نێونەتەوەییەکان و ئەو توانا دەگمەنەی کــە هەیبوو. ئەم تایبەتمەندییانە ڕێگەی پێدەدا کە وێناکەری نەریتــەکان و بەهــا لەمێژینەکانی گەلەکــەی لەناو بەهــا جیهانییەکانی کۆتایــی ســەدە، واتە ئــازادی و دێموکراســی و جیهانگەرایی بێت. ئەو بــۆ هەمــوو خەڵکەکە، کەمتر ناســراو بوو و خەڵکێکــی زۆر تەنیا پاش مەرگەکەی لەبوونی کەسایەتییەکی ئاوا ئاگادار بوونەوە.

دیارە ئەوە، بەو مانایە نییە کە ئەو پیاوێکی گۆشــەگیر و پڕ لە ڕەمز و ڕاز بــوو. ســکرتێری گشــتی حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران، زیاتــر لەوەیکە ڕێبەرێکی شــەڕکەر بێت، ڕێبەرێکی سیاســی بوو. ئەو پیاوی تێکەڵبوون و دیالۆگ بوو. ئەو بۆ دەستەبەرکردنی ئارمانجەکەی، سەرتاسەری دونیای ژێر و ژوور دەکرد. هەرگیز بەقەدەر ئەوکاتانەی کــە لەگــەڵ پێشــمەرگەکانی لــە کوخێکی گڵینــە و لەقووڵایــی دۆڵێکی دوورەدەست لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران و عەراق دەژیا، کەیفی ساز نەبوو. لەم ناوچانەدا زۆرتر لەلایەکەوە بۆ لایەکی دیکە شــوێنەگۆڕکێی دەکرد، بەڵام هەمیشــە کتێبخانەکەی لەگەڵ خۆی بۆ شــوێنە نوێیەکەی

دەگواستەوە.

قاســملوو عاشــقی کتێبی چاک و شــەرابی چاک بوو، بەڵام هەمیشە یەکەمەکەی بەلاوە گرینگتر بوو. ئەو چ لە پشت مێزی نان خواردن بوایە لە بەرهەیوانێکی پاریس و چ خواردنێکی ســادەی لە بەردەستدا بووایە لە زســتانێکی تووشی شــوێنێکی دوورەدەستی شاخەکانی کوردستان، بە یەک ڕادە هەســتی بە ئاســوودەیی و ئارامی دەکرد. ئەو لە تەمەنی ٥٩ ســاڵدا ـ ٢٢ی دێســامبری ١٩٨٩، تەمەنی دەبووە ٥٩ ساڵ ـ ئارامیی بیرمەندێکــی ڕۆژهەڵاتــی، جووڵــە و زیندوویەتــی لاوێک، پرســۆکیی زانستنامەنووســێک و ئیشــتیای مرۆڤێکی شــادمان و ســەرزیندووی پێکــەوە هەبوو. قاســملوو لە پەیوەنــدی لەگەڵ باوەڕەکانیــدا، نەرمیی نەدەنواند و لەسەرپەرەشتی کردنی شۆڕشگێڕەکانیدا پراگماتیست بوو، وادیار بوو کە بە ئاســانی، ئەو سەرســەختییانەی لە خەباتی سیاســی ـ نیزامیــدا، پێویســتین، بە دڵەڕاوکێ وردەکانی مامۆســتایەکی زانکۆوە (پیشەی پێشووی) گرێ دەداتەوە.

ئــەو کە پلەی دوکتــورای هەبوو لە بواری ئابووریدا، عاشــقی تاریخ و ئــەدەب بــوو و شــارەزاییەکی وردبینانەشــی لە شــیعری کوردی و عەرەبیــدا هەبوو. هاوکات، بەحەزەوە بــە هێنانەوەی، وتە و بورهان و شاهێد، باسی هۆگۆ (Hugo)، بوودلێر (Baudelaire)، واڵت وایتمەن (Walt Whitman) و تووماس ئێلیۆتی (Thomas Eliot) دەکرد. قاسملوو مرۆڤێکی خاکەڕا، ڕۆشــنبیر، بە بیــری کراوە و ئامــادەی خزمەتکردن بە خەڵک بــوو. ئەو لە کەڵک وەرگرتن لە تەنــز و گاڵتەدا، وەکوو لێهاتووییەکەی لە بەکارهێنانی شــەش زماندا، وەکوو زمانی قســە پێکردن و نووسین، کارامە بوو. هەموو ئەو کەســانەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان قاســملوویان بینیبێت، بەم دەســتەواژانەوە قســەی لەســەر دەکەن. هەموو، بریتی لە لایەنگرەکانی ئەو بزووتنەوەیەی کە ئەو ڕێبەریی دەکرد، ڕۆشنبیرەکان، پزیشکەکان، سەفیرەکان، وەزیرەکان و سیاسەتمەدارەکانی حیزبەکان، بە چەپ و ڕاســتەوە، هەرکە گفتوگۆیەکی تەنانەت دووریشــیان لەگەڵ

ئــەو وەبیر بێتــەوە، دان بەوەدا دەنێن کــە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی قاسملووەوە. لەم سەدەیەدا (سەدەی بیستەم) کەمتر کەسێک دەتوانێت بڵێت کۆدەنگییەکی ئاوا لەســەری هەیە. زیاتر لە بیســت ســاڵ بەســەر کوشــتارەکەی ڤییەندا تێپەڕیوە. هێشتاش جینایەتەکە بێسزا ماوەتەوە. بێگومان، دوکتور قاسملوو مەبەستی سەرەکی ئەم جینایەتە بوو. بەڵام ئــەو تاکــە قوربانی نەبوو. هــەردوو هاوڕێکەی، واتــە عەبدوڵڵا قادری ئــازەر، نوێنەری حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێــران لە ئۆرووپا و پرۆفســیۆر فازڵ ڕەســوولیش، کــوردی عەراقیی دانیشــتووی ڤییەن، کە لە ڕێکخســتنی ئــەو دیدارەدا ڕۆڵــی هەبووە کوژران. بە کوشــتنی شــاهیدەکان، بکوژەکان دەیانویســت جینایەتێک ئەنجــام بدەن کە هیچ بەڵگەیەکی لەدوا بەجێ نەمێنێ. جگە لە بەشــداربووانی ئەو دانوســتانە، هیچ کەســێکی دیکــە لەشــوێنی کۆبوونەوەکە ئــاگادار نەبــوو. ئەگەر یەکێــک لە ئێرانییــەکان بەهۆی دەســتەپاچەیی و شــڵەژانی خۆیانەوە برینــدار نەبووایــە، کەشــف کردنی ئــەو جینایەتە چەندیــن کاتژمێری دەخایاند و بەو شــێوەیە، جینایەتکارەکان کاتی پێویستیان لەبەردەستدا دەبــوو بۆ ئەوەی بەبێکێشــە ئەو وڵاتە بەجێبهێڵــن. بەڵام وەک دەڵێن، زیخێــک لە پێڵاوەکــەدا مابووەوە و پاش ڕێکخســتنەوەی ئەو دۆخەی کە کوشــتارەکە تێیدا ڕوویدا بوو، ناســینەوەی شوناســی بکوژەکان و پشتڕاست کردنەوەی ئەوەیکە گومانی تێدا نییە کە ئەو جینایەتە لەلایەن دەوڵەتێکــەوە ئەنجامــدراوە، بە بێکات بەفیڕۆدان و بێکێشــە جێبەجێ کرا.

پۆلیســی ئۆتریش، پــاش خاوەخاو کردن و خۆ لــەکار دزینەوەیەکی درێژخایــەن، دواجــار لە مانگــی نۆڤامبــری ســاڵی١٩٨٩دا، واتە پاش چوارمانگ، ســزای دەستبەســەرکردنی نێونەتەوەیی لە دژی ئەندامانی باندی بەشــدار بوو لــەو کۆبوونەوەدای ڕاگەیاند. ئەم ســزایە هەرگیز جێبەجێ نەکرا. بکوژەکان لەمێژ بوو گەڕابوونەوە بۆ ئێران. سەرپەرەشتی بانــدی بکــوژەکان، پلــەی بەرزکرایــەوە و پۆســتی باڵای پێــدرا. پێش

لەوەش، دەسەڵاتی سەرەڕۆی ئێران پێرستێکی دوور و درێژی لە کوشتنی دژبەرەکانی خۆی لە دەرەوەی وڵات، لە کارنامە ڕەشەکەی خۆیدا تۆمار کردبوو و کوشتنی قاسملووش دواهەمینی نەبوو. لە١٧ی سێپتامبری١٩٩٢دا، دوکتور سادقی شەرەفکەندی، جێگرەوەی دوکتور قاسملوو، لە ڕێستوورانتێک لە بێرلینی ئاڵمان کوژرا. گۆڤاری تایم، ساڵی ١٩٩٤ وێڕای بڵاو کردنەوەی لێکۆڵینەوەگەلێک ئاشکرای کرد کە لە ساڵی ١٩٧٩وە تا ئەوکاتە، زیاتر لە ٦٠ دژبەری ڕێژیمی ئێران، لە دەرەوەی سنوورەکانی ئێران کوژرا بوون.

کاتێک دەڵێم جینایەتی دەوڵەتی، مرۆڤ دەستبەجێ بیری بەلای سود و بەرژەوەندی و هۆکارە دەوڵەتییەکاندا دەچێت. بێگومان کۆماری ئیسلامیش لەو وڵاتانەدا کە نێردراوە جینایەتکارەکانی، جینایەتیان خولقاند، هۆکاری پتەویان بۆ ڕازیکردنی ئەو وڵاتانە بەدەستەوە بووە، چونکە بەگشتی، نە بەدواداچوونیان بۆکرا و نەدادگایی کردنێک هاتە ئاراوە و ئەگەریش بە دەگمەن دادگایی کردنێک وەک ئەوەی لە بێرلین کرا بەڕێوەچوو و بکەرەکانی جینایەتەکان دادگایی کران، لایەنی سکاڵاکەر، هەرگیز نەیانتوانی ئەو کارگێڕ و شاهێدانەی کە بە فەرمی دەوڵەتی ئێرانیان تاوانبار دەکرد بەوەیکە دەستیان لەو جینایەتەدا هەیە، لەسەر کورسیی شاهێد دانیشێنن. لە هەموو ئەو وڵاتانەدا، سەرەڕای ئەوەیکە دەزگای دادوەرییەکەیان ناوبانگی سەربەخۆییان دەرکردووە و تەنانەت هەندێجاریش دادوەرێک یان سەردۆزگەرێکی (دادستان) چاوقایم هەڵدەکەوت کە بۆ جێبەجێ کردنی دادپەروەری پێداگری دەکرد، بەڵام هەمیشە بێئاکام دەمایەوە و سزا نەدان وەکوو بنەمایەک ڕەچاو دەکرا.

کوشتنی دوکتور قاسملوو بەرەوڕووی خەمساردی نەبووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، نەبووە هۆی نیشاندانی هەڵوێستێکی چاوەڕوانکراو و شایستەی کەسایەتیی دوکتور قاسملوو لەلایەن بنیاتەکانی نێو دێموکراسییەکەی ئێمە. ئەوانەیکە بە سەرنجدان بە جێگەوپێگەکەیان،

دەبوو بیزانن، دەیانزانی. بەڵام ئەو ڕۆژە، جگە لە دۆستانی قاسملوو و ئارمانجی کوردەکان و هەروەها کۆمەڵێک ڕۆژنامەنووس کە بابەتەکە بەلایانەوە گرینگ بوو، کەس ئەوی لەبیر نەبوو. لەو ڕۆژەدا دۆستەکانیان لەدەوری تابووتی شەهیدەکانی ڤییەن کۆبوونەوە و لە گۆڕستانی پێرلاشێز وەکوو دوا ماڵئاوایی، ڕێزیان لێگرتن. بەڵام لە دەرەوەی گۆڕستانی پێرلاشێز، بێدەنگییەکی بەرفراوان زاڵ ببوو و ناکرێت بە بیانووی ترس لە تووڕەیی ڕێژیمی مەلاکان پاساوی بۆ بدرێت. ئەم هەڵسوکەوتە لەوپەڕی شوورەییدا دەتوانێ ڕاچڵەکێنەر بێت، بەڵام هەرچۆنێک بێت ئەوە ڕاستییە و شتێکی نوێش نەبوو.

جارێکی دیکەش لە دەرئەنجامی ڕووداوێکی تراژیکدا، چەشنێک بنەمای ئاسنینی جێی پەسەندی هەمووان لە کۆڕ و کۆمەڵە سیاسی - دیپلۆماتیکە نێونەتەوەییەکاندا پشتڕاست دەکرایەوە و ئەویش ئەوەیە کە هەرچی کەمتر سەبارەت بە کوردەکان قسە بکەی، زەرەر و زیانی کەمترت بەردەکەوێ. قاسملوو لەکاتی ژیانی خۆیدا بەرەوڕووی ئەم مێتۆدەی دوورەپەرێزی لە کوردەکان بووەوە، مێتۆدێک کە تەنانەت مەرگەکەشی تێکی نەدا. بەدڵنیاییەوە، ئەوە بابەتێکی شەخسی نەبوو - قاسملوو دەیزانی کە دەتوانێت حیساب لەسەر دۆستانێکی زۆر، تەنانەت لە ناوەندەکانی دەسەڵاتیشدا بکات - و بینیشمان کە چلۆن، شارەزایی ئەو لەمێژوو، بووە هۆی پوختەبوونی ئەندێشە سیاسییەکانی. بۆ قاسملوو، تەریک کەوتنەوەی کوردەکان دۆخێکی ستراتژیک بوو و هەربۆیەش، خواستی خودموختاری بۆ کوردەکان لە ئێرانێکی دێموکراتیکیشدا خواستێکی تاکتیکی نەبوو و ئەم خواستە سەبارەت بە ٢٥ میلیۆن کوردیش وەڕاست دەگەڕا (ئەم ژمارانە، تایبەت بەو سەردەمەن. ئەمڕۆکە حەشیمەتی کوردەکان نزیکەی ٣٠ میلیۆن کەسە).

ڕۆژێکیان قاسملوو بەشێوەیەکی دیکە ئەو بابەتەی فۆرموولە کردبوو. من ئەمڕۆکە دەقاودەقی وتەکانی ئەوم بیر نایەتەوە، بەڵام لە ناوەرۆکەکەی دڵنیام. قاسملوو لەبەر چاوی ڕای گشتی دەیگوت

کــە کــوردەکان بــۆ هەمــوو کێشــەن و ئــەوە خــودی کوردەکانن کە دەتوانن کێشــەکە چارەســەر بکەن. بە گوتەیەکی دیکە لە ڕۆژهەڵاتێکی نێوەڕاســتی دیموکراتیــک و تــەژی لــە ئاشــتەواییدا، گەلــی کورد کە وڵاتەکــەی ســنوورەکانی چەنــد وڵات دەگرێتــە خۆی، ئەگــەر ڕێز لە کولتــوور و زمانەکەی بگیرێت و وەکوو هەمــوو کەمینە نەتەوەییەکان چارەنووسی خۆیان بەدەستەوە بگرن، لەو حاڵەتەدا، گەلی کورد وەکوو هۆکارێکی بەهێز لە هاوکێشەکاندا ڕۆڵ دەگێڕێت و دەبێتە هۆی ئاشتی و گەشــەکردنی ناوچەکــە و لەم بــوارەدا، ئوروپا وەبیــر دێنێتەوە. لە ئێســتادا، ئێمە هێشــتا زۆر لەو ڕێگاچارەیە دوورین، بەڵام کێ دەزانێ، ڕەنگە ڕۆژێک..

